ئەحمەد خواجە

# چیم دی

## شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزن





اا

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspress.com
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

ئەحمەد خواجە
چیم دی
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٣٩٠
چاپی دووەم ٢٠١٣
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٣٠٥ - ٢٠١٣
نەخشاندنی ناوەوە و رازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: ئەحمەد تاقانە، بەدران ئەحمەد حەبیب
رێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

ژێنك:
ژمارەی پێوانەیی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-91-979170-6-3



نەخشەی ئەو کوردستانەی شێخ مەحموود ئەیویست

شێخ مەحموود، لە ڕۆژی ٢١ مایس ١٩١٩دا بەرامبەر بەریتانیای گەورە شۆڕشی کوردی دەست پێ کرد، هەموو گەلە یەخسیرەکانی ئینگلیزی تێ گەیاند کە ئادەمیزاد نابێت یەخسیر بێت، نەک تەنیا بۆ کورد بۆ گەلانی ڕووی زەمین بانگی ئازادیی بڵاوکردەوە.

زۆر سوپاسی بە ڕێز بابا عەلی و بە ڕێز شێخ لەتیف ئەکەم کە بۆ لە چاپدان یارمەتییان دام.

# مەرام

داخەکەم، لە کاتی ئاژاوە و بێوڵەتیی کوردستان، بەتایبەتی لە شاری سلێمانی، ئەو تاوێرە زل و کارەساتە ناقۆلایانەی، بەسەر هیوای کوردا تلۆر ئەبۆوە و تاریك و لێڵیی بەسەر ڕۆژی ڕووناکی ئاواتی کوردا ئەهێنا، نە لەو تەمەنە و نە لەو جۆشەدا نەبووم، کە توانای نووسینی ئەو گوزارشە و بەسەرهاتووەم ببێت، تاکو ئیمرۆ ئەو ڕووداوانە بە ناوی دیاریی ڕەنجی گەنجیمەوە بیخەمە پێش چاوی ئەوانەی بەبێ بەزەیی بۆ دەستکەوتوویەکی ڕسوایی، مافی کورد لە ژێر پێدا ئەشێلن.

ئەو کارەساتانەی بە چاوی خۆم بینومە، وە ئەوانەی بە بیستنێکی ڕاست بیستوومە و ئەوانەی خوێندوومەتەوە، لە تۆماری ئەو باسانەدا، کە لە بیرم ماوە بۆ ئەوەی تەنیا بیخەمە پێش چاو نا، بۆ ئەوەی بیئاخنمە مێشکی هەموو کوردێکی دڵسۆز و ببێت بە ئاوێنەیەکی پیشاندەری ئەو دەردی دەرمان نەدۆزراوەیە و بدۆزرێتەوە، ئەم نووسراوە بچووکەم پێشکەش کرد.

لەمێژەوە دەستم بە نووسین کردبوو، بەڵام بەختەکەی منیش، گیرۆدەی بەختی کورد بوو. لە جیاتی چاپ و بڵاوکردنەوە زۆر شارە و شار و کونا و کون گێڕام. تا ناچاری ناشتنیشی بووم، لەو ماوە دوور و درێژەدا لە خاکدا بەشێکی زۆری، بوو بە خۆراکی مشك و سەرلەنوێ کەوتمەوە پێکهێنان.

جا ئەوەی زیاتر هانی ئەم نووسینەی دام، ڕەنجە – گەورە و گرنگەکانی شێخ مەحموود بوو کە هەندێك لە بێگانە بەدبەختەکان بەسەرزەنشتەوە لێی ئەدوێن و لە داناو پسپۆڕەکانی کوردیشەوە بێ وەڵام مایەوە چونکە بە خۆیاندا ڕانەدەبەرموان پێنووسیان (قلم) بەکاربێنن، یان لە مێژووی کۆنی گەلەکەیان بدوێن و بیکەن بە یاداشتێك، بۆ بناغەی مێژووی دوارۆژ.

هەموو ئەیزانین، شۆڕشەکەی بە فەرماندەیی شێخ مەحموود لە ١٩١٩وە تا ١٩٢٧– بەرامبەر

ئەو چەکی ئاگرینەی، کە حکومەتی بەریتانیای گەورە بۆ پەرێشانیی تورك و ئەڵەمان بەکاری دەهێنا لەگەڵ کوردا پێی جەنگان، پێویستە ئەمە بە پێشەکیی شۆڕشەکانی پێشوو، کە بۆ سوودی دوژمن و بێوڵەتیی کورد دوایی هاتووە، پیشانی بدەن.

شێخ مەحموود لە پێناوی ئازادیی کوردا ماوەی هەشت ساڵ لە جەنگ و تێکۆشاندا بوو بێ ئەوەی بێگانە بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت و پەنجە بکێشێتە شۆڕشەکەیەوە.

شێخ مەحموود، فەرمانڕەوا، خاوەن دێهات و ئاو و زەوی و دارایی بوو. لە پای ڕزگاریی گەلەکەیدا، بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی کیشوەری کورد لە عێراقدا، بە گیانی خۆی و گەلەکەیەوە تێ کۆشا. بەڵام بەبێ یارییەدەر و بەبێ یارمەتی، ئەو ماوە دوور و درێژەی بە سامان و دارایی خۆی بردە سەر.

شێخ مەحمموود، دوژمنی خوێنڕێژ و خوێن ڕژاندن بوو، ئاسایش یەکەمین ئاواتی بوو، پیاو خراپ لە پەنایدا هەرگیز نەئەحەسایەوە. ژیانی دیلیی بەمردنی دلێری ئەگۆڕییەوە. بۆ هیچ لەنگییەك سەری دانەنەواند، هەموو ژیانی لە بەربەرەکانیی کوردا بەسەر برد.

شێخ مەحموود، زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی بە هاوڕێی زمانەکەی خۆیەوە زۆر باش ئەزانی. بە کوردیی پەتی ئەدوا. بە فارسی و کوردی وتار (شیعر)ی زۆرە. ئەمەیش وێنەیەك بە فارسی.

ما بعزم این سفر پا از میان بەر داشتیم

تاکە زنگ کفر از کوردستان بەر داشتیم

واتە: بەو هیوایە ئەم کۆچەمان کرد، تا وەکو ژەنگی، زاڵییەتیمان لە کوردستان هەڵگرد.

و ئەمەیش وێنەیەك لە وتارە کوردییەکەی:

من کوردم و بە کوردی ئەڵێم و برایەوە
درك ئەمما گوڵی هیوا گەشایەوە

وەختێ بە پەنجەی دوژمنی بەد نهاد
کە خونچەی ئەمەلمان ئەشکایەوە

ئیمڕۆ بە نووکی خەنجەری تیژی خۆی
مەردانە بۆ کورد ئازادی سەنرایەوە

شێخ مەحموود، مەردێکی دەستە پیاو، چاو و موو ڕەش، گورج و چالاك، لە گفتوگۆدا لەسەرخۆ، هێمن و زمان خۆش، ڕوو بە پێکەنین. حەز لە قسەی ئەستەق. نیشان شکێنێکی بێ

هاوتا و چەکبازێکی بەناوبانگ بوو.

شێخ مەحموود، نەترس و بەهێز، لە بەڵێندا ڕاست و دروست، لە پێناوی گەلەکەیدا بەخشندە، لە خراپەی بەرامبەر بە خۆی چاوپۆشی پیشەی بوو.

بەرامبەر بە دوژمن سەر بەرز و نەترس، بۆ دۆست نەرم و هێمن. لە ناسین (فەراسەت)دا زۆر بالا بوو.

لە بابەت چۆنیەتی و بەهرە و هونەر و فرمانی شێخ مەحموودەوە نووسین تەواو نابێت. هەر ئەو نەختەمان بە بەس زانی، خوا وێنەی زۆر بکات.

ئەحمەد خواجە

نووسەر و گەنجینەداری تایبەتی شێخ مەحموود

خوێنەواری خۆشەویست:

جا بۆ ئەوەی خوێندەوارە بەڕێزەکانمان تێ بگەیەنین کە لە مێژەوە ئەم دوو گەلەی عێراق لە کۆششی ڕزگاریدا سرەویان نەبووە و لە کێشەی ئازادیدا بوون، پێشەکیی ئەم باسەمان پێشکەش دەکەین.

**عەرەب و کورد لە باوی عوسمانییەکاندا**

هەر چەندە عەرەب هاوئاینیان بوون، سەردارێتیی عوسمانییەکانیان پێ خۆش نەبوو، بەڵام لاوەکانی تورك لە ڕێز گرتنیان درێغییان نەدەکرد.

عەرەبەکان بە ناوی (کۆمەڵی برایەتیی عەرەب و عوسمانی = جمعية الاخاء العربي العثماني)وە، لیژنەیەکیان دامەزراند. بۆ ئەوەی پاش هەڵبژاردنەکەی ١٩٠٨ نێرراوە (مبعوث)ی عەرەب لە تورك کەمتر نەبێت، داوایان دەکرد و لاوەکانی تورك هانیان ئەدان، کە لە پلەیەکی بە تین و بە هێزتردا کۆمەڵانی عەرەب دروست بکرێت. چونکە لەو کاتەدا لە ٢٤٥ نێرراو ١٥٠ لە تورك و ٦٠یش لە عەرەب بوو و کۆمەڵ داخرا.

جا عەرەب دوو لیژنەی بە هێز و نهێنییان پێك هێنا، یەکەمیان (کۆمەڵی قەحتانی: بە سەرۆکی عەزیز عەلی میسری - لە ئەستەمبووڵ ) و لە ساڵی ١٩١٢/١٩١٣یشدا (لیژنەی ڕێکخستنی دەسویردی = لجنة الإصلاح الفعالة - بیروت)یان دامەزراند و پێنج لێژنەیش لە جێگایانی تر بە هیوای دروستکردنی حکوومەتێکی مەلەکیی عەرەبی - تورکی - تێکەڵ) و هەر بۆ ئەمە لە ساڵی ١٩١٦دا ئەمیر فەیسەلیشیان بەو ئاواتەوە کە تێکەڵ کرد، بۆ ڕزگاریی عەرەب بوو.

جا بەبێ جیابوونەوە داوای (حوکمی زاتی - ئۆتۆنۆمی)یان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد. بەم داوایە حکوومەتی تورکیان - خستە لەرزە و لەقاندن.

**بەڵام، کوردەکان**

گەلێکی بچووکتری موسڵمان بوون لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا و بەشێکی ئازاو دلێری

چیاکانن. بەڵام بەڕێوەبەری سیاسییان کەم بوو و قوڵت و گرێیەکی گەورەیش بوون بۆ ئێران و تورکیا. چونکە بە درێژیی ژیانیان بەرامبەر بە ئیستیعمار لە شۆڕشدا بوون بۆ پچڕینی بەشێکی گەورە و گرنگ لە ڕێی ئازادییاندا، لەگەڵ ئەوەیشدا لە کاتی شەپۆلی جەنگی یەکەمدا، کوردەکان تا دوای جەنگ لە پێناوی سەرکەوتنی تورکەکاندا ڕاست و گیان بەختکەر بوون و هۆشی ئیسلامی ماوەی ئەوەی نەدان لە ڕێی ئازادییاندا ببزوونەوە و هیچ دەستدرێژییەك بەرامبەر بە عوسمانییەکان بکەن، تا جەنگ برایەوە[1].

بەڵام مامۆستا (الدرة)یش ئەڵێت: پیاوە سیاسییەکانی کورد لە پایتەختی عوسمانیدا خەریکی پێکهێنانی بەرهەمی ئازادی بوون. ڕۆژنامەکانی کورد کە لە لایەن بەدرخانییەکان و شێخ عەبدالقادرەوە دەرئەکرا و کۆمەڵە کوردەکانی پارێزەر – محامی – و سوپایی و قوتابییەکانی حەربییە، زۆر بە ئاشکرایی لە ١٩٠٨ەوە تا ١٩١٤ لە ڕێی ئازادیدا زۆر بە گەرم و تیژی ئەجووڵانەوە. بەڵام کۆشش و تەقەڵای کورد بە گرتنی ئەستەمبۆڵ لە لایەن موستەفا کەمال پاشاوە بە با چوو و دوایی هات. ئیتر «نازانم مامۆستا جۆرج لنشوفسکی چۆن بێ ئاگا بووە»

## بانگی جەنگی ١٩١٤

لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عوسمانی سوڵتان و خەلیفەی ئیسلام و فەرمانڕەوا و حوکمڕانی ڕۆژهەڵات بوو، لە ساڵی ١٩١٤دا بۆ یارمەتیی ئەڵمانییەکان تێکەڵی جەنگ بوو، لە کاروباری ئەو دەوڵەتەدا فەرمانبەران – موظفین – لە عەرەب، کورد، تورك بە کیشوەری عوسمانیدا بە هەرهەمەیی بڵاو کرابۆوە. وایان بڵاوکردەوە کە لە ڕێگەی ئاینی ئیسلامدا بەرامبەر بە دوژمن ئەجەنگن. بە دەهۆڵ و زوڕناوە دەست کرا بە شای لۆغان.

هەر پاش یەك مانگ بەڵگەی پەرێشانییان دەرکەوت. سەربازی بێ خاوس، برسی و ڕووت ئەخرانە کۆڕی جەنگەوە، خراپیی چەك و کردەوەی فەرمانبەرەکانیان لە گیان بێزاری کردن و پەرێشانیی حکوومەت گەیشتە گەل ڕووتاننەوە.

تورکەکان وشەی ئیسلامیان کردبوو بە کوتەکی دەستیان ئیتر ڕاو و ڕووت بوو بە پیشەی حکوومەت، تا وای لێ هات لە مەڕ و بزن، گا و مانگا، کەر و ئێستر، ماین و ئەسپ، لە هەموو جۆرە چوار پێیەك. لە گەنم، جۆ، برنج، لە هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك، لە کا، دار، خەڵووز لە هەموو پێویستییەك، سەرەڕای ئەمانەیش بەرگ و مرۆڤیش هەمووی پێویستیی حکوومەت بوو و بە خۆرتی ئەسێنرا و ئەبرا.

---

١. الشرق الاوسط فی شئون العالم: جورج لنشوفسکی.

هەناسەی خۆشی نەما. برسیەتی، نەخۆشی، هەموو چەشنە پەتایەك وڵاتی داگیر کرد. دەرمان، پزیشك، چارەساز نەبوو. لە شار و لادێدا، ناڵەی ژن، پیاو و منداڵ لاشەی لەبرسا مردوو شەقام و کەلاوەکانی پڕ کردبوو. جا، تەنیا گیان هەرزان و نان گران بوو.

سەرەڕای ئەو گرفتارییە لە ناوەڕاستی شارا، لە سلێمانی و دێهاتەکاندا دەستە دەستە لاوانی کورد ئەدران بە نیشانەوە بە دەستڕێژی سەربازی تورك دەکوژران، ئەمە وێنەیەك بوو لە بەسەرا هاتووی کوردی عێراق.

## کوردی ئێران

ژن و پیاویان بە لێشاو خۆیان ئەگەیاندە ناو کوردی عێراق. بەڵام بە لووت، دەست یان مەمك بڕاوی لە لایەن سوپای ڕووسی قەیسەرەوە. بە منداڵی ساواوە ئاوارە ئەکران و لە لایەن سوپای تورکی ئیسلامیشەوە ڕووت دەکرانەوە. بەم چەشنە قڕی کورد هات.

لە دەوڵەتی عوسمانیدا قەبارەی یاسا ڕما. دەستە دەستە سەرباز بە چەکەوە لە کۆڕی جەنگەوە ڕایان دەکرد. وڵات لە میری بوو بەکوانووی ئاگر.

## خوارووی عێراق

وەکو ژووروو، ئینگلیزیش لە بەسرەوە چنگی خستە ناو جەرگی عێراق (عوسمانی)، سوپای تورك لەبەر ڕووتی و برسیەتی و بێ تفاقی بە هیچ چەشنێك خۆی پێ ڕانەئەگیرا و بەرگەی ئەو دوو لێشاوەی نەئەگرت کە لە سەرەوە ڕووس و لە خوارووی عێراقەوە ئینگلیز، دەمیان تێ ژەنیوە. جا پیاوەکانی میریی (تورك) و کاربەدەستەکانیان تێ گەیشتن کە کار لە وزەیاندا نەماوە و کەوتنە چارە دۆزینەوە. زانییان تەنیا کورد، بە هێز و دەسەڵاتە. بۆ ئەوەی ئەمجارەیش کورد بکەن بە قەڵغان و مەرام و سەرکەوتنی خۆیانی پێ بێننە دی، لەشکری کوردیان دۆزییەوە. بۆ ئەم کار و هیوایەش تەنیا (شێخ مەحموود) بوو کە بتوانێت ببێت بە هۆی یارمەتییان.

شێخ مەحموود، لەو کاتەدا لەسەر هەندێك خەرج و باجی ناڕەوا لە حکوومەتی تورك زویر بووبوو و چووبوو بۆ (قەڵای مەریوان) لە خاکی ئێران، بەو مەرجەی ئەو باج و سەختڵەتییە لەسەر گەلەکە هەڵگیرێت و لابرێت. پەیمانیان دایە، کە بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، بەڵام مەبەستی حکوومەت ئەوەبوو کە شێخ مەحموود، لەو عەشایرە چەکدارانەی کورد کە خۆیان دەسەڵاتیان بەسەریاندا نییە و یەکسەر بەستراوی فەرمانی خۆین، بیانهێننە کۆڕی جەنگەوە و بەربەستی لێشاوی ڕووسەکانیان پێ بکەن. شێخ مەحموودیان هێنایەوە بۆ سلێمانی لە مارتی ١٩١٥.

فەرماندە سوپاییەکان و موتەسەریفی سلێمانی (بهرام فهمی) کارمساتیان لە شێخ مەحموود گەیاند و بەناوی تەڵعەت پاشا و ئەنوەر پاشا و خەلیل پاشاوە، پێیان وت، پێویستە

ئەو فرمانەی، کە بەریەستی ڕووسەکانە بیهێنێیە جێ و بچیتە جەنگەوە. هەروەها کارمساتیشیان بە ئەنوەر پاشا گەیاند– بە زوویی خەلیل پاشایان نارد و گەیشتە سلێمانی بۆ بەدیهێنانی ئەم پرۆگرامە. پاشا بە ئۆتۆمبیل هات، بەڵام لەم ئۆتۆمبیلانەی ئێستا نەبوو. بەلامانەوە زۆر ستەم بوو کە پاشا دەوێرێت لە ناو ئەو ئاگرەدا دانیشێت.

بە پەنهانی لەگەڵ شێخ مەحموودا یەکتریان بینی. وا دەرکەوت کە ڕێك کەوتوون چونکە شێخ کەوتە لەشکر ئارایی و ڕوو بە پێنجوێن ڕۆیشت بۆ جەنگی ئیسلام و ڕووس.

ئەیانوت: سوڵتان خەلیفەی ئیسلام لە ئەستەمبوڵ فەرموویەتی ئەگەر هەموو ئیسلام نەچێتە کۆڕی جەنگەوە ئاڵای پێغەمبەر دەرئەهێنم، لەو کاتەدا ئەم فەرموودەیە و بڕیارە تیغێکی زۆر کوشندە بوو بۆ گەلی ئیسلام.

بۆ تۆڵەی شکستە و پەرێشانییەکەی خۆیان – تورك – کە شێخ مەحموودیان ساز کرد. ئیتر لەسەر فەرمانی شێخ لە بادینانەوە تا خانەقین. چەکداری کورد ئامادە بوو.

ئەوەی لەگەڵ خۆی بوو و ڕوو بە پێنجوێن ڕۆیشت لە پلەی یەکەمدا عەشایری جاف بوو، لەگەڵ سمایل عوزەیری و شێخان و لە پشدەر، مەنگوڕ، بڵباس، ئاکۆیش بۆ سەردەشت و لە بادینانەوە بۆ ڕەواندز کەوتنە لێدانی سوپاکانی ڕووس. پاش کوشتارێکی نادیدە لە هەردوولا ڕووسەکان کشانەوە بۆ ناو ئێران – مایس ١٩١٥.

### شێخ مەحموود بۆ شعێبە

تورکەکان بەدەم سوپای ئینگلیزەوە زۆر بێ دەسەڵات بوون، توانای خۆگیرییان نەمابوو. لە کاتێکدا ئەو دەسەڵات و سەرکەوتنە بێ هاوتایەیان لە شێخ مەحموود بینی. ئینجا بۆ ئەوەی لە خوارووی عێراقیشدا بە کاری بێنێت، ئەمجارەیش شێخیان تەفرە دا، بە لەشکرێکی زۆری کوردەوە ناردیان بۆ شوعێبە.

ئیتر ڕووسەکانیش هەلێکی باشیان کەوتە دەست، پاش ڕۆیشتنی شێخ گەڕانەوە و ئەمجارەیش دیسان تەنگیان بە سوپای تورك هەڵچنی و هاتنەوە بۆ سەر سنوور.

لە شکری کورد پیادە و سوارەیان، بە چەك و خواردەمەنی و بەرگ و تفاق و هەموو پێویستێکی خۆیانەوە ڕۆیشتبوون بۆ شوعێبە.

لەگەڵ گەیشتنی کوردەکان، ئینگلیزەکان بۆ دەست پێشکەری کەوتنە جەنگێکی نەبیستراوی جەهەنەمی. بە تۆپ و فڕۆکە و گیانی بەلاشی هیندی، زۆر لە گیاندارانی کورد لە ژێر لم و خاکی عەرەبستاندا نێژرا. بە تایبەتی ڕەشید پاشا و دە پیاوی ناودار بە تۆپ لەش و گیانیان پەرش و بڵاو کرایەوە. لەو ماوە درێژەدا، تورکەکان نەك بەرگ و نان، یان تفەنگ و فیشەك، نەیانتوانی

ناو بدەن بە کوردەکان. تا لە ژێر فەرماندەی سەرۆك و سەرداریان، شێخ مەحمووددا ماوەی لەشکرەکەیان گەڕایەوە بۆ نیشتمانەکەیان.

لە پاش گەڕانەوەی شێخ مەحموود سوپای ئینگلیز بەبێ ترس و وەستان کەوتە پێشکەوتن، نەمانبیست لە پێش سوپای ئینگلیز و بەدوای سوپای تورکدا سوپایەکی بێ چەکی عەرەب هەیە. بۆ کۆکردنەوەی چەکی کوژراو و بریندار و پەککەوتووی سوپای تورك. هەر بە دوای گەڕانەوەی کوردەکان و شکستەی تورکەکان (سلێمان عەسکەری) فەرماندە و سەر لەشکری تورکەکان خۆی کوشت.

لە پاش گەیشتنەوەی چەکدارە کوردەکان. بە سواری و پیادە لە شوعێبەوە بە سلێمانی، بە ماوەیەکی زۆر کەم دیسانەوە تورکەکان یەخەگیری شێخ مەحموود بوونەوە.

وتمان ڕووسەکان گەڕانەوە بۆ سەر سنور. گەڕانەوە بەڵام بە سوپایەکی ئێجگار زۆر بە چەك و تفاقێکی تازەوە هێرشێکی گیان بەختکەریان هێنا. سوپای تورکی بەستەزمان و لە هەموو پێویستێك بێ بەش، بەرامبەر بەو لافاوە، بێ گومان خۆگیرییان پێ نەکرا و بە پەرێشانی گەڕانەوە. هەر بەدوای شکستەکەیاندا ڕووسەکان. ڕواندز، پێنجوێن، خانەقینیان سووتاند. بە هەزاران گیانداریان بێ گیان کرد. بێ شومار دێهاتیان بە وێرانی و خاپووری بەجێ هێشت. ژن و منداڵ، پیاو ئاوارە کرا. سەرەڕای ئەم پشێوییە، ئەو ئازووقەیەی لەگەڵ گیانیان دەریازیان دەکرد، تورکەکان لێیان دەساندن. کوردی هەژار لە نێوانی ڕووس و تورکدا بێ سەر و ماڵ و سەرگەردان بوون، ڕەگ و ڕیشەیان دەرهێنرا.

جەنگی دووەمی شێخ مەحموود و ڕووس

دیسانەوە گەل لە ژێر باری خەرج و باج، ڕاوو ڕووتی حکوومەتیدا دەیناڵاند. بە ناوی کڕینەوە، بەبێ پارە و ماڵ پشکنین دەغڵ و دانیان لە وڵاتدا نەهێشت. مەئمووران لە برسان ناوی یاسا و حکوومەتیان فەرامۆش کرد. گەورە و بچووکیان، خۆ خۆیی خەریکی جەردەیی و بەرتیل وەرگرتن بوون.

پارەی حکوومەت (کاغەز – نوط) بوو، حکوومەت خۆی دەیدا وەری نەدەگرتەوە و لە ناو گەلیشدا نرخی نەمابوو. لەم کاتە ناهەموارەدا سەرکەوتنی ڕووس و زاڵیەتی و بەدکاریی تورکەکاندا = شێخ مەحموود و لەشکری کورد گەیشتەوە پێنجوێن کە لە ژێر فەرمان و حکومڕانی ڕووسدا بوو. جەنگی کورد و ڕووس دامەزرا. بەرامبەر بە هەڵمەت و دلێرییان بە ناچاری ڕووسەکان پێنجوێنیان بەجێ هێشت و بوون بەدوو قۆڵ:

١- بە مەریواندا:

گرانباری وەکو تۆپ و چادر و بارخانە قورسەکانیان فڕێ دایە ناو (گۆمی زرێبار) و بەسەڵتە زەلامی بە (کەلی گاران)دا خۆیان ڕزگار کرد و گەیشتنە شاری (سنە).

٢- بە بانەدا:

ئەم لقە زۆر زۆر و بەهێز بوو شێخ مەحموود بە هێزەکەیەوە کەوتنە دوای ئەم لقە و لقی مەریوانی بە سوپای تورك سپارد.

ڕووسەکان زۆر پەرێشان کران. لە بانەیش دەرکران. هەرچەندە لە کوردیش زۆر کوژرا بەڵام سەرکەوتنیان دەست کەوت، لە بەرئەوە بە گرنگتر و پەسندتر زانرا. جا تورکەکان بۆ ئەوەی ئەم سەرکەوتنە بۆ خۆیان پێشان بدەن فەرماندە سوپاییەکانیان (غروب قوماندانی) کە لە سلێمانی بوو ئاگاداریان کرد کە خۆیان کردوویانە و بەدبەختانە لەو جەنگاوەرانە و لە کوێخا و سەرکۆمارەکانی جاف حەوت کەسیان گرت و لە ناکاو و بەبێ ئاگاداریی شێخ مەحموود نران بە بەر دەستڕێژی تفەنگی سەربازی تورکەوە.

شێخ مەحموود لەم کردەوە کێوی و جانەوەرییەی زابت و فەرماندەکان ئاگادار کرا، زویر بوو و ڕاستییەکەی بە سلێمانی گەیاند، سووچدارەکانیان دا بە (مەجلیس عورفیی عەسکەری - لە مووسل) و سزا دران. بەڵام تورکەکان شێخ مەحموودیان ناچار کرد بە مانەوە و جەنگی بەرامبەر بە دوژمن. چونکە ئەگەر بگەڕایەوە و بەری ڕووسی بەرەڵا بکردایە هیچ گومان نەبوو کە بەدەست ڕووسەوە کوردێك نەدەما. لە خۆی، شێخ مەحموودم بیست، فەرمووی: من بەڵێنم بە خەلیل پاشا دا بە درێژایی جەنگ شان بە شانیان بجەنگم بەو مەرجەی پاش جەنگ (حوکمی زاتی) بدەن بە کورد و کورد ئازاد بێت. لەبەر ئەوە نەمویست بگەڕێمەوە و ئەو پەیمانە بشێوێنم.

ڕووسەکان و شێخ مەحموود

ڕووسەکان بۆیان ڕوون بووبۆوە کە بەرامبەر بە هێزی کورد و بە تایبەتی شێخ مەحموود هیچیان بۆ ناکرێت چونکە بە ناوی شێخ مەحموودەوە پشت و پێشیان لێ گیرابوو و ئێرانیان لێ بووبوو بە کوانووی ئاگرین. بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا تێگەیشتن و پێکهاتنێك بنیات بنێن، کەوتنە تەقەلایەکی زۆر.

جا، لە پێش بانگی جەنگدا، لە ئەندامی کۆمەڵی ئیتیحادییەکان، کە بۆ ناو حکوومەتە بێگانەکان ڕایان کردبوو یەکێك لەوانە سەفوەت بەگ، لە ئەستەمبووڵەوە چووبوو بۆ ڕووسیا، پترسبۆرغ (لینین غراد)، کە ئەوسا پایتەخت بوو.

سەفوەت بەگ پێش جەنگی ١٩١٤ هاتە سلێمانی. بە فەرماندەیی و موتەسەڕیفی، دۆستی

دێرینی شێخ مەحموود و خاوەن کردگاری باش بوو. ڕووسەکان دۆزیانەوە بە هیوای ڕێککەوتنی شێخ مەحموود بە دەسەڵاتێکی زۆرەوە ناردیان بۆ (سەقز) لە وێوە بە هیوایەکی گەورە و نیازێکی پاکەوە قورئانێك بە مۆرکراوی و نامەیەکی دۆستانەی نارد بۆ شێخ مەحموود کە لە (بانە)دا بوو.

کورتە و پوختەی نامەکەی سەفوەت بەگ

حکوومەتی عوسمانی لە تەواویووندایە، پەکی کەوتووە، ناتوانێت بەربەرەکانیی حکوومەتی قەیسەر بکات. چونکە بێجگە لە هێزی کورد، هێزی سوپاییەکەی لە باریا نییە بجەنگێت. ڕووس خاوەن سوپا و تۆپ، هێزی فڕۆکەی زۆرە. دڵنیابن بەم زووانە بە سەرکەوتنی ڕووس جەنگ تەواو دەبێت. جا بە بۆنەی دۆستایەتیمانەوە ئەم تکایەت لێ دەکەم.

ئەوەی تۆ ئارەزوو دەکەیت و دەتەوێت، حکوومەتی قەیسەر ئامادەیە پێشکەشتان بکات. ئێمە زیاتر پێویستیمان بە یارمەتیت هەیە. نامەوێت دوژمنی وا گەورەت ببێ، چاوەڕێی وەڵامتانم.

ئەو قورئان و نامەیە لەگەڵ ئاغا ئەحمەد ناوی سوورێنیدا نێررا بوو. دێی سوورین لە بەشی بانەدایە.

وەڵام لە شێخ مەحموودەوە:

(پوختەی نووسراوەکە)

من لە جانەوەری و خوێنخۆریی ڕووس، نیشتمانم دەپارێزم. بە هیوای بەخشندەیی قەیسەر نیم. کوردیان لەبن هێنا. خۆت دەمناسیت، دارای من دەزانێت. لەو دوژمنەی ناسیم، ناترسم، ئاوات و ئارەزووی من ئازادیی گەلی کوردە. کێ دەست بداتە دەستمان دۆستی ئەو کەسەین، وەڵامی دوژمن، لە لوولەی تفەنگی کوردەوە دەبیسترێت.

ئەیلوول ١٩١٥

ئەم نامانە بە زمانی تورکی نووسراون. زۆر بە کورتی پێشان دران. بەڵام وەڵامەکەی شێخ مەحموود بەلای ڕووسەکانەوە زۆر بە نرخ بوو چونکە ئەرمەنییەکان بە هیوای ئازادی شان بە شانیان بوون. تێ گەیشتن کە شێخ مەحموود و کوردەکانیش بە ئاسانی دەست دەکەون چونکە ئەمانیش عەودالی ئازادین.

### له ئەستەمبۆڵ

له ساڵی ١٩٥٤دا بۆ جاری دووەم چووم بۆ ئەستەمبۆڵ (گۆڤاری مێژووی وێنەدار – رسملی تاریخ مەجموعەسی)م بینی. کریم، له ژماره ١ مانگی ئوجاخ ١٩٥٠دا ئەم نووسراوه بەنرخەم تێدا خوێندەوە:

له ساڵی ١٩٢٤دا له لایەن. ئی. ئی. ئادام ئۆف: سەرۆکی لێژنەی پشکنینی تۆماره نهێنییەکانی قەیسەریدا له بابەت پارچەپارچەکردنی کیشوەری تورکیا (عوسمانی)یەوه ئەم بەڵگەیه دۆزرایەوه دەڵێت:

له ١١ کانوونی یەکەمی ١٩١٥دا له لایەن. ئێس. ئەی. پوکلەفیسکی، ئێلچیی ڕووس له بکرمشەوه بۆ شالیاری دەرەوەی ڕووسیای نووسیوە، که جەمال پاشا لەگەڵ حکوومەتەکەیدا نارێکه، بێتو دەستدرێژی بکەین بۆ تورکیا، دەبێت جەمال له حکوومەتەکەی هەڵگێڕینەوه و ئەرمەنییەکانیش بگەیەنین به جەمال، ئینجا به مەرام دەگەین. چاوەڕێی وەڵامم[1].

ئەم مەرامه له لایەن شالیاری دەرەوەی ڕووسیا (سازانۆف)ەوه گەیێنرا به ئێلچییەکانی ڕووس له ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئیتاڵیا، که سوێندخۆریان بوون، بۆ ئەوەی له عەرەبستان، عێراق، کیلیکیادا بەناوی تورکیای ئاسیاوه جەمال پاشا بکرێت به سوڵتان. بیری ئەو حکوومەتانه چییه لێیان بچێژنەوه و ئەم مادانەی پێشان داوه ئەگەر جەمال یاخی بوو.

١- بۆ ئەم سوڵتانه تازەیه. سووریا، فەڵەستین، عێراق، عەرەبستان، کیلیکیا و ئەرمەنستان و (کوردستان). له وێنەی ئەیالەتدا بەناوی تورکیای ئاسیاوه سەربەخۆییان بدرێتی و دەوڵەته گەورەکان بەڵێن بدەن بۆ پارێزگارییان. (بێجگه لەم مادەیه ١١ مادەی تریش هەیه لەبەر بێ جێگایی هەر ئەوەندە بە بەس زانرا).

هەروەها دەڵێت:

له ئەنجامدا ئینگلیزەکان وتیان: بەسرامان گرتووه که عێراقمان تەواو کرد، لەم کاره دەدوێین و فرانسزەکانیش وتیان لوبنانمان گرتووه پاش گرتنی سوریا و عێراق قسەی لێ دەکەین.

که ئەم نووسراوەم بینی نامەکەی شێخ مەحموود که بۆ سەفوەت بەگی ناردبوو هاتەوه بیرم و هیچ دوور نییه که لەسەر ئەو نامەیە ڕووسەکان نەکەوتبنه دوای ئەم مەبەستە و سوێندخۆرەکانیش له ترسی دواڕۆژی ڕووس نەیانوێرا ئەم چاکەیه بکەن.

بەڵام و بەڵام، ئینگلیزەکان ئەم هیوا و ئاواتەی کورد و شێخ مەحموودیان کرد به پرپاسکەیەکی توندوتۆڵ و بەستیان به لوولەی تۆپ و بۆمبا زلەکانیانەوه و دایان بەسەر کورد

---

١. ئەم نووسینەی ئێچلی بکرەش له وەڵام دەچێت. ڕەنگه لەوەپێشیش نووسرا بووبێت.

و كوردستاندا و ئازادیی كوردیان خسته بریتی نرخی بۆمبا نەتەقیوەكانیان، كە لە ناو خانوو و چیاكانی كوردستاندا بە نێژراوی ماوەتەوە.

### توركەكان و شێخ مەحموود

كاربەدەستەكانی تورك نالەباری و زاڵبەتیێكی ئێجگار زۆریان پێشان دا، وەكو بە كوشتن، بە كوشتندان، بە برسیەتی و نەخۆشی و مردنی لە ناكاو. بەدبەختییان گەیشتە ئەو پایەیەی بە نووسین تەواو نەبێت.

لە رووی كردەوەی ناپەسند و ناشیرینیانەوە، كورد و شێخ مەحموودیان وەڕست كرد. كەڵكەڵەی جیابوونەوە كەوتە یادی هەموو یەكێكەوە. چونكە نە لە برایەتیی ئیسلامی و نە لە یەكیەتیی عوسمانیدا نەما.

لە ١٨ مایس ١٩١٨دا ئینگلیزەكان گەیشتنە بەغداد، رووسیش لە خانەقیندا مۆڵیان دا. تا گەیشتنە (منصورية)یش ئینگلیز زۆر بە گورجی دەهات. سوپای تورك گەیشتەوە كەركوك. ئیتر توانای جەنگیان نەمابوو. لە كاتێكدا كە ئینگلیز گەیشتە كنگربان. توركەكان كەركوكیشیان بەجێ هێشت. ئیتر هیوای مانەوەی تورك لە عێراقدا بەسەر چوو. نەڕۆن بەبێ یادی باش.

### شێخ مەحموود و ئینگلیز

بۆ ئەوەی جارێكی تر دووچاری جەنگێكی تازە نەبنەوە، شێخ مەحموود دوو نامەی نووسی:

١- بۆ حاكمی عامی عێراق.

٢- بۆ فەرماندەی گشتی لە كەركوك.

یەكەم: بەهۆی سەید موحسین ئاغاوە لە كفری.

دووەم: بە هۆی عەبدوڵڵا سافی یەعقووبییەوە لە كەركوك.

لە نامەكاندا دەڵێت:

چەرخی گەردوون ئێوەی بە سەركەوتوویی گەیاندە نیشتمانی كورد، كە كوردستانە. لە عوسمانییەكان كورد هیچ بەهرەیەكی وەرنەگرت. دەزانن كە بە هەزران ساڵ ئەم خاكە نیشتمانی كوردە. لە ئادەمیزاد پەروەریتان ئومێد دەكەین كە ئێوە حەقی كورد بدەن و ئازادی و سەربەستی لە كوردستاندا بڵاوبكەنەوە و ماوەی ئەوە نەدەن كە كورد بە چەك داوای حەقی خۆی بكات و بیسێنێت. (١٩١٨).

ئەمە بوو پوختەی نامەكان. وا رێ كەوت لە پاش بەجێ هێشتن، دووبارە گەڕانەوە بۆ كەركوك. عەبدوڵڵا سافی نامەكەی نەگەیاندبوو بە ئینگلیز، دای بە توركەكان. توركەكان

دەستبەجێ فەرمانیان دا بە سوپاییەکەیان لە سلێمانی، بە فێڵ شێخ مەحموودیان گرت و بردیان بۆ کەرکوك – موسڵ، بێ سەرو شوێن مایەوە. لە مووسڵ بڕیاری خنکاندنیان دا.

بەخت یاریدەر بوو. عەلی ئیحسان پاشا گەیشتە مووسڵ، تورك خۆیان دڵنیا بووبوون کە عێراقیان لە دەست چووە. بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا کەڵکی لێ وەربگرن و پارێزگاریی هێزە ماوەکەی سلێمانییان بۆ بکات، شێخ مەحموودی ڕزگار کرد. بە پرۆگرام و هەندێك پارەوە ناردیەوە بۆ سلێمانی.

پرۆگرامەکەی عەلی ئیحسان پاشا ئەوە بوو، کە شێخ مەحموود هێزێکی عەشایریی کورد پێکەوە بنێت و ئامادەی یارمەتییان بێت، لەم کاتەدا دەوڵەتە یەکگرتووەکان کەوتنە پیلانی ڕێککەوتن – هودنە.

لە سەرەتای تشرین ٢– ١٩١٨دا عەلی ئیحسان پاشا فەرمانی دا بە سەرەك سوپاکەی سلێمانی کە بەڕێوەبەری سوپایی و شارستانی – عەسکەری و سیاسی – بدرێتە دەست شێخ مەحموود و بە ناوی دەوڵەتی عوسمانییەوە فەرمانڕەوا بێت.

هەموو کەسێك بە ئاوات و هیوایەکی تازەی فەڕ بەخشەوە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەی دەکرد کە ڕووناکیی کوردی تێدا دەبینرێت. برسیەتی و پەرێشانیی ڕابووردوو فەرامۆش کرا. جەژنی ئازادی تارای خۆشیی هەڵدا و چاوەڕێی فریشتەی چاکەن. بەڵام ئەو دیوی پەردە چیی تێدایە؟ کێی لێیە؟ چۆن دەگۆڕرێت نازانرێت، تاریکە.

کە لە ئەستەمبوڵ بووم لە ١٩٥٤دا لەگەڵ عەتای حاجی کاکە حەما چووینە دیدەنیی عەلی ئیحسان پاشا. زۆر بە گەرمی پرسیاری شێخ مەحموودی کرد. باسی ڕزگاریی لە خنکاندنی گێڕایەوە. وتی من تێ گەیشتبووم عێراقمان دۆڕاندووە. ئیتر بۆچی پیاوێکی وا گەورە و خاوەن چاکە لەناوبچێت و دەیشمزانی پاش خنکاندنی، ئێمە لە ناو کوردەکانا تووشی چوورتمی گەورە دەبین، ڕێگەی گەڕانەوەمان لێ دەبڕن. کردەکەی من بەجێ بوو.

نەزانرا هێشتا بێوڵەتی کوردی بەر نەداوە.

١– لەسەر بڕیار و بەڵێنی ئازادی لە لایەن بەریتانیاکانەوە.

٢– بەبێ جەنگ و بەرگریبان لەسەر نامەکان بۆ هاتنە کوردستان لە لایەن شێخ مەحموودەوە بەڵێن درا.

نوماینده و نوێنەری ئینگلیز (مێجەر نوئێل) لەسەر ئەو پەیمانە ڕۆژی ١٨ی تشرینی دووەم ١٩١٨ پاش نیوەڕۆ گەیشتە سلێمانی.

## هاتنی مێجەر نوئێل

گەیشتە سلێمانی، لەسەر ڕاسپاردە و فەرمانی حاکمی عام، شێخ مەحموود، زۆر لە سەرۆك عەشایرەکانی بینی. بڕیاری خۆیان دا. ویستی کە هەموو زابت و سوپاییەکانی تورك کە لە سلێمانیدایە بیاننێرێت بۆ کەرکوك و تێکەڵ بە یەخسیرەکانیان بکات. شێخ مەحموود بە پێچەوانەی ئەو ویستە گەیاندنیە کۆیە هەولێر و لەوێوە بۆ مووسڵ. بەڵام پەراگەندەکانی لە سلێمانییەوە تا چەمچەماڵ و کەرکوك کە نزیکەی ۲۰۰ سوپاییەك دەبوون برانە کەرکوك.

کە مێجەر هاتە سلێمانی بارگەکەی تەنیا دەستێك - پێخەف بوو. ڕۆژی دوایی لەبەر دەرگای سەرای حکوومەتدا لە پێش چاوی چەند هەزاران دانیشتوانی شار و عەشایرەکانی - وەکو جاف، هەمەوەند، پشدەر، مەنگوڕ، ئاکۆ، بلباس، جەباری، زەنگنە، داودە، تاڵەبانی و عەشایرەکانی تری سلێمانی، چووە سەر کورسییەك، بە زمانی فارسی وتی:

بەناوی حکوومەتی بەریتانیا و حاکمی عامی عێراقەوە قسەتان لەگەڵ دەکەم.

ئەوا لە یەخسیری ڕزگاربوون. ئیتر سەربەست و ئازادن. شێخ مەحموود حوکمداری کوردستانە. لەسەر فەرمایشی حاکمی عام لە بەغداد ئەم مژدەیەتان دەدەمێ.

## مەلا محەمەدی دەنگ گەورە

ڕۆژە ڕەشەکانتان فەرامۆش نەکەن. کەستان نازانن باوك، برا، کوڕتان لە چە کوڵە شیو و بوودرێکدا کوژرا و بوون بە خۆراکی جانەوەر و کێوی. ئیمڕۆ پیرۆزیی ئازادیتان لێ دەکەم. ئەگەر ئەمانیش، ئینگلیزەکان، خراپ بوون، خۆتان دەزانن چییان لەگەڵ دەکەن.

## شێخ مەحموود

«برایینە لەو هەورازە کوورەی لە پێشمانەوە بوو، سەرکەوتین. لە ئێوە یەکیەتی و لە منیش گیان بەختکردن».

(داخەکەم لە فەرموودەکەی شێخ مەحموود لەمەندە زیاترمان بۆ پێك نەهات).

بەو مژدەیەی مێجەر نوئێل، کە بانگی ئازادی و حوکمداریی کوردستان بوو. بۆ هەڵکردنی ئاڵای کورد بڕیار درا، شاری سلێمانی بوو بە بەهەشت. خاوەن تەو(همت)مکان دلێرانە پاڵیان دا بە پاڵی هیوای کوردەوە. بە گیان، بە داراییان بۆ گەیشتن بە ئاوات و بوون بە پشتیوانی حوکمدارییان.

نامەی مەندووبی سامی- لە بەغداوە بۆ حوکمدار شێخ مەحموود - بە زمانی فارسی.

لە حکوومەتی خاوەن شکۆ (ساحب ئەلجەلالە)وە فەرمانم پێ درا پێتان بگەیێنم.

ئەم ڕۆژانەدا لێدوانی – سەربەستی – ئیستیقلال–ی کوردستان تەواو دەبێت. کورد سەربەخۆ تێوەش بە حوکمدار ناسراون».

**نوێنەرانی کورد بۆ پاریس**

لە پاش کۆبوونەوە و لێدوانێکی زۆر و بە پەسندیی مێجەر نوئێل بڕیار درا کە لە کوردستانەوە بۆ ئەوەی لە پاریس شەریف پاشا ببێت بە نوێنەر و نوێنەری کورد و لە کۆمەڵی ئاشتیدا داوای مافی کورد بکات، لە سلێمانییەوە لەگەڵ نامەی گشتیی مەزبەتە (مضبطة)دا سەید ئەحمەدی بەرزنجەیی و ڕەشید زەکی کابان نێرران.

شەریف پاشا ڕۆڵەیەکی سلێمانی و دانیشتووی پاریس بوو کە لەوەپێش سەدری ئەعزەم = سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

نێرراوەکان سەید ئەحمەد و ڕەشید زەکی بە پاساپۆرت و خواهشی پیاوە باوەڕ پێکراوەکانی بەریتانیا، گەیشتنە (حلب) لەوێ لە لایەن فرانسزەکانەوە مەزبەتەکانیان لێ سێنرا و پاشە و پاش گێڕرانەوە بۆ کوردستان.

ئەو دوو نوێنەر و ڕێبوارە، بە کاری گەلێك و بە پاساپۆرتی حکوومەتی بەریتانیای گەورە و بە ئاگاداریی مێجەر نوئێلی خۆیان و مەندوویی سامی نێررابوون. کەچی بەبێ ترس و وێڵی دەوڵەتی لە حەلەب بە فەرمانی ئەفسەر (ضابط)ێکی بچووکی فرانزی گێڕرانەوە و حکوومەتە مەزنەکەی بەریتانیای خۆمان کە باڵی بەسەر کوردا کێشابوو فرزەی لێوە نەهات، لەوەیش سەیرتر لە جیاتی مەزبەتە (مضبطە)کە بگاتە دەست شەریف پاشا یان کۆمەڵی ئاشتی، لای ئینگلیزەکانی خۆمان لە بەغداد سەری دەرهێنا و لە کۆمەڵی ئاشتیشدا ماوەی شەریف پاشایش نەدرا.

چاپکراوەکان: بەهیچ چەشنێك نە ڕۆژنامە و نە چاپکراوێك نەبوو و نەدەبینرا. بەڵام لەم دوا دواییدا کە پەنجە و فرۆفێڵی ئینگلیز لە عێراقدا نەما، ئەوەی نەك بە بینین بە بیستنیش نەبیسترابوو ئێستا دەبینرێت وەکو:

١–عندما عقد مؤتمر الصلح فی پاریس إجتمع رؤساء العشائر الكردية كافة وإنتخبوا الجنرال شريف پاشا – السليمانية – وكان مقيما فی پاريس ممثلا عاما يسعى لإنجاح القضية الكردية لدى دول الحلفاء فی مؤتمر الصلح. فقدم شريف پاشا مذكرة الى مجلس الحلفاء الأعلى فی ٢٢ مارت ١٩١٩. طالب فيها باستقلال كوردستان و بجعل الشعب الكردی أمة واحدة تحت لواء واحد.

٢– سيڤر و لوزان: عندما وضعت معاهدة سيڤر فی آب ١٩٢٠ جاء فی موادها (٦٢ و ٦٣ و

٦٤) بما يحقق مطالب الاكراد[1].

بەتەواوی داواکەی شەریف پاشا پێش دوو مانگ لە شۆڕشەکەی ١٩١٩دا بوو. بەڵام ئەم داوا و نووسراوە لە هەگبەی دیپلۆماسییەکانی ئینگلیزا ڕەنگە مابێتەوە. چونکە خۆی زۆر لەوەپێش بانگی ئیستقلالی کوردی دابوو.

هیوای کورد بۆ گەیشتن بە ئاوات تەنیا بەریتانیا بوو، کە ئاواتی هەزاران ساڵەیانە. بەڵام بەراستی پیاوی دانا و سیاسییان نەگەیاندە کوردستان و لەڕووی نەزانییانەوە، ئەو هیوا و ئاواتەی کورد لە ناو جانتای پیاوە سیاسییەکانی ئینگلیزا خنکاوە، هاواری کورد بە هیچ لایەکدا نەگەیشت.

**مێجەر گرینهاوس (مستشاری سیاسی: دانشمەندی سیاسی)**

یەکەمین سیاسی بوو کە یەکەم جار هاتە سلێمانی و زابتێك بوو کە لە گێژاوی جەنگ ڕزگاری بووبوو. وەکو لە هیچ ئاگادار نەبێت، بەناوی خۆیانەوە دەزگایەکی توند و تیژی دامەزراند. جا لە شاری سلێمانیدا دوو حکومەت لە کارا بوو. بەریتانیای گەورە و کوردستانی بێ نەخشە. ئینگلیزەکان وردە وردە کەوتنە بادانەوە و هێنانی بێگانە لە هەندەرانەوە وەکو: ئینگلیز، هیندی، ئەفغانی، عەرەب، ئێرانی، کوردی بێ نیشان و ناویش ناوی حکوومەتی کوردستان و گرینهاوسیش حاکمی سیاسی.

سەرەڕای ئەو ناهەمواریەیش دەستیان کرد بە چووغل (جاسوس) دروستکردن و دەستدرێژیی تەواو لە کاروباری وڵاتدا بۆ ئەوەی حوکمدار بچەسپێننە ناو چوارچێوەیەکی تەنگ و بێ دەرفەت.

شێخ مەحموود، زۆر چەکەرەی دەکرد بۆ ئەوەی جەنگێکی کتوپڕ ڕوو نەدات. چونکە تەمی جەنگ تازە لە کوردستاندا ڕەویبۆوە نەیدەویست بەرەبەرەکانییان بکات. بۆ هیوای گەورە چاوەڕێ بوو، لەبەر ئەوە زۆر بەساردی لەگەڵیان دەبزووتەوە.

**ئازووقە**

ئینگلیزەکان زانییان کە برسیەتی ئێجگار زۆر بڵاوبۆتەوە، گەنم، شەکر، چایەکی زۆریان هێنایە سلێمانی. بە پارە دەیانفرۆشت، بێ پارە هەر لە سەخڵەتیدا ما. ئەو ئازووقەیەیان کرد بە هۆیەکی باش بۆ ناسینی دانیشتووانی ناو شار، هەل و فەرێکی سیاسیی باشیان لەبرسی و هەژارەکان دەست کەوت.

---

١. خناجر وجبال. لاپەڕە – ٧٨ و ٧٩

گرینهاوس بە هەموو لایەکدا هەڵپەی دەکرد. خۆی لە کاربەدەستەکانی نەوتی عەبادان بوو. زمانی فارسیی زۆر باش دەزانی. بە پیاوە نالەبارەکانەوە زۆر تێکەڵیی پەیدا کرد و زۆر دەستدرێژیی دەکردە سەر کاروباری وڵات.

ئینگلیزەکانی سلێمانی بە ئارەزووی خۆیان کاریان هەڵدەسووڕاند و مەندوویی سامیش لە بەغداوە جار جارێك بانگی ئیستیقلالی بە گوێی کوردا دەدا.

ئێستا، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە گرینهاوس ڕاست بوو، بەبێ پەردە و فڕ و فێڵ هاتبووە دەست. ئەو لە تەڵەکە و فێڵی حکوومەتەکەی خۆی و کردەوەکانی (نوئێل) باش ئاگادار بوو و دەیویست یەکسەر باو باوی خۆیان، (ئینگلیز) بێت و بەس.

وە نەبێت شێخ مەحموودیش تێ نەگەیشتبێت کە کار خراپە و دەیشیزانی کە تەنها بە خۆی و کورد کاری کوردستان تەواو نابێت. جا لەبەر قوڵتی زۆری دوایی، ناچاری بێ دەنگی بوویوو.

بۆ ئەوەی بە تەواوی کار بکەنە سەر هیوای شێخ مەحموود و هەرەس بە هیوای کوردیش بێنن، یەکە یەکە پیاوە خاوەن دەسەڵات و داراییەکانیان تەفرە دەدا وە دەیانکێشایە لای خۆیان، لە شێخ مەحموودیان دوور دەخستەوە.

بە ناوی (معاونی حاکم سیاسی)یەوە زۆر ئینگلیزیان هێناوە هەموویان سوپایی و بە بەرگی سوپاییەوە بوون و بەستراو بە پرۆگرامی (گرینهاوس)ەوە دەهێنرانە سەر سەری کوردی پاشکەوتوو لە هەموو شتێك و پاشەرۆکی ئەو جەنگەی کە بە سەرکەوتنی بەریتانیا دوایی هاتبوو. لە جیاتی بەهرەبەخشی و دەستی یارمەتی، بۆ بڵاوکردنەوەی زانستی، پیشەسازی، کشتوکاڵ، بەزاڵییەتی ڕایان دەبوارد و وشەی سیاسەت خرایە شوێنی ئیستیقلالی کورد.

**میجر دانلیس (دانشمندی سوپایی: مستشاری عسکری)**

بە ناوی سەر لەشکر و دامەزرێنەری سوپای کوردستان و دانشمەندی سوپای حوکمدار، بۆ ئەم دوو فرمانە گرنگە نێررابوو و گەیشتە سلێمانی. لە فەرماندەی زابتە کوردەکانی لە تورکیاوە هاتبوونەوە، سوپایەکی گەورە و بەهێزی دروست کرد. ئەم سوپایەی ناو نرا (لیڤی) و فەرمانی مەشقیش بە ئینگلیزی.

وەکو وتمان لە هەندەران دەنگی دایەوە، کە ئینگلیز لە کوردستانی خواروو (جنوبی)دا حکوومەتێکی سەربەخۆی بۆ کوردەکان دامەزراندووە. دەهاتنەوە و دەخزانە ناو کۆڕەکەی دانلیس، بەڵام دەنێرران بۆ دیوانی حوکمدار بۆ سوێند خواردن بەرامبەر بە حوکمدار و حکوومەتی کورد – کوردستان –دڵپاك و گیان بەختکەر بن. بەڵام سوێندیان نەدەکەوت، چونکە نە حوکمدار و نە حکوومەت نەبوو.

### ماك برايد (یاریدەدەری دانلیس)

سارجن مێجەر ماك برايد ناوێكی ئینگلیزیش هێنرابووە سوپاكەی لیڤییەوە. بە چاك و خراپ فەرمانڕەوا بوو. هەمووو سوێندخۆرەكان خزمەت گوزارێكی بێ وێنەی ئەو بوون. لە خۆشەویستیدا ناویان نابوو (مام برايم)، هەموویان كۆیلەی بوون. هەرچیی بكردایە، بوتایە، بویستایە، ڕەوا بوو. لە پاش ماوەیەكی زۆر ئەم پیاوە خۆشەویستەیان نێررایەوە بۆ لەندەن. داخێكی زۆری بۆ زابتەكانی بەجێ هێشت. زۆر چاوەڕاوی خانەدانییان بۆ دەكرد گوایا لە خێزانێكی گەورە و ناسراوی لەندەنە. بەڵام پاش چەند مانگێك لە لەندەنەوە نامەیەكی نارد بۆ ڕەشید ئەفەندیی بەكر ئەفەندی كە لە لیڤیدا كەپتان بوو، لە نامەكەیدا ئەو خانەدانە دەفەرمووێت:

لە پاش گەیشتنەوەم بە لەندەن زۆر بێ ئیش مامەوە. بەڵام ئەمە سێ ڕۆژە لە جێگەیەكی گشتی، كاباریێەكدا بە قرناتەچی دامەزرام بە پێویستم زانی مژدەتان بدەمێ.

جا ئەمە یەكێكە لەو خانەدانانە كە گیان و دواڕۆژی كوردیان پێ سپێررا بوو.

تەنیا لە سوێند خۆرەكان ئەحمەد فەهمی كە مێجەر بوو تێ گەیشت كە كار بە پێچەوانەی ئاواتی حوكمدارە. وازی هێنا وتی من سوێندخۆرم.

### ئینگلیزەكان و شێخ مەحموود

دەستدرێژیی گرینهاوس و پێچ و پەنای دانلیس شێخ مەحموودی وەڕس كرد و دەسەڵاتیان لە دەس ساند. بەرامبەر بەو هەمووە ناڕەوایییەیان نەینەوێرا ڕەخنەیەك بگرێت نەوەك ئینگلیزەكان رەنجیدە ببن. وە نەیشیئەزانی ئینگلیز بڕیاری نەداوە كە هەرگیز كوردستان دروست بكات و بیكات بە خاوەن نەخشە لە ڕووی گێتیدا و ئەو بەشەی لە كوردستاندا دابوویان بە حوكمدار تەنیا ٣٠ پۆلیس بوو بە سەرۆكایەتیی تاهیر ئەفەندی حەمەد ئەفەندی و یاریدەدەر حاجی ئاغا و مستەفا ئەفەندی. حاجی ئاغا یەكسەر خۆی هاوێشتە ناو جۆشەكەی گرینهاوس و خۆی پێدا هەڵواسی.

### نووسین

ئینگلیزەكان خۆیان فارسیزان بوون. لە دائیرەكاندا نووسین بە فارسی بوو. تەنیا وەڵام لە حوكمدارەوە بۆ ئینگلیزەكان بە كوردی بوو. تا لە قەزا و ناحیەكانیشدا بە هۆی معاونەكانی سیاسییەوە بە فارسی دەنووسرا و لەسەر پرۆگرامی گرینهاوس دەبزووتنەوە و هەر یەكە لە لایەكەوە بەبێ پەردە بۆ ڕماندنی ئاواتی شێخ مەحموود باڵیان لێ هەڵمالّی و كنەیان لە هیوای كوردا دەكرد.

بۆ وێنە

زۆر سەیر بوو، شێخ سەعیدی باراوی ناوێك بەلای ئینگلیزەکانەوە بە جەریەزە دەزانرا و لێی دەترسان، کە گوایا زیانی بۆ گرینهاوس دەبێت. بەڕاستی شێخ سەعید پیاوێکی لەسەر خۆ و بەڕێز بوو، ئازا و چاوتێر، پارسەنگی دزێەتییان بەسەرا سەپاند و گرتیان. خرایە بەندیخانە، لە هەلێکدا ڕای کرد.

گرینهاوس ناردیە سەر شێخ مەحموود و داوای شێخ سەعیدی لێ دەکرد و بە خورتی دەیویست بۆی بنێرێتەوە. ئەم کارەی کرد بە بیانوو کە گوایا شێخ مەحموود یاریدەیان نادات. ئەم شتە پڕ و پووچانەیان دەکرد بە ڕاپۆرت و دەیاننارد بۆ بەغداد.

ئینگلیزەکان هەر یەکە بۆ خۆی لە بەسرە، عەبادان و بەغدادەوە پیاوی هەرزە و ناچیزەیان بە ناوی فەڕاشی، مەیتەری، چێشتکەری و شتی ترەوە دەهێنا و شاری سلێمانییان پڕ کرد لەم چەرداوەڕووانە. لە شار و بازاڕدا بەرەڵلا و بڵاو بوویوونەوە و بەناوی کار تەواوکردن لای حاکم، سەرانە و باجیان دەساند، بە هەڕەشەی خراپ و چووغلی و ڕێگری دریغیان نەدەکرد و کەسیش نەیدەوێرا بەرگرییان بکات.

ئەم پیاوانەیان بێجگە لە پارە، کەلوپەل بە خۆڕایی ساندن، خواردنیشیان بەبێ پارە بوو. ئەم ناسۆرە زۆر لە تەشەنەدا بوو. ڕۆژێك کازم ناوێکیان لەسەر پارەی کەباب زۆریان لێ دا کار گەیشتە لای حاکم گرینهاوس، لە تۆڵەی کازمدا لە ریزە دوکاندارەکان، لە ڕاست و چەپی کەبابخانەکە یەکی بە پێنج روپیە سزا دران و پارەکە بە کۆمەڵی درا بە کازم و ئیتر نەبینرایەوە.

بەدکاریی سیاسییەکانی ئینگلیز لە وزەی حوکمداردا نەما بینوۆشێت. یەکسەر نامەیەکی نارد بۆ حاکمی عامی عێراق وڵسن و داوای بەڵێنەکەی کرد، کە ئازادیی کوردە. هەروەها ئینگلیزەکانی تەنگاو کرد کە دەستگای سەربەخۆی کورد دامەزرێنن و کورد بە خاوەنی کوردستان و ئینگلیزەکان خۆیان بە یاریدەدەر بناسن.

وڵسن حاکمی عامی عێراق لە کانوونی یەکەم ١٩١٨دا هاتە سلێمانی لەگەڵ شێخ مەحموود یەکتریان بینی. دیسان بەڵێنی دا کە بە زوویەکی زوو کاری کورد بە باشی تەواو دەبێت.

کەچی، پاش وڵسن ئینگلیزەکانی سلێمانی توند و تیژتر بوون. بە تەواوی کاروبارییان گرتە ژێر دەست و زۆریان لە سەرۆك عەشایرەکان تەفرە دەدا بۆ پچڕاندنەوەیان لە حوکمدار. ڕوون بۆوە کە ئینگلیزەکان بە پیلان و هانی وڵسن دەبزوونەوە. چونکە وڵسن دەیزانی شێخ مەحموود لە داوای ماف و ئازادیی کورد سوورە و دەستبەردار نابێت کە بۆیانی دەست نەدەدا.

جا بۆ تەفرە و ساردکردنەوەی کورد و شێخ مەحموود، لەم کاتە ناسکەدا ئەم پەندانەی

خوارەوەیان بڵاو دەکردەوە. «حکوومەتی بەریتانیا پێی ناخۆش نییە کە بە ناوی حاکمێتیی عامی سلێمانییەوە ئەو کوردانەی، بێجگە لە قەزاکانی بادینان – موسڵ، بیانەوێت کۆمەکی بدەن و بەو مەرجەی شێخ مەحموودیش خۆی بە نوێنەرێکی ئینگلیز بزانێت و دەزگایەك دابمەزرێنێت و مێجەر نوئێلیش بە ناو کوردەکاندا بگەڕێت».

ولسن ئەم فەرمانەی دەرکرد. بەڵام گەڕانی نوئێل بۆ چییە؟ خۆیان دەیزانن. ئیتر بە تەواوی دەرکەوت کە ئینگلیز نایەوێت کورد ئازاد بێت و لەم کاتەیشدا کەوتنە تەقەڵای ئەوەی بۆ تێکدان و هەڵوەشاندنی ئەو بناغەیەی کە شێخ مەحموود دای مەزراندووە. هۆیەك و یان یەکێك بدۆزنەوە کە لە گرینهاوس زاڵتر و ملۆزمتر بێت، بینێرن. چونکە بە تایبەتی ولسن، بە پاچ و قوڵنگەوە کەوتبووە بنکەندی قەڵای هیوای کورد، جا بۆ ئەم ئامانجەی (مێجەر سۆن)ی دۆزییەوە.

**هاتنی مێجەر سۆن**

پیاوێکی سیاسی، زیرەك، لە فارسی و کوردی زمانزان و لە پێش جەنگی یەکەمدا بە ناوی (میرزا غولام حوسێن) لە هەڵەبجە و سلێمانیدا ماوەیەکی تەواو ژیاوە. لەگەڵ زۆر چینی پیاوانی کوردا ناسیاوی و دۆستایەتیی هەبووە و بە تایبەتی لەگەڵ شێخ مەحموود.

ولسن، مێجەر سۆنی فوو دا و بەبێ لێپرسینەوە ناردی بۆ سلێمانی و هەموو کارویاری دایە دەست.

جا لە پێش هاتنی سۆن و بە چەند ڕۆژێك و بۆ هاتنی ئەم حاکمە سیاسییە تازەیە و پێکهێنانی پێویستیی بە پیرەوە چوون، گرینهاوس شێخ مەحموودی حوکمداری ئاگادار کرد. بۆ پێشوازی چی پێویست بوو کرا. پتر لە ٥٠٠ سوار و ١٠٠٠ پیادە، ریز بەستەی بەخۆش هاتن بوون و چادری زۆریش لە دەشتی موشیرئاوا هەڵدرا. چاوەڕێی حاکمی تازە و بەختیاری بوون.

حاکم گەیشت، لە فرۆکە دابەزی، ڕووی کردە چادرەکان لەگەڵ هەموو یەکە یەکە دەست گوشینی تەواو کرد. بە هیچ جۆرێك ڕووی نەکردە حوکمدار. بەڵام حوکمدار شێخ مەحموودیش دەستبەجێ ئەوی ناسییەوە. ئیتر حوکمدار چادر و میوانی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ سلێمانی. بێجگە لە ئینگلیزەکان کەس نەما.

لە کردەوەی سۆن، شێخ مەحموود زۆر دڵتەنگ و ئازوردە بوو. هەر بۆ ڕۆژی دوایی مێجەر سۆن کەوتە کار هەڵسووڕاندن، وردە وردە هەموو بیر و کردەوەی خۆی بەست بە پێچەوانەی کار و ویستی حوکمدارەوە. ڕۆژ بەڕۆژ ناکۆکی لە پتربووندا بوو. تا هێمنی و ساردیی لە حوکمدارا دەبینی، سۆن توند و تیژتر دەبوو و هەرگیز دیدەنیی حوکمداری نەکرد، جا ئەمجارە،

له سلێمانیدا هێز كەوتە كار

١- مێجەر سۆن، بۆ شڵەقاندنی كار و شكاندنی شێخ مەحموود.

٢- گرینهاوس، لەسەر خووەكەی خۆی بە فرۆفێڵ بۆ ئاگر خۆشكردنی ئاكۆكی.

٣- شێخ مەحموود، بە ناوی حوكمداری كوردستانەوە بە هیوای ئازادی ئەم سێ هێزە وەكو برووسكە لە یەكتریان دەدا.

شێخ مەحموود تێ ئەدەگەیشت، بۆچی سۆن بە پێچەوانەی پرۆگرامی حكوومەتەكەی كە ئازادیی كوردە دەبزوێتەوە.

سۆن و گرینهاوس بەدكاری و ناپەسەندییان گەیاندە ئەو پەڕی ناشایستەیی.

ئەمجارەیش شێخ مەحموود دای چڵەكاندن. بۆ وڵسن و سۆنی نووسی:

«كورد داوای ئازادی دەكات. ئەگەر بە زوویەكی زوو ئەو مافە حەقەیان نەدرێتێ من ناتوانم بەڵێنی بەریەستنیان بدەم، جا بە ناوی خۆم و هەموو كوردەوە تكا دەكەم، كە ڕەوشتی سیاسەتە ناڕەواكەتان و ئەم پیاوە سیاسییانەی ئێستەتان بە پیاوی ژیر و تێگەیشتوو بگۆڕن».

شوبات- ١٩١٩

بەم نووسینە شێخ مەحموود، مێجەر سۆنی تێ گەیاند ئەگەر ڕەوشت و خووی بە باشی نەگۆڕێت، دەردەكرێت. بەڵام سۆن بە تەنیا ئەمە پرۆگرامی خۆی نەبوو، بە ئامۆژگاریی وڵسن بوو.

جا بۆ ئەوەی بیری ڕەخنەگرەكان بۆ ڕێگەی ڕاست بگۆڕین و بە تەواوی تێ بگەن كە ئینگلیز بە بیریا نەهاتووە ئیستیقلال بدات بەكورد، تەنیا بۆ كارسازیی خۆیان بوو كوردیان تەفرە دا و شێخ مەحموودیان پێ خەڵەتاند، كە دەرگای كوردستانیان بۆ بكاتەوە. لەم كارەساتە دەدوێین.

بەبێ گۆڕین و دەستكاری:

كتاب السير أ. ت. ولسن: العراق بين ١٩١٧ - ١٩٢٠، الجزء الثاني، «بحكم الاحتلال والادارة الملكية البريطانية»[١].

لم يكن من السهل الحكم الى أي مدى كانت الحركة الوطنية بطلب الاستقلال قد وصلت او اذا

---

١. القضية الكردية، وخناجر و جبال و ڕۆژنامەكانی (الجهاد) و (نداء الشعب) ساڵی ١٩٣٠ (رقم ٥٠).

كانت ليست سوى نتيجة طموح شخص من زعماء العشائر. ولكن الذى نعرف ان الحركة في السليمانية نفسها كانت بلا شك قوية. واجبرنا على كبح جماحها بتذكير أهالى السليمانية ان حكومة صاحب الجلالة لم تقبل المسؤولية عن كوردستان الا بشرط ان يكون سلوك الأهالي والزعماء حسنا وان يقبلوا نصائحنا وإرشاداتنا في المسائل المهمة.

وأفهمنا الشعب بان موظفى الادارة سيكونون من الكرد بقدر الاستطاعة و كان بقصدنا تشكيل جيش وطني ظباطه من الكرد. وان تكون اللغة الكردية لغة الحكومة الرسمية، وتعدل القوانين والشرائع بحيث توافق العوائد والطبائع الأهلية ويعزز قانون عوائد العشائر ويتاح للزعماء البارزين ان يستعملوا سلطتهم ضمن حدود معقولة لحكم عشائرهم. و كان الشيخ محمود اكبر معضلة لنا فقد كان طفلاً بجهله ولكن ليس بسذاجته و كان له امال عظيمة و مصالح كبيرة و كان على جانب عظيم من الحيلة. و كان معرضاً الى نوبات فورية من الحمق والقساوة. الأمر الذى جعل رجل مثل الميجر سون الذى كان يراقبه ان يعتقد بأنه ليس مسئولا من كل أعماله. ولكن رغم كل عيوبه لا ننكر بانه كان له أتباع كثيرون، ففي كوردستان الجنوبية كانت نسبة أتباعه نحو (٨٠ فى المائة) من السكان. فإتضح حالا إن هذه السلطة او السيطرة التى لا يمكن الإستفادة منها فى منطقة السليمانية ومع ذلك ففي هذه المنطقة نفسها كانت قوة لا يستهان بها مؤلفة من أصحاب الأملاك والتجار تفضل إعطاء الحكم والادارة رأسا بيد موظفين بريطانيين كما كانت الحالة فى زمن الترك عن الرجوع الى حكم العشائر شبه الوحشية.

تعيين الميجر سون للسليمانية

والآن ظهر بوضوح اننا لايمكننا إسناد الشيخ محمود ومعاضدته له رياسة عدد كبير من العشائر ولما كان هذا هو الواقع، القضاء عموما على تعديل خطتنا في كردستان الجنوبية بانشائنا شكلا من الادارة على الأصول المتبعة في باقي أنحاء العراق.

وهكذا تداولنا فى القضية وإشترك – نوئل وليچمن و سون و نموردن و وكر وغيرهم من لهم علاقة بالكرد. و كانوا مطلعين على الأحوال شخصيا. فتقرر بموافقة الميجر نوئل تعيين الميجر سون بمحله في السليمانية. ولم يكن بعد للميجر سون أى علاقة شخصية بالشيخ محمود ولكن كان عنده من المزايا الخارقة ومن معرفة البلاد ما يؤهله للمنصب. أما الميجر نوئل فبايعاز من حكومة صاحب الجلالة أخذ يجول فى كوردستان جولة واسعة ليتحقق الى أى حد يمكن تطبيق بدعة الإستقلال الجديدة على الأهالى.

أفول نجم الشيخ محمود

بتعيين الميجر سون الى السليمانية أخذت الأحوال تعود الى مجراها القديم. فأعاد الامن الى

البلاد وعادت التجارة الى ما كانت عليه سابقاً وظهر بين الاهالي بعض الاشمئزاز من الشيخ محمود فظهر كثيرون من الذين قبلوا الشيخ محمود في أول الأمر لم يفعلوا ذلك مدفوعين بدافع المحبة له، بل خوفا من بطشته ولأن جعلهم ليفهمون ان الحكومة البريطانية كانت على استعداد لتأييد حكمه بالقوة إذا إقتضى الأمر. والآن طلبت عشيرة الجاف الخروج من تحت سيطرته لتكون علاقتها معنا رأسا وتبعها غيرها من العشائر. فأرسلنا ضابط بريطاني الى حلبجة لتلبية طلبهم. ولما رأى الاهالي أننا لا ننوي إرغامهم على الخضوع للشيخ محمود والرضوخ لحكمه بدأ نجمه بالافول رويدا رويدا. ولما ينتهي شهر نيسان الا و كان عدد كبير من العشائر المهمة قد إنفصلت عنه ورمت نيره على ظهرها، و كان أهم اتباعه اعضاء عائلة من شيوخ برزنجة في سروچك و كريشنة و عشيرة الهموند والميخائلي من الجاف. أما الشرطة وقوات الليفي فتحولت الى تحت إدارتنا رأسا ولكن بعض الضباط كانوا قد حلفوا سابقا بالولاء له مقابل إعانات مالية».

خوێندەواری خۆشەویست:

فەرموودەکانی (أ. ت. السیر ولسن) حاکمی عامی عێراق، گیان بەدەستی کورد و عەرەب، بە عەرەبی نووسراوەکەی پێشکەش کرا.

لە وردکردنەوەدا، دیاری دا کە فەرموودەکانی لەسەر نووسینی پیاوە سیاسییەکانیان بووە کە لە سلێمانییەوە بۆی نێرراوە و ڕاست نییە.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا بینرا هەموو (موظف)ەکانیان بێگانە بوون (ضابط) و سەربازی کورد بوون، بەڵام لە پای سوودی بەریتانیادا بەخێو دەکران، بە ناوی لیڤییەوە لەجیاتی سوپای کوردستان.

شێخ مەحموود بۆی دەست نەدەدان، چونکە داوای بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەی لێ دەکردن کە ئازادیی کوردە و بەو مەرجە ڕێگای دابوون بێنە کوردستانەوە.

وڵسن خۆی دەڵێت: لە (سەد ٨٠)ی کوردەکان لایەنگیری شێخ مەحموودن. بێگومان (٢٠)ەکەی تریشی خاوەن دووکان، بازرگان، تووتن کڕ و فرۆش و پەیوەستیان بە بەغداوە بوو.

ئەگەر ئەم بەشەیش، بێجگە لە داوای ئازادی هەرچی داوایەکیان کردبێت بێ نرخە. چونکە مێجەر سۆن خۆی ولاتی سلێمانیی شڵەقاند و (لام باشە)ی بینی کە لە دوو کەس زیاتر نەبوو و ئەو شێرەی وڵسن لە ولاتی سلێمانیدا بە ناوی (غلام حسین)، یان نۆکەری تاهر بەگ و لە هەڵەبجەدا ناسرابوو و یان بە دەروێشی دەسووڕایەوە بە کارێکی تایبەتی خۆی.

کوژاندنەوەی ئەستێرەی شێخ مەحموود مەگەر مردن بێت بە جیابوونەوەی بەشێکی بچووکی

عەشائیرێك نوشستی نەدەهێنا، ئەو جافانەی دەفەرمووێت، ئەوانە بوون کە عەودالّی قایمقامی و رووپە بوون. چونکە جافەکان مەکایتان دەدا، پارمەتییان دەدا، چەکدار بوون بۆ شۆڕش و خۆ بەکوشتدان لە پێناوی شێخ مەحمووددا کە ئازادیی کوردە. بە دوای مانگی نیساندا لە مایس و حوزەیراندا لە تاسڵووجە، دەربەند، قەرەهەنجیر، چەمچەماڵ، لە فەرمانەدی شێخ مەحمووددا ئەوانەی سوپاکانی ئینگلیزیان ناپووت کرد. ئایا عەشایری کورد نەبوون بەرامبەر بە ٣٠ – ٤٠ هەزار سوپای ئینگلیز لە (دەربەندی بازیان)دا دەستەویەخە دەجەنگان؟

بە تایبەتی بۆ وەرزکردنی شێخ مەحموود دەگەڕان بۆ دۆزینەوە و ناردنی پیاوی چەتوون بۆ سلێمانی، ولّسن خۆی ئاشکرای کرد کە دەیانویست شۆڕشێك بەرپا بکەن و مافی کورد بەنێژراوی لە خاکدا بهێڵنەوە. خۆ زۆر باش دەیانتوانی مافی کورد بدەن و شێخ مەحموودیش بە خۆشی دوور بخەنەوە، ئەگەر بەلایانەوە خۆشەویست نەبوو.

ئینگلیزەکان دەیانویست شێخ مەحموود هەڵفریوێنن و بیکەن بەگژ تورکدا و بە هۆی شۆڕشی کوردەوە ولاتی مووسڵ ساخ بکەنەوە و هیوای تورکی لێ ببڕن. بەلام شێخ مەحموود لە پێش بانگی ئازادیی کورددا هیچ پرۆگرام و ئاواتێکیانی بەدی نەهێنا. بەبێ وچان داوای بەڵێنەکەی لێ دەکردن کە ئازادیی کورد بوو.

نامەکەی شێخ مەحموود بۆ ولّسن:

(هیوامان زۆر بەهێزە کە بەندی پەیمانەکەتان بهێننە جێ، بەلام ئێستا کردەوەی پیاوە سیاسییەکانتان لەوە ناچێت کە بەرامبەر بە قەومێکی ئازادیخوا دەبێت بکرێت. من وای بە باش دەبینم زوو حەقی کورد بدەن، با کورد خۆی نەیسێنێت).

نیتر- بە هاتنی مێجەر سۆن هیوا و خاپاندن نەما. پەردە درا. کار و گوزەران تاڵ بوو. بە ئارەزووی خۆی فەرمانی دەدا وەکو بە نووکی ڕم یان بە جەنگ ولاتی گرتبێت و یان داوا و تۆڵەیەکی بەسەر شێخ مەحموود یان ئەم گەلە هەژارەوە بێت، زاڵییەتیی دەنواند.

ئەنجامی توند و تیژیی مێجەر سۆن، فڕوفێڵ و ئالەباریی گرینهاوس، جوست و جۆی پیاوە ئینگلیزە بەدنیهادەکانیان، نەك شێخ مەحموود، هەموو کوردی وەرز کرد و بەو نیازەی دەتوانن کوردەکان لە شێخ مەحموود هەڵبگێڕنەوە، سڵیان لە خراپە نەدەکرد.

## شێخ مەحموود و مەحموود خانی دزلی

بۆ ئەوەی بەرامبەر بە کردەوە ناشرین و توند و تیژییەکەی مێجەر سۆن ئەویش نومایشێك بکات، بە مەحموود خانی دزلیی گەیاند کە بێت بۆ سلێمانی. لەسەر ئەو فەرمانە بە لەشکرێکی

زۆری هەورامییەوە گەیشتە شارباژێڕ، مێجەر سۆن ئاگادار کرا.

نامەکەی سۆن بۆ حوکمدار:

(وەکو بیستوومانە مەحموود خانی دزڵی بە لەشکرێکی زۆری چەکداری هەورامییەوە گەیشتۆتە شارباژێڕ، دێت بۆ دیدەنیتان. تکایە تێی بگەیەنن، پێویستە تەنیا خۆی و دە کەس زیاتر نابێت بێتە ناو شار و بە بێ چەك و ئەگەر چەکیان پێ بێت، دەبێت هەر لە ڕێوە چەکەکانیان بدەنە پۆلیسخانە و خۆیان بێ چەك بکەن).

حاکمی سیاسیی سلێمانی

مێجەر سۆن

١٨ مایس ١٩١٩

شێخ مەحموود، ئەم نامە و فەرمانەی مێجەر سۆنی زۆر بە لاوە سەخت و گران بوو، چەند هەوڵی دا بۆ خاوکردنەوە و لەو بیرە گێڕانەوە بێ سوود بوو و هیچ چارەیەکیش نەبوو کە بتوانێت پەشیمان ببێتەوە و خانی دزڵی بگێڕێتەوە یان نەیەتە ناو سلێمانی.

ڕۆژی ٢٠ی مایس مەحموود خان بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە سەر کەلی گۆیژە و چاوەڕێی فەرمانی حوکمدار بوو.

مێجەر سۆن بەبێ لێکدانەوە بە پەلە فەرمانی جەنگی و بەربەستی دا بە مێجەر دانلیس. لەو کاتەدا پیادەی لیڤی لە فەرمانەدەی ڕەزا بەگ و سوارەی لیڤی لە فەرماندەی جەمال عیرفاندا، لە بناری گۆیژە و سەر کارێزی حوسێنە جۆلا لە چادرا بوون. بەڵام مێجەر سۆن، شێرەکەی وڵسن شەوی ٢٠ - ٢١ مایس ١٩١٩ سەری خۆی دەرکرد و چوو بۆ کەرکوك و دانلیس و هێزەکەی کرد بە تەڵەی مەرگەوە.

لەگەڵ سپێدەی ڕۆژی ٢١دا سوپای ئینگلیز، لیڤی ڕوو بە چیای گۆیژە و بەرامبەر بە خانی دزڵی کەوتنە جەنگەوە.

شێخ مەحموود لە ڕۆژی ٢١ی مایس ١٩١٩دا بەرامبەر بە بەریتانیای گەورە شۆڕشی کوردی دەست پێ کرد. هەموو گەلە ژێردەست و بەخسیرەکانی ئینگلیزی تێ گەیاند، کە ئادەمیزاد نابێت یەخسیر بێت. بانگی ئازادیی تەنیا نەك بۆ کورد، بۆ گەلانی ڕووی زەمین بڵاوکردەوە.

رۆژی ۲۱ی مایس (جەنگی کورد و ئینگلیز) یان (بانگی ئازادی)

لە بناری گۆیژە سوارە و پیادەی لیڤیی ئینگلیز بەرامبەر بە مەحموود خانی دزڵی و لەشکری هەورامی ویستا، تا نزیکەی ئێوارە جەنگ درێژەی بەست. سوپای لیڤی لەوە زیاتر خۆگیریی پێ نەکرا، گەڕانەوە و خۆیان گەیاندە بەر دیوانی حوکمدار. سوارە و پیادە چەکیان دانا و وتیان: (کورد، کورد، ناکوژێت)، هاواریان دەکرد.

جەمال عیرفان لەگەڵ سوارەکە گەڕایەوە. بەڵام ڕەزا بەگ بە نزیکەی سەد چەکدارێکی پیادەوە مایەوە. تا نیوەشەو دەجەنگا. گیرا و هێنرایەوە.

هەر لەگەڵ دامەزراندنی جەنگ هەموو ئینگلیزەکان زۆر بە ڕێزەوە کۆ کرانەوە و لە کۆشکی حکومداریدا دانران و مەئموور و پیاوە بێگانەکانیشیان لە دەبۆکەدا دانران.

حکومدار ئەم تەلگرافەیشی بۆ وڵسن نووسی:

«کورد لە وزەیدا نەما ئیتر بە قسەی ئێوە تەفرە بخوات، بۆ ئازادی دەست درایە چەك. گیانی هەموو پیاوەکانتان لە داڵەی خۆمدایە. بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێت حەقی خۆمان بدەنێ کە ئازادیی کوردە، وەعدتان بەجێ بێنن».

هەروەها بۆ هەموو سەرۆك عەشایرەکانی سۆران و بادینان نامە و فەرمان نووسرا و نێررا. پوختەی نووسراوەکە:

«ئینگلیزەکان ناچاریان کردین دەست بدەینە چەك و خۆمان لە ژەنگ و ئازاوەی ئینگلیز ڕزگار بکەین، پشت بە خوا سەرکەوتن بەشی کوردە. ئینگلیز نایەوێت کورد بە سەربەستی بژیەت و بە ئادەمیزادمان بزانێت».

مەحموود

حوکمداری کوردستان

نامەکە زۆر دوور و درێژ لە زاڵیبەتی و بەدکاریی پیاوەکانی ئینگلیز نووسرابوو. ئەوە پوختەکەی بوو.

کاتێك ئینگلیزەکان، هێنران بۆ کۆشك، شێخ مەحموود خۆی چوو بە پیریانەوە. یەکە یەکە دەستی گوشین. پێی وتن، ئێوە میوانێکی خۆشەویست و بەڕێزی خۆمن. دڵتان هیچ نەکات، بە سەربەستی دەژین.

ڕووی کردە گرینهاوس. وتی: کوا سۆن؟ تۆ بوویت بە هەوێنی ئەم شۆڕشە. ئێمە دەزانین چیمان لە ئێوە دەوێت. بەڵام نازانین ئێوە چیتان لە ئێمە دەوێت؟ پاش دانیشتن و دڵنەواییێکی زۆر.

فیصلن بەرامبەر بە گرینهاوس

من لە ڕێگەی ئازادیی گەلەکەمدا زۆر بە پاکی و ڕاستی هاتم بە پیر ئێوەوە بە هیوایەکی زۆر گەورەوە چاوەڕێی بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەتانم دەکرد کە بە شەرەفی بەریتانیا دڵنیا کرابووین. کەچی تۆ و سۆن، ئاگرتان بەردایە سەر هیوای کورد و بەڵێنەکەتان لە بیر چووەوە. داخەکەم حیولیە لە ڕۆژی خۆیدا ڕێگام نەدانایە. چونکە لەمە زیاترتان پێ نەدەکردین.

١ - جەنگی تاسڵووجە:

هەموو دانا و دەم ڕاس و ناسراوەکانی شار و سەرۆك عەشیرەتەکان کۆ بوونەوە. بڕیاریان دا بە پاکەماڵکردنی سوپاکەی تاسڵووجە و بەبێ وێستان بۆ کەرکوك چوون.

لە فەرماندەی سوپا سالار شێخ قادردا نزیکەی ٣٠٠ سوار لە عەشایر و بەشێك لە عەسکەرە لیڤییەکە ڕوو بە تاسڵووجە نێرران. خۆم لەگەڵ شێخ قادر لەم جەنگەدا بووم. گەیشتینە دێی کانی پان، شەو داهات، سوارە بوو بە دوو بەش.

١- لە فەرماندەی خۆی: شێخ قادردا بۆ داود بلاغ. ٢ – لە فەرماندەی سەرۆکەکانیاندا، بۆ کەندە کەوە.

١- لە داود بلاغەوە گەیشتنە پشتی تەپە شوانکارە و سەری تاسڵووجە. لەگەڵ سپێدەی ئاسماندا یەك تەقە کرا و تووەس ئەمە نیشانی بەینیان بوو. لە هەموو لایەکەوە بوو بە تەقە و جەنگ دامەزرا. لەناو دۆڵی تاسڵووجەدا لەبەر چادری سپی و ڕیزی ئۆتۆمبێل و ئێستر و ئەسپ، زەوی نەدەبینرا.

بەڕاستی جەنگ و هەڵمەت پیشەی کوردە. سوارەی کورد بەبێ ترس و وێستان دەگەیشتە ئەو جێگایە و سپێرە کە سۆجری بە مترالیۆزەوە تێدایە و بەبێ گەڕانەوە، دەیانگرت. تا پاش نیوەڕۆ تاسڵووجە بوو بە گۆڕستانی ئەو سوپایە و گیاندار لە دوژمن بڕا. وا دەزانم زابتێك لەگەڵ موشیری حەمەی مام سلێمانی هەمەوەندا ڕزگاری بوو.

بۆ ئەوەی زۆر بەڕێز نگاهدارییی ئینگلیزە یەخسیرەکان بکرێت، لەسەر فەرمانی حوکمدار لە هەموو پێویستێکیان وەکو خواردن، پێخەف، خاوێنی و سەربەستییان بۆ پێك هێنرا.

ناوی ئینگلیزەکانی سلێمانی کە گیرابوون:

١–مێجەر گرینهاوس: حاکمی سیاسی

٢– کەپتان دگلاس: موعاون سیاسی

٣– کەپتان هۆلت: موعاون سیاسی

٤- کەپتان رایت: موعاون سیاسی

٥- مێجەر دانلیس: فەرماندەی لیڤی و دانشمەندی سوپای حوکمدار

٦- شکۆفیل: سارجن مێجەر

٧- کەپتان بوند: حاکمی چەمچەماڵ و چەند زابتێکی تر.

مەئموورە هیندی و عەرەب و ئەفغانی و ئێرانییەکان لەگەڵ هەموو خزمەتکارەکانیان نزیکەی (٢٠٠) کەس بەرەڵا و سەربەست کران. تەنیا ١٥ مەئموری هیندیی گەورەیان لەگەڵ چەند ئینگلیزێك نێررانە دەبۆکە.

دەرکەوت، کە ماوەیەك لە پێش ڕوودانی شۆڕشەکەدا لە لایەن حاکمی عامی عێراق وڵسن و (مێجەر سۆن) کرابوو بە (یاریدەدەری فەرماندەی گشتیی هێزی چەکداری بەریتانیا لە کەرکوك) و کەوا بوو خۆیان بڕیاری هەڵگیرساندن و کوژاندنەوەی شۆڕشیان دابوو بۆ پایەماڵکردنی هیوای کورد. وڵسن لە نووسراوەکەیدا وتوویەتی کە مێجەر سۆن نێررا بۆ کوژانەوەی ئەستێرەی شێخ مەحموود.

بسم الله الرحمن الرحيم

فەرمانی حوکمدار

ژمارە ١

٢٢ مایس ١٩١٩

لە ژێر فەرمان و فەرماندەی گشتیی حوکمداری کوردستان مەحموود کوڕی سەعیددا، سوپای کورد بەرامبەر بە ناڕەوایی و بەدبەختیی ئینگلیزەکان و تەفرەدانی گەلی کورد و پەیمانشکێنییان، بە نەدان (عدم إعتراف)ی حەق، کورد پەلاماری چەکی دا. ڕۆژی ٢١ مایس ١٩١٩ ڕۆژی یەکەمینی شۆڕشی کوردە بەرامبەر بە بەریتانیای گەورە. ڕۆژی ٢٢ مایس لە سلێمانی ئەم فەرمانە دەرچوو.

مەحموود

حوکمدار و فەرماندەی گشتی

ڕۆژی ٢٢/٢٣ سوپای کورد ڕوو بە کەرکوك بزووت. لە دەربەندی بازیان بارەگا دامەزرا.

بسم الله الرحمن الرحيم

فەرمانی حوکمداری

ژمارە ٢

٢٢مایس ١٩١٩

بۆ بەڕێوەبردن و کاروباری خواردەمەنی و ئازووقەی سوپای کوردستان، ئەم لیژنەیەی ناویان لە ژێرەوە نووسراوە دانرا و پەسندکران.

مەحموود

حوکمدار

١- حاجی سەید عومەر: سەرۆك

٢- سەید کەریم سەید ئەحمەد: ئەندام

٣- شێخ عەلی سەرکار: ئەندام

٤- ئەحمەد سەبری خواجە ئەفندی: ئەندام و نووسەر*

ئەم لیژنەیە لە ڕۆژی ٢٢وەوە دەست بە ئیش دەکات.

بسم الله الرحمن الرحيم

فەرمانی حوکمداری

ژمارە ٣

٢٢مایس ١٩١٩

بە پێی ئەو باوەڕەی کە بەم پیاوانەمان هەیە و لە پێناوی گەلەکەیاندا لە کردەوەی پەسندا دوا نەکەوتوون لە ماوەی دوور کەوتنەوەی حکومداری کوردستان لە شاری سلێمانی (پایتەخت) ئەم ناوانەی خوارەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەتی کوردستان و گەلەکەیان هەڵبژێرران.

مەحموود

حوکمدار

١- سەید عومەر: سەرۆك

٢- ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ: ئەندام

٣- سەید کەریم سەید ئەحمەد: ئەندام

---

* نووسەری چیم دی.

٤- شێخ عەلی سەرکار: ئەندام

٥- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا: ئەندام

٦- ساڵح پاشا: ئەندام

٧- حەمەد بەگی قادر پاشا: ئەندام

٨- ئەحمەد سەبری خواجە ئەفەندی: نووسەر

داخەکەم بۆ لێژنەی ئازووقە بە هۆی سستیی سەید کەریم، کار بەجێهێنان ستەم بوو. بەپێی پێویست نەدەچوو بەڕێوە. بە سەید عومەر گەیێنرا. لە منی پرسی، وتم خراپە.

هەرچەند حاجی سەید عومەر گرتبیە ئەستۆی خۆی بەڵام کار لەکار ترازابوو. لە دەربەند سەختەتیی نان هەبوو. دوو نانەواخانەکەی دەربەند بەس نەبوو بۆ ئۆردووەکە.

چووخلەکانی ناوخۆ (جاسوس) ڕانەدەوێستان، لە کارا بوون. لەو کاتەدا کە لە لای حاجی سەید عومەر بووم، پیاوێکی شاڵی سەوز بەسەریان هێنا. لە ناو پێڵاوەکانیا نامەیەك دۆزرابۆوە دایە دەستم فەرمووی چی نووسراوە.

ئەمە بوو: (لە: ع. بۆ: م. دەکەون. خ. ناچێت) پێی وت: نێرەمراوی لە وشکی مەلە دەکەیت، ئەمە چییە؟

وتی ۳ زابت دایانمێ. کە بیبەم بۆ موشیر ئاغا. وتیان بڵێ خواردن ناچێت. من بەجێم هێشتن.

تەلەفۆنی دەربەند

لە دەربەندەوە بۆ سلێمانی هێڵێکی تەلەفۆنی هەبوو نەدیم ئەفەندی بەڕێوەبەر بوو. هەرچەند داوای نان دەکرا سەید کەریم دەیوت نێرراوە. بە هۆی ئەو هێڵەوە هەواڵی جەنگیش پەی دەرپەی دەدرا بە سلێمانی. بێجگە لە گەنم و جۆ و نانەواخانە، لە دێهاتەکانی حوکمدارەوە لە بازیان برنج، ڕۆن، گۆشت بۆ دەربەند دەنێررا و ڕاپۆرە جەنگییەکانمان وەردەگرت و ڕۆژ بەڕۆژ دەنووسرایەوە.

سەرچاوەی: حکومدار:

لە دەربەندەوە

ژمارە ١

٢٥ مایس ١٩١٩

ئیمشەو هێزێکی ٥٠ کەسیمان وورووژمی بردە سەر قەڵای چەمچەماڵ، یوزباشی ڕەشید ئەفەندی عاسیە خان و کەریم حەیدەر کوژران و دوو برینداریش هەیە.

ژمارە ٢

٢٨ مایس

دوژمن هێزێکی زۆری گەیاندە چەمچەماڵ. لە مووسڵیشەوە هێزێك گەیشتە کەرکوك، پیادە و سوارە هەمووی بنێرن بۆ دەربەند.

ژمارە ٣

هێزی پیادەی هەورامی بە فەرماندەی عەبدوڵڵا بەگی دزڵی لە بانی مەقان بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون، پەرێشان کران، ئێمەش یەکێکمان بریندارە.

ژمارە ٤

دووەمین شەوە هەورامیی دزڵی و دوژمن لە قەرە هەنجیر لە جەنگدان. ئیمڕۆ سوارەی مەندومی و هەمەوەندیش ئاوێتەیان بوون، لە دوژمن کوشتار زۆرە. تاڵان زۆر گیراوە. پێنج لە هەورامی ٢ لە مەندومی کوژراوە و ٢٢ بریندار هاتۆتەوە.

ژمارە ٢٢

مایس

دوژمن هێزێکی زۆری ئینگلیز و هیندیی بە تۆپ و چەکی زۆرەوە لە مووسڵەوە گەیاندە کەرکوك زرهلییان زۆرە.

ژمارە ٣٨

٣ حوزەیران

لە چیمەن تاڵانێکی زۆر لە دوژمن گیرا و یەك مەترالیۆز. حەمە ئەمین کۆزە

سەرچاوەی: حکومدار:

لە دەربەندەوە

ژمارە ١

٢٥ مایس ١٩١٩

ئیمشەو هێزێکی ٥٠ کەسیمان ورووژمی بردە سەر قەڵای چەمچەماڵ، یوزباشی ڕەشید ئەفەندی عاسیە خان و کەریم حەیدەر کوژران و دوو برینداریش هەیە.

ژمارە ٢

٢٨ مایس

دوژمن هێزێکی زۆری گەیاندە چەمچەماڵ. لە مووسڵیشەوە هێزێک گەیشتە کەرکوک، پیادە و سوارە هەمووی بنێرن بۆ دەربەند.

ژمارە ٣

هێزی پیادەی هەورامی بە فەرمانەدەی عەبدوڵڵا بەگی دزڵی لە بانی مەقان بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون، پەرێشان کران، ئێمەش یەکێکمان بریندارە.

ژمارە ٤

دووەمین شەوە هەورامیی دزڵی و دوژمن لە قەرە هەنجیر لە جەنگدان. ئیمڕۆ سوارەی مەندومی و هەمەوەندیش تاوێتەیان بوون، لە دوژمن کوشتار زۆرە. تاڵان زۆر گیراوە. پێنج لە هەورامی ٢ لە مەندومی کوژراوە و ٢٢ بریندار هاتۆتەوە.

ژمارە ٢٢

مایس

دوژمن هێزێکی زۆری ئینگلیز و هیندیی بە تۆپ و چەکی زۆرەوە لە مووسڵەوە گەیاندە کەرکوک زرهلیبان زۆرە.

ژمارە ٣٨

٣ حوزەیران

لە چیمەن تاڵانێکی زۆر لە دوژمن گیرا و یەک مەترالیۆز. حەمە ئەمین کۆزە

ڕەقەیی و ٢ جەباری و یەك هەمەوەند کوژرا و ٢ بریندارمان هەیە لاشەی یەك زابتی ئینگلیزی و ١٥ سۆجەر بەجێ ماوە. بریندارییان بردووە.

ژمارە ٤٢

١٠ حوزەیران

دوژمن دێت بۆ چەمچەماڵ. هێزی سوارەی ئێمە بلاوە لە کفری تا ئاڵتوون کوپری، کار بەباش نابینرێت، تەنیا هێزی پیادە لە بارەگا ماوە.

ژمارە ٥٠

١٨ حوزەیران

بە فەرمانەی جەنەراڵ فرایزەر هێزێکی گەورە لە مووسڵەوە گەیشتە کەرکوك. لە کەرکوکیشەوە هێزێك گەیشتە چەمچەماڵ بە فەرمانەی جەنەراڵ تۆمسن. کار چەتوونە. سوپا و هێزی عەشایر لە سوپەردا ئامادەی جەنگن. دوژمن زۆر بە هێمنی دێت.

**دوایی جەنگ و بەخسیریی حوکمدار**

ژمارە ١٨،٥٠ حوزەیران ١٩١٩ دوا بروسکەی بارەگا بوو، دوژمن ڕۆژی ٢٢ حوزەیران لە ژێر فەرماندەی سوپای ئینگلیز (جەنەراڵ فرایزەر)دا گەیشتە دەربەندی بازیان، سوپای گیان بەختکەرانی کوردیش لە ژێر فەرماندەی گشتیی سوپای کورددا لە نیشتمان و خاکی خۆیدا لە سوپەر و قوختەی دلێریدا ئامادەی فەرمانی حوکمداریان بوون و چۆکی پارێزگاری نیشتیمانیان تا کوشتن دادابوو.

هێزی کورد ڕوو بەڕووی سوپای دوژمن و لە ژێر بۆمبای فڕۆکەکەیاندا هیواداری جەنگی سەرکەوتن بوون. بەلام و بەلام.

لە ژێر جلەوکێشیی موشیر ئاغای هەمەوەندیدا کە بەفەرمانی حوکمداری کوردستان کرابوو بە سەرۆکی هێزی سوارەی چەمچەماڵ، لە لارێی چیای دەربەندەوە، لە چەپ و ڕاست ڕوو بەڕوو بە هێزێکی سوارەی گیان بەلاشی هیندییەوە بە سێ لێشاوی بەدبەختی و خوێنمژ لە ناکاو و سپێدەی ئاسماندا هێرشیان هێنا. بە تۆپ و مەترالیۆز و هێزی سوارە لە زەوی. لە ئاسمانەوە بە سەدەها فڕۆکە جەنگیان دامەزراند، بەپێی بیستن لە ڕۆڵە جەنگاوەرەکان ڕیزە سوپەری پێشەوەی لە ژێر ئاگری تۆپ و شێڵنگی تفەنگ و مەترالیۆز و بۆمبای فڕۆکەدا توانای مانەوەیان نەما، وەکو شێر و پڵنگ دەست بە خەنجەری ڕووتەوە لە سەنگەرەکان دەرپەڕین و پەلاماری

سوپاییەکانیان دا بەخەنجەر، لەگەڵ سوونی بەدەست دەجەنگان و هیچ گومان نییە کە یەکێکیان بە زیندوویەتی گەڕابێتەوە. چونکە تێکەڵ بە دوژمن بوون و کوژران و لە ژێر سمی وڵاخی دوژمندا شێلران. مێژوو ناویان ون ناکات و ملۆزمی و پەڵەی بەدبەختیی ئینگلیزیش هەرگیز فەرامۆش ناکرێت.

شێخ مەحموودی سەرلەشکر

لە کوڕ و گەرمەی جەنگدا، سەرلەشکر و جەنگاوەر حوکمدار شێخ مەحموود بوو، کە بەردە قارەمان لە ژێر لوولەی تفەنگەکەیدا قرچە قرچ دەینالاند. لە پاش جەنگێکی دلاوەرانە و خوێنڕشتن، بەردە قارەمان، قارەمانانە بوو بە دالدەدەر و پارێزگاری.

بە تەنیشتیەوە تاهر ئەفەندی و حاجی سەید حەسەنی مامی کوژران و ئەو سوپا بەم بە خوێنینەی پاشماوەی جەنگی یەکەم بە ٣٠ – ٤٠ هەزار چەکدار، بە چەکی ئاگرینەوە ڕژانە ناو بەرەکا و تێکەڵ بە هێز و سوپای کورد بوون. ئەو چەکەی کە لە جەنگی تورک و ئەڵماندا بە کاری نەهێنا، بەبێ بەزەیی، پەلاماری گەلی کوردیشیان پێ دا. جا لەسەر پێشاندان و پەیغامی موشیر ئاغا بە بریندار‌ی شێخ مەحموود لەگەڵ شێخ محەمەد غەریب بە یەخسیر گیران و بران بۆ بەغداد و دوایی جەنگیش هات. کوژراوانی لە ڕێگەی نیشتمانیشدا تێکەڵ بە خوێن و خۆڵ بوون و خەنجەرەکانیان بێ خاوەن مایەوە. ٢٢حوزەیران ١٩١٩.

هەروەها لە کوڕی جەنگ و مەیدانی مەردیی شەرەف و دلێریدا، لە کاتی پاسەوانیی نیشتمانەکەیاندا، دەست بە تفەنگ و چەکی هیوای سەرکەوتنەوە ئەم زابتە بە ئەو (همت) و شەریفانەیش بە دوای حوکمداریاندا بە یەخسیر گیران و بران بۆ بەغداد.

١– عەبدولقادر سەعید، قالەی ئایشەخان

٢–ئەدهەم ئەفەندی

٣– قادر ئەفەندی قەرەداخی

٤– عزەت تۆپچی، عزەتی فاتە

٥– ڕەشید سدقی غەفوور

بێجگە لەم ناونیشانەیش زۆری تریش گیران و لە بەغداد، ئیچ قەڵا، لەسەر بڕیاری سارجن کۆیەك ڕۆژی هەریەکێ بە هەزار خشتی کاڵ بڕین حوکم درابوون و دوا بەدوای ئەمانەیش لە سەرۆك عەشیرەتەکانیش، کە هاوکاریی جەنگیان کردبوو، ئەوانیش بوون بە تەڵەی ئینگلیزەوە.

١– مەحموود خانی دزڵی، هەورامی

٢– مەحموود خانی کانی سانان، مەریوانی

لە خاکی ئێران و ئێرانین بەڵام بۆ ملۆزمیی ئینگلیز سنوور نەمابوو.

٣- سوار ئاغا، سەرخومە بڵباس، ئەمانەیش تێکەڵ بە بەخسیرەکانی ئیچ قەڵا کران.

سلێمانی و هاتنەوەی ئینگلیز

ڕۆژی ٢٢ حوزەیران لە کاتی نزیکەی (پاش نیوەڕۆ) بەبێ ئەوەی کەس لە کارەسات ئاگادار بێت، سوارەی ئینگلیز و هیندی گەیشتە ناو شاری سلێمانی. بەرامبەر بە ماڵی حکومدار و چیای گۆیژە بەریزە تۆپیان دابەست و سەر گردی قشڵەیان کرد بە بارەگای جەنگی. شار شڵەقا، هیوای گیانداری نەما، بە هۆی چالاکیی رەئووف ئەفەندییەوە کە فەرماندەی بلووکی سەربازیی دیوانی حوکمدار بوو، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا خێزانی حوکمدار و کەلوپەلی پێویستیان بە ٤٠ باری ئێستر دەرباز کران.

ئەوەی کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە و لەپێش چاومە، دلێرییەکەی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگە بە تەنیا سوارە و حەمەد بەگەوە پاسداری ئەو خێزانە بوون. دەیوت گیانی من ئەم خێزانە دەپارێزێت. لە تووی قۆجە وێستابوو بە تفەنگە جانبێزارە جوانەکەیەوە.

لەگەڵ گەیشتنی سوپاکەیان، ئینگلیزەکانیان لە بەندی دەرهێنا و گرینهاوس دیسانەوە کەوتەوە گەڕ و ئاشووب. بە ناو شارا دەسووڕایەوە بەسەر ئەو ماڵانەدا کە لە شۆڕشدا بەشدار بوون و خۆی دەیناسین، یەکە یەکە دەستەیەك سەربازی هیندیی بۆ دادەنا، خێزانەکانیان سەربانە و سەریان ئاوارەی گەڕەك بوون و ئەمەیش ناوی چەند ماڵێك لە ماڵە تالانکراو و ئاوارەکان:

١- ماڵی حوکمدار شێخ مەحموود

٢- ماڵی حاجی سەید عومەر

٣- ماڵی حاجی سەید حەسەن

٤- ماڵی تاهر ئەفەندیی حەمەد ئەفەندی

٥- ماڵی عزەت نەجیب

٦- کاکە حەمەی ئەمین عەتار

٧- ماڵی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ

٨-ماڵی سەید نووری نەقیب

٩-ماڵی سەید کەریم سەید ئەحمەد

١٠- ماڵی زۆر لە زابت و دەستەی حوکمدار، نزیکەی ١٠٠ ماڵ.

ئەو ماڵ، پارە، زێڕ، بە تاڵان ڕۆیشت. شار تێك چوو، كەس بە هیوای ژیان و مان نەما. ئەوەی گیرا لە بەندیخانە توند كرا. ئەوەی توانی ڕای كرد و دایە چیا، سەرەڕای تاوانبارییان و پەرێشانیی شار، پەی دەر پەی سوپای ئینگلیز و هیندیی دەگەیاندە سلێمانی.

خێزانی حوكمدار، گەیشتە دزڵی (هەورامان)، نزیكەی (٣٠٠) خێزان لە دانیشتوانی سلێمانی بە ڕووتی و برسیەتی ئاوێتەیان بوون زۆر لە ئاوارەكان لە ناوچوون و كەس نەیزانی چییان بێ هات، ئیتر لە دزڵیدا نەیانتوانی بمێننەوە چونكە ئینگلیزەكان لە ئێراندا فەرمانڕەوا بوون. گەڕانەوە بۆ مەریوان و لەوێوە بۆ (بانە). بەگزادەی بانە، بەهێز و سەربەخۆ بوون لە پاش مێوندارییێكی زۆر بەڕێز و بەخۆشیی خۆیان، لە لایەن (ڕۆستەم خان)ەوە بۆ (سەقز) بەڕێ كران بۆ لای (حەمەخان) و لەوێش، لە پاش ماوەیەك زۆر بەڕێز بۆ (بۆكان) بۆ لای (سەردار) بەڕێ كران.

هەروەها لە لایەن ئەو پیاوە ناودار و مەزنانەوە بە میوانداریێكی بەڕێزەوە بۆ ئەوەی لە ئێرانیشدا لە فەرمانڕەوای ئینگلیز ڕزگاربین بڕیاریان دا كە داڵدە بدەنە بەر توركەكان.

ڕووم بــە (وان) كــەوتــنــە ڕێ، كــە گــەیشتــنــە شاری وان، تــێ گــەیشتــن كــە نــە شاری وان و نەمەئموورەكان لەوانەن داڵدەیان بدەن، بە ڕاستی لە كردەوەی مەئموورەكانیش بە گلەیی بوون.

لە وانەوە بۆ چاریە

ناچاری ڕێگەی پیشان دان بۆ لای (ئیسماعیل ئاغا – سمكۆ) لە (چاریە)، خۆیان گەیاندە پــەنــای ئــەم سەرۆكــە مــەزن و نــاودارە كــوردەی شوكــاك، لــەو كــاتــەشدا ئــەویش دووچــاری بەربەرەكانیی نەستورییەكان بووبوو.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئێران و توركیش دۆستی نەبوون، هەر لەو كاتەدا كە ئەو خێزانە پەرێشان و لێقەوماوە میوان و لە داڵدەیدا بوون سوپای ئێران و تورك لەگەڵ لەشكری نەستورییەكان دایان بە سەریا . لە پێش هەموو پێویستییەكدا ئەم خێزانەی ڕزگاركرد و خۆی كەوتە ناو جەنگی سێ لانە. (چاریە) سووتا و خۆیشی بە خێزانی خۆی و میوانیەوە ئاوارە بوو.

ئیتر خێزانی حوكمدار وەكو دەروێش هەر ڕۆژە لە جێ و شارێك و هەر ڕۆژە لە پەنایەكدا داڵدە دەدران.

ئینگلیز و (شریف الدولة)

وترا، ئینگلیز پەلی بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا كێشاوە. بێگومان ئێرانیش لە ژێر پێی ئینگلیز ناڵەی دەهات. حكوومەتی ئێرانی ناچار كرد كە لە ژێر پرۆگرامی خۆیاندا (شریف

الدولة) دوای ئەو خێزانە بکەوێت. بە سوپایەکەوە (شریف الدولة)ی گەیاندە بانە. بە پێی دادگا پورتاتیفەکەی خۆی، لە (بانە ڕۆستەم خان و لە سەقز حەمەخان و لە بۆکان سەردار)ی کرد بە سێدارەدا و خنکاندنی. چونکە میوانداریی خێزانی حوکمدار شێخ مەحموودیان کردووە. بەڵام خێزان لەدەسەڵاتی (شریف الدولة)دا نەمابوو.

لە ڕاکردووەکانی سلێمانی، پاش جەنگی دەربەند زۆریان گەیشتبوونە سەقز. بە گەیشتنی (شریف الدولة) ئەم ناوانەیش گیران و نێرران بۆ سنە – کرماشان – بەغداد:

١- شێخ قادر: سوپا سالار و برای حوکمدار

٢- عزەت نەجیب: بەڕێوەبەری شار

٣- عارف سائیب: نووسەری تایبەتی حوکمدار

### دیسان گرینهاوس

لە لایەکەوە شەو و ڕۆژ لە شاری سلێمانیدا گرینهاوس دەسووڕایەوە و لە کۆڵانەکاندا بە هۆی (ئێم. پی)وە دارکاریی ڕێبوارەکانی دەکرد و بە کۆمەڵ دەیگرتن و لە بەندیخانەی تووند دەکردن و لە لایەکی تریشەوە ڕۆژی بە سەد جاڕ و سەد چەشن بڵاودەکرایەوە کە شێخ مەحموود چووە بۆ ئێران، پشدەر،.... ئینگلیزەکانیش پەیتا پەیتا بڵاویان دەکردەوە کە لە بەغدا لە بەندیخانەیە کەس باوەڕی نەدەکرد.

### لە بادینان

ئاگری شۆڕش، لە بادینان لە بڵێسەدا بوو، لەسەر ئەو نامانەی حوکمدار بۆی ناردبوون، بێ وچان بە کوشتن و دەرکردن، ئینگلیزەکانیان دەرپەتاند و لەسەرپێچی لە فەرمانیان هەرگیز ڕانەدەوەستان، لە عەقرە (ئاکرێ)، عەمادیە (ئامێدی)، زاخۆ. شۆڕش زۆر بە گەرم و تین دەڕۆیشت، لە بابەت کوشتاری ئینگلیزەکان و درێژەی باسی بادینان لە جێگەی خۆیدا دەخوێنینەوە.

### شێخ مەحموود و یاسای ئینگلیز

شێخ مەحموود لە بەندیخانە و نەخشەی وڵسنیش بۆ لەناوبردنیەتی. جا ئینگلیزەکان ویستیان بە ناوی زۆرداری و زاڵیەتی بەسەر دانیشتوانی شاری سلێمانیشدا سووچداری بکەن. بۆ ئەوەی لە دادگاهدا بە سووچدار پیشانی بدەن فەرمان درا بە حاکمی سلێمانی ئەم پیاوانە بنێرن بۆ بەغداد:

١- میرزا فەرەج حاجی شەریف

٢- حەمەد بەگی قادر پاشا

٣- شێخ نەجیب قەرەداغی

٤- عزەت بەگی وەسمان پاشا

٥- عەونی ئەفەندیی حاجی گوڕوون

٦- حاجی مەلا سەعید کەرکوکلی زادە

٧- حاجی ئاغای حەسەن ئاغا بەڕێوەبەری پۆلیس

لە بەغداد لە مەجلسی عورفیی عەسکەریی ئینگلیزدا ئەم کۆمەڵە وەکو مەڕ مۆڵ دران و بە پێش چاوی ئەم پیاوە ناسراوانەی سلێمانیدا شێخ مەحموود بە پەرانقە و زنجیرەوە هێنرا. تەنیا لە پاش چەند پرسیارێك بە ئارەزووی کۆمەڵەکەی خۆیان بڕیاری خنکاندنیان بە شێخ مەحموود گەیاند و داوای پارێزەریان (محامی) لێ کرد.

شێخ مەحموود

وتی: لەسەر خواهشی گەلەکەم داوای ئازادیی کوردم لە بەریتانیا کرد بەو پەیمانە ڕێگەی هاتنیان درا و لە لایەن حکوومەتەکەیانەوە، ئەم حوکمدارییە بەمن و ئازادی بە کورد بەخشرا. بەڵام ڕاستیان نەکرد، جا من کە لەسەر ویستی گەلەکەم بە حوکمدار دانرام دەبوایە داوای ئەو پەیمانە بکەم، بە زمان یان بە چەك.

من لەگەڵ ئێوە لە جەنگدا بووم، منتان بە دیل گرت و لە بەندی ئێوەدام کە دوژمنی کورد و منن، لەبەر ئەوە بێ گومان دوژمن بۆ دوژمن بڕیاری باش نادات و منیش بەو حوکمەی ئێوە ڕازی نیم و بە عەدالەت نایبینرێت.

لە پاش ئەم وەڵامە سەروپێچەکەی دا بە سنگی گرینهاوسدا و وتی: بەدبەخت ئەمە هەمووی گۆیەنگی تۆیە.

هەر لەو کۆمەڵەدا، گرینهاوس وتی: عزەت نەجیب هات، ئاڵای بەریتانیای داگرت، ئاڵای کوردستانی خۆیانی هەڵکرد، بەڵام ئاڵاکەی بەریتانیای دڕاند و فڕێی دا.

وەڵامی عزەت نەجیب

لەسەر فەرمانی حوکمداری کوردستان، لە کاتی شۆڕشدا بۆ دامەزراندنی ئیشوکاری دائیرەکان و مەئموورەکان فەرمانم پێ درا، بێگومان دەبوایە ئەم فەرمانە بەجێ بێنم. ئاڵای ئینگلیزم داگرت و ئاڵای کوردستانم هەڵکرد. بە قەدکراوی و زۆر بەڕێزەوە پێشکێش بە گرینهاوسم کرد. بەڵام داخەکەم دڕیی و بەشەق لە بالقۆنەکەوە فڕێی دایە خوارەوە جنێوی خراپی بە من و بەریتانیایش دا.

که له شێخ مەحموودیان پرسی،

وتی: بەڵێ من فەرمانم دا بە داگرتنی ئاڵای بەریتانیا و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان. ئەو کوردستانەی کە ئێوە، بەریتانیا دروستی دەکرد و لە ڕووی زاڵی و نەزانیی سیاسییەکانتانەوە ئاڵاتان داگیرا و ئاڵای ڕاست و حەقمان هەڵکرد. (ئەم باسە لە لایەن ئەو کەسانەوە گێڕرایەوە کە نێررابوون بۆ شاهێدی لە شێخ مەحموود. بەڵام هیچیان لێ نەپرسیبوون).

لە لەندەنەوە بڕیاری خنکاندنەکەی شێخ مەحموود کرا بە دە ساڵ بەندی و ئاوارە بۆ (دوورگەی ئەندامان) لە هیند.

ئیتر یەکسەر فەرمان بوو بە فەرمانی ئینگلیزەکان.

خوێنەواری بەڕێز:

ئینگلیزەکان لە کورد، بەتایبەتی لە شێخ مەحموود کەوتبوونە بیانوو گرتن. ئەوەی بە باشیان نەدەزانی بڵاویان دەکردەوە و بەو چاوەڕاوە، دەریای مێژووی کوردیان لیخن دەکرد.

لە کاتی نووسینەوەی جاری دوایی (چیم دی)دا، لە ڕۆژنامەی (برایی) ژمارە ١٥ ڕۆژی ٢٦ – ٧ – ١٩٦٧مدا خوێندمەوە لە باسی (کورد لە مێژوو لەیاداشتەکەی. مس بیل) بینیم، ئەمەیە ڕاستییەکەی:

١– مێجەر نوئێل بە دەستێك پێخەفەوە هاتە سلێمانی و زۆر کەم مایەوە. گرینهاوس کە هاتە جێگاکەی، وڵاتی پڕ کرد لە هەرچی و پەرچیی بێگانە. (مس بیل، بە هەڵە چووە).

٢– حکوومەتی بەریتانیا شێخ مەحموودی کرد بەحوکمدار، نەك نوئێل، کە ڕابەر بوو. لەگەڵ ئەوەدا کە ولسن خۆی دەڵێت سەدی ٨٠ لە کورد لەگەڵ شێخ مەحموودە لەگەڵ نوئێل و مس بیل بە هەرسێکیان کەوتنە دوژمنایەتیی شێخ مەحموود و هەرەس پێهێنانی هیوای کورد.

٣– سەرۆك عەشیرەتەکان بێجگە لە شێخ مەحموود نە نوئێل و نە مس بێل و نە ئینگلیزیان نەدەناسی.

٤– مومەیزی کورد تەنیا لە ڕانیە شێخ ئەمین سندوڵان و لە هەڵەبجە حامید بەگ قائمقام بوون.

٥– لە پاش عوسمانییەکانەوە تا گرتنی شێخ مەحموود ئاسایش لە ئەستۆی خۆی (شێخ مەحموود)دا بوو. کەس دەستدرێژیی نەکردووە و هەموو کەس چە هەژار چە خاوەن دارایی وەکو یەك بێ ترس و بیم ژیاون.

بەڵام، لە بەشی دوایی و فەرمانڕەوایی ئینگلیز، مێجەر سۆندا ئاسایش و یاسایان، بە سەرنجەوە دەخوێننەوە.

# چیم دی

هاتنەوەی مێجەر سۆن و کارەساتی کورد و کوردستان لە بیر نەچێتەوە.

لە ڕۆژی ٢١ مایس ١٩١٩ لە ڕووی گێتیدا تەنیا کورد بوو، کە لە ژێر فەرماندەی شێخ مەحموودا یەکەمین گوللە نرا بە سنگی مژەر – ئینگلیزەوە.

خوێندەواری بەڕێز:

ئەمجارەیش دەیڵێمەوە، ئەوەی لەمەوپێش بە چاوی خۆم بینیومە، ئێستە بەدەستی خۆم دەینووسم. وەکو وتمان لە کاتی عوسمانییەکانەوە تا باوی ئینگلیز خوێندەواریم لەو تەمەنەدا نەبوو، ڕۆژ بەڕۆژ زاڵیەتیی ئەو بێگانانە بنووسم. ئەوا ئێستە بە ناوێتەی خوێندنەوە و بیستراوە ڕاست و دروستەکانەوە ئەم نووسراوەم (چیم دی) بە یادی قارەمانی کورد – شێخ مەحموود، حوکمداری کوردەوە پێشکێش بەو کەسانە کرد، کە ڕێزی گەلەکەیان دەزانن.

لە سەیدەی ڕۆژی پێنانە عێراقەوە، تا دوا ڕۆژیان، ئیمڕۆ کورد و عەرەب لە هەموو پێویستێکی ژیانیاندا وەکو یەك گرفتاری داوی ئینگلیز بوون و لە پەنجە و چنگی نارەواییان ناڵە ناڵیان بووە. لەبەر ئەوە لە یادی کرد و کاریان هەرگیز نابێت پێنووس بوەستێت و کورد و عەرەب چاوی تۆڵەساندنیان لێ بترووکێنێت.

نووسەر: ئەحمەد خواجە

فەرمانی دا بە ناوی (ئەملاکی مضبوطە)وە هەموو موڵك و ماڵ و چاندگەی شێخ مەحموود خرێتە ژێر دەستیان و لە ژێر چاودێریی خۆیاندا بەڕێوە ببرێت و خێزانی ئەو پیاوانەی بە هۆوریی خێزانی حکومدار ڕۆیشتبوون، خرانە ژێر چاودێریی پۆلیس.

مەئموورەکانی سۆن

لە مەوبەر وترا کە ئینگلیزەکان زۆر پیاوی بێگانەیان لەگەڵ خۆیان هێنا و لە جیاتی کورد لە کاروباری حکوومەتیدا دایانمەزراندن.

١- عەزیز خان: نەخوێندەوار، دەیانوت ئێرانییە. سەرۆك مهەندس و بەڕێوەبەر.

٢-عەلی خان: برای عەزیز خان، محاسبی ئیدارەی مهەندسخانە.

٣- حسێن خان: ئامۆزای عەزیز خان، شارەوان - رئیس بەلەدیەی سلێمانی.

٤- سلێمان خان: ئامۆزای عەزیز خان، مودیری حیساباتی لیڤی.

٥- عەبدولڕەزاق خان: ئامۆزای عزیز خان، موتەرجیم و موفەتیشی مالیە.

بەڕاستی کەس نەیدەزانی ئەمانە کوێندەرین. هەر بە فارسی قسەیان دەکرد. جا لە وێنەی ئەوان زۆرتر لە ئەفغانی، هیندی، کورد و ئێرانییان ڕژاندبووە ناو سلێمانییەوە.

لە باوی مێجەر سۆندا دائیرەی ئیشغال دامەزرا. لە ماوەی چوار ساڵدا بێجگە لە پردی تانجەڕۆ و پێچەکانی ژاژیلە بەولاوە کارێکی تریان لێ نەبینرا. بە ناوی کوردستانەوە بەلێشاو ڕووپیە لەناو دەبرا. نە کورد و نە کوردستان سوودی لێ نەبینی. هەمووی بە هۆی عەزیزخانی نەخوێندەوارەوە چووە کیسە و سندووقی خۆی و سۆنەوە.

ڕۆژێك مێجەر سون لە هەڵەبجەوە هاتەوە، پیاوێکی فەرمنجی لەبەریشی لەناو ئۆتۆمبێلەکەیدا قنج و قیت دانابوو سوپاسیان دەکرد کە گوایا ئینگلیزەکان کردەوەی پەسندیان هەیە و ئەم لادێییە هەژارەی لەگەڵ خۆی سوار کردووە کەچی ڕاستە و ڕاست بردیە بەر دەمی داری سیاسەتەکە و پێی وت:

حەمە ئەمین! پارەکە و کەر و ڕۆنەکەم دەدەیتەوە یان نا؟ ئەگینا بەدار لێت دەسێنمەوە.

حەمە ئەمین واقی وڕما. وتی: تۆ دەڵێیت چی؟ تۆ حاکمیت کەر و ڕۆنت لە کوێ بوو؟

کابرا: ئەی لە بیرت نایەت پێش دە دوانزە ساڵ، لەسەر ئاوی سەراوی سویحان ئاغا دوو هێزە ڕۆن و کەرەکە و چی لە باخەڵمدا بوو لێمت ساند و بردت، ئەختێکیش ئازارت دام؟

لە وەڵامدا: وتی، بەڵێ ڕاستە. داخەکەم ئەگەر دەمزانی تۆ ئەم پیاوە دەبیت، بە گیانداری بەرەڵام نەدەکردیت. ئینجا وتی پارەکەم کەم بوو بۆ خۆت. پارەی کەر و ڕۆنەکەم دەوێت و

دەبێت بیدەیت. حاجی ئاغای مودیری پۆلیسی کرد بە کوڵکیەوە، پاش تۆزێك ئازار پارەکەیان لێ ساند. بەڵام زۆر بە گران کەوتە سەر حەمە ئەمین. ئەمە بوو لە هەزاران یەکێك لە کردەوەکانی حاکمی سیاسیی ئینگلیز لەناو گەلدا.

کۆمەڵ کەوتە بزووتن و پشکۆی ئاشووب کەوتە چزەچز لە ڕووی نەزانی یا بێباکیی ئینگلیزەکانەوە، یا لە زۆری تەوژمیان بوو، بۆ سەر گەل. چاوی گەل کرایەوە. بیر و باوەڕ لە پلەیەکی زۆر گرنگدا کەوتە یەکگرتن و دۆستیی ئینگلیز کەوتە کزی، چونکە کورد و عەرەبیان بە گیاندار نەدەزانی. لە دێهات و ناو عەشایەر، لە شاردا، خوێندەوار و نەخوێندەوار، کاسب و مەئموور کەوتنە یەککرتن و سوێند خواردن بۆ یەکیەتی و چوونە پێشەوە، سنگ نان بە گوللە و سزاوە پێنج دەستەی پوخت بە پرۆگرامێکی ژیرانەوە کەوتنە کار بۆ کنەکردن و ڕووخاندنی قەڵای بەدبەختی سۆن.

بە پەنهانی و بەم ناوانەوە پێنج کۆمەڵی هەڵبژێرراو دروست بوو و هاتنە کایەوە بە سەرۆکایەتیی جەمال عیرفان:

١- بەرزیی وڵات. ٢-کوردستان. ٣- گزنگ. ٤- فیداکارانی کورد. ٥- وەتەنپەروران.

لەسەر یەك پرۆگرام و یەك ڕەوشت، بە هەمووو لایەکدا لقی ئەم کۆمەڵانە بڵاوکرایەوە. پڕۆپاگەندە لە ناو شار و مەئمووراندا زۆر بەتین بوو. ئەمە یەکەمین بەیاننامە (نشرە)یە کە بڵاوکرایەوە.

تەنیا بە دوور خستنەوەی و یان نەمانی، شێخ مەحموود نە ناوی شێخ مەحموود و نە ناوی کورد نامرێت. چونکە شێخ مەحموود، شێخ مەحموودی زۆرە. دەبێت ئەو شێخ مەحموودەی حوکمداری کوردستان بە زوویی بێتەوە. یان دەبێت ئێوە بڕۆن. کوردستان نیشتمانی کوردە. ئینگلیز بێگانەیە.

بە ناوی کۆمەلانی کوردستان، کۆمەڵی بەرزیی وڵات

٢٠ شوبات ١٩٢٠

بۆ گەورەیی و زاڵییەتیی مێجەر سون، ئەم بەیاننامەیە زۆر گرنگ بوو، ژیانی پێ تاڵ بوو. بە هۆی مودیری پۆلیسەکەیەوە کەوتە هەوڵی دۆزینەوەی ماکەکەی. لەو کاتەدا لە زابتە کوردەکان کە لە تورکیاوە هاتبوونەوە چەند کەسێکیان بە لای حکوومەتەوە خۆشەویست نەبوون لەوانە ماجید مستەفا و ئەورەحمان سەعید، گیران و خرانە بەندیخانەیەکی پڕ ئازارەوە.

جەمال عیرفان پاش شۆڕشەکەی ٢١ی مایس نەگەڕایەوە بۆ سوپا و وەزیفە. خۆی زابتێکی هونەرمەند، زیرەك و بەتوانا، ئازا، دانا و لە جەنگی یەکەمدا ڕەئیسی ئەرکانی حەربییەی عەلی

ـــــن پاشا بوو لە عێراقدا. ڕۆڵەیەکی کوردی بە تەو (همت) و ژیر بوو.

ـ بۆ بەڕێوەبردن و دامەزراندنی، پرۆگرام، یەکخستنی ئەم کۆمەڵانەی خستە سەر شان و ـی خۆی و هەرگیز ماوەی ئەوەی نەدا بزانرێت و بناسرێ.

ـەرچەندە مێجەر سۆن لەسەر شۆڕش و جەنگەکەی بەرامبەر بە مەحموود خانی دزڵی لە ـەسـاڵ زویر بوو بوو. بەڵام هەر چەکەرە و ترسی لێی هەبوو، نەیدەویست بیورووژێنێت.

ـەمال زۆر بە ژیرانە دەبزووتەوە، نەیدەویست بێجگە لە ڕووخاندنی دەزگاکەی مێجەر سۆن، ـی کۆمەڵانە بە هیچ شتێکی ترەوە خۆیان خەریك بکەن. بۆ هەر کۆمەڵە لە تەمەنی ١٥–٢٥ ـسڵینا بۆ کاری گرنگ و نهێنی چوار پێنج کەسی هەڵبژارد بەرنامەیان پێ دەسپێررا. بەڕاستی ـرووتنەوەی کۆمەڵەکان، جێگایان بە سۆن لێژ کرد و ئەم کۆمەڵانە هەر یەکە بە لایەکدا، ـیوەستیان بە سەرۆك عەشیرەتەکانەوە پەیدا کرد و کردیانن بە سوێند خۆر. وردە وردە بە هێمنی و لە ژێر پرۆگرامدا ئاشووب، یاخییەتی دەستی پێ کرد. گەیشتە ئەوەی کە سۆن هەر خەریکی تۆراو و یاخی ئاشتکردنەوە بێت. ڕێکەوت باش بوو ڕووپیە بەخشینەوە زۆر بوو.

**ناردنی نوماینده بۆ لای سمکۆ**

لەم کاتەدا، لە ئێران شۆڕشی (سمکۆ) زۆر لە برەودا بوو. جەمال و کۆمەڵەکان بڕیاریان دا کە لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئێراندا پەیمانێك ببەسترێت، کە سەرۆك و فەرماندە (ئیسماعیل ئاغا) سمکۆیە و سەرۆك عەشیرەتی شوکاکە، کە ڕۆژ بەڕۆژ شۆڕشەکەیان لە تەنینەوەدا بوو.

حکوومەتی ئێران، بە ناچاری لەسەر ئارەزوو و زۆرداریان دایە کۆمەکی ئەستۆرییەکان کە دوژمنی سمکۆ بوون. بەڵام لەشکری سمکۆ گەیشتە سەقز و بانە. لەم کاتەدا سۆن و ئینگلیزەکان لە بزووتنەوەی ناو شاری سلێمانی دەترسان چونکە کۆمەڵەکان زۆر بەهێز بوون.

بەرامبەر بە سیاسەتی حکوومەت بێ ترس وەستابوون و دەبزووتنەوە بۆ شۆڕش و ژیانەوەی داواکەی شێخ مەحموود، کە ئازادیی کوردستانی خواروو بوو.

ئیتر جەمال بڕیاری دا بە تێکەڵ بوون بە شۆڕشەکەی سمکۆ بەڵکو بەو هەل و هۆیەوە ڕزگاریکار بێت و بە کۆمەڵەکانی گەیاند لەبەرئەوەی پرۆگرام یەك و ئاوات یەك بوو چەند کار گرنگ و سەخت بوایە پێك دەهات. بە بیری گشتی، بۆ ناردنی دوو کەس بڕیار درا. لە پاش چەند ڕۆژێك بیسترا کە ڕەشید جەودەت و عارف سائیب نێرراون، کار زۆر بە نهێنی دەگیرا. کەس و تا ئەندامەکانیش لە گوزارش ئاگادار نەدەکران تەنیا هەر کەسە پێسپێرراوی خۆی بەجێ دەهێنا.

## سەید تەها

لە ژێر فەرماندەی سەید تەها ئەفەندی لەشکرێکی زۆری کورد لە سەقز و بانەدا بوو. رەشید و عارف گەیشتنە سەقز و خزمەت سید تەها، لە بابەت کردەوەی ئینگلیزەکان و کارەساتی کوردستانی خوارووەوە گفتوگۆ کرا و ویستیان لە فەرماندەی سەر لەشکرێك بنێرن بۆ سلێمانی و ناوێتەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە ببن و شۆڕشی گەورە دەست پێ بکاتەوە.

سەید تەها ئەفەندی وتبووی: ئێمە کارمان باش نییە و ڕەنگە بەم زووانە خۆم لە سلێمانی بتانبینم. پێویست نییە سمکۆ ببینن، بگەڕێنەوە.

ئەم باسە لەسەر گێڕانەوەی نێرراوەکان دەگێڕینەوە، گوایا سەید تەها ئەفەندی لەگەڵ ئینگلیزەکان لەوەپێش پەیوەستی بووە و ئارەزووی شۆڕشی سلێمانی و تێکدانی سیاسەتی ئینگلیزی نەدەکرد و ئەم بیر و کارە بوربوو بە هۆی شکستی سمکۆ. ئەوەی خستبووە مێشکەوە کە لەگەڵ ئینگلیزەکان ڕێك بکەوێت و لە جیاتی شێخ مەحموود ببێت بە حوکمدار.

لە ساڵی ١٩٢٨دا لە بەغداد، کە لەگەڵ بابا عەلی چووبووم، سەید تەها ئەفەندی قایمقامی ڕەواندز بوو، هاتە بەغداد. چوومە دیدەنیی. بە هۆی ئەمین ڕەواندزییەوە یەکترمان ناسی. چەند پرسیارێکی کرد و چۆنیەتیی شێخ مەحموود.

وتی: کاکی خۆم، نە تەنیا سلێمانی کوردستانە و نە شێخ مەحموود مەلیکی کوردستان.

لە وەڵامدا وتم: ئەو شێخ مەحموودە دەفەرموون کە لە هەولێرەوە تەلگرافت بۆ دەنووسی؟

فەرمووی: سلێمانییەکان زۆر فیداکارن بۆ شێخ مەحموود و قسەکەی گۆڕی.

سەید تەها ئەفەندی پیاوێکی وریا، ئازا، بەخشندە و لە نەوەی شێخ عوبەیدوڵڵای گەورەیە. هەڵدەگرێت سەردار بێت بەڵام دوای شێخ مەحموود. کۆمەڵەکان پەی دەر پەی بەیاننامەیان بڵاو دەکردەوە، شاری سلێمانی و عەشایر لە ژێر فەرمان و پرۆگرامێکی ڕێکوپێکدا لە قوڵپ و جۆشی شۆڕشگێڕیدا بوون. سۆن دەترسا کە لەپڕ ئاگر بسێنێت.

نووسراوێك بۆ مێجەر سۆن:

به زوویەکی زوو دەبێت حوکمدار و دیلەکانی دەربەند کە ئێستە لە (ئێچ قەلا) خشتیان پێ دەبڕن بیانهێننەوە. باش لە دوارۆژی خۆتان بیر بکەنەوە، ئەوەی قەومێك بە دیل بزانێت، خۆی بە دیل دەگیرێت.

کۆمەڵی فیداکارانی کوردستان

مارت ١٩٢٠

...ی بۆ نەچوو بێجگە لە مەحموود خانی دزلّی، کە نێررابوو بۆ هیند بۆ لای شێخ مەحموود، ...ن بەرەلا کران. سۆن وای دەزانی بەم کارە ئیتر ئاشووب نامێنێت و دەکەونە ...ی، بەلام بەرەنگاری زۆر قوڵت و هەورازی سەختتر بوون.

...ی کوردی

...بۆ دلّنەوازی، مێجەر سون بلاّوی کردەوە، ئیتر زمانی کوردی لە هەموو کاروباری ...مەتیدا بەکار دەهێنرێت، زمانی کوردی زمانی ڕەسمییە. هەندێك لە ئینگلیزەکان، وەکو ...موس، گاردان و کر کە زۆر شارەزاییبیان لە زمانی فارسیدا هەبوو، ئەم فەرمانەیان پێ ...ۆ نەبوو.

...ی کۆمەڵی گزنگ:

براکان، دانیشتوانی سلێمانی، سەرۆك عەشیرەتەکان:

چاوتان بکەنەوە، لە ڕووی گێتیدا فران فرانی کلاّوی ئازادی و دەنگی داوای سەربەستیی هەموو گەلە دواکەوتووەکانە دەڵێن: (مردن یا ئازادی).

ئێمەش، کورد، هێشتا لە خەواین. حوکمدارتان دیلی دوژمنە. چونکە داوای ئازادی دەکات. چونکە دەیەوێت پێوەندی یەخسیریی گەلەکەی بشکێنێت. ئینگلیزیش بە تۆپ و بۆمبا، بە سوپای ۳۰-٤۰ هەزارییەوە گیانمان دەکێشێت. هێلانەی هەزاران سالّەمان دەڕووخێنێت، کشتوکالّمان دەسووتێنێت، دەیەوێت یەخسیر و بەندەی بین.

چاوتان بکەنەوە، لە شارەکەماندا نە قوتابخانە، نە کارگە، نە دلّسۆزیّ نییە و نییە. بە ئادەمیزادمان نازمێرن ئەی کوردانی نامدار. تاکەی ئەم سەرشۆڕییە. ناوی ئازایی و دلێریمان تازە بکەنەوە. دوژمنی خوێنمژتان لە ناو بەرن. داوای ئازادیی خۆتان بکەن. بە چەك، بە پێنووس، بە هاوار.

کوا حوکمدارەکەتان؟

کوا ئالا ڕەنگا و ڕەنگەکەتان؟

کوا هەڵمەتە دلێرانەکەتان؟

چاو بکەنەوە، ئینگلیز مافمان ناداتێ، دەبێت بە یەکیەتی، بە دانایی، لە پێویستدا بە چەك بیسێنن.

کۆمەلّی.. سیفەر.. حەقی داوە جا پێویستە بە نووکی خەنجەر لە جانتای

دیپلۆماسییە بەدنیهادەکاندا دەری بهێنین.

ڕۆژی (؟) مارت ڕۆژی کۆ بوونەوە و بڕیارە کۆ بنەوە بۆ ئامانجی ڕزگاری و برایەتی.

کۆمەڵی گزنگ

٢١ مارت ١٩٢٠

ئەم نامەیە بەڕاستی مێجەر سۆنی لە وشکی خستە مەلە. تەنیا عەودالی دۆزینەوەی ماکەکە بوو، بەلام بێ سوود بوو، لە دەر و ناوشاردا بە یەك بیر و باوڕ، بە یەك دەنگ و ئاواتەوە دەژیان. بێگانە پەرست، بە پارە خۆفرۆش، بە لەگامی نیشتمان کاولکەر، لە ناودا نەمابوو. تەنیا بۆ کورد گیان بەخت دەکرا.

## چاپ و ڕۆژنامە

بۆ ئەوەی بە دەستویردی، دڵپاکی و ڕاستیی خۆی بخاتە ڕوو و یان مەرامەکانی خۆی بە ڕۆژنامە بلاو بکاتەوە، مێجەر سۆن لە بەسرەوە چاپێکی بچووکی نیوداشتی هێنا.

ڕۆژی یەکەمی ١٩٢٠ یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) لە ژێر چاودێری و پرۆگرامی خۆیدا، لە شاری سلێمانی دەرهێنا. ئەم ڕۆژنامەیە بە مژدەیەکی خۆش زانرا، چونکە زمانی کوردیی پێ جێگیر بوو.

بەلام کۆمەڵەکان لە بلاوکردنەوەی سکالا نووسراوەکانیان هیچ ڕانەدەوەستان. هەموو هەفتەی جارێك نەشرەیەك بلاو دەکرایەوە و دەبوو دانەیەکیشی بنرێت بە لەوحەی ئیعلانەوە کە لەبەر دەرگای دیوانی حاکمی سیاسی هەڵواسراوە و گاردێکی سۆجری ئینگلیزی لێ بوو.

بۆ پێوە نووساندنی نەشرەکە دەبوایە یەکێك لە ئەندامان بچێت. ترس لە سوجرەکان نەبوو. چونکە ئەو فەرمانەیان پێ نەسپێررابوو، بەلام ترس لە چووغڵ و پیاوخراپە کوردەکان بوو کە پۆلیسی نهێنی بوون و شوێن دۆزینەوە دەکەوتن.

لەو کاتەدا لە کۆلانەکانی ناو شارا فانۆسی نەوتی، هەڵواسرابوو. ئەم فانۆسانە بە با و پیسی لە دە دانەیان چواریان نەکوژاوە بوو. کۆلانەکان تاریك بوو، لە تەنگانەدا خۆشاردنەوە ئاسان بوو.

زۆرتری داوا بۆ کردنەوەی قوتابخانە، هێنانی کارەبا، کردنەوەی شەقام، دروستکردنی پردی قەشان بوو، کە هیچی نەکرا.

بە نووسینی هەڕەشە مێجەر سۆن تەنگاو کرا. بەلام ئەویش بە نووسینی کوردی و ڕۆژنامە

...کردنەوە دەیویست دەمبەست بکات، بێ سوود بوو.

...گیزەکان لە قەزاکان و سۆن و ئینگلیزەکانی سلێمانیش زۆر کەوتبوونە ترس و تەنگاوەوە. ...کە بابەکراغای سەرۆکی پشدەر، بەشی سەلیم ئاغای، کەس نەما هاوکاریان بێت، بابەکر ...چیش گرنیەکی زۆر گەورە بوو لە ڕێگەدا و پیاوێکی زۆر بەهێز و دانا و تێگەیشتوو بوو و لەو ...کەیەی بەرامبەر بە ئینگلیزەکان گرتبووی هەرگیز هیچ هێزێك نەبوو بتوانێت لای بدات.

...یکردنەوەی ئەم پیاوە بەهێز و بە فەرەیشیان زۆر بە پێویست زانی. لەبەر ئەوە لە لیژنەی ...تی نیساندا کۆمەڵەکان بڕیاریان دا، دوو پیاوی تێگەیشتوو بنێرن بۆ جیاکردنەوەی بابەکر ...ە لە ئینگلیزەکان.

...سەر هەڵبژاردنی لیژنەکان، قالەی ئایشەخان و ماجیدیان پەسند کرد و بەڕێ کران. لەگەڵ ...ەکر ئاغا کۆششیان بێ سوود بوو و تیرەی بابەکر ئاغا بە یارمەتیی حکوومەت تا نێزیك ...جوێن دەستیان بەسەر دێهاتەکاندا گرتبوو و داگیریان کردبوو.

بەڵام عەباس مەحموود ئاغا، ئامۆزای بابەکر ئاغا سەرۆکی بەشی مەحموود ئاغای، بەڵێنی هاوکاریی دا و تێکەڵ بە ئازادیخواهانی کورد بوو. جا لە پشدەرەوە بە ناو عەشایرە کوردەکاندا ڕۆیشتن تا گەیشتنە شاری (وان). والی و حەیری پاشایان بینی. کارەساتیان تێ گەیاند، تورکەکان بە بۆنەی ولایەتی مووسڵەوە ئارەزووی شۆڕش و ئاشووبیان دەکرد. تورکەکان بە هیوای ساندنەوە بوون. بەڵام وەڵامەکەیان دەرمانی دەردی نەدەکرد و گەڕانەوە تا گەیشتنە کەندە سوورە، لای حەمە ساڵح بەگی نائیب لە میر و بەگزادەکانی بانە.

لە مارتی ١٩٢١دا، لە لایەن مێجەر سۆنەوە فەرمانی لێبووردنیان بۆ دەرچوو و هاتنەوە بۆ سلێمانی.

جەمال لە کردەکەیان دڵخۆش نەبوو. چونکە خۆیان بە سۆن ناسی و ئیتر ماوەی ئەودا تێکەڵ بە کاری کۆمەڵایەتی بوون.

### کردەوەی مەئمورەکانیان

ئەو نامەیەی کە لە لایەن مودیری ناحیە ئیسماعیل حەقی ناو، کە پیاوی خۆیان و بەغدایی و کۆنە زابتی تورك بوو و بۆ حاکمی سیاسیی نووسیوە و زۆر کارێکی عەنتیکەیە لێرەدا پێشانی دەدەین، دەڵێت:

ماینێك لە ژێر حاجی کەریمی سوارەی مودیری ناحیەدا کوژرا. لەسەر ئەمە لە لایەن مودیری ناحیەوە عەزە، مچە، ڕەسوول، ناوانی گوێزیلەی گرتووە. تفەنگ و بزن و گایان هەرچی هەبوو (تالان) کران و ناردوونی بۆ سلێمانی. لەبەر ئەوەی (باش)

دەرنەکەوت ماین کوژەکان ئەمانەن، حکوومەت هەر بە (تالآنەکە) وازی لێ هێنان.
بەخشینی لە گرتنی بەندیخانە.

ئەم حوکم و عەدالەتەی لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە ٢ ڕۆژی ٦ی مایس ١٩٢٠دا بڵاوکراوەتەوە.

ئینجا خوێندەواری بەڕێز، خۆت سەرنجێك لەم بڕیار و یاسایە بدە:

ئینگلیزەکان وایان دەزانی بە چاو و ڕاو دەتوانن ملی کورد بشکێنن، وای دەزانی کوردی جیهان تەنیا بە باس و چاو و ڕاوی ئازادی دەستخەڕۆ دەبێت. بەرامبەر بە تورك، ئێران، عێراق چەکێکی کوشندەیە بە دەستیەوە و کوردیش با زەقەی چاوی بێت.

مێجەر سۆن هەندێ دڵخۆشیکەرەوەی لە گیرفانی خۆی دەردەهێنا و بڵاوی دەکردەوە. لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە ٦ نیسان ١٩٢٠دا دەڵێت:

«لە کۆمەڵی ئاشتیدا لە بابەت کوردستانەوە وترا، کە لە کوردستانی ژووروو، وان، باش قەڵعە، خەرپووت... دا ژمارەی کورد زۆرە. دەبێت حکوومەتێکیان بۆ دروست بکرێت و بۆ بەجێهێنانی ئەم بڕیارە و ئامانجە لە ئینگلیز و فرانز و ئیتاڵیا، ئێران، لەگەڵ کوردێك لێژنەیەك دروست دەکرێت».

پێشکەوتن

دوا بە دوای ئەم بڵاوکراوەیەی پێشکەوتن، لە لایەن کۆمەڵی (وەتەنپەروەران)ەوە دوور و درێژ نامەیەك بڵاوکرایەوە ئەمە پوختەکەیەتی، دەڵێت:

نووسراوەکەی ژمارە ٦ی پێشکەوتن لای لایەیە بۆ خەو لێخستنی کورد. ئایا نازانن دانی ئیستیقلال بە کورد پیشەی ئێوە، ئینگلیز نییە؟ کورد مەردانە بازووی خۆی هەڵکردووە حەقی خۆی بە دەستی خۆی دەسێنێت. گیانی کورد وەلیفەتی ئەو ئاواتەیە. تۆ کوردەکانی خۆت ئازاد بکە بازت مەدە بۆ دوور............ و زۆر شتی تر.

لە ڕۆژنامەکانی ژمارە ٧٥،٦٥،٥٤،٤٠ی پێشکەوتندا لە بابەت کوردستانەوە زۆر باسی گرنگی بڵاو دەکردەوە. بەڵام ئاشکرا بوو کە ئەم قسانەیشیان وەکو چاو و ڕاوەکانی پێشوویان تەنیا بۆ چاوبەستی کورد بوو، دەگەڕان بۆ سووسە و دۆزینەوەی بنکە و ئەندامانی ئەو کۆمەڵانەی کە بەنووسین، داوا، پروپاگەندە، مێجەر سۆنیان وڕکردووە و بە گەرمی وەڵامی ئەو درۆیانەیان دەدەنەوە.

لەبەر زۆریی نووسراوەکان چاوپۆشیمان لە دووبارەکردنەوەیان کرد.

**وتابخانه**

ـيكەى سێ ساڵ بەسەر هاتنى ئينگليزدا و گرفتاربوونى كوردا ڕابورد، چاكەيەكيان ـرـمبەر بە كورد ڕەوا نەبينى. چونكە ئەم پياوە بەڕێوەبەرانەى ئينگليز لە هيندستانەوە ـتبوون، كە هينديان بە گياندار و ئادەميزاد نەدەژمارد، نەيانويست هەروەها بڕواننە ـيش. جا ئەم زەلە و نادانييە، زۆر بە گران كەوتە سەر شانيان.

ـكمەكانيان ڕۆژێك بە بيرياندا نەهات، كە بە چاوێكى دڵسۆزى بڕواننە كورد، كوردى نەك ـيەنى، هەموو گيرۆدە بووەكانيان، وەكو: قوتابخانە، ئاوەدانى، ئاو و جۆگە و چاندگە و زۆر ـى تر... چاكەيەكيان بەجێ نەهێشت.

ـە مەزبەتە و بەياننامەى زۆر داواى كردنەوەى قوتابخانەيەكى سەرەتايى و يەكێكى ـوەندى دەكرا، كە لە سلێمانيدا بكرێتەوە. لە دوا كەشماكەشێكى زۆر بە كردنەوەى سەرەتاييەك ـۆ خوێندنى ئينگليزى و تەنيا دوو سەعات لە شەودا دڵخۆش كران.

بۆ ئەم هيوايە، نزيكەى ١٥ كەس لە لاوەكانى سلێمانى كە مەئموور بوون. بۆ داواكردنەوەى ـوەندييەكەيش ئيستيعفايان كرد و مەزبەتەيەك بە هەموو دانيشتوانى سلێمانى ئيمزا كرا و بە ـشداريى ڕەشيد جەودەت پێك هێنرا. ئەو مەئموورانەيش ناوەندييان تەواو كردبوو بەڵام بۆ كردنەوە و بەجێهێنانى ئاواتەكە دەستبەردارى وەزيفەكەيان بوون.

بۆ پێشكەشكردنى مەزبەتەكە بە حاكمى سياسى، مێجەر سۆن خرايە سەر شانى من، نووسەرى (چيم دى). بەپێى پێويست چوومە لاى كاپتان هۆڵت موعاونى حاكمى سياسى. باش كورديى دەزانى، بەڕاستى پێى خۆش نەبوو. وتى (بزانم جەنابى حاكمى سياسى چى دەفەرمووێت)، ڕۆيشت.

كە هاتەوە وتى: دەفەرمووێت داوايان قبووڵ نييە.

مەزبەتەكە و نامەى ئيستيقالەكەى دايەوە دەستم و وتى (متأسف)م، لەسەر داواى من لەسەر هەردووكيان دوايى نووسى: (جەنابى حاكمى سياسى ئەم جۆرە داوايانە قبووڵ نافەرمووێت و لەم تەشەببوساتە تەجەنوب بكەن).

لە ناكاو چوار مەزبەتە:

١- لە لايەن دانيشتوانى سلێمانى

٢- عەشايرەكانى ليواى سلێمانى.

٣- عەشايرەكانى ليواى هەولێر.

٤- شێخانی بەرزنجە، قەرەداخ و هەندێك لە بە گزادەی جاف، ئەم چوار مەزبەتە لە ڕۆژێکدا پێشکەش بە مێجەر سۆن کرا.

لە مەزبەتەکاندا وەکو یەك:

١- بەجێهێنانی بەڵێنەکانی درابوو بە شێخ مەحموود کە ئازادیی کوردە.

٢- گەڕانەوەی حوکمدار شێخ مەحموود.

٣- سپاردنی کار بە مەئموورانی کورد.

٤- پاك ڕەوشتی، بینینی دەستووری وڵات.

بەڵام مێجەر سۆن ئەم داوایانەی بەبێ نرخ بینین و گوێی نەدایە. هانی ڕۆژنامەکانی بەغدادی دا و کەوتنە گاڵتە پێکردنی کورد. ڕۆژنامەی (العراق و العالم العربي) زۆریان نووسی. بەڵام لەبەر بێ هۆی توند و تیژی، سۆن وەڵامی ئەو ڕۆژنامانە بەبێ دەنگی درایەوە.

سۆن دەیویست لە دانیشتوانی سلێمانیش مەئموورانی گەورە دابنێت بەڵام لەبەر دوو کۆسپ بوو، کە کەس نەیدەوێرا قبووڵی بکات:

١- ترسی گۆڕینی باو و هاتنەوەی حوکمدار.

٢- ترسی سەرزەنشتی گەل.

ئینجا لە سەرەتادا سۆن ئەم ناوانانەی هێنایە ڕیز:

١- ئاوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا، مدیری ناحیەی تانجەڕۆ.

٢- ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، سوورداش.

٣- حەمەد بەگی قادر پاشا، سەرچنار.

٤- سەید ئەحمەدی حاجی مامەند، سرۆچك.

٥- ئیسماعیل حەقی بەغدادی و زابتی عوسمانی، قەرەداخ.

٦- ئەحمەد فائیق، سکرتێری مالییە.

٧- ڕەزا بەگ، حاکمی شار بازێڕ.

بەڵگەی شۆڕش

لە ناو شار و دەرەوەی سلێمانیدا وردە وردە لە ژێر پرۆگرام و بزووتنەوەیەکی ڕێکوپێکدا سەرەتای شۆڕش دەستی پێ کرد. لە ملۆزمیی کاربەدەستان و مەئموورانی ئینگلیز، یاخییەتی پەرەی سەند.

ـ ـمكاو، قەرەداغ، شۆڕش دەستی پێ کرد. دوا بە دوای ئەوان بە چەند ڕۆژێك لە نیزیك و حـ ـویختی، سلێمانیش، ئالۆزان و لە دێهاتەکانی بن چیای شارەزوور تەقە دەستی پێ کرد. جـکـلر نلیە چیا. لە هەموو لایەك و دێ و کوێخا دێیەکەوە نامە بەسەر مێجەر سۆندا دەباری و هـمووی یەك چەشن داوای (بەڵێنەکەیان دەکرد کە داویانە بە شێخ مەحموود). سۆن کەوتە لەقە حۆ.

ـۆن لە ڕۆژنامەی پێشکەوتندا بڵاوی دەکردەوە کە ئیستیقلالی کورد بەم زووانە تەواو حێتـ لەولایشەوە ڕێگەی ڕۆژنامەکانی بەغدادیان دەدا، یەك بەدوای یەکدا دەیاننووسی کە ـێمانی لیوایەکی عێراقە و دەبێت کوردەکان خۆیان بە عێراقی بزانن و بەس و ئەو ڕۆژنامانە ـە زۆری لە سلێمانیدا بڵاو دەبۆوە. تەنیا مەبەس ئەوە بوو کە کورد و عەرەب بکەن بە دوژمن.

بەلام بەرامبەر بە هەموو کردەوە ناپەسندەکانی ئینگلیز، هیوای کورد تەنیا چەکەکەیان و ـترسییان بوو. کۆمەڵ و سەرۆکەکان لە پیلان و پرۆگرام ڕێکخستندا هیچ کاتێك وەستانیان نەبوو.

### باوی دەروێشی

لە ناکاو کۆلان، مزگەوت، دائیرەکانی حکوومەت، پڕ بوو لە دەروێشی پرچ درێژ، بەرد، پارباخ، گوێزان، دار..... هەموو شتێکیان دەخوارد. پەی دەر پەی ڕۆژی بیست چین زیاتر دەستە دەستە دەروێشی بە زەرك لێدان، سەر بڕین و تەپڵ و دەفەوە دەیانکرد بە شاری سلێمانیدا و ئەوەندەیش دەرۆیشتە دەرەوە. لەبەر هوولەی دەروێش و دەنگی تەپڵ و دەف، هەموو کار وەستا. بە هەزاران دەهاتن و دەڕۆیشتن.

ئینگلیزەکان کەوتنە سڵەمینەوە. چونکە بەڕاستی سامی کۆمەڵێ دەروێش لە هەزاران سوپای چەکدار کاریگەرتر بوو و لە پەرەساندن بوون. زەندەقیان لە ڕەشمارەکان چوویوو کە لە ملیان ئالاندبوو.

لە گەڕەکی سەرشەقام بنکەیەکی گەورەیان دامەزراند. کە شێخە گەورەکانیان لەوێ کۆ دەبوونەوە و باوەڕ پێکراویان (خەلیفە دومە) بوو.

مێجەر سۆن زۆر لێی دەترسا. فەرمانی دا بە مودیری پۆلیس و سارجن براوند بیگرن. هێنایانە پۆلیسخانە. سارجن گاڵتەی پێ کرد. خەلیفە تووڕە بوو. لەپێش چاوی سارجن و هەموو وێستاوەکان، بەردێکی حۆقەی هەڵگرت و دەستی کرد بە کرۆشتن. زۆر بە ئاسانی وەکو پەنیر دەیخوارد. سارجن ڕای کرد، بە مێجەر سۆنی گەیاند. دەستبەجێ وتی بەرەڵای بکەن نەوەك ئێمەیش بخوات. زۆر جار وەکو خورما فیشەکیان دەخوارد و دەیانجوو و قووتیان دەدا.

حەمە کەریمی فەڕاشی گومرگ لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا و دەرویش بوو بردیانە لای معاونی حاکمی سیاسی. لەسەر مێزەکەی دەمە گوێزان هەبوو. هەڵی گرت و خواردی. کاپتان ڕای کرد. هاواری کرد ئەم کوڕە شێت بووە. ئێستە دەمرێت، گوێزانی خوارد. بەڵام حەمە کەریم شتی تریشی دەخوارد. کاپتانی ئینگلیز سلێمانیی بەجێ هێشت، بەڕاستی باوی دەروێشی کارێکی زۆر ستەمی کردە سەر سیاسەتی ئینگلیزەکان.

هەر لەم کاتەدا، لە لایەکی تریشەوە، چەکدار ئارامی حکوومەتیان نەدەدا. ڕێگا و بان بڕا. ترسی هاتوچۆ ئێجگار زۆر بوو. ڕێگەی پۆلیس و پیاوانی میری بەسترا، ناوی حکوومەت کز بوو.

بەرامبەر بەم ئاژاوەیەی (ئاینی و چەکداری)یە مێجەر سۆن دیسانەوە کەوتەوە پیلانی باسی ئازادیی کورد، بەڵام بێ سوود بوو. چونکە پرۆگرام لە کۆمەڵەوە دەردەچوو توند و تیژیی سەرەتای شۆڕش تێك نەدەچوو، لە بڕووزدا بوو. ماوەی ئینگلیزەکان نەدەدرا بە قسە و لاوانەکەیان تەفرە بدەن. لەگەڵ ئەوەیشدا یەك بەدوای یەکدا، نامەی سەختیان بۆ دەنێررا تا وای لێ هات ڕاستە و ڕاست داوای ئیستیقلالی کورد دەکرا لەگەڵ نەخشەی کیشوەر، نەك تەنیا سلێمانی.

مێجەر سۆن

لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە ٥٤ ڕۆژی پێنجەمی ١٩٢١دا مێجەر سۆن دەڵێت:

بۆ ئەوەی لە بابەت موقەدەراتی کوردستانەوە، جەنابی حاکم سیاسی لە چوونە بەغدادا و بینینی مەندوبی سامیدا قسە و موزاکەرەی لێ بکات بڕیاری دا لە پێش ئۆغرکردنیاندا لەگەڵ پیاوە ناودار و ناسراوەکانی سلێمانی مولاقاتێك بکات. جا بۆ ئەم مەبەستە ئەم پیاوانە داوا کراوە:

١- حاجی حەسەن ئەورەس ئەفەندی: مودیری پۆلیس

٢- عەزمی بەگی بابان: ئەشراف

٣-حاجی سەعید ئاغا: ئەشراف

٤- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا: ئەشراف

٥- عەبدولکەریم ئەفەندی عەلەکە: ئەشراف

بۆ ئەوەی لەگەڵ حکوومەتی عێراق موناسەبەت و یەکیەتییان هەبێت. چونکە کوردستان زۆر پێویستی بە یارمەتی هەیە و دەبێت کارێکی وا بکرێت کە عێراق

زۆر یارمەتیی کوردستان بدات، هەتا فێری ئیدارەی سەربەخۆ دەبن و هەموو جێ و ئیش و کارێکیش لە ژێر ئیدارە و تەماشاکردنی حکوومەتی فەخیمەی ئینگلیزدا بێت.

پێشکەوتن

لە پێش بڵاوکردنەوەی ئەم نووسراوەدا مێجەر سۆن چووبوو بۆ بەغداد. ئەم پیلانە لە ترسی شۆڕش بوو.

پارچەی دووەمی پێشکەوتن لە ژمارە ٦٥ و ٢١ جولای ١٩٢١دا مەجلیسی وەزاریی بەغداد ڕۆژی ١ جولای ١٩٢١ بۆ ئەوەی یاسای هەڵبژاردن، بخرێتە گۆڕ، بە نووسین پرسیاریان لە مەندووبی سامیی عێراق کرد. چونکە لە لایەن حکوومەتی بەریتانیاوە ئەمیر فەیسەڵ دەهێنرێت بۆ سەر تەختی شاهیی عێراق.

لە وەڵامدا مەندووبی سامی دەڵێت:

دەرکردنی یاسای هەڵبژاردن تەنیا لەبەر چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی قەزاکانی کوردی دواخراوە چونکە هەندێك لەوان پێوەندییان بە عێراقەوە (لا باش نەبووە) بەڵام ئەگەر کۆمەڵی وەزیرانی عێراق بەڵێن دەدەن کە ئەو یەکیەتییە یەکیەتیی کورد و عەرەب هیچ وەزنێکی بۆ دواڕۆژی کوردستان نەبێت، دەتوانن هاوکاری هەڵبژاردن ببن و یاسای هەڵبژاردن دەریکەن و مەجلیسی وزەرا بەبێ وەستان و بیانوو بڕیاریان دا کە ئەمیر فەیسەڵ بە مەلیکی عێراق بناسرێت.

لە پاش ئەم بڕیارە و بڵاوکردنەوەی لە لایەن مەندووبی سامی سێر پێرسی کۆکس و بە حاکمی سلێمانی گەیێنرا کە ئەم لیوایە حوڕ و سەربەستن بۆ هاوکار بوون و یان نەبوون لە هەڵبژاردندا و لە دواڕۆژدا هیچ دەخل و تەئسیرێك بەسەر ئەم لیوایەوە نابێت.

پێشکەوتن

و لە (مشكلة الموصل) یشدا لاپەڕە ١٥ تا ٢٠دا دەڵێت.

«..... حين أجرى إستفتاء لإنتخاب الأمير فيصل لملوكية العراق، وقد صوت أكثر أكراد الموصل وأربيل فى جانب إنتخابه على شرط الإدارة اللامركزية. وصوت أكراد كركوك ضده، وأما أكراد السليمانية فلم يشتركوا فى الإستفتاء»

مشكلة الموصل

ئینگلیزەکان: سەریان لێ شێوا. کوردیش باوەڕی پێیان نەمابوو. بەڵام ئەوان لە فێڵ و تەڵەکەی خۆیان دوا نەدەکەوتن. لە لایەکەوە بۆ عێراق حکوومەتیان دروست دەکرد، لە حیجازەوە مەلیکیان بۆ دەهێنا و لە لایەکی تریشەوە، فوویان دەکرد بە گەرووی کوردا و بە ناوی کوردەوە پەلاماری تەخت و تاجی عێراقیان دەدا بۆ مەرامە نهێنییەکەیان.

پارچەیەکی تر:

لەندەن ۹ ئەیلول: ئەستەمبوڵ

کوردەکان داوایان لە حکوومەتی ئەنقەرە کردووە بۆ جیابوونەوەی وڵاتی کورد، بەپێی ئەو حدوودەی کە حولەفا بۆیانی داناوە و ڕۆیشتنەوەی مەئموور و پیاوی تورك کە لە کوردستاندا هەن. داوای ئەو بەدەلی عەسکەرییەیشیان کرد کە حکوومەت لە کوردەکانی وەرگرتووە. لەگەڵ جیاکردنەوەی عەسکەری کورد، کە لە ناو ئۆردووی تورکدایە.

پێشکەوتن ژمارە ۷۵ و ۹ سێپتەمبەر ۱۹۲۱

جا نازانین ئینگلیز – حولەفا، لە عێراقەکەی خۆیدا چی بە کورد بەخشی تاوەکو نۆرەی تورکیا و کوردەکانی ئەوێ بێت. ئەمەیش بۆ ترساندنی حکوومەتی بەغدایە.

سەرەتای شۆڕش

لە زۆر جێگای یادینادا هێشتا شۆڕشەکەی ۱۹۱۹ لە کاردایە، دوایی نەهاتووە لە لاپەڕەکانی دوایدا (چیم دی) کارەساتە ڕوودراوەکان و ناوی حاکمە کوژراوەکانیان دەخوێننەوە، سەرۆکەکانی یادینان نامەکەی حکومداریان لە بیر نەچۆتەوە.

جا ئەوا ئینگلیزە کار نەزانەکان لە کوردستاندا دیسانەوە ئاگری شۆڕشیان خۆش کردەوە. چونکە لە هەموو لا و لە هەموو بابەتێکەوە کوردیان ڕەنجیدە کرد. کوردیش پشووی ئینگلیزی نەدەدا. داوای ئازادی و گەڕانەوەی حوکمداریان دەکرد. ئەوانیش، ئینگلیز، بە گێلی ڕای دەبوارد و خۆیان بە زۆردار دەزانی.

تاوەکو لە لایەن شێخ فەرەجی (بانی بنۆك)ەوە بە خزم و عەشیرەتیانەوە ڕێگەی سلێمانی – هەڵەبجەیان بەست. بانگی یاخیەتی و شۆڕشیان دا و ئەم نامەیە بۆ مێجەر سۆن نێررا و ئاگاداریان کرد:

«ئەو نامانەی کە لەمەوپێش بە ناوی لێژنە و کۆمەڵانەوە بۆتان نێرراوە و تا ئێستە بەبێ وەڵام مایەوە. زۆر بە پەلە و گورجی وەڵاممان دەوێت. چونکە

لەمەندە زیاتر ناتوانین چاوەڕێی بەجێهێنانی بەڵێنەکەتان بکەین، کە ئیستیقلالی کوردە و هێنانەوەی حوکمدار».

## سەرۆکی شۆڕش

مێجەر سۆن بە وەرگرتنی ئەم نامەیە کە بە هۆی کوێخا سەعدوونی بێستان سوورییەوە بۆی نێررابوو، زۆر توورە بوو. دەستبەجێ فەرمانی دا بەهێزی لیڤی لە ژێر فەرماندەی (جەنەراڵ ڤیتس گیڤن)دا بچن بۆ بانی بنۆك بیسووتێنن و شێخ فەرەج و هاوپایەکانی بگرن و بە کەلەپچەکراوی بیانهێنن بۆسلێمانی.

ماوەی دە ڕۆژ زۆر بە گەرمی جەنگی ئینگلیز – کورد بوو، بەلام کورد بە کورد کوشتدان ڕووی دا. نزیکەی دە فرۆکە (طیارة) لە چیاکانی هەورامانەوە بە گوللەی تفەنگی کورد خرایە خوارەوە و سووتا.

فەرماندەکەیان (ڤیتس گیڤن) کوژرا. لاشەکەی بە شانی، حەمەی قالەی پیرۆت، سەربازی لیڤیی کوردەوە ڕزگار کرا. جەنگی (بانی بنۆك) لەسەر ئینگلیز و بە تایبەتی مێجەر سۆن زۆر گران کەوت و کورد پیشانی دا کە بیر و باوەڕەکەیان لە تۆپ و فرۆکەی ئینگلیز بەهێزترە.

ئەو ڕۆژەی ڤینس گیڤن کوژرا، شەو شێخ فەرەج هاتە سلێمانی. چۆنیەتیی جەنگەکەی بە تەواوی گێڕایەوە. وتی ئێمشەو سوپاکەیان دەگەڕێتەوە. داهێزراون و پەرێشان کراون. بەلام داخەکەم هەر لاوی کوردی تێدا چوو، لەگەڵ یەکێك لەوان.

چی پێویست بوو وەری گرت و گەڕایەوە بۆ (بانی بنۆك) هەر لە کاتی ئەو جەنگەدا لە گەڕانەوەدا لە سلێمانیش زۆر لە فرۆکەکان لە پێش نیشتنەوەدا دەکەوتن.

جا لە پاش گەڕانەوەی لیڤییەکە، بە شەو فرۆکە دەچوو بۆمبابارانی چیاکانی دەکرد. دەیانوت خوشکی ڤیتس گیڤنە دێت بۆ ساندنی تۆڵەی براکەی.

## هەمەوەند و جەباری

بەدوای جەنگی شارەزوور – بانی بنۆکدا، لە بازیان و چەمچەماڵیشدا بزووتنەوە ڕووی دا. (مەحموود خدر کە لە باوی عوسمانییەکاندا، فەرماندەی ژاندەرمە (مدیری) پۆلیس بوو لە مووسڵ و لە کاروباری عەسکەریدا ئاگادار بوو و لە سەرۆك عەشیرەتەکانی هەمەوەند و هەرگیز ملیان بۆ عوسمانی – تورك کەچ نەکرد). ڕێگەی سلێمانی – کەرکووك لە کاروان و میری بڕرا و توانای گوزەریان نەما.

شۆڕش بەستی پێ کرد، ئینگلیزەکانی کەرکووك و لە سلێمانی مێجەر سۆن کەوتنە سەخڵەتی. مێجەر سۆن بە لاسایی تورکەکان دەستەی ئیستر سواری دامەزراند. ئیستری ولاغداری

سلێمانی کە زۆر لە قەتاری ئێستری تێدا بوو، کۆی کردەوە و سەربازی پیادەی لیڤی کرد بە ئێستر سوار، ناردنی بە شوێن مەحموود خدرا بیگرن و بە دەست بەستراوی لەگەڵ سەید محەمەدی جەباریدا بیانهێنن.

ڕۆژ باری لیڤی نەبوو، ئێستری بێ لغاوی باری وەکو ئێستر سواری عوسمانییەکان ئامادە نەبوو. لە دەربەندی بازیان بەرەنگاری شۆڕشگێڕان بوون، شپرزە کران، زۆریان لێ کوژرا. لە گیان لەناوبردندا ئینگلیز زیانی نەدەکرد. هەردوولا کورد بوون، لاوی کورد دەکوژرا. ئینگلیزیش تەماشاکەر.

ماوەیەکی زۆر ئینگلیزەکانیان تەنگاو کرد. کەپتان بۆند حاکمی چەمچەماڵ لە ئەستەمبوڵ ژیابوو تورکیی زۆر باش دەزانی. زۆر چەتوون و تووڕە بوو. زانی چارەی ئەم گێژاوەیان بێ ناکرێت. مەحموود خدری بینی، زۆر شتی بۆ جێبەجێ کرد. لە پاش پێکهاتن، بە مەحموود خدری وت: حکوومەت لە بەندییەکەت خۆش بوو بەڵام پێویستە کە دەبێت (دە هەزار) ڕووپیە بدەیت. ئەم سزایە لە لایەن مەندووبی سامییەوە بڕیار دراوە.

سوپاسی کرد. چووە ژوورەوە لێفەیەکی شڕی بۆ هێنا. وتی:

جەنابی حاکم، ئەم لێفەیە بنێرە بۆ لەندەن بیکەن بە بانك نۆتی دە ڕووپیەیی. چەندتان گەرەکە وەری گرن و ئەوی تریش بنێرنەوە بۆخۆم.

تێ گەیشت کە دەرهەقەتی نایەت بەجێی هێشت.

مەحموود خدر پیر بوو، سەید محەمەد جەباری لە شۆڕشدا مایەوە و [لەگەڵ] کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، کە خۆشەویستی حوکمدارە، بوو بە هاوڕێ و حکوومەتیان ئاڵۆزاند.

لە سەنگاو و قەرەداغ

شێخان و کوێخایان هەردوو ناحیەکەیان بە حکوومەت چۆڵ کرد.

لە هەڵەبجە

لە شەمێران، حەمەی سان ئەحمەد پەلاماری حکوومەتی دا تا خانەقین و هەڵەبجەی بە حکوومەت بەجێ هێشت.

لە لایەکەوە کۆمەڵەکان بە بەیاننامە و ئاژاوەی ناو شار و لە لایەکی تریشەوە، چەکدارەکانی دەرەوەی سلێمانی کەوتنە بزووتنەوەیەکی وا کە ئینگلیزەکان هەموو ڕێگە و بیریان لێ تێك چووبوو، بە هەموو لایەکدا لە هەڵەی ئاسوودەییدا دەچەوسانەوە، بەڵام بێ سوود بوو، کار بەرەو شۆڕش دەڕۆیشت.

**ئوێز دەمیر**

لە زابتەکانی عوسمانی عەلی شەفیق چەرکەسی – میسری. بە ناوی ئوێز دەمیر – ناوەوە، بە هیوای وەرگرتنەوەی ولایەتی[مووسڵ] بە ٣٠ سەربازی تورکەوە لە وێنەی چەتەگەریدا گەیشتە (کانییە ڕەش).

ئومێدی ئوێز دەمیر لەشکری کورد و چەکەکەیشی چاو و ڕاوی ئاینی ئیسلام بوو. تورکەکان دەیانزانی کە کورد بە ناوی ئیسلامییەتەوە بە ئاسانی کەڵەمە دەکرێن و هەر بەو ناوەوە دوارۆژی خۆیان، ئازادی و سەربەستییان لە پێناوی – تورك، ئێران، عەرەبدا بەخت کرد و دۆڕاند تا بێ ناو و نیشان مانەوە. ئەوانیش تورکەکان هەر بەو ناوەوە بە کوشتن پاداشتی چاکەیان دایەوە.

ئوێز دەمیر بۆ ڕزگارکردنی مووسڵ لە چنگی ئینگلیز گەیشتە ناو کوردی عێراق. عەشایری ڕانیە و ڕەواندز ئاوێتەی بوون، غەفوور خان لە سەرۆکە عەشایری ئاکۆ چوو بە پیریانەوە و لە ڕانیەوە گەیاندنیە کۆیە و عەباس ئاغای مەحموود ئاغای پشدەریش کە ناحەزی ئینگلیز بوو ئەویش دایە کۆمەکیان. خەوەکەی ئوێز دەمیر تا ئێرە هاتە دی ١- ئیسلامێتی ٢-لەشکری کورد.

لە پلەی یەکەمدا. درۆ و فڕ و فێڵی ئینگلیزەکان زۆر زۆر کاریگەر بوو بۆ کۆمەکی کوردەکان بۆ ئوێز دەمیر. ئەو مافەی لە (سیڤەر) درابوو بە کورد هەرگیز لە لایەن ئینگلیزەکانەوە نەدەهاتە کایە. کوردیش پەنایەکی نەبوو دەردی خۆی تێ گەیەنێت. تەنیا چەکەکەی بوو کە بە هەموو جۆرێك بۆ خرابەی ئینگلیز بەکار بهێنێت. ئوێزدەمیر شەو و ڕۆژ لەسەر بەرماڵی نوێژ بوو، کە بەلای کوردەوە زۆر پەسندە.

ئەوەی بوو بە هۆی نووشستیی ئینگلیز تەنیا قووتدانی مافی کورد نەبوو، زیاتر ڕشتنی تۆوی دووبەرەکییەکەی بوو. دەیویست کورد و عەرەب، برا لەگەڵ برا، عەشیرەت لەگەڵ عەشیرەت هەمیشە لە جەنگدابن. کەس بە کەسەوە نەنووسێت.

ئەوانەی بەلای ئینگلیزەکانەوە پیاو خراپ بوون دایانە کۆمەکی ئوێز دەمیر. پڕوپاگەندەی تورك گەیشتە شاری مووسڵ، هەولێر، کەرکووك، سلێمانی.

بە وردی، سەرزەنشت، پیاوە گەورەکانی بەریتانیا دەگرێتەوە، کە چۆن گەلێکی چەکداری، لە ئاشووبی جەنگی یەکەم ڕزگاربووی دایە دەست ئەو زابتە نەزانانەی لە سیاسەت بێ ئاگا، کە ببن بە هۆی کوژاننەوەی چرای بەختی تاج و تەختی بەریتانیا کە بە یاسای قەمچی و زاڵییەتیی سیاسەتیان، حوکمیان دەبرد بە ڕێگەوە و بەریتانیا دووچاری نووچێك دەبێت کە مێژووی خۆیان بزانێت باسی بکات.

## جەنگی دەربەندی ڕانیە

بـارەگـای حـاکـمـی سیـاسی (مـێجـەر ئـدمـۆنـدس) و سوپـای لـیڤـی و زابـتـە سیـاسی و عەسکەرییەکانی ئینگلیز لە دەربەندی ڕانیە لە ناو قەڵا کۆنەکەی حەمەد پاشای ڕەواندزا بوو، کە حوکمڕانیی قەڵادزە و ڕانیەیان دەکرد.

هیچ گومان نییە. کە سەرۆك عەشایر و عەشیرەتەکەیان وەکو هەموو کوردێك ئەوانیش ڕەنجیدە و دڵشکاو نەبووین لە کردەوەی ئینگلیزەکان.

لـە عـەشایری پشدەر، بـەرەی عـەبـاس ئـاغـای مـەحـموود ئـاغـا و عەشیرەتی مـەنگوڕ، ئـاکۆ، لەشکری زۆر بە نهێنی کۆ بۆوە و لە ناکاو چوار لایان گرتن. ئەوەی کوژراو بریندار بوو مایەوە، زۆریـان بەبێ چەك سەریـان دەرکرد و ئەوەی بە دەم جەنگەوە ویستی خۆی دەرکات تووشی مەرەزە و جۆگە ئـاو بوون، پەرێشان کران. بەڵام مێجەر ئدمۆندس و چەند زابتێکی ئینگلیز خۆیان گەیاندە دێی سەر خومە لای سوار ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی بڵباس کە بە یەکەمین دوژمنی خۆیان دەزانی. پاراستنی لە کوشتن، میوانداریێکی بەڕێزی کردن. ڕەوشتی کورد ئەمەیە هـاوڕێی لێقەوماو، دۆستی تەنگانەیە، با دوژمنیش بێت.

## کوشتنی بۆند حاکمی چەمچەماڵ و مێجەر ماکەنت

لە پاش مەحموود خدر، کەریم بەگی هەمەوەند و سەید محەمەدی جەباری ڕێگەی سلێمانی، کەرکوکیان بە تەواوی بەست. حکوومەت کەوتە سەختڵەتی و لە ڕق و بەرامبەر، بە بەدکاری ئینگلیزەکان کۆمەکیان ئێجگار زۆر بوو. کاپتان بۆند ویستی بە قسە کەریم بەگ بخەڵەتێنێ. پێی گەیاند، کە لە (مورتکە) لای فەقێ محەمەدی مودیری ناحیە، کە ئەویش هەمەوەندە یەکتر ببینن. بەڵام بۆ دووەم جار وای بە باش زانی کە لە بناری چیای هەنجیرە یەکدگیر ببن و بچن بۆ مورتکە. لە کاتی یەکدگیری و بەڕێوە چەند قسەیەکی ناشیرین بە کەریم بەگ دەڵێت، کە زۆر بـە گرانـی دەزانـێت. فـەرمـانـی کـوشتـنـی دان. کوشتیـانـن و هـەر لـەوێوە چوون بۆ ڕەواندز و ئەمانەیش دایانە کۆمەکی ئوێز دەمیر. بەڵام زۆر خۆش بوو کە تا دە ڕۆژیش لە دێهاتی سلێمـانیدا بە فرۆکە بۆیـان دەگەڕان و نزیکەی سەد چووغل، جاسووسیان بڵاوکردبۆوە. کەچی نەیاندەزانی کە چوون بۆ ڕەواندز.

## کاپتان کووك حاکمی ڕانیە

لەو کاتە ناسك و پڕ ئاشوویەدا، ئینگلیزەکان خۆیان گیری خراپە نەکردنیان پێ نەدەکرا. لە هەموو جێگایەك – بێجگە لە فرۆمایە و بێ سەرمایەی ڕەوشت و خووی باش، کەس نەمابوو دۆستیان بێت.

لە ڕانیە فەتاح بەگ کە لە خێزانێکی ناسراو و پیاوێکی ڕاست و بە قۆناغ بوو، هەمیشە خۆی لە جەنگە و خراپەی ئینگلیزەکان دەپاراست. حاکمی ڕانیە کاپتان کووك خۆشی نەدەویست ڕۆژێك بانگی دەکاتە سەرای و لە ژوورەکەی خۆیدا دەڵێت فەتاح بەگ وەرە شێر و خەت بکەین لەسەر دڵخوازی ڕووییەیەك هەڵدەدا. دەڵێت بزانە چییە؟ لەو کاتەدا کە دادەنوێنێتەوە. دوو دەمانچەی نا بە تەپڵی سەریەوە و کوشتی. بەڵام لەم پیاوکوژە پرسیارێك نەکرا، چونکە ئینگلیزە. سەرۆك عەشیرەتەکانی ڕانیە ئەم کردەوەیەیان بە کێویەتی زانی. ئەمانیش بوون بە هاوکار و بیری نوێ دەمین.

کۆمەڵەکان و خێزانی حوکمدار

عەشایرەکان هەموویان بوون بە هاوکاری و بیری کۆمەڵ لە هەموو لایەکی کوردستاندا تەقە دامەزرا و لەم کاتەدا خێزانی حوکمداریش گەیشتنەوە سەر ئاوەڕێژی عێراق – ئێران و لەناو کوردەکاندا.

لەلایەن کۆمەڵەکانەوە بە ناوی خێزانەکە (عایشەخان کچی نەقیب و خێزانی حوکمدار)ەوە نامەیەکیان نارد بۆ مێجەر سۆن، کە ڕێگایان بدرێت بۆ گەڕانەوەیان و لە لایەن خۆیشیانەوە نامەیەك نێررابوو.

١– بەو مەرجەی تێکەڵ بە هیچ ڕووداو و سیاسەتێك نەبن.

٢– لە داریکەلی وە یان لەو جێگایەی حکوومەت پیشانیان دەدا دانیشن.

٣– پێچەوانەی یاسای حکوومەت هیچ نەکەن.

لەسەر ئەم مادانە تەنیا بۆ گەڕانەوەی (حەپسەخانی نەقیب) فەرمانی دا و نێررا بۆ حەپسەخان (حفصة) و هاتەوە.

مێجەر سۆن خۆی ئەم کارەی پێ خۆش بوو. چونکە وایان دەزانی بە هاتنەوەی ئەوان، ئەم ئاگرەی کە لە کوردستاندا بڵێسەی ساندووە دادەمرێتەوە. پاش ماوەیەکی تریش بۆ هاتنەوەی هەموویان فەرمانی دا و لە (داریکەلی) دابنیشن. شۆڕش تەنییەوە، لە بادینانەوە تا خانەقین کورد بە ناوی جەنگی کورد و ئینگلیزەوە، کوردی دەکوشت چونکە سوپای لیڤی هەمووی کورد بوو، لە پێناوی سوودی ئینگلیزا بە کوشت دەچوون. ئینگلیزیش بە بۆمبای فڕۆکە دێهات و چیای کوردی دابێژا، ئاژەڵ ئەما هەمووی کوشت. بەڵام کارێك بەسەر ئینگلیز هات، بوون بە گاڵتەی منداڵان لە کۆڵانەکاندا دەستە دەستە بە گۆرانییەوە ئەم بەزمەیان دەگێڕا:

تەیارە بە فیلو دەگەڕێت سامە دەینوێنێ
تا خەڵقی نەڵێن عەسکەری ئینگلیزە شکاوە

٢٠ حوزەیران ١٩٢٢

بۆ گەڕانەوەی ویلایەتی مووسڵ بۆ تورك، چاو و ڕاو، پڕوپاگەندە گەیشتە ئەو پایەیە ئینگلیزەکانی وڕ کردبوو، بە تایبەتی لە لیوای سلێمانیدا جێگەیەك نەما کە تۆزێك دەسەڵاتی حکوومەتی تێدا بێت، لە دەرەوە عەشایر و چەکدار و لە ناو شارییەکاندا بە هەڕەشە و نامە نووسین تەنگیان بە حکوومەت و بە تایبەتی بە مێجەر سۆن هەڵچنی.

سەرەڕای چەکدار باوی دەروێشی و تەپڵ و دەفیش لە کارا بوو. بەڕاستی دەروێش ئینگلیزەکانی حەپەساندبوو و زۆر جێی باوەڕە کە دەروێش لە چەکدار زیاتر بوون بە هۆی ڕووخاندنی قەڵای هیوای ئینگلیز.

ڕۆژ بە دوای ڕۆژا بۆ تواندنەوەی سیاسەتی ئینگلیزەکان کە لە ڕوودا بوو، زۆر جار ئەگەر زابتێك لە سەربازێکی لیڤی توورە ببوایە. یان فەرمانی گرانی بدایە، لە جیاتی بەجێهێنانی فەرمانەکەی دەستی دەکرد بە خواردنی شتومەکی سەر مێزەکەی. کەم و زۆر نەڕێزی یاسای عەسکەری و نە مەئمووڕانی تر نەما. ئەوەیش سەیر بوو، کەم و زۆر ئینگلیزەکان نەیاندەوێرا پەنجە بکێشنە ناو کاری دەروێشی چونکە لە خریویکی ئاینی زۆر دەترسان.

ئینگلیزەکان بۆیان ڕوون بۆوە کە ئەم کارە گەورە و ڕێکوپێکانە لە ژێر پەردە و پیلانگێڕێکی دانا و ڕێکوپێکدا بەڕێوە دەبرێت لەبەر ئەوە هەر بە تەماشاکردن و خوێن ساردی ڕایان دەبوارد، چاوەڕێی دوای کاریان دەکرد. بەڵام زۆر تەنگاو کران. ویستیان سیاسەت بگۆڕن و بڕیاریان دا کە شێخ مەحموود بهێننە کوێت، ئەم باسەیان بڵاوکردەوە.

### شێخ مەحموود هێنرایە کوێت

لە لاپەڕەکانی ڕابووردوودا، گوزارش و هەڵسووڕانی کۆمەڵەکانتان خوێندەوە کە بەدوای، کرنگاری چەکدارەکاندا، باوی دەروێشی چۆن کەوتە کایەوە. کۆمەڵەکان یەکە یەکە بەبێ یەکترناسین لە کارا بوون. سەیر ئەوە بوو نەزانرا لە کوێوە و کێ و چۆن ئەو دەستە بەهێزە بۆ ڕووخاندنی سۆن و حکوومەتەکەی لە کارایە. لە دەروێشە باوڕ پێکراوەکانی ئینگلیزیش بە بادانەوە [سەر] خوێنی نەتەوایەتییانەوە لەم کۆڕ و کایەدا کەوتوونە کار چونکە کار زۆر بەنهێنی و پەنهانی دەڕۆیشت.

نامەیەکی بچووك، لە کۆمەڵی پزیشك بۆ مێجەر سون، وێنەیش بۆ مەندووبی سامی:

«ئێوە بە میوان دەزانین. کورد لای شوورەییە وەزنگی بۆ میوان بێت. بەڵام چاکیی ئێوە لەوەدایە حوکمدار بهێننەوە، لە هەموو تەنگە و چەڵەمەیەك ڕزگارتان دەکات».

ئیتر ئینگلیزەکان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بڵاویان کردەوە کە شێخ مەحموود گەیشتە کوێت و حیانوت: ڕەنگە حکوومەتی فەخیمەی بەریتانیا بەم زووانە بیەوێت بیهێنێتەوە بۆ سلێمانی.

تەلگرافی جەژنە پیرۆزە بۆ حوکمدار

چووم بۆ پۆستەخانە، ڕەشید جەودەت لای عیزەتی تەل دانیشتبوو. لە پڕ وتی: بۆچی هاتوویت، تەل دەنووسیت؟ وتم بەڵێ تەل بۆ شێخ مەحموود دەنووسم: بە پێکەنینەوە کاغەزێکی خستە بەر دەستم وتی فەرموو بنووسە. نووسیم پارەکەیم دا ئیتر وتیان بچۆ لە ناو شارا بڵاوی بکەرەوە، وا دیار بوو کە خۆشیان نووسیبوویان.

لە ماوەی دوو ڕۆژا پتر لە سێ بەشی سلێمانی تەلی بۆ کوێت نووسی. نەزانرا مێجەر سۆن لەم بابەتەوە بیری چۆنە. بەڵام وەکو لافاو تەل دەڕۆیشت. سۆن یان نەیتوانی، یانیش نەیویست، بەربەستی بکات. چونکە کار لە کار ترازابوو و ئێجگاری ئاڵۆزا و کاری لە دەستدا پچڕا. بێگومان ئینگلیزەکان نەیاندەتوانی ئەم شەپۆلانە لە مەندوویی سامی بشارنەوە.

لە پادینانەوە تا خانەقین چەکدار و دەروێش داگیری کرد و بەیەك زمان دەوترا «ئازادی یان ڕۆیشتنی ئینگلیز»، ڕێگا و بان لە ئینگلیز بەسترا، دەستدرێژییان پێ نەدەکرا، لە شۆڕش و گیانیان ئێجگار زۆر دەترسان.

ئەمجارەیش شێرەکەی وڵسن بەزی. کاری لێ تێك چوو با ئەوەیش بڵێین مێجەر سۆن ئارەزووی بەرزکردنەوەی زمانی کوردیی دەکرد، چەند نووسراوێکی دەستنووسی خۆی زۆر بە نرخی بە کوردی بەجێ هێشت. لە زمانی کوردی بە زۆر شێوە و لە هەورامی و فارسی زۆر شارەزا بوو. بەڵام زۆرداریيەکەی لە چاکەی پترتر بوو و باش تێ گەیشتن کە کوردستان بەبێ شێخ مەحموود و شێخ مەحموودیش بەبێ ئازادیی کورد، کوردستانیان بۆ ساخ نابێتەوە.

مێجەر سۆن چوو بۆ بەغداد، لەگەڵ حکوومەتەکەیدا گفتوگۆی کرد. پاش نزیکەی دە ڕۆژ گەڕایەوە بۆ سلێمانی، بە فڕۆکە لەگەڵ خۆی (مێجەر گۆلدسمیت) ناوی هێنا و سلێمانیی پڕ لە ئاشووب و شێواوی، دایە دەست.

بەدکاریی ئەو زابتە سیاسیيانە بوو بە هۆی کوشتنی زۆر زابت و مەئموورانی ئینگلیز لە کوردستاندا. دوور نییە ئەوەی ئەم کوژراوانە لە تۆڵەی باوکیاندا کارێك نەکەن کە ببێ بە هۆی وریاکردنەوەی ئەو زاڵ و ملۆزمانەی، کە مافی یەکێك و یان گەلێك، دەخەنە ژێر پێ و بەدکاریی ئینگلیز، بەرامبەر بە کورد لە ئاوێنەی مێژووی بەریتانیادا پیشان ئەدەن.

گۆلد سمیت

حاکمی سیاسیی تازه له جێگەی مێجەر سۆن دەستی کرد بە پێکهێنانی کاروباری سلێمانی. پیاوێکی لەسەرخۆ و بە کارزان بینرا بەلام هاتبووە جێگەی پیاوێکی خراپ. گۆلد سمیت، لە پاش دوو ڕۆژ کۆمەڵێ بەڕێوەبەری کۆ کردەوە کەوتە پرس و بیر وەرگرتن، ئەو پیاوانەی لەم کۆمەڵەدا بوون ئەمانەن کە کۆمەڵی پیرانی شارن:

١- عەبدولفەتاح چەلەبی

٢- حاجی سەعید ئاغا

٣- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا

٤- حەمەد بەگی فەتاح بەگی بابان

٥- عەزمی بەگی بابان

بێجگە لەم کۆمەڵەیش، لەگەڵ زۆر چینی تری شاری سلێمانی لە کارەسات و چۆنیەتیی کار دوان. تێ گەیشت و تێ گەیێنرا کە ئەم شۆڕش و ئاشوویە بە شێخ مەحموود نەبێت چارە ناکرێت چونکە سیاسەت و پروپاگەندەی نوێز دەمیر لە بادینانەوە تا سلێمانی پەرەی سەند، لە هەموو لایەکەوە چەکداری کورد دەستدارە و حکوومەت بێدەست. دەروێشی، سیاسەتی ئینگلیزەکانی بە جارێك لە ناو برد. جا وا تێ گەیێنرا کە تاوەکو، وەکو مێجەر سۆن، کوردستانە دروست نەکراوەکە بەجێ نەهێڵن، پێویستە شێخ مەحموود بێتەوە و ئازادیی کورد بدرێت و کورد و ئینگلیز بە دۆستی بژین.

مێجەر گۆلد سمیت، ماوەی وەلامی دەدا، هاونشینیی دەکرد، لە پرسیار چەکەرەی نەدەکرد و دەیزانی ئەو ڕۆژە نییە ئەمیش هەر بە ئینگلیزییەتی بەڕێوە بچێت.

خوێندەواری خۆشەویست: لە پێناوی لەگامی و کار نەزانیندا ئەم زابتە سیاسییانە خۆیان بە کوشت دا وەیان بە کوشت دران.

ئەم کوشتارە بێجگە لە لیوای سلێمانییە.

١- لە هەولێر: موعاونی حاکمی سیاسی و مودیری پۆلیسی هەولێر لە بەر دەرگای تیاترۆدا حاجی سەعید ئاغا کوشتی.

٢- لە مووسڵ: ١- کۆلۆنێل لچمەن حاکمی سیاسی مووسڵ، لە خان زاری کوژرا. ٢- بێل مەعاونی حاکمی سیاسی لە مووسڵ کوژرا.

٣ - لە زاخۆ: ١- کاپتان وکر.٢- پیر سون. ٣- بارسن، لە جەنگدا کوژران. ٤- ویکلی.

٤- لە ئامێدی: ١- کاپتان ویلی. ٢- کاپتان ماك دۆناڵد.

٥- له عهقره: ١- کاپتان سکۆت.

٦- مزوورکی ئامێدی: ١- کاپتان لویس. ٢- مێجهر شبرد. ٣- لیفتننت روس.

ئهم زابته بهدبهختانه بوون، که بهریتانیای گهوره، سیاسهتی کوردستانی پێ سپاردبوون. کورد به هیوای بهریتانیا بوو که حکومهتێکیان بۆ دروست بکات، ئهویش کوردستانی کردبوو به قوتابخانهی زابتهکانی فێری سیاسهتیان بکات، بهڕاستی دهرسی وهرگرت. هیچ دوور نییه ئهم کارهساتهی ئینگلیز له کوردستاندا بینی، ئهو گیان بهختکردنهی له ڕێگهی ئازادیدا کورد بهزانێت بهختی بکات، له مێژووی تازهی بهریتانیادا نهنووسرێت و ببێت به مایهی شهرمهزارییان بهرامبهر به نهوهی تازهیان.

گۆلد سمیت، به ژیرانه کهوته خوار و ژووری گهل و لاوانهوهی کاربهدهستان، بهڵام کۆمهڵهکان وریا بوون. به یهك دوو نامهی سهخت وریایان کردهوه، تێیان گهیاند، که ڕێگای ڕاستیی ڕزگاری له شۆڕش و دهروێش، دانی ئازادی و گهڕانهوهی شێخ مهحموودهوه.

له ههموو کوردستاندا تهنیا ڕۆژنامهکهی پێشکهوتنی مێجهر سۆن ههبوو، که ئهمهیش لهو ڕۆژنامانه نهبوو دادی کورد بدات. جا ههلێکی باش بوو بۆ داوا کردنی ڕۆژنامهیهکی باشی له حکوومهت دوور.

حاجی مستهفا پاشا، له باوی عوسمانییهکاندا و کاتی شۆڕشهکهی کهمالییهکاندا، میر لیوای ئهرکانی حهرب و ڕهئیسی مهجلیسی عورفیی عهسکهری بوو، له ئهستهمبوڵ بڕیاری خنکاندنی مستهفا کهمال پاشای دهرکردبوو و له کاتی گرتنی ئهستهمبوڵدا له لایهن کهمالییهکانهوه له ترساندا ئهو خۆی دهرباز کرد و هاتهوه بۆ نیشتمانهکهی خۆی، شاری سلێمانی. له تورکیای تازهدا به (نهمرود) ناو دهبرێت. ئهم ههلهی به باش زانی، داوای دهرهێنانی ڕۆژنامهیهکی سیاسیی له گۆلد سمیت کرد، زۆر به ئاسانی ڕێگهی پاشای دا بۆ ڕۆژنامهیهکی تازهی سیاسی له جێگای پێشکهوتن و داخرا.

له ڕۆژی ٢١ تهمووز ١٩٢٢دا له مزگهوتی سهید حهسهن له لایهن پاشاوه کۆبوونهوهیهك کرا بۆ ههڵبژاردنی بهڕێوهبردنی ڕۆژنامهکه و کۆبووهکانیش ٢٤ کهس بوون و ١٣ کهسیان لێ ههڵبژێررا. ئهوا له خوارهوه ناو و چهندیهتیی دهنگیان دهخوێنینهوه:

---

• ثورتنا فی الشمال – مامۆستا (غلامی).

| ناو | له ۱۰۰ نمرهدا |
|---|---|
| رهفیق حیلمی | ٦٥ |
| ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ | ٦٢ |
| ساڵح ئەفەندیی قەفتان | ٥٤ |
| فائق بەگی مارف بەگ | ٤٥ |
| ئاغا فەتحوڵڵا | ٤١ |
| عیزەت بەگی وەسمان پاشا | ٣٩ |
| ئەدهەم ئەفەندی | ٣٨ |
| ئەحمەد بەهجەت | ٣٦ |
| شێخ محەمەدی گوڵانی | ٣٢ |
| شێخ عەلی سەرکار | ٣١ |
| عەلی ئەفەندیی باپیر ئاغا | ٢٩ |
| عەبدوڵڵا ناجی | ٢٤ |
| شوکری ئەفەندیی عەلەکە | ٢٤ |

مامۆستا رەفیق حیلمی لەوەپێش، نووسەری رۆژنامەی (نجمة) بوو لە کەرکوك. بە زمانی تورکی زنجیرەی نووسینی (شەرق ناپلیۆنی، مستەفا کەمال)ی دەنووسی. حاجی مستەفا پاشا لەم زنجیرەیە زۆر دڵگیر بوو و زۆری پێ ناخۆش بوو. لەو کاتەدا کورد و ئینگلیزیش زۆر ناحەزی تورك بوون. بۆ ئەوەی رەفیق حیلمی لەو نووسینە دوور بخاتەوە هێنایە سلێمانی و پاشا لەگەڵ خۆی تێکەڵ بە کاروبار و بەڕێوەبردنی رۆژنامەکەی خۆی کرد.

رۆژنامەکە بە ناوی (بانگ کوردستان)ەوە فەرمانی دەرهاتنی درا. ئەمیش حەفتەیی بوو. بێجگە لە ژمارەی یەکەمی، نووسراوەکانی ئەمیش بەلای کۆمەڵەکانەوە پەسند نەدەکرا و باسەکان بە پێی کات نەدەنووسرا و نەچووە ژێر پرۆگرامی کۆمەڵەکان.

رۆژنامەی بانگی کوردستان، گەیشتە هەندەران. زابت و ئاوارەکانی کورد بۆ گەڕانەوەیان بۆ نیشتمانیان داوای یارمەتییان دەکرد، یەکەمین نامە لەلایەن ئەم کەسانەوە هات و لە رۆژنامەکەدا بڵاوکرایەوە:

١- بینباشی ئەمین زەکی، کە لە عێراقدا گەیشتە پایەی وەزیری.

٢- بینباشی ئەرکانی حەرب، مستەفا کامیل.

٣- یوزباشی زەهاوی زادە.

٤- نوری سابت.

٥- دکتۆر ئیبراهیم ئالووسی.

نامەکە لە ڕۆژی ١١ تەمووز ١٩٢٢، لە ئەستەمبوڵەوە نووسراو و نێرراوە و لە بانگی کوردستان ژمارە ٤ و ڕۆژ ٢٨ ئاغستوسدا بڵاوکرابۆوە.

لە نامەکەدا دەڵێن: زۆر عەرەب و کوردی پەرێشان لە تورکیادا ماوەتەوە، کە ئەمانە پشەرۆکی جەنگی یەکەم و بەبێ ئیش و کار و بە پەرێشانی دەژین. داوای یارمەتییان بۆ حکەن، کە بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانکەیان و بە جیایش نامەیان بۆ مەندووبی سامیی عێراقیش نووسیبوو.

ئینگلیزەکان نەیاندەویست لە کوردستاندا خوێندن هەبێت و خوێندەوار بمێنێت. ماوەی کردنەوەی قوتابخانەیان نەدەدا ئیتر چۆن دڵی بەو ئاوارە خوێندەوار و زانایانە دەسووتا، کە لە تورکیاوە بیانهێننەوە بۆ وێزەی گیانی خۆی.

باوی دەروێشی و هێزی چەکدار: بە تەواوی تەنگی بە ئینگلیز هەڵچنی زەوییان بوو بە کوانووی ئاگر. کورسی و تەختیان پێ لەق کرا. لە هەموو لایەکەوە وەکو باران نامە بەسەر ئینگلیزەکاندا دەڕژا، بۆ:

١- هێنانەوەی حوکمدار

٢- بەجێهێنانی بەڵێنەکانیان کە ئازادیی کوردە.

زۆر تر لەوە زەندەقیان چوو و تێ گەیشتن، کە دەست و یەکیەتییەکی بەهێزە ئەم پرۆگرام و پیلانە بەڕێوە دەبات، کە لە هەموو شار و قەزاکانی. ئینگلیزی لێ هەیە و لە جێگا دوور و پەناکانیشەوە وەکو یەك نووسراو نامەکانیان بۆ دێت و پێیان دەگات. حەپەسابوون، بە کوشتن و ڕۆیشتن، یان دانی ماف هەڕەشەیان لێ دەکرا.

تەلگرافی گۆلد سمیت

لە ناکاو، لە ڕۆژنامەی بانگی کوردستاندا لە لایەن حاکمی سیاسیی سلێمانییەوە لە ژمارە ٥ و ڕۆژ ٤ ئەیلوول ١٩٢٢و ٩ موحەڕەم ١٣٤١دا ئەم باسە بڵاوکرایەوە:

لە بابەت دامەزراندنی کاری کوردستانەوە لە مێژەوە حاکمی سیاسیی سلێمانی، لەگەڵ مەندووبی سامی، ئەویش لەگەڵ لەندەن خەریکن، ئەوا ئێستە ڕێگا درا بە حاکمی سیاسی مێجەر گۆلد سمیت.

ئەوا بڵاوکرایەوە، بۆ ئەوەی بەم زووانە بۆ دروستکردنی حکومەتێکی کوردستان بڕیار بدرێت، بە هەموو دانیشتوانی سلێمانی و بە هەموو جێگایەکدا بگەیێنرێت

که بیری خۆیان پیشان بدەن چونکە مەندوویی سامی لەگەڵ لەندەن خەریکی ڕێکخستنی ئەم پێویستەیە و بۆ هاتنەوەی شێخ مەحموود و شێخ محەمەد غەریب لە کوێتەوە بۆ بەغداد لە لایەن حکوومەتی بەریتانیای گەورەوە ڕێگە دراوە.

گۆڵد سمیت

حاکمی سیاسیی سلێمانی

شێخ قادریشیان، لە هیندستانەوە گەیاندەوە بەغداد – داریکەلی و هاتەوە بۆ سلێمانی، ژن و پیاو و منداڵی سلێمانی تا دێی (کانی گۆمە) چوون بە پیریەوە و بە هەردوو لای شەقامدا وەستاو و بە درێژیی ڕێگا گوڵ باران کرا تا گەیشتەوە ناو شار.

۱ ئەیلوول ۱۹۲۲ – کاتژمێر (۱) پاش نیوەڕۆ.

حاکمی سیاسی، لە بەیانەکەیدا کە بڵاوی کردەوە دەڵێت: (پێویستە بیری خۆیان پیشان بدەن) ئەی ئەو شۆڕش و پشێوییە و کوشتارە بۆ چییە؟

ئەو هەموو نامە و هاوارە کێ دەیکات و لە کێی دەبیستن؟ ئایا هەر کورد نییە بۆ ئازادی بۆ سەربەخۆیی؟ گەل داوا دەکات، ئینگلیز نایدات و دەبێت هەر ئینگلیزیش بیدات، ئەگەر لە قسە و ژوانیاندا ڕاست بن. بەڵام لە چاو و ڕاو زیاتر نەبوو، تەنیا پەرێشانی بوو بەشی کورد.

ئینگلیز سلێمانیی بەجێ هێشت

بە گەیشتنی شێخ قادر لە ناو سلێمانیدا ئاگری ئاشووب دامرایەوە، ئینگلیزەکان ترسیان نەما، بەڵام بەبێ وچان کۆمەڵەکان لەو دیو پەردەوە خەریکی کاری نهێنی بوون. پاش چوار ڕۆژ هاتنەوەی شێخ قادر، لەپڕ لە سلێمانیدا بانگی سەربەستی و ئیستیقلال درا. شاری و عەشایر تێکەڵ بوون شار و وڵات لەو شارە نەدەچوو کە مێجەر سۆن دەستداریی تێدا دەکرد.

ڕۆژی ٤ ئەیلول شەش فڕۆکەی گەورە هاتە سلێمانی و نیشتەوە، ئیتر نە ئینگلیز لە ناو شارا بینراو نە کەس دەیزانی ئەم فڕۆکانە بۆچی هاتوون.

ڕۆژی ٥ ئەیلول لە پێش گزنگدا گۆڵد سمیت و هەموو ئینگلیزەکان چوونە فڕۆکەخانە و بە شێخ قادریان گەیاند کە لەگەڵ لیژنەیەك بچێت بۆ لایان. لەسەر ئەو داوایە، لەگەڵ ئەم ناوانەی ژێرەوە گەیشتنە لای گۆڵد سمیت:

۱– شێخ قادر.

۲–حاجی مستەفا پاشا.

٥- دکتۆر ئیبراهیم ئالووسی.

نامەکە لە ڕۆژی ١١ تەمووز ١٩٢٢، لە ئەستەمبوڵەوە نووسراو و نێرراوە و لە بانگی کوردستان ژمارە ٤ و ڕۆژ ٢٨ ئاغستوسدا بڵاوکرابۆوە.

لە نامەکەدا دەڵێن: زۆر عەرەب و کوردی پەرێشان لە تورکیادا ماونەتەوە، کە ئەمانە پاشەرۆکی جەنگی یەکەم و بەبێ ئیش و کار و بە پەرێشانی دەژین. داوای یارمەتییان بۆ دەکەن، کە بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانەکەیان و بە جیایش نامەیان بۆ مەندووبی سامیی عێراقیش نووسیبوو.

ئینگلیزەکان نەیاندەویست لە کوردستاندا خوێندن هەبێت و خوێندەوار بمێنێت. ماوەی کردنەوەی قوتابخانەیان نەدەدا ئیتر چۆن دڵی بەو ئاوارە خوێندەوار و زانایانە دەسووتا، کە لە تورکیاوە بیانهێننەوە بۆ ویژەی گیانی خۆی.

باوی دەروێشی و هێزی چەکدار: بە تەواوی تەنگی بە ئینگلیز هەڵچنی زەوییان بوو بە کوانووی ئاگر. کورسی و تەختیان پێ لەق کرا. لە هەموو لایەکەوە وەکو باران نامە بەسەر ئینگلیزەکاندا دەڕژا، بۆ:

١- هێنانەوەی حوکمدار

٢- بەجێهێنانی بەڵێنەکانیان کە ئازادیی کوردە.

زۆر تر لەوە زەندەقیان چوو و تێ گەیشتن، کە دەست و یەکیەتییەکی بەهێزە ئەم پرۆگرام و پیلانە بەڕێوە دەبات، کە لە هەموو شار و قەزاکانی ئینگلیزی لێ هەیە و لە جێگا دوور و پەناکانیشەوە وەکو یەك نووسراو نامەکانیان بۆ دێت و پێیان دەگات. حەپەسابوون، بە کوشتن و ڕۆیشتن، یان دانی ماف هەڕەشەیان لێ دەکرا.

تەلگرافی گۆلد سمیت

لە ناکاو، لە ڕۆژنامەی بانگی کوردستاندا لە لایەن حاکمی سیاسیی سلێمانییەوە لە ژمارە ٥ و ڕۆژ ٤ ئەیلوول ١٩٢٢و ٩ موحەڕەم ١٣٤١دا ئەم باسە بڵاوکرایەوە:

لە بابەت دامەزراندنی کاری کوردستانەوە، لە مێژەوە حاکمی سیاسیی سلێمانی، لەگەڵ مەندووبی سامی، ئەویش لەگەڵ لەندەن خەریکن، ئەوا ئێستە ڕێگا درا بە حاکمی سیاسی مێجەر گۆلد سمیت.

ئەوا بڵاوکرایەوە، بۆ ئەوەی بەم زووانە بۆ دروستکردنی حکومەتێکی کوردستان بڕیار بدرێت، بە هەموو دانیشتوانی سلێمانی و بە هەموو جێگایەکدا بگەیێنرێت

که بیری خۆیان پیشان بدەن چونکە مەندوویی سامی لەگەڵ لەندەن خەریکی ڕێکخستنی ئەم پێویستەیە و بۆ هاتنەوەی شێخ مەحموود و شێخ محەمەد غەریب لە کوێتەوە بۆ بەغداد لە لایەن حکوومەتی بەریتانیای گەورەوە ڕێگە دراوە.

گۆلد سمیت

حاکمی سیاسیی سلێمانی

شێخ قادریشیان، لە هیندستانەوە گەیاندەوە بەغداد – داریکەلی و هاتەوە بۆ سلێمانی، ژن و پیاو و منالّی سلێمانی تا دێی (کانی گۆمە) چوون بە پیریەوە و بە هەردوو لای شەقامدا وەستاو و بە درێژیی ڕێگا گوڵ باران کرا تا گەیشتەوە ناو شار.

١ ئەیلوول ١٩٢٢ – کاتژمێر (١) پاش نیوەڕۆ.

حاکمی سیاسی، لە بەیانەکەیدا کە بڵاوی کردەوە دەڵێت: (پێویستە بیری خۆیان پیشان بدەن) ئەی ئەو شۆڕش و پشێوییە و کوشتارە بۆ چییە؟

ئەو هەموو نامە و هاوارە کێ دەیکات و لە کێی دەبیستن؟ ئایا هەر کورد نییە بۆ ئازادی بۆ سەربەخۆیی؟ گەل داوا دەکات، ئینگلیز نایدات و دەبێت هەر ئینگلیزیش بیدات، ئەگەر لە قسە و ژوانیاندا ڕاست بن. بەڵام لە چاو و ڕاو زیاتر نەبوو، تەنیا پەرێشانی بوو بەشی کورد.

ئینگلیز سلێمانیی بەجێ هێشت

بە گەیشتنی شێخ قادر لە ناو سلێمانیدا ئاگری ئاشووب دامرایەوە، ئینگلیزەکان ترسیان نەما، بەڵام بەبێ وچان کۆمەڵەکان لەو دیو پەردەوە خەریکی کاری نهێنی بوون. پاش چوار ڕۆژ هاتنەوەی شێخ قادر، لەپڕ لە سلێمانیدا بانگی سەربەستی و ئیستیقلال درا. شاری و عەشایر تێکەڵ بوون شار و وڵات لەو شارە نەدەچوو کە مێجەر سۆن دەستداریی تێدا دەکرد.

ڕۆژی ٤ ئەیلول شەش فڕۆکەی گەورە هاتە سلێمانی و نیشتەوە، ئیتر نە ئینگلیز لە ناو شارا بینراو نە کەس دەیزانی ئەم فڕۆکانە بۆچی هاتوون.

ڕۆژی ٥ ئەیلول لە پێش گزنگدا گۆلد سمیت و هەموو ئینگلیزەکان چوونە فڕۆکەخانە و بە شێخ قادریان گەیاند کە لەگەڵ لیژنەیەك بچێت بۆ لایان. لەسەر ئەو داوایە، لەگەڵ ئەم ناوانەی ژێرەوە گەیشتنە لای گۆلد سمیت:

١– شێخ قادر.

٢–حاجی مستەفا پاشا.

٣- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا.

٤- عەبدولفەتاح چەلەبی.

٥- مەجید ئەفەندیی حاجی ڕەسوول ئاغا.

٦-ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ.

لەگەڵ گەیشتنی ئەم لیژنەیە. گۆلد سمیت وتی: لە لایەن مەندووبی سامی لە بەغداوە فەرمانم پێ درا، کە ئێستە سلێمانی بەجێ بهێڵین. عەسکەر، پۆلیس، چەك، پارە، خواردەمەنیمان هەموو لە جێگای خۆیدا بەجێ هێشت. ئیتر خۆتان بۆ کاری خۆتان تێبینی دەکەن. ئەمەیش کلیلی خەزێنەیە بیدەم بەکێ؟ و کێ بە سەرۆك هەڵدەبژێرین؟

لیژنەکە هەموویان وتیان. تا حوکمدار دێتەوە، کلیل بدەن بە شێخ قادر و ئەو سەرۆکە، پێویستە بەبێ گیروگرفت شێخ مەحموود بنێرنەوە. لە پاش ماوەیەك چاوەڕێی حاکمی هەڵەبجە چوونە ناو فڕۆکەکان و ڕۆیشتن. ٥ ئەیلول ١٩٢٢.

ئینگلیز سلێمانیان بەجێ هێشت. ئاسایش گەڕایەوە. سوپا خرایە ژێر فەرماندەی حاجی مستەفا پاشا. خۆش ئەوە بوو کە پیاوخراپەکان بە سەرشۆڕی دەسووڕانەوە.

ئینگلیزەکان بڕیاری گەڕانەوەی شێخ مەحمووددیان دا بۆ سلێمانی. بەڵام پاش مانەوەی لە بەغداد و چەند ڕۆژێك پاش بینینی مەندووبی سامی بۆ لێدوانی کاروبار و پێویستەکانی کورد و کوردستان.

لە سلێمانیدا، بە ناوی حکوومەتی کوردستانەوە شێخ قادر داوودەزگای بەڕێوەبردنی دامەزراند. دیسان زۆر کەس دەمیان لێ داچەقاند. وایان دەزانی کە ئەو چەك و گەنجەی کە ئینگلیز بەجێی هێشتووە بەخشراوە بە شێخ قادر.

ئەوانەی کەوا دوای ئەو باوەڕە کەوتبوون شێخ عەبدولقادری گوڵلەنەبڕی سەنگاو، کەریم بەگی هەمەوەند، بە ناوی یارییەدانەوە گەیشتنە سلێمانی، بەنیازی کەڵەبوور. کار بە توندی گیرابوو، کۆمەڵ لە کارابوو، دەستدرێژی ڕووی نەدەدا.

بۆ دانانی پرۆگرامێکی بەڕێوەبردنی وڵات، لەسەر فەرمانی شێخ قادر کۆبوونەوەیەکی گشتی کرا. دەرگا بۆ گشت واز کرابوو کە لەسەر ئەم مادانە وتووێژ بکرێت.

١- تا گەیشتنەوەی حوکمدار، هەڵبژاردنی دە کەس بۆ دامەزراندنی ئیشوکاری حکوومەت.

٢- بۆ بەربەستیی چاو و ڕاو.

٣-دانانی پرۆگرامێك بۆ پێکهێنانی هێزێك، ئەگەر هاتو ئینگلیز یان بێگانەیەك ویستی دەستدرێژیی کرد بۆ سەر ئەم حکوومەتە تازەیە.

جا بێگومان لەسەرەتای کۆ بوونەوەدا هاوار و چەپڵە بۆ سەرکەوتنی کورد و ژیانی حوکمدار

بوو. لە ماوەیەکی کەمدا کۆبووەکان بوون بە دوو بەش:

١- رەزا بەگ و کوردخواە.

٢- کەریم بەگ و تورك خولە (جل خوار).

تورك خواهەکان، بەبێ شەرم بۆ ژیانی (ئەتاتورك و ئۆیز دەمیر) بانگیان دەکرد. هانی کەریم بەگیان دا بۆ هەرەشە و چەك بەکارهێنان. کار کەوتە ترس و ناسکی. لەپڕ یەکێك بانگی کرد سوپای تورك گەیشتە کانی ئاسکان. ئیتر کۆمەڵ بڵاوەی کرد. هەر جل خوار بوو بە ڕاکردن بۆ بە پیرەوە چوون دەچوو بۆ کانی ئاسکان. سلێمانی چۆڵ بوو، بەڵام درۆ بوو.

ئەم پیلانە لە لایەن قومیسەری پۆلیس حیلمی (حایوم) ناوی جوولەکەوە مەردانە پێك هێنرا، کە بینی کار گەیشتۆتە ناخۆشی و چەك. جا لە کاتی ئەو مژدەیەدا بۆ ئەوەی بیکات بە دیاریی دەستی خۆی، کەریم بەگ حاجی مستەفا پاشای گرت و دایە دەست پۆلیسخانە بینێرێت بۆ ئۆیز دەمیر. بەرامبەر بەم دەستدرێژییە کۆمەڵەکان بریاریان دا کە بە خورتی پاشا ڕزگار بکەن و سلێمانی لە سوارەی عەشایر پاك بکەنەوە و دەریان بکەن. ئەم پرۆگرامە بە شێخ قادریش گەیێنرا. ئەم باسە گەیشتە کەریم بەگ، شەو سلێمانیی بەجێ هێشت و ڕۆیشت و پاشایش دەرهێنرا و هەموو کارێك ڕێگەی خۆی گرتەوە. جل خوارەکانی ناو شاریش ئەوەندە بەهێز نەبوون کە جێی ترس بن.

### ئاڵای کوردستان

ئەمجارەیش بۆ هەڵکردنەوەی ئاڵای کوردستان لە مزگەوتی گەورەدا کۆبوونەوەیەکی ئێجگار گەورە و مەزن کرا. لە ڕۆژی ١٧ ئەیلوول ١٩٢٢دا بریار درا و کۆبووەکان بەم پێیە وەستابوون:

١- ڕیزی سەربازان و مۆزیقا.

٢- قوتابیان و سروودی نیشتمانی.

٣- پیاوە ناسراوەکانی شار و عەشایر.

٤- دانیشتووانی شار بە گشتی.

٥- مۆزیقای سوپایی و سروودی ئاڵای کورد.

لە ژوورووی ئەم ڕیز بەستانەوە کۆمەڵی دانایان و ئاینی. لە لایەن ڕەفیق حیلمی و یوونس عەبدولقادرەوە دوو وتەی زۆر نایاب و بە جەوهەر خوێنرایەوە و لە کاتژمێری ١٢ نیوەڕۆدا، ئاڵای کوردستان لەسەر قشڵەی سوپایی هەڵکرا بە ئاگردانی چەکەوە.

ڕۆژنامەی بانگی کوردستان، ژمارە ٧ ڕۆژ ٢٢ ئەیلوول

تەلگرافی مێجەر گۆلد سمیت لە بەغدادەوە

لە لایەن حاکمی سیاسیی پێشووی سلێمانی مێجەر گۆلد سمیت و ئەم تەلگرافە بۆ شێخ عەبدولکەریم نووسرا:

«بۆ جەنابی شێخ عەبدولکەریم لە کفری، ڕۆژی چوارشەممە ١٣ ئەیلوول، ئیمڕۆ شێخ مەحموود و شێخ محەمەد غەریب دەگەنە بەغداد. بە ئەوەڵین فرسەت بۆ کفری حەرەکەت دەکەن. بەڵام بۆ بەعزێ ئیش لە پێش بزووتندا لازمە مەندووبی سامی مشاوەرەی لەگەڵ بکات. هەتا خەبەری ترتان بۆ دەنێرم ئینتیزاریتان لە کفری پێویستە. هەر چ وەختێك شێخ مەحموود بۆ کفری حرکەت دەکات خەبەرتان بۆ دەنێرم.

گۆلد سمیت

حاکمی سیاسی

ئەم تەلگرافەیش لە ژمارەی پێشووی بانگی کوردستاندا بڵاوکراوەتەوە و بەبێ گۆڕین پیشان درا.

لە ڕۆژی ١٨ ئەیلوولدا لە لایەن خۆی حوکمدارەوە لە کفری داوای ئەم ناوانە کرا:

١- حاجی مستەفا پاشا.

٢-ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ.

٣- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا.

٤- عزەت بەگی وسمان پاشا.

٥-ئیبراهیم ئەفەندیی زابت.

٦- ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ.

ئەم لێژنەیە ڕۆیشتن و ڕۆژی ١٩ گەڕانەوە و گەیشتنەوە سلێمانی. بە بۆنەی کۆبوونەوەی عەشایرێکی زۆری کورد و عەرەب لە کفریدا و لەگەڵ حوکمداردا دەهاتنەوە بۆ سلێمانی، بڕیار درا کە بە سواری لە سەگرمەوە بێتەوە ٢٠ ئەیلوول.

٢٠/٢١ داریکەلی.

٢٢ ئەیلول لە سلێمانی و پایتەختەکەی خۆیدا، بڕیاردرا و کۆمەڵەکانی سلێمانی کەوتنە پڕۆگرام ڕێکخستن و ڕازانەوەی شەقام و کۆڵانان و دووکانەکان و بڵاوکردنەوەی نامەی هاتنەوەی حوکمدار بە ناو لادێ و عەشایرەکاندا.

گەورەیی بە لێبووردن، دارایی بە کۆشش دەست دەکەوێت، بەڵام جەنگ بەهەردووکیان و سوپا دەکرێت.

شێخ مەحموود

لەبیرتان نەچێت، ڕۆژی ٢١ مایس ١٩١٩ لە ڕووی گێتیدا یەکەمین گوللە، گوللەی سوپای کورد بوو بە فەرماندەی حوکمدار شێخ مەحموود نرا بەسنگی ئینگلیزەوە و داماوانی جیهانی ئاگادار کرد بۆ ڕزگاری.

برای بەڕێز:

لە پێشەکیی هەموو نووسینێکدا پێویستە نووسەر پوختەی نیاز و ئاواتی خۆی بخاتە ڕوو. لە سەرەتای نووسینی (چیم دی)یەوە، تا دوای پەڕە، بۆ ئەوەی وێنەیەکی جوان و سەنگین، لە ئاوێنەیەکی پاك و بێگەردا ببینرێت و ببێت بە یادێکی پیرۆز، بۆ ئەم نامیلکەیە زۆر کاتی خۆم تەرخان کرد. جا هیوادارم لە هەڵە و کەم و کوڕی چاوپۆشی بفەرموون.

هاتنەوەی حوکمدار شێخ مەحموود

بیسترا کە شێخ مەحموود گەیشتۆتە کفری. دانیشتووانی سلێمانی خۆیان ئامادە کرد. کۆمەڵەکان، لێژنە کەوتنە پێکهێنانی بە پیرەوەچوون.

ئێمە لەگەڵ شێخ ڕەئووف و بابا عەلی چووین بۆ (داریکەلی) لە ماڵی شێخ ڕەئووف میوان بووین، ٢١ ئەیلوول ١٩٢٢ ڕۆژی دوایی، لە کاتی نیوەڕۆدا چووین بۆ (چنارە) کە بە مەزندە نیو سەعات لە داریکەلییەوە دوورە. لەوێ بەرنگاری بەرایی سواری گەرمیانی بووین کە لەگەڵ حوکمدار هاتبوون و لەگەڵ دەرکەوتن و بینینی حوکمدارا لێشاوی ژن، پیاو، مناڵ. پیر و جوان وەکو لافاو دەجما و دەهەژا. گەیشت، لەگەڵ بینیمان فەرمووی: ئەحمەد یەکەمین تەل، تەلەکەی تۆ بوو کە وەرم گرت.

بۆ ماوەی یەك کاتژمێر، شەو لە ماڵی شێخ ڕەئوف، لە گەڵمان دانیشت. فەرمووی ئاگاتان لە مێجەر نوئێل و پاشا بێت (حاجی مستەفا پاشا)، بێ خزمەت نەبن.

من بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەدا پێشەکی سەرە تاوێکی کار بگەینم بە کۆمەڵ بە هەلم زانی، وتم: ئەمجارە مێجەر سۆن چیمان بە سەر دەهێنێت و بە کێمان دەسپێرێت، ئازادین یان نا؟ فەرمووی: بام ئێمە ئینگلیز هەر بە فریشتەی چاکە بزانین ئەگەر لەگەڵمان بوون لەگەڵیان دەبین، کورد مافی خۆی دەوێت، چ ئینگلیز بێت و چ مینگلیز.

لە سپێدەی ڕۆژی ٢٢دا حوکمدار ڕوو بە سلێمانی کەوتە ڕێگا، چەندێتیی سوارە و پیادە لە

خەمڵدا نەبوو. بۆ (وێنە) لەبەر دێی بارووییدا، کەروێشکێکی هەژار لە لانەکەی دەرپەڕی بەبێ ئەوەی کەس بتوانێت بۆی دابەزێت و یان بۆی بچێت لە ناو دەست و پێی وڵاخدا دەرنەچوو، کەوت و مرد.

مێجەر نوئێل، وەکو لە لەندەندا بسووڕێتەوە شارەزا بوو، لەگەڵ حاجی مستەفا پاشا بەرایی سوار بوون. کەس لە هاتنی نوئێل دڵخۆش نەبوو، دەترسان ئەمجارەیش بێت بە مەقاشی ئاگری شۆڕش هەڵگیرساندن بۆ کورد بە کوشتدان و هۆی خوێن ڕژاندنێکی تری وەکو جاران.

کار زۆر عەنتیکە دەڕۆیشت، نەدەزانرا ئایا بەریتانیاکان سیاسەتەکەی خۆیان لە نوئێل دەشاردەوە، یان لەم پیاوە خراپتریان نەدۆزییەوە، کە گەلێکی وا بێچارەی پێ پەرێشان بکەن.

جێی باوڕ نییە لە بیری چوو بێتەوە، کە بۆ دڵنەوازی، وڵسن لە راپۆرەکەیدا دەیوت (کوردەکان پێیان خۆش نییە شێخ مەحموود حوکمداریان بێت)، کەچی ئێستە خۆی بەرایی سوارە و زەق زەق دەبینێت کە نەك هەموو کورد عەشایرەکانی عەرەبیش کەوتوونەتە دوای و بانگی حوکمداریی بۆ دەدەن. ئەو ماوە کەمەی لە داریکەلییەوە تا کانی گۆمە بە حەوت کاتژمێر بڕرا. ٢٢ ئەیلوول.

لە کانی گۆمەوە تا سلێمانی، لەبەر ژن و پیاو، منداڵ بە چەپکە گوڵ و گۆرانی و چەپڵە ڕێزان، عەشایر و سوپایی بە هاواری خۆشهاتنەوە و شێلنگی تفەنگ، مەئموران و دانیشتووانی سلێمانی لە پێش ئەسپی شێخ مەحموودەوە، بە چەپڵە و پێکەنین ڕوو بە پایتەختەکەی دەڕۆیشتن. لە کاتی ئەم بەزم و زەمزەمەیە بە ڕاستی سەر سوڕ دەما.

سدیق پاشای قادری، بە کامێرەکەیەوە بە ڕێگەوە خەریکی وێنەگرتن بوو. (لە سوپای ڕووسی قەیسەریدا جەنەراڵ (پاشا) بووە. بەڕاستی پیاوێکی زیرەك، وریا، قسە نەستەق و یەکێك بوو لە ڕۆڵەکانی سلێمانی).

لە سەرەتای شارەوە تا دیوانی حوکمداری، ماوە ماوە لە لایەن کۆمەڵەکانەوە کەوانە (طاق) دروست کرابوو و لە سەریانەکانەوە بە هەزاران چەپکەگوڵ باران دەکرا و لە کاتژمێری ٥ی پاش نیوەڕۆدا حوکمدار شێخ مەحموود لەبەر دیوانەکەی خۆیدا پیادە بوو، ٢٢ ئەیلول ١٩٢٢، بەڵام دەنگی بژی حوکمدار و چەپڵە گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد.

شێخ مەحموود. وەستا، ڕووی کردە وەستاوەکان، وتی:

براکانم، لە پێناوی گەل و نیشتمانەکەماندا، لە بەریەرەکانی، چەکبازی دوا نەکەوتم. بە برینداری، لە خنکاندنەوە بۆ هیندستان ئاوارە کرام. چونکە لە ڕێگەی ئازادی و سەربەستیی گەلەکەمدا بوو، پێم ناخۆش نەبوو و بەکەم جاریش نەبوو.

ئێستە هاتمەوە، گەیشتمەوە ناوتان. باوەڕم پێ بکەن تا دەگەین بە ئاواتی ئازادی
من لەم داوا و پیشەیە لا نادەم. ئەگەر حەقمان نەدەنێ، گیانمان دەدەین تا
دەیسێنین. ئیتر زۆر سوپاسی دڵسۆزیتان دەکەم. خواتان لەگەڵ بۆ حەسانەوە.

مێجەر نوئێل بۆ دامەزراندنەوەی دەزگای حکوومەتەکەی کوردستان ئەمجارەیش بە حوکمداریەتیی شێخ مەحموود بە دڵسۆزانە کەوتەوە کار.

بۆ بینینی سەرۆك عەشایر و دانیشتووانی شار و دێهاتەکان و سوپاسیان لە لایەن حوکمدارەوە، ئەم پرۆگرامە رێك خرا و بڵاوکرایەوە بۆ ئەوەی لە کاتی دیاریکراودا دەستە دەستە و چین چین بچنە دیوانی حوکمداری.

چوونە دیوان لە کاتژمێر ٩وە دەست پێ دەکات

ڕۆژی ١٦ ئەیلوول

| لە | تا | |
|---|---|---|
| ٩:٠٠ | ٩:١٥ | مامۆستایان و پسپۆڕان |
| ٩:٢٠ | ٩:٣٥ | دانیشتووانی سلێمانی |
| ٩:٤٠ | ٩:٥٥ | بازرگان و گشتی |
| ١٠ | ١٠:١٥ | مەئمووران |

٢٧ ئەیلول – سەرۆك عەشیرەتەکانی گەرمیان

| | | |
|---|---|---|
| ٩:٠٠ | ٩:١٥ | (ئەلعوبێد) |
| ٩:٢٠ | ٩:٣٥ | زەنگنە |
| ٩:٤٠ | ٩:٥٥ | داودە |
| ١٠:٠٠ | ١٠:١٥ | بەیات |
| ١٠:٢٠ | ١٠:٣٥ | جەباری |
| ١٠:٤٠ | ١٠:٥٥ | هەمەوەند |
| ١١:٠٠ | ١١:١٥ | تاڵەبانی |
| ١١:٢٠ | ١١:٣٥ | شوان |
| ١١:٤٠ | ١١:٥٥ | شێخ بزێنی |

٢٨ ئەیلول

٩:٠٠ ٩:١٥ بەگزادەی جاف

٩:٢٠ ٩:٣٥ سەرکۆمارانی جاف

٩:٤٠ ٩:٥٥ پشدەری

١٠:٠٠ ١٠:١٥ ئاکۆ

١٠:٢٠ ١٠:٣٥ بلْباس

٢٩ ئەیلوول

٩:٠٠ ٩:١٥ سەرۆك عەشیرەتی خۆشناو

٩:٢٠ ٩:٣٥ دزەیی

٩:٤٠ ٩:٥٥ گەردی

٣٠ ئەیلوول

٩:٠٠ ٩:١٥ بەگزادەی بانە

٩:٢٠ ٩:٣٥ مەریوان

٩:٤٠ ٩:٥٥ هەورامان

١ تشرینی یەکەم

٩:٠٠ ٩:١٥ کوێخایانی سووورداش

٩:٢٠ ٩:٣٥ تانجەرۆ، سەرچنار، قەرەداغ

٩:٤٠ ٩:٥٥ شارباژێڕ

بەپێی پرۆگرامی سەرەوە ئەوانەی لەگەڵی هاتبوون و ئەوانەی بۆ بە خۆشی هاتنەوەی گەیشتبوونە سلێمانی لە لایەن حوکمدار شێخ مەحموودەوە دیدەنی کران. بە سوپاس و خۆشی و خەڵاتەوە بەڕێ کران. عەشایری (العبید) ئالایەکی کوردستانیان وەرگرت. وتیان ئێمە کوردین و لە ناوەڕاستی چیای (حەمرین)دا دەیچەقێنین.

فریشتە دەم ڕەشەکەی کورد، (مێجەر نوئێل) بۆ جێبەجێکردنی هەندێك کاروباری حکوومەتە تازەکەی کوردستانی خۆیان و گوایا بە کوردی دەبەخشن، چوو بۆ کەرکووك، ٦ تشرینی یەکەم.

بەلام پاش سێ ڕۆژ، لە جیاتی نوئێل، میستەر چیمن هات بۆ دانشمەندیی حوکمدار (مستشار)، ئینجا لە دوا دواییدا دەرکەوت کە مێجەر نوئێل بەتەنیا پێی تێك نەدەدرا چونکە چیمن زیاتر گێرەشێوێن بوو، ناردیان.

ئینگلیزەکان بەو هیوایە شێخ مەحموودیان لە هیندەوە هێنایەوە، کە شۆڕشەکەی کوردستانی پێ دامرێننەوە و ئۆێز دەمیر بڕەتینێتەوە بۆ تورکیا، نەك بۆ داوای ئازادیی کورد. جا وا دەرکەوت بە ئیجازە هێناویانەتەوە. چونکو نووسینەکانی حاکمی عامی عێراق وای پێشان دەدا.

بەپێ دەستکاری نووسینەکەی (وڵسن) و هەندێك لە بڵاوکراوەکانیان دەخوێننەوە. جا لە نووسین و کردەوەی کاربەدەستەکانی ئینگلیز بەراوردێکی وردی گەرەکە.

لە (القضية الكردية) و ڕۆژنامەی (الاخاء الوطنی) ٥ و ٦ أب ١٩٣١ و ڕۆژنامەی (الجهاد) ١٩٣١ وە:

(كتاب السير) أ – ت. ولسن (الجزء الثانی)

(اكراد العراق وحركة الشيخ محمود)

مابين فترة الإحتلال البريطانی ودخول العراق عضوا في عصبة الامم ١٩١٧ – ١٩٣٢

(يقطن الأكراد العراقيون فی منطقتهم الجبلية فی الشمال، والشمال الشرقی من العراق في خمسة ألوية (محافظات) عراقية من أصل ١٤ لواء. وهی لواء الموصل ولواء أربيل ولواء كركوك ولواء السليمانية ولواء ديالى.

وكان من نتائج حل قضية الموصل، على نحو ما ذكرنا فی الفصل السابق ان أُلحقت بالأراضي العراقية الجديدة مناطق كردية صغيرة لم تكن تابعة لحكم الوالی العثمانی الذی كان يحكم العراق باسم الخليفة فی أسطمبول. وقد ضمت هذه الأراضي الواقعة فی أقصى شمال شرقی العراق الى لواء الموصل.

ولقد إرتبطت المنطقة الكردية العراقية بالعراق العربي فشارك الاكراد إخوانهم العرب فی السراء والضراء فی أمجاد الدولة الإسلامية وفی الكوارث التی حاقت بهم بعد تفكك الدولة العباسية، او فی خضوعهم فی النهاية لحكم الاتراك الذی دام اكثر من ستة قرون قبل ان يحتل البريطانيون العراق فی الحرب العالمية الاولى ما بين عام ١٩١٤ – ١٩١٧ ولم يقتصر إرتباط الاكراد العراقيين بالعرب العراقيين بالمصير المشترك فحسب بل إنهم إندمجوا معا حياتهم الإقتصادية والإجتماعية، فكانوا يسوقون منتوجهم من المواشي ومنتوجاتهم من التبوغ وفحم الغابات والبلوط والجوز والقطن الى أسواق كركوك والموصل وبغداد ليشتروا من أسواق تلك المدن المنتوجات من الحبوب وسائر المواد الغذائية والإستهلاكية الأخرى. ولقد نزح عدد كبير

من أكراد السليمانية و كركوك و أربيل و الموصل الى بغداد وسائر المدن العربية وإختلطوا بالعرب وتصاهروا كما رحل من علماء الدين العرب الى الجبال الكردية وفتحوا المدارس للأكراد وتصوف بعضهم، وإنبثقت من تعاليمهم الدينية مشيخات وطرق صوفية وتركت أثرها في نفوس الأكراد.

الشيخ محمود في السليمانية

و كانت مدينة السليمانية وما جاورها تخضع لأسرة كاك أحمد العالم العربي الذي إحترمه الأكراد وبلغ من إحترامهم له ان رفعوه ال منزلة الأولياء الصالحين. فانقادت الى تعاليمه جميع الطبقات الكردية في ذلك اللواء. فلما توفي، خلفه حفيده الشيخ سعيد وخلف الأخير الشيخ محمود الذي لعب دوراً سياسياً خطيراً في حياة العراق في سني الحرب العالمية الأولى أي منذ عام ١٩١٧ حتى عام ١٩٣٠ الذي أستقل فيه العراق بموجب معاهدة عام ١٩٣٠.

وعندما إندحر الأتراك في العراق وأخلوا بغداد في عام ١٩١٧ ليحتلها الجيش البريطاني ثم أخلوا كركوك في عام ١٩١٨ طلب القائد التركي الشهير (علي إحسان باشا) من قائد الحامية التركية في السليمانية ان يمد الشيخ بمبلغ كبير من النقود الذهبية لتساعد على تنظيم حرب العصابات لإزعاج مؤخرة الجيش البريطاني الزاحف الى الشمال، ولما عقدت هدنة مندرس التي إستلمت فيها تركيا للحلفاء لتلك السنة طلب علي إحسان من قائد حامية السليمانية ان يسلم زمام لواء السليمانية الى الشيخ محمود، فيحكم اللواء بإسم الدولة العثمانية ويبقى الفوج التركي المرابط هناك تحت إمرته وتصرفه.

على ان الشيخ محمود الذي أستغل مركزه الجديد، والذي كان يطمح الى الزعامة والسلطان، أدرك أن بانضمامه الى المعسكر المنكسر المستسلم انما يلعب على حصان خاسر. فإتصل بالانكليز وأعلن إستعداده لتسليم لواء السليمانية اليهم بلا قيد ولا شرط. فرحب الحاكم العسكري البريطاني بإخلاص الشيخ وأوفد اليه في تشرين الثاني ١٩١٨ ضابطين لمفاوضته في أمر إحتلال السليمانية. ورحب الشيخ بمقدمها وسلمها جنود وضباط الفوج التركي كأسرى.

ومما دعا الحاكم البريطاني العام الى تعيينه حكمداراً للواء السليمانية براتب قدره (١٥٠٠٠) روبية، أي (١٢٢٥) جنيهاً استرلينياً. وعينت الميجر نوئيل مستشارا ملكيا له والميجر دانليس، عسكريا وأصبح الشيخ محمود حاكماً على السليمانية.

رسالة ولسن الى الشيخ محمود

ان الحكومة البريطانية تعضده من الناحية الادبية، ولا تعارض كل من يريد الإنضمام اليه

من القبائل الكردية التى تقطن المنطقة الممتدة من الزاب الكبير الى نهر ديالى عدا الذين يقطنون الأراضي الإيرانية. وإن على الشيخ محمود ان يحكم هذه المنطقة بوضعه ممثلا للحكومة البريطانية، التي يجب عليه ان ينفذ تعليماتها ويحترم إرادتها.

* وبذات الوقت. طلب الحاكم البريطاني من الميجر نوئل ان يتجول في المناطق الكردية العراقية يثبت من رغبة الاكراد في الحكم الذاتي كما كان يدعي الشيخ محمود. فظهر من ميجر نوئل ان الاكراد غير راغبين في حكمدارية الشيخ محمود، وانهم يسايرونه لانهم يخشون بطشه.

وكعادة بريطانيا دائما – في إتباع فرق تسود – فانها أخذت تقلص من نفوذ الشيخ محمود ومرتبه أيضاً. وأخذت تحرض الرؤساء الاكراد عليه. فثار ثورته في عام ١٩١٩ على الإنكليز وتقدم بقواته حتى منتصف طريق السليمانية –كركوك. وفتك – بالحاميات البريطانية المرابطة في مضايق ذلك الطريق. وأخذ يهدد مدينة كركوك وعلى إثر هذه الأحداث المفاجئة أذاعت سلطات الإحتلال البريطانية بلاغا جاء فيه:

ان الشيخ محمود قبض زمام الحكم في السليمانية بغية أيام ٢١ ايار ١٩١٩ وأخذ بعض ضباط البريطانيين هناك بصفة أسرى لذلك سارت قوة جنودنا حالا الى جمجمال وفي ٢٥ الجاري وصلت كشافتنا الى مضيق طاسلوجة ومن ثم الى جمجمال. وان قوة من جنودنا مجهزة بكل أنواع المعدات الحربية تحتشد الان في كركوك.

* وسارت قوة بريطانيا الكبيرة الى مضيق درنبد في أواخر حزيران ١٩١٩ فاحاطت قوات الشيخ محمود بحركة التفاف بارعة. وإعتقلت الشيخ محمود وجماعة من أتباعه وأرسلتهم الى بغداد. وهكذا قضي على حركته بعد أربعين يوماً من ثورته على الانكليز. وحكم عليه الإنكليز بالإعدام. ثم أبدلوا الحكم بالسجن المؤبد. ونفوه الى الهند حتى أواخر عام ١٩٢٢.

وعمد الحاكم البريطاني العام من الناحية الأخرى الى تنفيذ نص لائحة الانتداب البريطاني للعراق بايجاد وضع خاص للاكراد يتيح لهم التطلع الى حكم ذاتي قبل ان يجرى إستفتاء الشعب العراقي على إقامة حكومة وطنية مركزية للعراق يرأسها (الملك فيصل) كما كان المنتظر.

فيما يلي النص الكامل لمقدمة لائحة الانتداب البريطاني – العراقي والمادة خاصة بالاكراد:

بناء على نص المادة ١٣٢ من معاهدة الصلح الموقع عليها في (سيفر) في ١٠ آغستوس ١٩٢٠ التى تنازلت تركيا بموجبها عن جميع حقوقها وتملكها في العراق الى دول الإئتلاف الرئيسية. وبناء على نص المادة ٩٤ من تلك المعاهدة التى بموجبها قررت الدول الكبرى

---

* (القضية الكردية) ماموستا (الدرة).

* القضية الكردية.

المذكورة وفقا للفقرة الرابعة من المادة ٢٢ من الفصل الاول (عهد جمعية الأمم) بان تعترف بالعراق دولة مستقلة يشترط عليها قبول المشورة الإدارية والمساعى من قبل منتدب الى ان تصبح قادرة على القيام بنفسها لوحدها وان تحديد تخوم العراق سوى ما هو مقرر فى المعاهدة المذكورة وإختيار المنتدب تتفق عليه الدول الرئيسية المتحالفة، وبما ان الدول المتحالفة الرئيسية قد أختارت صاحب الجلالة البريطانية منتدبا من قبلها على العراق. وبما ان شروط هذا الانتداب الآتى ذكرها رفعت الى مجلس جمعية الامم للمصادقة عليها، وبما ان صاحب الجلالة البريطانية قد قبل ان يكون منتدبا على البلاد المذكورة وتعد بذلك بالنيابة على جمعية الامم طبقا للمواد الاتية. فجمعية الامم توافق على شروط هذا الانتداب كما يلى:

١- المادة السادسة عشر: (لايوجد فى هذا الانتداب ما يمنع - المنتدب من تأسيس حكومة مستقلة إداريا فى المقاطعات الكردية كما يلوح له).

إدرك الشيخ محمود ان الانجليز قد استفدوا اغراضهم منه، ولابد إنهم سيفعلون به مثل ما فعلوه فى عام ١٩١٩ و لذلك فلقد سارع فأعلن نفسه فى تشرين الثانى ١٩٢٢ (ملك كردستان) واخذ يرهب مواطنيه ليقدموا له جيشاً يسطيع فيه مهاجمة كركوك وضمها الى مملكته. فجردت الحكومة البريطانية عليه حملة عسكرية أستطاعت ان تحتل مدينة السليمانية، ولكنه عاد فاحتلها ثانية. وبقى معسما فيها قرابة سنة كاملة.

وفى هذه الفترة بالذات. وفى أثناء البحث فى معاهدة لوزان ١٩٢٣ التى أستبعدت فكرة إعطاء حق تقرير مصير للاكراد على نحو ماورد فى معاهدة سيفر.. أكرهت السلطات البريطانية الوزارة العراقية على إصدار بيان مشترك - من بريطانيا والعراق. وهذا نص البيان:

تعترف حكومة صاحب الجلالة البريطانية والحكومة العراقية بحقوق الاكراد القاطنين ضمن حدود العراق فى تأسيس حكومة كردية ضمن هذه الحدود، وتأمل ان الاكراد على إختلاف عناصرهم سيتفقون فى أسرع ما يمكن على الشكل الذى يودون ان تتخذه تلك الحكومة. وعلى الحدود التى يرغبون ان تمتد اليها ويرسلون مندوبيهم المسؤلين الى بغداد لبحث علاقتهم الاقتصادية والسياسية مع حكومتى انكليز والعراق.

ئينجا دهڵێت:

ورافق هذا البيان، تحشدات عسكرية قام بها الجيش العراقى الناشيء على حكم الشيخ محمود، وتمكن الجيش من إحتلال السليمانية فى ١٩ تموز ١٩٢٤ على ان الشيخ محمود اجبر قطعات الجيش العراقى التخلى على المدينة فجردت حملة عسكرية أخرى أستطاعت ان تقضى على نفوذ الشيخ محمود وعلى أتباعه الذين تفرقوا.

لێرەدا وەڵامی ولسن* :

• تجارەتی بازرگانەکانی کورد – سلێمانی بۆ وارشۆ، ڕووسیا و ئێران. لە لایەکی تریشەوە بۆ شام و حەڵەب بوو، بەڵام تەنیا توتنیان لە بەغداد دەفرۆشت. ئەگەر بە کڕین و فرۆشتن بوایە ئەبوایە ئینگلیزەکان ئەفریقایی بن، ئەوانەی گەیشتوونەتە چیاکانی کورد، دەروێشەکانی (نعیم) بوون.

دانا و عولەماکانی کورد زمانی عەرەبییان کرد بە موعجیزە و جادوو و ئاینی ئیسلامیان کرد بە چرای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە برا عەرەبەکانیش لەم ڕاستییە لا نادەن.

– کاک ئەحمەد ئەوەی باباتاهیرە: شێخ مەعروفی باوکی بۆ ئەوەی بەتەواوی فێری عەرەبیی بکات، ئەحمەدیی بۆ دانا.

– لە پێش هاتنی ئینگلیزدا بۆ سلێمانی شێخ مەحموود داوای ئازادی و سەربەخۆیی کرد ئایا لەسەر ئەو نامەیە نەبوو کە تورکەکان بڕیاری خنکاندنیان دا؟

– نوئیل هات، مژدەی ئازادیی کورد و حکومداریی کوردی دا. دانشمەندانی سیاسی و سوپایی بۆ نێررا. ولسن خۆی دەڵێت سەدی ٨٠ لە کورد ملکەچی شێخ مەحموودن. ئیتر چۆن شێخ مەحموودیان بە حوکمدار ناوێت.

– ئایا پێویست نەبوو ولسن ناوی دوو سەرۆک لەو ٦٠ سەرۆکانە بڵێت کە لەگەڵیان کۆ بووەتەوە و قەلای هیوای کوردیان ڕووخاند؟

– ئایا ئەو جەنگە گرنگ و خوێنڕێژەی ١٩١٩ عەشایر و زابت و عەسکەری کورد نەبوون کردیان؟ بەڵام داخەکەم، سووچی گەورە دەکەوێتە سەر کورد و عەرەب، کە بە سیاسەتی ئینگلیز خەڵەتان. لێرەدا زیاتر دەکەوێتە سەر برا گەورە کە عەرەبە، دەبوایە بە پێچەوانەی ئاواتی ئینگلیز ماف و حەقی کوردی بدایە.

چونکە کورد لە هەموو شیر و ساتیانی براکانی تری بۆ عێراق بە کەڵکترە و ڕێگەی ڕێزی برابچووکی باشتر دەزانێت، چونکە ئاین و بڕوایان زۆر بەهێزە. ئینگلیز لە پێش ساڵانی ١٩٢٤دا یەك بەدوای یەکدا لە بابەت(حوکمی زاتی و تەقریری مەسیر)ی کوردەوە زۆر بەیانی دەرکرد بەڵام بە چە کورد و نیشتمانێکی کورد گەیێنرا و بڵاوکرایەوە؟ ئایا هەر لەگەڵ بەیانەکاندا، لە ناردنی سوپای پایەماڵکردن و فڕۆکەی بۆمباهاوێژ و بۆمبابارانی سلێمانی و دێهات و جێگای ئەو عەشایرانەی هاوپەیمانی داوای ئازادی بوون، بە کوشتنی ژن، منداڵ، پیر، جوان و قڕهێنانی مەڕ و ماڵات و ئاژەڵ و سووتان و ڕماندنی خانوو و بەرە چەکەرەی دەکرد؟

وێنەی بۆمبابارانی کاولکەرەکەی لە جێگەی خۆیدا دەبینن، جا دەزانن لە ١٩٢٣ – ١٩٢٤دا کە کاتی گەرمەی بەیانەکانیانە چیی لە سلێمانیدا کردووە؟ وڵاتی چۆن داپێژاوە؟

تکایە لە خوێندەوارەکان ئەو نووسراوانەی کە بە عەرەبی و بەبێ دەستکاری لەم (چیم دی)یەدا دەیبینن ورد ورد بیخوێننەوە و لەگەڵ ڕەخنەکانی سەرەوە بەراوردی بکەن.

– لە ساڵی ١٩٢٢دا لە ئەشکەوتی (جاسەنەوە) بە هۆی عەلی کەمالەوە لە (کۆیە)وە ساڵح زەکی =

پشت بە خوا[1]

فەرمانی حوکمداری

ژمارە ١

١٨ سەفەر ١٣٤١

٩ تشرین یەکەم ١٩٢٢

لە پایتەختی کوردستان شاری سلێمانی، لە مەحموود کوڕی سەعیدەوە بۆ هەموو میللەتی کورد:

لە پاش داوای خۆشی و ئازادی لە خوای گەورە و تەنیا بۆ ئەم گەلە دلێرەی خۆم بڵاوی دەکەمەوە، کە لەبەر هەندێك ڕووداو و سیاسەتی بێگانە، لە مێژەوە لە گیان بەختکردن لە ناوتاندا دوور کەوتبوومەوە، وا بە هۆی دلاوەریی ئێوەوە ئەمجارەیش هاتمەوە.

ئیتر لەم ڕۆژە پیرۆزەوە بۆ هەڵسووڕاندنی پەروانەی پێویستی لە ڕێگەی سەربەستی و ئازادیی کورد و کوردستاندا، بە گیان و تواناوە، بە یارمەتیی ئێوەوە هەوڵ دەدەم، هیوادارم، هیوادارم، کە هەموومان وەکو یەك دەست بدەینە دەست و هەل نەدۆڕێنین.

براکانم، پێویستی یەکەم یەکیەتییە، لە پێویستدا دەتوانین خوێن بڕێژین.

پشت بەخوا[2]

فەرمانی حکمداری

ڕۆژ ١٩ سەفەر ١٣٤١

١٠ تشرین یەکەم ١٩٢٢

لە پایتەختی کوردستان شاری سلێمانی، مەحموود کوڕی سەعیدەوە بۆ بەجێهێنانی کاروباری گەل و حکوومەت، ئەم ناوانەی لە خوارەوە نووسراون پەسند کران، بە ڕەئیس و بەڕێوەبەر دانران:

| | |
|---|---|
| عەبدولقادر | مەحموود |
| ڕەئیس و سوپاه سالار | حوکمداری کوردستان |

---

= ساحبقران، نێررا بۆ ئەوەی بە مەندووبی سامی و حکوومەتی عێراقی بگەیەنێت، کە شێخ مەحموود و کورد ئامادەن بە پەیڕەوی (قبووڵ)ی ئەو ڕێگە ئامانجە، کە پێشانی دەدەن بەو مەرجەی لە پەیەکی ناوەندیدا ئازادیی کوردی تێدا بێت. بەڵام ساحبقران، بەدەستی بۆش، گەڕایەوە و لە بەندیخانەکەی ئەشکەوتی (سیاکۆڵە) توند کرا.

١. ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ژمارە ٩ ڕۆژی ٨ و ژمارە- ٠

٢. بانگی کوردستان ژمارە ١٠.

١- عەبدولقادر سەعید: رەئیسی وەزیران و سوپاه سالار.

٢- شێخ محەمەد غەریب: وەزیری داخلییە.

٣- میر لیوا مستەفا پاشا: وەزیری مەعارف.

٤- عەبدولکەریم عەلەکە: وەزیری مالییە.

٥- شێخ عەلی ئەفەندی قەرەداخی: وەزیری شەرع و عەدل.

٦- ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ: وەزیری گومرگ.

٨- سەید ئەحمەدی بەرزنجی: وەزیری ئەمنییەتی عوموومی.

٩- میرلیوا سدیق پاشا: موفەتتیشی عام.

فەرمووەدەی حوکمدار شێخ مەحموود. بە بۆنەی کۆبوونەوەی یەکەمین جاری وەزیرانەوە:

براکانم:

ئەوا ئیمڕۆ بەردی بناغەی حکوومەتی کوردستان دانرا و کۆمەڵی وەزیران کەوتنە کار. بانگی ئازادیی کورد بە گێتیدا بڵاوکرایەوە.

پشتیوانی ئێمە خوا و بازووی خۆمانە. لە منداڵیمەوە بیری ئازادیی کورد لە مێشکمدا کەڵکەڵەیەکی گەورە بوو. ئێستە دەبێت بزانین، کە لەم ڕێگایەدا، لە هەزاران ساڵەوە ڕۆڵەی دلێرمان لە ناو چووە. تۆڵەی ئەوان کەوتۆتە سەر شانی ئێمە، کە بە مژدەی ئازادیی گەلەکەمان گیانی پاکیان شاد بکەین. (چەپڵە...)

لە بیرمە، کە لەگەڵ باوکم بۆ دیدەنیی سولتان عەبدولحەمید چووین بۆ ئەستەمبۆڵ، بینیم کە ژیان و گوزەرانی ئەو شارانە و دانیشتووەکانی لەگەڵ ژیانی ئێمە زۆر جیاوازە. لە باوکم پرسی لە وەڵامدا وتی: «کوڕم، ئەمانە بۆ خۆیانن و ئێمەش بۆ ئەمان».

ئیتر لەم تێگەیشتنەوە کەوتمە تاووتێکردنەوەی تورکەکان کە بە ناوی ئیسلامییەتەوە ئەیانڕووتاندینەوە. ئێوە هەمووتان ئاگادارن کە ئاژاوەیەکی زۆرم بۆ نانەوە. لە وڵاتی سلێمانیدا تەنگم پێ هەڵچنین. (چەپڵە...)

بەڵام، بەڵام ئەوان بەهێزتر بوون، دەریان پەڕاندم، خۆم گەیاندە (قەڵای مەریوان)، چوومە ناو کوردە ئازا و دلێرەکانی ئێران، بەڕاستی لە حکوومەتی ئێران چاکەم زۆر بینی.

لەوێش درێغیم نەکرد، لە وانیشم گەیاند کە دەبێت کوردیش بۆ خۆی بژیت، لە سوودی خۆیا بمرێت، کەس کەسی ئێمە نییە و تێم گەیاندن دروستە بە کوردی بخوێنن و بنووسن و نوێژیش بە کوردی بکەین. (چەپڵە...)

ئینجا تورکەکانیش وەکو دۆستەکەی ئێستامان کە ئینگلیزە، منیان پێویست بوو، بە زەمزمە

و دەبدەبەیەکی زۆرەوە هێنامیانەوە بۆ سلێمانی. بەڵام من هەر لەو نیاز و ئاواتەدا بووم، کە بۆ ڕزگاریمان کەلێنێك بدۆزمەوە.

جەنگی گەورە لە هاڕینی گیانی لاواندا بوو. تەفرەیان دام، کە بۆ یارمەتیی ڕۆڵەکانی کورد، بۆ پارێزگاریی نیشتمانەکەمان لە زاڵیەتیی ڕووس، بە لەشکری عەشایری کوردەوە بچم بۆ بەریەستی ڕووسەکان.

ئەوەیش بزانن، بۆ ئازادیمان لەگەڵ ڕووسەکانیشدا دریغیم نەکرد، بەڵێنیان دا بەڵام شۆڕشی ناوخۆی کەوتە پێشی ئاواتەکەی ئێمە. (چەپڵە...)

زۆر لاشەی کورد لە پێناوی سوودی بێگانەدا، بوو بە خۆراکی مەل و جانەوەر. گرانی و نەخۆشی نیوەمانی کوشت. لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لەسەر بەڵێنەکەی خۆمان تا دواییان شان بەشانی تورکەکان بە دڵ پاکی و خزمەتگوزارییەوە ڕۆیشتین. کەچی لە پاداشتدا لە ناکاو گیرام و بەبێ پشوو بڕیاری خنکاندنم درا. بەڵام سوپاسی عەلی ئیحسان پاشا دەکەم، کە لە چنگی ئەو بەدبەختانە ڕزگاری کردم.

من ئەم مەینەتییەم بە گران نەزانی، چونکە هیوام ئازادیی کورد بوو، کە ئەو ئاواتەیش بەبێ گیان بەختکردن دەست ناکەوێت. (چەپڵە...) هاتمەوە، هاتمەوە سلێمانی شاری دلێران و ئازادیخواهان. (چەپڵە...)

کرام بە موتەسەڕیف، قوماندانی سوپا. لەو لایشەوە ئینگلیز گەیشتە (کنگربان)، گەیشتە کەرکوك. ئەم هەلەم زۆر بە گرینگ زانی کەوتمە نووسین و تێگەیشتن لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بۆ ئازادیمان، تاوەکو ئێمەیش وەکو ئادەمیزاد بە ئازادی بژین. لە شێلانی ژێر پێی بێگانە ڕزگار ببین. داڵەمان دا بە ئینگلیز. ئەو ئینگلیزەی کە نەماندەناسین و لە کردەوە و پێشنیاریان ئاگادار نەبووین. خۆمان خستە بەختیانەوە، کە نیشتمانمان بۆ دروست بکەن، ئیستیقلال بدەن بە کورد. لەسەر ئەم مەرجە، بەبێ وەی بەبێ تەقە بەبێ بەربەرەکانی ڕێگەمان دان، بێنە کوردستان و گەیاندمانیە سلێمانی.

باوەڕتان بێت لەو کاتەدا زۆر بەهێز بووین. ئامادەی جەنگ بووین. بەڵێنیان دا، کە ئاواتەکەمان بهێننە جێ. هەر بە دۆستی و بەبێ سوپا و زیان هاتن. وایان پیشان داین کە دروستکردنی حکوومەتی کوردستان ئاسان و ئەوپەڕی ئاواتیانە و وایان پیشان دەداین کە دەیانەوێت پێشدەستی بکەن. نەوەك لە لایەکی ترەوە دەست بدرێتە دەستمان و مافی خۆمان بدرێتێ.

برایـنه

ئەو ئینگلیزە دڵسۆزانەی کورد. بەبێ تەقیە و شەرم و بەبێ ئەوەی بەڵێنەکەیان بە بیرا بێت، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا وڵاتیان پڕ کرد لە ئینگلیز، ئەو ئینگلیزانەی لە هیند و کۆڕی جەنگەوە هاتبوون گەیاندیاننە سەر ئێمە و بێجگە لە خۆیان بە هەڕەمەیی لە هەموو تیرەکانی شەرق و غەرب پیاویان هێنا و کاریان پێ سپاردن. ئیتر پیاو و خوێندەوارەکانی خۆیشمان بوون بە سەیرکەر. ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هەرەسیان بە هیوامان ئەهێنا. وایان ئەزانی کە ئینگلیز کوردستانی بە نووکی ڕم داگیر کردووە و ئێمەیش ئەبێت کۆیلەیان بین. وردە وردە گەیاندیانە ئەوەی کورد پەلاماری چەك بدا. خوێنی هەزارانی بێ تاوان بڕژێت. تا گەیشتە ئەوەی خەنجەری ئەبانی کورد بەرامبەر سونگیی بێ ئەمانی ئینگلیز بکەوێتە کار. منیش بە برینداری لە کۆڕی جەنگدا گیرام، ئەمجارەیش لە بڕیاری خنکاندنەوە بە دە ساڵ ئاوارەیی لە هندستان توند کرام و بۆ دووەم جار لە خنکان ڕزگار بووم. جا هەر ئەو برین و فەرمانی خنکاندنانەم، کە لە پێناوی گەل و نیشتمانەکەمدایە لەگەڵ دلێریی ڕۆڵەی کوردە جێگەی شانازیی ژیانم، کە لە پاش مردنم یادگار بێت. (چەپڵە...)

بە هۆی دلێری و مەرد ڕەوشتیی ئێوەوە لە پاش سێ ساڵ ئاوارەیی، ئەمجارەیش هێنرامەوە (بە حوکمداری) کە بەڵگەی ئازادیی کوردە (چەپڵە...)

(لە گەلەوە دەنگ و هاوار): «ئێمە بژتۆ، تۆیش بۆ کورد، بژی شێخ مەحموود، بژی حوکمدار، گیانمان لە ڕێبازتایە».

براکانم، بۆ گەیشتن بە ئاوات، ئاواتی ئازادی و ئیستیقلال، هەر یەکیەتییە، هەر یەکیەتی ڕۆژی ڕەشمان ڕوون ئەکاتەوە. ئیتر بە خواتان ئەسپێرم. (چەپڵە...)

فەرموودەی حوکمدار لە ڕۆژنامەی بانگ کوردستان ژمارە ۹ و ڕۆژی ۸ تشرین یەکەمی ۱۹۲۲ بە کورتی، پوختەی نووسرابوو لێرەدا بە تەواوی بڵاوکرایەوە.

پشت بەخوا

وەزارەتی زانستی

ژمارە ۱

ڕۆژ ۱۰ تشرین یەکەم ۱۹۲۲

پێشگاهی حوکمدار

لە سەر فەرمانتان، بۆ بەڕێوەبردنی قوتابخانەکان بەم پێیە مامۆستایان دامەزرا:[1]

۱. ڕۆژنامەی بانگ کوردستان ژمارە ۱۱ ڕۆژ ۲۹/ ۱۰/ ۱۹۲۲

١- قوتابخانەی ناوەندیی مەحموودی:

١- ڕەفیق حیلمی: مودیر.

٢- سالّح ڕەفعەت: موعەلیم (مامۆستا).

٣- خواجە ئەفەندی: مامۆستا.

٤- سەعید سدقی: مامۆستا.

٥- زێوەر ئەفەندی: مامۆستا.

٦- سەعید ئەدیب قەزاز: مامۆستا.

٢- قوتابخانەی سەرەتاییی قادری:

١- شێخ محەمەد زوهدی: مودیر.

٢- سەعید زەکی: مامۆستا.

٣- عەزیز ئەفەندی: مامۆستا.

٣- قوتابخانەی سەرەتاییی رەئووفی:

١- سەید عاکف: مودیر.

٢- ئەحمەد ئەفەندی: مامۆستا.

٣- محەمەد ڕەمزی ڕەحیم: مامۆستا.

٤- قوتابخانەی سەرەتاییی لەتیفی:

١- ئەحمەد حەمدی عەزیز ئاغا: مودیر.

٢- فائیق ئەفەندی: مامۆستا.

٣- ئەحمەد حەمدی: مامۆستا.

١- جەنابی ڕەشید زەکی کابان موفەتتیش عام.

لە پاش تەواوبوونی دامەزراندنی مامۆستا و قوتابخانەکانی ناو شار و دێهاتەکانی تریش قائمەیان پێشکەش بە بارەگاهتان ئەکرێت.

وەزیری زانستی

حاجی مستەفا پاشا

دیسان لە ڕۆژنامەی بانگ کوردستان ژمارە ١١دا

بۆ زانین

بۆ ئاغا و کوێخا و هەموو دانیشتوانی کوردستان:

ئیمڕۆ ڕۆژی یەکیەتی، برایەتی و یەکگرتنە. جا، دزی، جەردەیی، خراپە زۆر شوورەییە. دەبێت

زۆر باش بزانن و ئاگادار بن. لە ناو و یان لە نزیك هەرچی جێگە، دێ، مووچە، چاندگە، ڕێگەیەك، خراپەیەك ڕوو بدات سزای دانیشتوانی ئەو جێگایە ئەدرێت و بەرامبەر بەو خراپەیە فەرمانی خوا (قورئان) بە کاردەهێنرێت جا هیواداریں هیچ نابەجێییەك ڕوونەدات.

مەحموود

حوکمدار

سوپا و سوپاییەکان

ئەو زابتە کوردانەی لە تورك بەجێ مابوون و لە سوپای عێراقدا لە بەغداوە ئەنێررانەوە بۆ سوپاکەی خۆیان، کوردستان:

ناویان و کاری تازەیان

١- ئەرکانی حەرب تۆفیق وەهبی: سەریاوەری حوکمدار.

٢- خالید سەعید: فەرماندەی پیادە.

٣- ڕەشید ئەفەندی ئەمین ئاغا: فەرماندەی پیادە

٤- ئەمین ڕەواندزی: مودیری نەخۆشخانە.

٥- عەبدولعەزیز ئەفەندی: زابتی پیادە.

٦- عەزیز حکمەت قەزاز: زابتی پیادە.

٧- عەزیز کوردی: زابتی پیادە.

٨- عەلی کوردی: فەرمانەدەی سواری.

٩- فائق کاکە ئەمین: فەرماندەی پیادە.

ئەو زابتە کوردانەی کە لە (لیڤی)وە مابوونەوە:

١- یونس عەبدولقادر: کەپیتان.

٢- ڕەشید عەبدولکەریم: لیفتنەنت.

٣- ڕەمزی عەبدولکەریم: لیفتنەنت.

٤- ڕەشید سدقی غەفوور: لیفتنەنت.

٥- ئیبراهیم زۆری: لیفتنەنت.

٦- حیکمەت ئەمین: کەپیتان.

٧- عەزیز حیکمەت: کەپیتان.

٨- محەمەد ئەفەندی- جل خوار: لیفتنەنت.

٩- عادل شێخ سەلام: کەپیتان.

١٠- سالّح ڕەفعەت: مێجەر، بوو بە مامۆستا لە ناوەندیی مەحموودی.

ئەو زابتانەی لە تورك بەجێ ماون و یەکسەر گەڕانەوە بۆ سوپایی:

١- قادر ئەفەندی قەرەداخی: یوزباشی.

٢- سەید ڕەزا ئەفەندی: یوزباشی.

٣- مەجید بەگ حاجی ڕەسوول بەگ: یوزباشی.

٤- سەید رەئووف ئەفەندی: یوزباشی.

٥- سەبری ئەفەندی (کاکەڕەش): ] لە تورکیا زابت ئیحتیات بوون نەچوونە ناو سوپا، بەڵام
٦- ئەحمەد تەقی: ] لە کارا نەبینران.

بەراتی حوکمداری

لە پاش سوپاس بۆ وەزیری زانستی حاجی مستەفا پاشا لە لایەن حوکمدارەوە (دوو هەزار) ڕووپیە درا بە وەزارەتی زانستی بۆ تەواوکردنی کەموکوڕیی قوتابخانەکان.

قوتابخانەی مەحموودی: ٥٠٠، قادری: ٥٠٠، ڕەئووفی: ٥٠٠، لەتیفی: ٥٠٠ ڕووپیە.

دیسان شێخ مەحموود و ئینگلیز:

لەمەوپێش و لە نووسراوەکانی (مامۆستا الدرة)دا بەبێ دەستکاری و بە عەرەبی نووسراوەکان خوێنرایەوە، کە وترا شێخ مەحموود لە فێڵی ئینگلیزەکان گەیشت، هێنانەوەی بۆ باشیی کورد نەبوو بۆ بەجێهێنانی مەرام و کارە نهێنییەکانی خۆیانە و دووریش نییە کارەساتەکەی ١٩١٩یش تازە نەبێتەوە.

قۆڵتەکانی پێش ئینگلیز زۆر بوو

١- شۆڕش لە هەموو شار و دێهات و سەرووبنی چیایەکدا.

٢- نوێز دەمیر و کۆمەکە بەهێزەکەی.

٣- کارە گرنگەکەی مووسڵ.

زۆر قۆڵتی تریشیان لە پێشەوە بوو، کە ئەمانە هەمووی پاش گرتنی شێخ مەحموود و شۆڕشەکەی ١٩١٩ کەوتە ڕوو و چارەیان پێ نەدەکرا. لە توانایشیاندا نەبوو، کە سوپایەکی گەورە و جەنگی بهێننەوە بۆ عێراق، شێخ مەحموودیان هێنایەوە.

شێخ مەحموود، پێش هەموو داوا و پێویستێکیان، داوای بەجێهێنانی بەڵێنەکەی لێ کردن، کە ئازادیی کوردە. وە نەبێت ئینگلیزەکانیش خۆیان هەر لەو بەڵێن و ژوانەدا پێشان نەدابێت،

یان لاریان لە دانی ئازادیی کورد بوویێت.

دەیانویست شێخ مەحموود بکەن بە مەقاش و هەموو ئاگرەکەی پێ بکوژێننەوە، ئیتر شێخ مەحموودیش تێ گەیشت کە دەبێت پرۆگرام بگۆڕێت. کۆمەڵی وەزیرانی کۆ کردەوە و بە ئاشکرا ویستنەکانی ئینگلیزی تێ گەیاندن. زانرا کە لەو بیر و باوەڕەدا نین ئازادیی کورد بدەن.

لە تشرین دووەمی ١٩٢٢دا بانگی (مەلیکی کوردستان)ی بۆ خۆی دا. بەڵام بە پێچەوانەی ئاواتی ئینگلیزەکان دەستی کرد بە بەهێزکردنی سوپا و لەشکرئارایی و پێی وتن، کە ئیتر پێویستە بۆ دامەزراندنی کاروباری حکومەتەکەی بچێت بۆ کەرکووك تا وەکو بتوانێت بە تەواوی فەرمانەکانیان بهێنیتە جێ.

ئینگلیزەکان بەم باسە کەوتنە لۆقە. وایان پێشان دەدا، کە نەك لە ماوەیەکی دوورا، لە ماوەی هەناسەدا ئیستیقلالی کورد دەدرێت و وا دەزانرا، کە لە ناو لەپیاندایە و حوکمداریش لە داواکەی خۆی نەدەگەڕایەوە، کوردیش تێ گەیشتبوو کە ئینگلیز هیچ نادات.

بەفەرمانی حوکمداری ڕۆژی ٢٤ سەفەر ١٣٤١ و ١٥ تشرین یەکەم ١٩٢٢ ڕۆژی دوو شەممە و پێنجشەممە بۆ کۆبوونەوەی وەزیران و لە هەموو کاتێکدا بۆ کاری پەلەیش، بینینی حوکمدار بە وەزیران گەیەنرا و ئامۆژگاری کران بۆ دروستکردنی بودجە و میلاکی سوپایی و موڵکی و موفەتیشی عوموومی بۆ گەڕان و ڕێکخستن وریا کرایەوە.

### سوپای کوردستان

ساڵح زەکی ساحب قران کە قائیمەقامی عەقرە بوو و لە پیاوە ناسراو و زاناکانی کوردبوو، هاتەوە بۆ سلێمانی. کاروباری فەرماندەیی گشتیی پیادە و سوارەی سوپایی پێ سپێررا. خۆی بینباشیی عوسمانییەکان بوو. چووە ڕیزی زابتە کوردەکانەوە.

ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارە ١ و ١٥ تشرین ٢، ١٩٢٢

### بەخشندەیی حوکمدار

بۆ پێویستیی تایبەتی دیوانی حوکمداری لە لایەن کۆمەڵی وەزیرانەوە مانگی (دە هەزار) ڕوپیە بڕیدە کرا.

لە پاش سوپاس لە لایەن حوکمدار شێخ مەحموودەوە، بۆ ئەوەی بۆ پێویستیی نیشتمان خەرج بکرێت، دایەوە بە گەنجینەی حکوومەتە تازەکە. ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان بە ناوی گەلەوە سوپاسی ئەم بەخشندەییەی لە ژمارە ١دا دەکات.

خوێنەواری بەڕێز:

وتمان، بۆ ئەوەی شێخ مەحموود سیاسەتی ئینگلیزەکان بە تەواوی بخاتە ڕوو و پەردە لەسەر مەبەسە نهێنییەکانیان هەڵماڵێت، بە بڕیاری کۆمەڵی وەزیران و پیرانی شار لە مانگی تشرینی دووەمدا بانگی مەلیکی کوردستانی بۆ خۆی دا. بەڵام ئینگلیزەکان ماوەی ئەوەیان نەدەدا، کە جەنگی کورد بە هیچ حکوومەت، یان گەلێکی خاوەن بەختدا بگات.

لە بەغدادەوە، لە پێویستییاندا، جار جار ناوی کورد و کوردستانیان دەژیانەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی پەیمان و ویستراوەکانی خۆیان بە حکوومەتی بەغداد کۆتایی بێنن و حکوومەتی بەغدادی بە کورد دەتۆقاند. لەگەڵ ئەوەیشدا ئینگلیزەکان تەنیا بە ئاڵۆزان و ئاشووبی کورد و عەرەبەوە ڕانەوەستان، بۆ کوردی تورکیا و ئێرانیش هەڵپەی دەکرد. بۆ دڵنیایی کوردەکان بە خاکی کوردستان و ئیستیقلالی کورد، سوێندیان بۆ کوردەکان دەخوارد و هانیان دەدان لە تورك بۆ بەجێهێنانی ئاواتەکەیان کە (ویلایەتی مووسڵ)ە هەروەها گەڕی ئالاندە ئێران، ئەو ئێرانەی، کە لە پاش جەنگی یەکەم ڕووس و تورك بە وێرانی و کاولی بەجێیان هێشتبوو. کەوتە زیندووکردنەوەی مێژووی شاهانی کورد و تازە کردنەوەی حدوودی کوردستان. بەڵام حکوومەتی ئێران بە ژیرانە جووڵایەوە.

کاتێك، لەگەڵ حکوومەتی بەغداد کاری پێك دەهات و پەیمان و مەرجیان تەواو دەبوو، بۆ خاوکردنەوەی ڕیسەکەی کورد و شێخ مەحموود دەکەوتە هاندانی ڕۆژنامەکانی بەغداد. لە ڕۆژنامەی (العراق) ژمارە ٧٣٨ و ٧٤٣ تشرین دووەم ١٩٢٢دا لە بابەت دروستکردنی حکوومەت و وەزارەتەکەی کوردستانەوە بە گرنگی دەیاننووسی و دەیانوت:

لە سلێمانیدا کۆمەڵێ ئیدارە پێك هێنرا، کە سلێمانی لیوایەکی عێراقە. زۆر باش دیار بوو کە ئەم گێژاوە لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە نییە. پیلانی ئینگلیزە و بە پارە. چونکە بە هیچ چەشنێك ماوەی نەدەدا ڕۆژنامە یان چاپکراوێك بێتە سلێمانی کەچی ئەو ڕۆژنامانەی کە پەلاماری هیوای کوردیان دەدا، بە هەزاران بڵاو دەکرایەوە. تەنیا بۆ تێکدانی برایەتیی کورد و عەرەب قوڵی هەڵماڵیبوو، هەرچەند لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستاندا وەڵام دەدرایەوە بەڵام گەیشتنی بە بەغداد جێی باوڕ نەبوو.

بە بۆنەی بانگی مەلیکی کوردستانەوە، لە شاری سلێمانیدا نومایشێکی بێ وێنەی سوپایی کرا. بەم بۆنەیەوە بەرامبەر بەو چاو و ڕاوەی ڕۆژنامەکانی بەغداد و بە پێچەوانەی ئەو وتووێژەی ئینگلیزەکان، کە گوایا حکوومەتی بەغداد و عەرەب نایانەوێت کورد ئازاد بێت ڕوونی بکاتەوە:

١- داوای حدوودی کوردستانی کرد.

٢- چۆنیەتیی سەرپەرشتیی بەریتانیا بۆ ئیستیقلالی کورد.

لەو نومایشەدا، دەستە دەستە پیادە و تیپ تیپ سوارەی سوپای بە چەك و هەموو پێویستیی سوپای تۆردووی کورد بە بەردەمی (مەلیك مەحموودی یەکەم) تێپەڕ دەبوون. بەڕاستی لە ژێر پێی ئەو لاوچاك و گەنجە چەکدارانەی ڕۆڵەی کوردا زەمین ئەلەرزا و لە لایەن گەنجە دەنگخۆش و دڵسۆزەکانەوە ئەم وتارە بەرز و بە نرخەی شێخ نووری بە ئاوازی سروودی سوپایی لە پێشداریی سوپاوە دەوترا:

ئەی عەسکەر، ئەی منداڵ و جگەر گۆشەی وەتەن
ئێوەن بەگیان بەدڵ کە پارێزگاری وەتەن ئەکەن
ئێوەن بەدڵ، کە سەرفی دەکەن غیرەت و بەدەن
ئێوە، وەتەن لە میحنەت و زیللەت نەجات ئەدەن
ئامادەن بۆ کەفەن

ئیتر وەرن، کە، بۆ وەتەن، وەتەن پاك پاك و میهرەبان
دەست دەینە دەستی یەکتری، یەك دڵ بە یەك زبان
ئێمەش بمانەوێت، وەکو خەڵقی حەقی ژیان
ئەم فرسەتە، غەنیمەتە، ئەڕوات لە دەستمان
تاماوە روح و گیان[1]

لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارە ٣ و ٦ کانوون ١، ١٩٢٢ ئەم فەرمانی مەلەکییە بڵاوکرایەوە پیرۆزییان لێ ئەکەن:

١- بینباشی ئەرکانی حەرب تۆفیق وەهبی، بوو بە سەریاوەری مەلیکی کوردستان.

٢- ڕەئیس عەشیرەتی زەنگنە عەلی ئاغا، بوو بە یاوەری مەلیکی کوردستان.

٣- ڕەئیس عەشیرەتی داودە ڕەفعەت بەگ، بوو بە یاوەری مەلیکی کوردستان.

٤- شێخ موحێدین کانی کەوە، فەرماندەی هێزی سوارەی تایبەتی.

٥- ماجید مستەفا: سەر موهەندیس.

لە ژمارە ٥ ڕۆژی کوردستاندا ئەم باسانە بڵاوکرایەوە:

جەمال عیرفان

لە دانا و زاناکانی کورد شەوی چوارشەممە ١٢/١٣ کانوون یەکەم ١٩٢٢، بە

١. ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارە ٦ لە ڕۆژنامەکانی عێراقەوە.

دەستڕێژێکی چەند کەسانێکی بەدکاری نەناسراو (جەمال عیرفان) کوژرا. بە ناوی هەموو کوردەوە داخی خۆمان دەردەبڕین لە دڵی هەموو کوردێکا بە ئاسۆری دەمێنێتەوە.

ڕۆژی کوردستان

لە بابەت ئەو(همت)ەکەی و بزووتنەوە دڵسۆزانەکەی (جەمال عیرفان) و کردەوە پەسند و بلێرانەکانیەوە لەمەوپێش بینرا و خوێنرایەوە: جا کۆسپی گەورە دێتە پێش پیاوی بەکار و بەنرخ نەك گەلۆر. هەرگیز ناوی جەمال نامرێت و بەشانازییەوە مێژووی کورد یادی دەکات.

ئالای کوردستان

پشت بەخوا، لە ناوچەی هەڵەبجەدا ئیمڕۆ ١٣ کانوونی یەکەم ١٩٢٢ ئالای کوردستان بە شادی و زەزەمەوە هەڵکرا. بە بای کێوەکانی کوردستان دەلەرێتەوە.

پشت بە خوای گەورە لە ناوچەی چەمچەماڵدا ڕۆژی ٢١ کانوون یەکەم١٩٢٢ ئالای حکوومەتی کوردستان هەڵکرا. ئیتر یان ژیانی ئازادی، یان مردن بە ئازایی.

ڕۆژی کوردستان ژمارە ٥

ئینگلیزەکان چییان کرد

لە لایەکەوە ڕۆژنامەکانی بەغدادیان هان ئەدا، کە ئاگر بنێن بە خەرمانی هیوای کوردەوە بە داوای ویلایەتی مووسڵ، کە عەرەبن و لە بەغداد عێراق جیا نابێتەوە. لە لایەکی تریشەوە، لە لۆزاندا بە ناوی کوردەوە ئاشووبی دەگێڕا و لەسەر پێستی کورد دەجەنگا.

لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٦دا، کە لە ڕۆژنامەکانی بەغدادەوە وەری گرتووە بەم چەشنە بڵاوی کردەوە.

لە کۆمەڵی لۆزاندا

١- نوێنەری تورك: لەبەر ئەوەی ویلایەتی مووسڵ عەرەب نین و بە زۆریان کوردن دەبێت بدرێتەوە بە تورك.

٢- نوێنەری ئاسووری: مووسڵ لە بناغەدا وڵاتێکی ئاسوورییە، دەبێت حکوومەتێکی سەربەخۆی ئاسووریی تێدا دروست بکرێت.

٣- نوێنەری عێراق جەعفەر پاشا: ئەم قسانە بێ بناغەن، شارەکانی ویلایەتی مووسڵ هی کوردە و کوردن، بە پێی پەیمانی (سیڤەر)، کە حکوومەتە سوێندخۆرەکان بڕیاریان داوە، دەبێت

بە سەربەخۆیی حکوومەتێکیان بیێ، ئێستە خۆیان حکوومەتێکی تەواو و مونتەزەمیان پێکەوە ناوە. لەگەڵ ئەمەیشدا حکوومەتێکی عێراق، کە ویلایەتی مووسڵی بە بەشی خۆی دانابوو، ساڵێکی بۆ تەرخان کردن، کە بتوانن مەرامی خۆیان پێشان بدەن بۆ ئەوەی لەگەڵ عیراقدا بژین، یان بە جیاوازی.

دیسان ئەو مۆڵەتەیش بەسەر چوو، خۆیان بە جیاوازی هێشتەوە و نەبوون بەیەك لەگەڵ عێراقدا و بۆ ژیانی سەربەخۆی خۆیان بەیەك دڵ هەوڵ دەدەن، کۆشش دەکەن. جا ئێستە بە حکوومەتێکی موستەقیل ئەناسرێن و مەلیکیان (مەلیك مەحموودی یەکەمە). لەبەر ئەوە هیچ حکوومەتێك حەقی پایەماڵکردنی ئەم حکوومەتەی نییە[1].

خوێندەواری خۆشەویست:

بێگومان، فەرموودەکانی جەعفەر پاشا دەستکرد و ناوئاخنی پرۆگرامی ئینگلیزە. لە لۆزان یا بە ڕۆژنامەکانی بەغداد، ئینگلیز دەیویست و ویستی، بە ناوی کوردەوە ویلایەتی مووسڵ لە گەرووی تورك دەربهێنێت. چونکە لە دواییدا دەتوانێت و توانی، بە لچ هەڵقرچانێك لە کورد، بە ئارەزووی خۆی بڕیار بدات.

دەیزانی کە شێخ مەحموود بەهێزە و کوردیش دەستبەرداری مافی خۆی نابێت. جا وەك دەڵێن (پادار بگرە و بێ پا ماڵی خۆمانە) بەسەر کوردیا هێنا.

لە پێش ئەوەدا بکەوێتە وتوویژی کۆمەڵی لۆزان، شێخ مەحموودی لە هیندەوە هێنایەوە و بەگوێیدا چرپان و بانگی (مەلیکی کوردستانی) پێ دا و حکوومەتێکی سەربەخۆ و وەزارەتی پێ دامەزراند. ئینجا نوێنەرەکەی و خۆی و عێراقی پێ فوو دا. بەرامبەر بە حکوومەتە ماندوو و لەچەرمەکەی تورك لە لۆزاندا قوتی کردەوە. ئەو پارێزگارییەی جەعفەر پاشایش، کە خۆی کوردە دەیزانی بۆ کورد نییە، بۆ ساخکردنەوەی ویلایەتی مووسڵە.

لە ئەنجامدا سلێمانیشی خستە سەر ۱۳ لیواکە و سەری دەرخۆنەکەی نایەوە. جا ئەمە بوو ڕابوردووی گەلی کورد. هێشتا کارەساتی مووسڵیش تەواو نەبوویوو، ئینگلیز بە تۆپ و فڕۆکە و بۆمبای کاتی (توقیت) و سوپای ۳۰/۴۰ هەزارییەوە ئەمجارەیش بە چەکی جەهەننەمی کوردستانی سووتان، وێرانی کرد. کورد لە ماڵ و دێهاتیاندا بۆ چیا دەربەدەر کران. لە هەندەران (خارج)یش بە ناوی حکوومەتی موستەقیل و ئازادەوە باس و باسی کوردی دەکرد.

بەڵام داخی گران ئەوەیە، زۆر لە دانا و پیاوماقووڵەکانی کورد بە هۆی زەربەدەخەنەیەکی ئینگلیزەکانەوە، خزابوونە بەغداد، لە پای گیرفاندا، لە پاش ئەوەی کە ڕەگی ژیانی کورد بڕرا،

---

۱. لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان ژمارە ۳ و ۳۰ تشرین ۲ – ۱۹۲۲

نەیانوت شێخ مەحموود نەیزانی.

جا ئەگەر خۆیان زانابوون، بۆچی وەکو چەکدارەکان کە گیانی خۆیان بەخت دەکرد ئەوانیش [نەچوون] و لە کۆمەڵی لۆزاندا بە زانایی و دانایی خۆیان پارێزگاری نیشتمانەکەیان بکەن، یان لە کۆمەڵی ئاشتی (سیڤەر)دا نەبوون بە هاودەردی شەریف پاشا، بۆ داوای مافی خۆی و نەوە و نیشتمانەکەیان بکەن، یان لە هەموو پێویستتر فەرمووەکانی جەعفەر پاشایان بەڕاست بگێڕایە.

ئەمەیش چاو بەستێکی تر لە لچمنەوە:

مژدەیەکی خۆش[1]

بە پێی تەلگرافێك کە لە نێرراوی کوردستان (مستەر لچمەن) لە بەغدادەوە هاتووە دەڵێت:

مەندووبی سامی بە ناوی حکوومەتی خۆیەوە پیرۆزی سەربەخۆیی (ئیستیقلال)ی کوردستان دەکات، بۆ ئەوەی ئەم ناو ئاخنانەیان بە تەواوی بکەوێتە ڕوو، ئەمە وێنەیەك لە بێ بەزەییێتیی ئینگلیز، کە دڵی دڵسۆزی ئادەمیزاد دەهێنێتە جۆش.

لمحات من تأريخ العالم

لە نووسینی: پاندیت جەواهیر لال نەهرۆ

لاپەڕە: ٣٤ و ٣٥

حدثت بعض القلاقل فی الأماكن النائية خصوصا فی المناطق الكردية فاستعمل سلاح الجو البريطانی فی إخضاع هذه الإضطرابات إلقاء قنابل من الجو وتهديم قری بأكملها.

وكان أحسن وصف لنتيجة محاولاتهم فرض السلام والنظام بالقوة، ما قاله الضابط الانجليزی الكولونيل السير ارنولد ويلسون، فی محاضرته فی الجمعية الآسيوية الملكية فی لندن ٨ يونيو ١٩٣٢ قد أشار فيها الی:

الذی قام به سلاح الجو الملكی فی قذف سكان الاكراد خلال العشر سنوات الماضية، وعلی الأخص خلال الستة أشهر الأخيرة، ان القری المهدمة والماشية المذبوحة والنساء المشوهات والاطفال المشوهين دليل يدحض، حسبما قالت، جريدة التايمس، علی طراز فريد فی المدنية.

ولما رأوا ان سكان القری يهربون ويختبئون عندما تقترب منهم الطائرات، ولم يظهروا روحا رياضية فی إنتظار القنابل الساقطة عليهم عمدوا لاستعمال نوع جديد من القنابل هی القنابل

---

١. ڕۆژی کوردستان ژمارە ٧

الموقوتة، وهذه القنابل لا تنفجر عند سقوطها مباشرة، وانما تنفجر بعد وقت محدود و قصدوا من هذه الحيلة الشيطانية ان يغرروا بالقرويين فيعودوا الى أكواخهم بعد انصراف الطائرات. فتتفجر فيهم القنابل عندئذ. كان الذين يموتون فى هذه الغارات يعتبرون سعداء بالنسبة لاولئك الذين يشوهون فتقطع أيديهم أو أرجلهم او تصيبهم عاهات خطيرة و خصوصا لفقدان التسهيلات الطبية فى تلك القرى النائية. وقد نجحت هذه الغارات فاستتب الامن والنظام.

وه له لاپەڕه ۲٥۹ و ۲٦۰يشدا دهفەرمووێت:

ان توركيا أصبحت دولة متماسكة وان العناصر الدخيلة فيها قد تقلصت كثيرا، ولكن ظل فى شرق توركيا شعب غير تركى متآخم للحدود التركية الفارسية، وهم الاكراد القدماء الذين كانوا يتكلمون اللغة الفارسية وكانت بلادهم كردستان مقسمة بين تركيا و فارس و العراق ومنطقة الموصل. وقد نقص عدد الاكراد من ۳ ملايين الى مليون ونصف، وكان نصف هؤلاء يقطنون داخل حدود تركيا، وقد قامت هذة الفئة بحركة قومية بعيد الثورة التركية عام ۱۹۰۸ كما طالب ممثل الاكراد فى مؤتمر الصلح فى فرساى باعطائهم الإستقلال القومى.

وفى عام ۱۹۲٥ قامت ثورة كبيرة فى الرقعة الكردية من تركيا وكان ذلك أيام الإحتكاك الناشب بين بريطانيا و تركيا حول منطقة الموصل التى كانت قسما من المنطقة التركية الكردية والتى قامت فيها الثورة. فاستنتج الأتراك ان الأصابع البريطانية هى التى حركت العناصر الدينية المتطرفة ضد إصلاحات مصطفى كمال ومع انه يصعب الحكم عما اذا كان البريطانيون هم المحرضين. غير انه من المؤكد ان بريطانيا قابلت ثورة الاكراد فى تركيا بالارتياح. واوضح ايضا ان النزعة الدينية كان لها أثر فى هذه الحركة كما كان للقومية الكردية سهم اخر، وربما كان سهم أوفر.

وقام مصطفى يعلن ان بريطانيا هى المحركة للاكراد. مما جعل المجلس الوطنى يسن قانونا يلحق الخيانة العظمى بكل من يستخدم الدين كوسيلة لاثارة الشعور الشعبى سواء بالكلام او بالنشر ويوقع تحت طائلة العقوبة القصوى. وحرم أيضا تعليم المبادىء الدينية التى تناقض الولاء للجمهورية فى المساجد. وقضى كمال پاشا بعد ذلك على الاكراد بلا رحمة، وأقام محاكم (الاستقلال) الخاصة لمحاكمتهم بالالوف و اعدم الزعيمان الكرديان الشيخ سعيد و دكتور فؤاد وغيرهما الذين ماتوا وأمنية إستقلال كردستان لا تفارقهم.

وهكذا نرى ان الاتراك الذين حاربوا مؤخرا للحصول على حريتهم سحقوا الاكراد لمطالبتهم بحريتهم. فما اغرب تحول قومية من دفاع عن الوطن الى هجوم لسلب حرية الغير. وفى عام ۱۹۲۹ ثار الاكراد ثانية، ولكن ثورتهم سحقت ولو الى حين. اذ كيف يمكن ان تخمد الى الابد ثورة قوم يكافحون من أجل الحرية وهم مستعدون لدفع الثمن.

ولم ينج من ذلك زعماء المجلس او زملاؤه القوميون اذ كانوا من معارضيه. أما رؤف بگ، الذي كانت الحكومة البريطانية قد نفته الى مالطة والذى اصبح فيما بعد رئيسا لوزراء تركيا، فقد حكم عليه غيابا. و كثير من الضباط والعسكريين الذين حاربوا بجانب الغازى فى حرب الاستقلال حل بهم الخزى والعقاب وحتى الموت، وكانت التهمة الموجهة الى هؤلاء التامر مع الاكراد او التآمر مع العدو اللدود بريطانيا ضد سلامة الدولة.

برِاينه:

ئینگلیز سەرچۆپیکێشی ئاواتی کورد بوو بۆ سەر کەندەلانی مردن و خۆی بە ئافەریدە و بەخشندەی کورد دەزانی. بە هاندان، بە پەنجە تێکێشان و بە سوپای بێ ئامانی خۆی، لە کتەکردنی برِاننەوەی کورد درێغیی نەکرد، ئەوە بوو لە هەڵبژێرراوەکانی باندویت لال جواهر نەهرۆ و کارەساتی کوردی تورکیا، چۆن دوایی هات، هەر دوا بەدوای جەنگی یەکەم لە شۆرِشی شێخ مەحموود لە عێراق، شۆرِشی سمکۆ لە ئێران، بە شۆرِشی شێخ سەعید و شۆرِشی دێرسم لە تورکیادا چ رەنگ و رِیسەیەکیان رِشت، مەگەر ئینگلیزەکان خۆیان زانیبێتیان چ کارێکیان بەسەر کوردا هێنا.

ئێران

لەم رِۆژە تەنگ و تاریکەدا، کە ئینگلیز هێنای بەسەر کوردا، ئێرانیشی لە ژیانی کورد خستە جووڵە. وای تێ گەیاندن کە بە زوویەکی زوو حکوومەتێکی توند و تۆڵ بۆ کورد دروست دەبێت و ئەم کوردستانەیش تەنیا عیراق نابێت و بێگومان شۆرِش دەخاتە ئێرانیشەوە.

لەسەر ئەم باوەرِە بە رِۆژنامەی (ستارەء ئیران) لە ژمارە ٧٠ و رِۆژی ٩ ربیع الاول ١٩٤١ کەوتنە کوتانەوەی سەر و گوێلاکی کورد.

بەڵام شێخ مەحموود بەرِاستی چاکەخوازی ئێرانە و نەیدەویست هیچ قوڵت و خراپەیەک بێتە پێش ئاواتی حکوومەتی ئێران. بە گورجی تێی گەیاندن، کە ئەم ئاشووبە هی ئینگلیزە و رِاست نییە.

لە پاش ئەوەی سمکۆ، کە لە شۆرِشەکەیدا سەر نەکەوت. هەر وەکو ئینگلیزەکان لێیان شێواند هێنایشیانە هەولێر، بۆ بەکارهێنانی لە سیاسەتی خۆیاندا و لە هەولێرەوە تەلگرافیان پێ نووسی بۆ شێخ مەحموود. ئەمە وێنەی تەلگرافەکانە لە تورکییەوە بە کوردی:

سلێمانییە، حوکمداری مەزن

ئیمرِۆ چاکە و خراپەی کورد کەوتۆتە بەر دەستی پیرۆزتان، هیچ بە باشی

نازانین بەبێ فەرمانی ئێوە هیچ کارێك بکرێت. دڵتان بسووتێت بە لێقەوماوی وەکو ئێمە و میللەتی کورد. بۆ یارمەتی و ڕزگارکردنی ئەم نیشتمانە لێتان دەپاڕێینەوە.

سمکۆ

١٤ کانون یەکەم ١٩٢٢

هەولێر

هەولێر، قارەمانی کوردستان ئیسماعیل ئاغا

ڕەنگە بزانن کە بە تاك و تەنیا لە ڕێگای ساندنی مافی گەلی کورد و لە پێش هەموو کەسێکەوە چۆن گیانی خۆم بەخت کردووە و تووشی چوورتمی چۆن بووم. ئیمرۆ بە یارمەتیی قارەمانێکی نیشتمانپەروەری وەکو ئێوەوە بەو ئاواتە گەیشتنمان چەند ئارەزوو دەکەم. وا دەزانم پێویست بە نووسین ناکات. چونکە دەزانم خۆتان دەتوانن تەقدیری بکەن، بەبێ هێز و بەبێ یارمەتی و یاریدەدەر، ئەگەر خۆمان بهاوێژینە ناو ئاگری بەریەرەکانی، گومان مەبەن کە دەبێتە هۆی لە ناوبردنی کوردی هەژار لە بنەڕەت. تا ئێستا بە ڕەسمی و بە تەواوی سەربەخۆیی نەدراوە بە کورد، کە بتوانین بەریەرەکانیی حکوومەتەکان بکەین. لەگەڵ ئەوەیشدا لە داوای مافی خۆمان دوا نەکەوتووین. بەڵام بە قسە خەڵەتێنراین. سێ مانگ لەمەوپێش لەو ژوان و پەیمانەی حکوومەتی بەریتانیای گەورە بە ئێمەی دابوو، هیچی بەجێ نەهێناوە تاوەکو ئێمەیش بتوانین پێشانی قەومەکەمانی بدەین، لەسەر حەق، پێمان خۆشە بجەنگین. بەڵام نامەوێت بێ سوود خوێنی کورد بڕێژم. ئەگەر حەقی خۆمان پێ بەخشرێت، ئەو کاتە دەبێت خۆمان لە دوژمنی بەدکار دوور بخەینەوە و هەر لە دوورەوە دەتوانم هەموو فەرمانێکی حکوومەتی بەریتانیای گەورە لە شیرازەی یاسادا بەجێ بێنم. ئەگەر زیاتر ئارەزووی تێگەیشتن و گفتوگۆ دەفەرموون بۆ سلێمانی، تەشریف فەرموونتان تکایە.

مەحموود

١٤ کانوون ١، ١٩٢٢

سلێمانییە، حوکمداری مەزن

لە حکوومەتی ئینگلیز بەولاوە کەس نییە سەربەخۆیی بە ئێمە ببەخشێت و بەرامبەر بەو چاکەیەی لە گەڵمان دەکات چاوەڕوانی پاداشە و ئەم حەقە

بێگومـان دەتوانین بسێنین. من ئامادەی ساندنی ئەم حەقەم ئەگەر لە لایەن حوکمدارەتیتانەوە فەرمانم پێ بدرێت، بەبێ ڕژاندنی خوێنی موسڵمانان و وای بە باش دەبینم، کە بە یەکەوە دوژمن لە ناو خۆماندا دەربکەین و حەقی خۆمان لە بەریتانیا و عەرەب وەربگرین.

سمکۆ

هەولێر، قارەمانی کوردستان ئیسماعیل ئاغا

بۆ هەموو بەخشندەییەك، بۆ هەموو چاکەیەك، دەبێت سوپاس بکرێت. بەڵام بۆ چاکەیەك کە شایانی سوپاس نەبێت، ئەرك کێشانە و لەڕێی بێگانەدا بە خۆڕایی گیان بەختکردنە. لەگەڵ ئەوەیشدا بێجگە لە حکوومەتی بەریتانیا کەسێکی تر نابینم کە حەقمان بداتێ. بەوانەیش کە زەریە لە حەقی کورد دەدەن چوونە بەریەرەکانییان زۆر بە پێویست دەبینم. بە بێ هوودەیش بچینە کۆڕی بەریەرەکانییەوە بە شوورەیی دەزانم. بۆ بەجێهێنانی ئەو پەیمانەی، کە حکوومەتی بەریتانیا داویەتی بە کورد ئەگەر بەجێی بهێنێت میللەتی کورد ئامادەیە بۆ لەناوبردنی ئەو دوژمنەی نەهێڵێت ئەو حەقەمان بدرێتێ، ئەگەر بە تەواوی ئیعتیرافمان پێ بکات و بە حکوومەت بزانرێین و یاریدەدەرمان بێت بەرامبەر بە دوژمنمان. بەڵام ئەو دوژمنەمان ئێستا کێیە، نایناسم و نایشزانم کام حکوومەت حەقمان دەداتێ. بەبێ وەرگرتنی حەق لەگەڵ کێ و بۆچی بجەنگین. بۆچی و بۆ سوودی کێ خوێن بڕێژین. ئیتر بەبێ دوژمنایەتی لە ماڵی خۆمدا دانیشتنم بە لاوە پەسەندترە.

مەحموود

سلێمانییە حوکمداری مەزن

دەستتان ماچ دەکەم بێتو بکەومە ژێر سێبەری گەورەییتان خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم. هەموو کار و ڕاسپێرییەك بە ئیسماعیل ئاغا گەیێنرا گەورەم.

سەیدتەها

هەولێر، برای خۆشەویستم سەید تەها

ئەو گەورەییەی بەرامبەر بەم برایەتان ڕەوا بینیوە زۆر سوپاستان دەکەم. وەڵامی فەرمایشەکانی ئیسماعیل ئاغام داپەوە. من کوردم و بۆ کورد دەژیم

لەبەر ئەوە ژیانم بە مەزنی و بەختیاری دەزانم. فیدای هەموو قارەمان و نیشتمانپەروەرێکی کوردم.

مەحموود

ئەم تەلگرافانە لە هەولێر لە لایەن (چەپمەن) وە ڕێك دەخرا و بە ئاگاداری و ئارەزوویان دەنووسرا.

ڕۆژی ١٤ کانون دووەم ١٣٣٩ – ١٩٢٣، بڕیاری هاتنی قارەمانی کورد (سمکۆ – ئیسماعیل ئاغا) درا.

بەپێی فەرمانی مەلیك مەحموودی یەکەم، بۆ بەجێهێنانی کاروباری بەپیرەوەچوونی سمکۆ، سەرنووسی ملووکانە تاهیر ئەفەندی و سوپا سالار شێخ قادریش بە ١٠٠ سواری سوپاییەوە نێرران بۆ ڕێگەی هاتنیان لە ڕانیەوە.

ڕۆژی ١٨ کانوون دووەم ١٣٣٩ هەموو دائیرەکانی میری داخرا. دووکاندار دووکانیان داخست. بە سواری یا پیادەیی هەموو دانیشتوانی شار پتر لە نیو سەعات ڕێگە لە سلێمانییەوە دوور کەوتنە ڕێ. ژن و منداڵ لەسەر شەقام و کۆڵان و سەربانەوە چاوەڕێیان دەکرد.

وەزیری داخلیەی کوردستان و وەکیلی فەخامەتی مەندووبی سامی، کاپتان چەپمەن و لە ڕەفاقەتییاندا کاتبی ملووکانە ئەحمەد خواجە*بە ئۆتۆمبێل ماوەی یەك سەعات لە شار دوور ڕۆیشتن.

گەردوونەی مەلیکی مەزن لە کاتژمێری ١١:٣٠ پێش نیوەڕۆدا نزیکەی ماوەی نیو سەعات لە شار دوور کەوتەوە. ئەم گەردوونە و بە پیرەوە هاتووانە لە جێگە دیاریکراوی ڕێگەدا چاوەڕێی هاتنی میوانی مەزن و خۆشەویست دەکرا و لە هەر دوو بەری شەقامدا ڕیزبەستەیی چاوەڕێیان دەکرد.

لە کاتی گەیشتنی ئاغای مەزن و دلێر، لەگەڵ ئەحمەد ئاغای برای و خزم و خوێشانی و سەرۆك عەشایرانی پشدەر بابەکر ئاغا و ئاغایانی مەنگوڕ و مامەش، کە نوموودار بوون، گەردوونەی مەلیکی مەزن چووە پێش و لەگەڵ بە یەکتر گەیشتندا پیادە بوون و بە خۆشی ئامێزان بوون، سمکۆ لەگەڵ مەلیکی مەزندا بە ئۆتۆمبێل و هەموو بە پیرەوە هاتووواندا بۆ سلێمانی گەڕانەوە تا بەر قۆناغی تایبەتی.

حەوت تۆپی مژدەدەری خۆشی تەقێنرا. لە لایەن قوتابیانی ڕیزبەستەی خۆشهاتی و گۆرانیی کوردی و سروودی نیشتمانی خوێنرایەوە.

---

* نووسەری چیم دی.

لە بابەت سوپاسی بەپیرەوە چوون و ڕێزگرتنی هاتنی و لە لایەن سەردار نەسرەت سمکۆیشەوە نووسراوێك بە هۆی ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستانەوە بڵاوکرایەوە.

باسی بەسەرا هاتووی گەلی کورد ئێجگار زۆرە. بە ناچاری بۆ کورتکردنەوەی باسەکان، بەسەر زۆر ڕووداودا بازمان دا، چونکە ئەوەی بەسەر ئەم گەل و حکوومەتە پڕ گێچەڵەی کە بەریتانیا بە کوردی بەخشی، هاتووە، تەواو نابێت:

وتمان، زۆر لە زابت و کوردە ڕەقاوە (مثقف)ەکانی کورد لە پاش گەڕانەوەی شێخ مەحموود لە هیندستان، بۆ گیان بەختکردن و هیوای دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی لە بەغداد و هەندەرانەوە بە باڵەفڕێ دەهاتنەوە، یان دەنێررانەوە بۆ نیشتمانە کەیان، بە دڵسۆزی و ڕێزەوە، دەخرانە کار و کایەوە، سوێندی دڵپاکی و گیان بەختکردنیان دەخوارد، بەڵام ئایا؟ حاجی مستەفا پاشا چاکی نەدەفەرموو کە لە ڕۆژنامەکەیدا بە پێشەکی دەینووسی:

قوربانی بەندی کەیفتم          تا پوولداری رەفیقتم

ئەم وتەیە زۆر باش هاتە دی. نامەوێت یەکە یەکە ناوی ئەو دڵسۆزە درۆزنانە پێشان بدەم، ئەوەکو ئەوانی تریشمان ببن بە چاو لێکەریان. بەڵام لە باسەکانی دوایی لەجێی خۆیدا ناچارین بیانخەینە ڕوو، کە بۆ چنۆکیی گیرفانیان، خۆیان بەدناو کرد و پەڵەیەکی گەورەیان دا بە پشتی شۆڕشەکەیاندا.

گەل، عەشایر و نیشتەجێیەکانی کورد، بە داوای ئازادی بەبێ پشوو شێخ مەحموودیان وەڕز کردبوو. لەسەر ئەم داوا و پشت بە تێگەیشتنی گەلەکە، هەموو ڕۆژێك لەگەڵ (چەپمەن – دانشمەندی سیاسی)دا وتووێژی دەکرد. تێی دەگەیاند کە کار جێبەجێ بکات، بەڵام چەپمەن ڕای دەبوارد و خۆی گێل دەکرد. بڕیاری دا، کە بە تایبەتی بانگی بکات و لە دیواندا مەرامی تێ بگەیەنێت. لە پاش بینین چەپمەن داوای خەڵوەتی و پەنهانیی لێدوانی کرد. لەو کاتەدا داواکانی شێخ مەحموود لە چەپمەن ئەمە بوو:

١– حکوومەتی بەریتانیا بانگی ئازادیی کورد بە حکوومەتەکاندا بڵاو بکاتەوە.

٢– یارمەتیی ئابووری و کشتووکاڵ بدا.

٣– یارمەتیی تەواو بدات بۆ بەرزکردنەوەی زانیاریی سوپایی. بەڵام چەپمەن وەڵامەکەی زۆر کورت و خۆش بوو.

فەرمووی: «دەبێت کورد لەگەڵ عەرەب ڕێك بکەوێت». شێخ مەحموود وتی: ئەم قسەیەم زۆر پێ ناخۆش بوو. ئێمە براین هیچ ئاڵۆزی و دوژمنایەتییێکمان نییە و نەبووە، لەسەر چ ناڕێکییەك ڕێك بکەوین. ئێمەتان بە تۆپ و لوولەی تفەنگ نەگرتووە. ئەگەر وەکو بەڵێنتان بە

کورد و من داوە، ئازادیی کورد نەدەن، دەیسێنن. کورد چەکدارە و خاوەن دەسەڵاتە ئەمجارەیش مەبن بە هۆی خوێن ڕشتن و بە ڕژاندنی خوێنی کوردی هەژار، مێژووی بەریتانیا بە خراپە مەڕازێننەوە. چونکە ئەوەی دواڕۆژتان باش یادتان ناکەن.

چەمەن ترسا، بای داوە داوای مەزبەتەی کوردی کرد. مەزبەتە جێبەجێ کرا. نێررا بۆ مەندووبی سامی بە هیوای بانگ و مژدەی ئازادی و سەربەخۆیی. بەڵام گوێی ئینگلیز لە بیستن کەوتبوو.

بۆ بێوڵەتیی کورد، لە بابەت گەیشتنی ئوێز دەمیر و بلووکە سەربازەکەیەوە بە کانیەڕەش، لەمەوپێش نووسراوەکەتان خوێندەوە.

لە شارەکان و قەزاکانی هەرسێ[1] لیوا و بادیناندا هاوژوان و پەیمانیان لە برەودا بوو، لەشکر و هێزێکی گەورەی دواکەوت. لەبەر ئەوەی شێخ مەحموودیش هیچ باوەڕی بە ئینگلیزەکان نەمابوو، بەربەستی نەدەکردن و بە ئاشکرا لە ناو شاری سلێمانیدا سێ[2] هێز لە کارا مابوو.

چینی یەکەم: بە پڕوپاگەندە خەریکی دامەزراندنی ئاواتی ئینگلیزەکان بوون بۆ ڕووخاندنی قەڵای هیوای کورد.

چینی دووەم: ئەمانەیش خەریکی تورك خواهی بوون بە ناوی ئیسلامەتییەوە بۆ ڕووخاندنی قەڵای هیوای کورد و ڕماندنی کەڵەکی دڕۆی ئینگلیز. بەبێ ئەوەی بزانن تورکیا جمهورییەتە، هەر بە ناوی ئیسلامەوە تێ دەکۆشان.

چینی[3] سێیەم: یەکسەر بەبێ پێچ و پەنا خەریکی نیشتیمانپەروەری و گیان بەختکردن بوون لە پێناوی کورد و کوردستاندا و بەربەرەکانیی دوو چینی سەرەوە بە دڵێکی پۆڵاینەوە چەند ئینگلیزەکان تەنگاو بکرایە و زیانیان ببینیایە، دەستبەرداری شێخ مەحموود نەدەبوون. وایان دەزانی بۆ کاریان دەست دەدا، بۆ کاری ویلایەتی مووسڵ.

لەگەڵ ئەوەدا کە شێخ مەحموودیان زۆر پێویست بوو، کەچی:

١- لە هەولێر: بۆ ئەوەی پڕپۆڵەکەی کورد یەك نەگرێت، ئەحمەد ئەفەندیی کاتبی بەلەدیەیان کرد بە ڕەئیس بەلەدیە و موتەسەڕیفی لیوا و کردیان بە هۆی تێگەیاندنی کوردەکان کە لیوای هەولێریش داوای ئیستیقلال بکات و لە شێخ مەحموود و سلێمانی دووریان بخاتەوە.

٢- لە کەرکووك: مەجید یەعقووبی رئیس بەلەدیە بوو ئەویشیان کرد بە موتەسەڕیف بۆ ئەوەی

١. ئینگلیز خواه: زابتەکان و هاو پەیمانەکانیان.

٢. تورك خواه: زابتە کۆنەکانی عوسمانی و هاودەردەکانیان.

٣. کورد خواه: چینی لاوان بە دڵێکی پۆڵاینەوە.

بە تەواوی لە سلێمانییان جیا بکەنەوە (مێجەر میللەر) ناوێکی تورکیزانیان دۆزییەوە و بە ناوی حاکمی سیاسییەوە ناردیان بۆ کەرکووک، ئەم ئینگلیزە تورکیزانە و موتەسەڕیف هانی کەرکووکییەکانیان دەدا داوای ئیستیقلالی خۆیان بکەن و هەر بۆ ئەوەی لە سلێمانییان بپچڕنەوە.

٣- لە سلێمانیش بانگی مەلیکی کوردستانی بۆ شێخ مەحموود دەدا.

٤- داوای کەریم بەگی هەمەوەندیان دەکرد، کە شێخ مەحموود بە پەل بەستراوی بیداتە دەستیان و لە خوێنی ئینگلیزەکانی لە ڕێگەی مورتکە کوشتنی، بیکوژنەوە.

٥- زۆر بە پەلە ئۆێز دەمیر دەریکات و بە لەشکری کوردەوە جەنگ لەگەڵ تورکدا دابمەزرێنێت، بەڵام شێخ مەحموود پێی دەوتن، سەربەخۆیی کورد بدەن دەبم بە سوێندخۆر و کارگوزارتان، ئەگینا نابم بە دوژمنی کەس لە سوودی بێگانەی بێ سوودا. کورد هاوڕیانی ئەو حکوومەتەیە کە مافی ئازادیی بداتێ. کە کورد سەربەخۆ بوو ویلایەتی مووسڵیش کوردستانە، وەڵامی دەدانەوە.

بەو داوا وەڵامانەوە نەوێستان. حاکمە سیاسییەکان (زابتە سیاسییەکان) زۆریان نووسی. ئیتر مەندوویی سامی تێ گەیشت، مانەوەی ئۆێز دەمیر، لە کوردستاندا دەبێتە هۆی شێواندنی کارەسات و بێگومان مووسڵیان لە دەست دەچێت.

داوای شێخ مەحموودیان کرد بچێت بۆ بەغداد. شێخ مەحموود تێ گەیشت بۆ ئەوەی بە لەشکری کورد ئۆێز دەمیر دەربکەن، داوای دەکەن. لەگەڵ ئەوەیشدا لە کوردەکان بگەیەنێت کە مووسڵ هی عێراقە، جا ئەم چوونە لە سوودی کورد نییە و لە پاشەڕۆژدا لە لایەن کوردەوە پرسینەوەی دەبێت.

لە وەڵامدا، شێخ مەحموود وتی: بە نووسین داوام لێ بکەن و بە نووسین وەڵام دەدەمەوە، بەڵام بەو مەرجەی لە پێش بەجێهێنانی هەموو فەرمانێکدا:

١- بانگی ئیستیقلالی کورد بدەن و ئالای کورد هەڵدرێت، ئامادەی هەموو فەرمانێکە.

٢- لە پاش بەجێهێنانی ئەم داوایە دەچێتە دێیەك لە دێهاتەکانی خۆی و گۆشەنشین دادەنیشێت و یەکەمین کەس دەبێت، کە بۆ ئەو سەرۆکی کوردەی هەڵدەبژێرێت سەری فەرمانبەری دابنێت.

ئەم وەڵامەیشی نەبیسترا، چوونی بۆ بەغداد داوا کرایەوە و ئەمجارەیش فریشتە بەدوومەکەی کورد (مێجەر نوئێل) هاتەوە، بۆ ئەوەی بە تەواوی پاشقولەکەی خۆی لە شێخ مەحموود و کورد بدات، بەڵام شێخ مەحموود پێی وت: من کوردەکانم دووچاری داوی ئێوە (ئینگلیز) کردووە. جا

ئێستە کوردەکان، ئینگلیز یان تورکیان بوێت من لەگەڵیانم و تەنیا خۆم لەگەڵ درۆی ئێوە نابم. مێجەر نوئێل باش دەیزانی کە زۆرترینی کوردەکان داویانەتە کۆمەکی ئۆێز دەمیر و تێ گەیشت کە شێخ مەحموودیش پەنجە ناکێشێتە ناویان. ئیتر زانی دەفەکەی دەنگ نادات، گەڕایەوە بۆ بەغداد.

پڕوپاگەندەی ئۆێز دەمیر تەنیا لە کوردستاندا نەبوو، زۆر بە گەرمی کەوتە ناو عەرەبستان و بە تایبەتی مووسڵ و بەغداد.

هەر وەکو تورك خواهی پەرەی ساند، پیاوخراپیش خۆیان خزاندە پەنای شێخ مەحموود، لەبەر ئەوەی لە لوتف و ژوانی ئینگلیز دەستی شتبوو و هەموو هیوا و ئاواتی بە با چووبوو، نەیدەوێرا پەلاماری تورکەکان بدات، وە نەبێت تورکیشی خۆش بوێت بەڵام ناچار بوو بە ڕاگرتنی هەردوو لا.

جا ئەو پیاوانەی تورك خواە یەکسەر خەلیفەی ئیسلامیان زیندوو دەکردەوە، بەهێزتر بوون لەوانەی کە خۆشیانی نەدەویست.

١- تاهیر ئەفەندی ئەمین: سەر کاتبی ملووکانە.

٢- سەید عەبدوڵا حاجی سەید حەسەن: ئامۆزای شێخ مەحموود.

٣- ئەحمەد تەقی: زابت ئیحتیاتێکی عوسمانی.

٤- سەید ڕەزا ئەفەندی: لە سوپای عوسمانیدا یوزباشی بوو.

٥- سەید ڕەئوف ئەفەندی: لە سوپای عوسمانیدا یوزباشی بوو.

هەروەها زۆر پیاوانی تری ناسراو و دەست ڕۆیشتوو.

بە هۆی ئەمانەوە، لە ناکاو دوو زابتی تورك لە زابتەکانی ئۆێز دەمیر، یوزباشی ڕەمزی لەگەڵ یەکێکی تریان بە ناوی میوانییەوە هێنا و خزانیانە ماڵی شێخ مەحموود.

لەم ڕۆژانەدا، میستەر چەپمەن خۆی بە نەخۆشی خست، بۆ پرسیار و چۆنیەتیی فەرمانم پێ درا بچم. لە پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکەم:

وتی: میوانەکانی شێخ مەحموود ڕۆیشتن؟

وتم: کام میوان.

- تورکەکان، بە تووڕەییەوە.

وتم، شتی وانییە. تورکی چی؟

دووبارە بە گرژییەوە وتی. قەی ناکات، من لە پێش ئەواندا دەڕۆم. گەڕامەوە چۆنیەتیی باسەکەم بەبێ کەم و زیاد گێڕایەوە، ڕۆژی دوایی میستەر چەپمەن هات. شێخ مەحموود چوو

بە پیریەوە. چەپمەن وتی من دەچم بۆ بەغداد.

پێی وت: تکایە، دوایی بەکارمان بهێنن. نازانین مەزبەتەکان بەچی گەیشت؟

وتی: باوەڕ ناکەم من بگەڕێمەوە. ئێوە بە لایەکی ترا کارتان تەواو دەکەن. سەید عەبدوڵا وتی: دەبێت پێی ئینگلیز لە وڵاتدا نەمێنێت. نوێنەری کەمال پاشا هاتووە، دەبینەوە بە ئیسلام. ڕاستە؟

شێخ مەحموود: ئێمە دوژمنی هیچ لایەك نین، ئەگەر میوان لە هەرچی لایەکەوە و لە هەرچی تیرەیەك بێت بەلای ئێمەوە بەڕێزە. ئەگەر ئارەزووی چوونی بەغدات هەیە خوات لەگەڵ، بەڵام فەرامۆشمان مەکەن.

۲۵ شوبات ۱۹۲۳:

ڕۆژی ۲۹ شوبات دوو فرۆکە هاتە سەر سلێمانی، پڕیاسکەیەکیان فڕێ دا و دوو بۆمبایش بەدوایدا. یەکەمیان لە چۆڵ، شێخ جافر و دووەمیان لە ناوەڕاستی سلێمانیدا درا بە ماڵی کەریم بەگی خانزادە جوانی، نیزیك بە سەرای حکوومەت. لایەکی ڕماند بەسەر خێزانەکەدا، دوو ژن بە کوڕاوی و سێ منداڵیان لە ژێر خاکدا مایەوە و لە دواییدا بە مردوویی دەرهێنران. لە ناو پڕیاسکەکەیشدا ئەم بەیاننامەیە بوو.

ئیعلان بۆ شێخ مەحموود ئەفەندی و خەلقی سلێمانی

خەبەرتان بێت کە ئەگەر لە پێش ئێمە ڕۆژی یەکشەمە، بیست و پێنجەم لەم مانگە (موتابقی۲۱ی شەوال) شێخ مەحموود ئەفەندی لە چەمچەماڵ یان لە کەرکووك دەخالەت بکات، بۆمباردمانی مەرکەزی سلێمانی ئیجرا ناکرێت. بەڵام ئەگەر حەتا ئەو وەختە دەخالەت نەکات بۆمباردمانێکی شەدید واقیع دەبێت.

لە کاتێکدا کە کورد و شێخ مەحموود لە وەڵامی مەزبەتەکاندا چاوەڕێی مژدەی ئازادی بوون، کەچی پیاوەکانی حکوومەتی ساحیب ئەلجەلالە بە بۆمبا وەڵامی دایەوە و خێزانێکی هەژار و بێ وەیی لە ناوبرد.

ئینگلیزەکان دەیانزانی کە جارێکی تر نە کورد و نە عەرەب نانووسێن بە تورکەوە بەڵام چەپمەن بیری مەندوویی سامیی گۆڕی و بوو بە هۆی ئەم بەدکارییە. هەر وەکو لە پێش هەموو کەسێکدا شێخ مەحموود ناتوانێت دۆستایەتیی تورکەکان بکات. بەڵام ئینگلیز بەدبەختانە دەتوانێت دوژمنایەتیی کورد و عەرەبیش بکات.

وتمان ئینگلیز بە دیوارێکی زۆر توند و بەهێز ڕێگەی گێتی و ڕزگاریی لە کورد بەست و ماوەی ئەدەدا لە ڕووداو و گوزارش ئاگادار بن و سیاسەتی حکوومەتەکان بزانن وە یان بتوانن

نوێنەر بنێرن و ڕێگەیەکی ڕزگاری بدۆزنەوە. کوردی بە دیار مەنجەڵە پڕ لە درۆ و تەڵەکەی خۆیانەوە وەکو سواڵکەرێکی برسی هەڵتووتانبوو نە بە ئاواتی دەگەیاندن و نەڕاستیی داوای خۆیانیان دەخستە ڕوو تا وەکو کوردیش چارەسەرێکی خۆی بکات.

ئینگلیز دەیویست بە تەفرەدان و باسی ئیستیقلالی کورد مووسڵ ڕزگار بکات و کورد بکات بە بیانوو. کوردیش مافینگی و بە ناڵەی برینی دەستی سیاسەتیانەوە دەیناڵاند.

پاش کەتنە ناڕەوا و ناڵەبارەکەی ئینگلیزی دۆستی دێرینیان بە بۆمباو بەیاننامەکەی، ئیتر کورد و شێخ مەحموود هیوای چاکەیان بە ئینگلیز نەما. شەوی ١/٣/١٩٢٣ بڕیاری کۆبوونەوەیەکی گشتی درا، لە دانیشتووانی شار و مەئموران، لە دیوانی مەلەکیدا.

شێخ مەحموود وتی:

> هەموو کۆشش و مەرایی و خوێن ڕشتنمان بەرامبەر بە ئینگلیز بێ سوود مایەوە. قلکزنەکانمان، من بە سووچدار دەزانن، منیش تا ئێستە لە ئینگلیز نەگەیشتووم. چونکە قسەی ڕاست ناکەن یان نازانن، تەفرەمان دەدەن، ئێمەیان کردووە بە گۆیاڵی دەستیان بۆ ساخکردنەوەی مووسڵ، نەك بۆ ئێمە یان عەرەب. بۆ مەرامی کاری خۆیان دەیخەنە سەر بەغداد، کە بۆ کوژاننەوەی ناوی کوردە. ئێوە چی دەفەرموون؟ بیڵێن لەگەڵتانم.

چەند کەسێك وەڵامیان دایەوە. بەڵام حاجی فەتحوڵلا وتی: باشترین ڕێگا ئەوەیە لیژنەیەك بنێریت بۆ بەغداد. ئەم کارەساتە بخەیتە پێش چاو. تۆیش وەکو ئەوان بەڵێن بدە و بەڵێنی تازە و بە بناغەیان لێ وەربگرن. ئەگەر لەم بیر و باوەڕە نەگەڕانەوە چی دەکەیت بیکە و چیمان بە سەردێت بابێت.

لەسەر ئەم بڕیارە، ئەم ناوانە هەڵبژێران و بە پرۆگرامەوە نێرران بۆ کەرکووك لەوێوە بۆ بەغداد.

١- حاجی مستەفا پاشا.
٢- حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا.
٣- عیزەت بەگی وەسمان پاشا.

پاش ڕۆیشتنی ئەم لیژنەیە دوو فرۆکە هاتە سەر سلێمانی و ماوەیەك سووڕایەوە، ترس و لەرزێکی زۆری خستە ناو دانیشتوانی شار. شار چۆڵ کرا، ژن منداڵ پیر، هەموو دایانە دەشت، ژیان تاڵ بوو.

سلێمانی چۆڵ کرا، بۆ دێهات کۆچیان کرد، لە دانیشتوانی شار دووبارە کۆبوونەوەیەك کرا،

هەموو بە یەك دەنگ وتیان ئەگەر حکوومەتەکەی کوردستان تەنیا سلێمانی بێت ئەم بەخشندەییەی ئینگلیزمان ناوێت وە دەردمان سووك ناكات.

شێخ مەحموود، وتی: کەوابوو دەبێت بیسێنین، ئێمە هەر خوا یاریدەدەرمانە. بڕیارم دا دەچم بۆ کەرکووك و بە بازوو و گیانی کورد دەیخەمەوە سەر کوردستان و نەخشەی هەموو کوردستانی جنووبی بە گێتیدا بڵاو دەکەمەوە. تۆڵەی ئەو بۆمبایەی کە ئەو خێزانە بێچارە و هەژارەی پارچە پارچە کرد، دەبێت بیسێنین. بەڵام بناغەی سەرکەوتنی کورد یەکیەتییە.

دانیشتوان بەڵێنیان دا کە بە سەر و ماڵەوە. ئامادەین.

شەوی ٣/٢ مارت ١٩٢٣ بڕیار درا بۆ پارێزگاریی گیانی دانیشتوانی سلێمانی لە بۆمبای ئینگلیز، شێخ مەحموود سلێمانی بەجێ بهێڵێت.

لە ژێر فەرماندەی مەلیك و فەرماندەی گشتیی ئۆردووی کوردستان مەحموودی یەکەمدا سوپا و چەکداری کورد وەك لافاوی بەهار ڕوو بە کەرکووك جما، ئەمجارەیش پایتەختەکەی کوردستان بێ خاوەن مایەوە.

بەڵام سوپا و ئۆردوو لە قلیاسانەوە ڕوو بە شەقامی (کانی بەردینە) وەرگەڕا، بۆ دۆڵی سورداش، بکرێت بە بارەگا.

ئینگلیز بە چۆڵکردنی سلێمانی ئاگادار کرا. بۆ ئەوەی داوا و بەربەرەکانییەکەی شێخ مەحموود سارد بکاتەوە و بتوانێت مەرامەکانی خۆیان بێننە جێ و بڕیارەکەی سیڤەر لە بیر کورد بەرنەوە، لە کاتی کۆبوونەوەی کۆمەڵی لۆزاندا بە دووتایی، ئینگلیز – عیراق ئەم بەیانەیان بڵاو کردەوە، کە هەرگیز کورد نەیبستبوو و نەیبینی:

« تعترف حكومة صاحب الجلالة البريطانية والحكومة العراقية بحقوق (الأكراد) القاطنين ضمن حدود العراق في تأسيس حكومة كردية ضمن هذه الحدود. و تأمل ان الاكراد على إختلاف عناصرهم سيتفقون في أسرع مايمكن على الشكل الذي يودون ان تتخذه تلك الحكومة، على الحدود التي يرغبون ان تمتد اليها ويرسلون مندوبهم المسئولين الى بغداد لبحث علاقاتهم الإقتصادية والسياسية مع حكومتي إنكليز – العراق».

بۆیە بۆ دووەمین جار ئەم بەیانەمان پێشان دایەوە، بۆ ئەوەی بزانین ئەم بەیانە چی لێ هات، بە کێ گەێنرا و ئەو دوو حکوومەتە چییان کرد بۆ کورد؟ لە وەڵامدا: هیچ.

## کانگاکان


چیم دی: له بینراوەکانی نووسەر.

خناجر وجبال: مامۆستا ئەحمەد فەوزی.

القضیة الکردیة: مامۆستا مەحموود الدرة و خەریتەکەی:

کتاب السیر ولسن: العراق بین ۱۹۱۷ – ۱۹۲۰ له رۆژنامەکانی: الجهاد و نداء الشعب: ساڵی ۱۹۳۰ بەغداد – لەگەڵ بەشی دووەمی

ثورتنا فی الشمال: مامۆستا عبدالمنعم الغلامی.

لمحات من تأریخ العالم: جواهر لال نهرو.

رسملی تأریخ مجموعەسی: انقره، تورکیا.

مشکلة الموصل: الدکتور فاضل حسین.

رۆژنامەی پێشکەوتن له باوی مێجەر سون. سلێمانی

رۆژنامەی بانگی کوردستان: میر لوای ئەرکانی حەرب حاجی مستەفا پاشا.

رۆژنامەی رۆژی کوردستان: م. نووری، دانا و زانای کورد.

الشرق الاوسط فی شئون العالم: جۆرج لنشۆفسکی. وەرگێڕ: جەعفەر خەیات.

بەناوی خوای گەورە و بەخشندەوە

# چیم دی؟

زاڵیەتیی ئینگلیز بوو بە نامەی هاودەردیی کورد و عەرەب لە ڕێگەی ئازادیدا. پاش جەنگی ١٩١٤، کە بەریتانیا فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو، شێخ مەحموود بە سوپای کورد بەرامبەر بە سوپای بەریتانیای گەورە کەوتە جەنگ و یەکەمین گوللە گوللەی کورد بوو، نرا بەسنگی ئینگلیزەوە ڕۆژی ٢١ مایس ١٩١٩.

با ئەوەیش بڵێین، ئەو گەل و کیشوەرانەی لە ژێر چنگ و زاڵیەتیی ئینگلیز بە ساڵەهای ساڵ لە ئەفریقیا، ئاسیا، هیندا ئەیانناڵان، ئازادی کردن و کردنی بە حکوومەت و ئیمڕۆ بە سەربەستی دەژین، بەڵام کورد؟ ئەوەیە کە ئێستە دەیبینن. ئینگلیز وەکو خوێنڕشتنەکەی ١٩١٩ ئەمجارەیش بە فرۆکە دەستی کرد بە قڕهێنانی کورد. بۆ یەك دڵۆپ نەوتی ڕەش، بۆ بە ملیۆن ڕژاندنی خوێنی سووری گەشی کورد، کەوتەوە زاڵیەتی.

# پێشەکی

هیوادارم، بەرگی یەکەمی (چیم دی)یش چوویێتە ڕیزی نووسراوە پەسندەکانەوە. ئێستایش پشت بەخوا لە زنجیرەکانی چیم دی بەم نووسراوە کەمەوە بەرگی دووەم پێشکێش بە خوێنەوارەکانمان دەکەم.

کاکی برا، تۆیش بنووسە، تۆ دەمریت، ئەو نامرێت ناوی گەلەکەت نیشتمانەکەت، بە بێگانە بە دۆست بە دوژمن بناسە. پیاوچاك، پیاوخراپی گەلەکەت بخەرە ڕوو، بنووسە چی دەنووسیت چۆن دەنووسیت لە دوارۆژ و ڕۆژانی ڕابووردووی گەل و نیشتمانەکەت بنووسە. پێنووست فێری سستی و وەستان مەکە. گەلێك نووسراوی نەبێت، دەبێت لە ژێر خاکدا، بێت. ئیتر پشت بە خوا بۆ بەرگی دووەم و ئەمەیش، وەلامی ڕەخنەگرەکانمانە لە بەرگی یەکەمی چیم دی لە بابەت نووسینی ئیملای تازەی کوردییەوە. من هەرگیز ئەو نووسینە و ئەم ئیملایە و ئەو پیتانە بەنووسینی ڕاستی کوردی نازانم. چۆن لە جیاتی (متصرف دەنووسرێت موتەسەڕیف) و لە چ زەمان و قامووسێکدا دەدۆزرێتەوە جا، لە ترسی توانجی دوارۆژمان من نامەوێت ئەم ئیملا تازەیە بەسەر کوردا بسەپێنم. خوا گەورەیە بۆ هەڵهاتنی ڕۆژێك لە ئاسۆی کوردا و لێژنەیەك لەم جۆرە چورتمانە ڕزگارمان بکات بەلام ئێستە نووسین تەنیا بۆ خوێندنەوە بێت و بۆ سەرمایە.

زۆر سوپاس بۆ کاك ڕەئوف خانەقا، کە بە چەند شیعرێکی جوان و دکتۆر خەزنەدار قرگەیی و زۆر لە خوێنەوارە بەڕێزەکانمان، کە لە بابەت کۆشش و بلاوکردنەوەی (بەرگی یەکەمی چیم دی)یەوە ڕێز و نیکمەندیی خۆیان پیشان داوە. خوا وێنەیان پتر بکات.

بو نامە پرهەستەکەی دکتۆر پاکیزە حیلمی، کە لە بەرلینی شەرقییەوە بۆمانی ناردووە، زۆر سوپاسی ئەو ڕێزەی دەکەین، کە بەرامبەر بە بەرگی یەکەم پیشانی داوین.

ا. خواجە

**خوێندەواری خۆشەویست:**

دەبێت بڵێین، ئاواتی گەلی کورد کەوتە سەر پەنجە و ناولەپی زابتە سیاسییەکانی ئینگلیز، لە کۆمەڵی ئاشتی یان حکوومەتی بەریتانیای گەورە. شەوی ٣ مارت بوو بە دوایی پێهێنەری هیوای کورد و ڕماندنی بارەگا.

لەم ڕۆژە تاڵ و سەختییەدا، کە بە سەر عیراقدا کشاوە، کورد و عەرەب وەکو یەك لە ژێر باری گرانی سیاسەتە ناقۆڵا و ناڵەبارەکەی ئینگلیزا تووشی سەر لێشێوان بوون. جا برا تێگەیشتوو و پسپۆڕەکانی عەرەب هەستیان بە کردەوە چەپەڵەکانی ئینگلیزەکانیان کرد و ئەم پارچە نووسراوەیان بۆ ئاگاداریی گەلی کورد دەخەینە پێش چاوی خوێندەوارە بەڕێزەکان. (بەبێ دەستکاری نووسراوەکەی پسپۆڕانی عەرەب):

ان القومية العربية النيرة لايمكنها ان تنكر على غيرها الشعور القومي ومتطلبات ذلك الشعور. وعلى ذلك فالقومية المتحررة المخلصة توقف موقفاً كريماً من شعور الاكراد القومي وان ترى من حقهم الطبيعي تنمية هذا الشعور، والعمل بكل وسيلة مشروعة مهذبة لتحقيق أهداف الاكراد القومية، وهي ترجو ان يدرك إخواننا الاكراد ان السير في ركاب القومية العربية – وهي غير عنصرية – لايعني هضماً لحقوق أي فريق من سكان العراق الأصليين او إنتقاصاً من ميزانهم.

فالقومية العربية تعترف بأن الشعب الكردي الذي يرزح تحت الأنظمة الرجعية والذي كان هدفاً للمؤامرات الإستعمارية، ترى إنه، أي أن هذا الشعب يؤلف وحدة متجانسة ذات خصائص قومية متكاملة.

فالعوامل التي توفرت للأمة العربية وخلقت منها أمة ذات خصائص قومية متكاملة توفرت مثلها أو معظمها للشعب الكردي. فالشعب الكردي يتحدث لغة خاصة به، وهو ذو تأريخ مشترك، و أرض معينة، و تكوين نفسي مشترك و أهداف مشتركة. ولكن، تأريخ الشعب الكردي منذ أبعد القرون قد تشابك من أطراف متعددة مع التاريخ العربي لاسيما في المنطقة الكردية العراقية.

فاذا توضح وثبت ان الأكراد يملكون كل مقومات القومية كشعب واحد فيكون واجب العرب دعم حق الأكراد في تقرير مصيرهم، بما هو المعروف عن العرب في عدم

رغبتهم في التسليط على سواهم من الشعوب. وقد أعتبرهم المؤرخون اكرم فاتحين عندما حملوا الرسالة الإسلامية للعالم أجمع.[1]

ئەمە بوو پێشنیازی برا عەرەبە داناکان، بەڵام ئینگلیزەکان بۆ مەرامی کاری، ڕیسی کورد و عەرەبیان دەئاڵۆزاند و لە پەنای دۆستیدا ئاژاوەی دەنایە ناویان و خوێنی هەردوو لایانی لە بازاڕی سیاسەتی گەلایەتیدا هەراج دەکرد. برایەتیی هەزار ساڵەی ئەم دوو گەلەی ئاخنیە گیرفانی زابتە نادانە سیاسییەکان و دای بەدەم باوە.

زابتە سیاسییەکانی ئینگلیز

جا ئەم کارەساتە بۆ ئەوەی لە دواڕۆژی گەلی کوردا بە سکالاوە لە لاپەڕەکانی مێژوودا بە ناسۆرەوە یاد بکرێت، لێرەدا پیشان درا و بۆ ئەوەی هەوێنی ئەم دەرد و بەسەرا هاتووە بۆ خوێنەوارەکانمان ڕوون ببێتەوە، ئەوە بوو، کە ئەم زابتە نادانە سیاسییانەی ئینگلیز، کە ناویان لە خوارەوە دەخوێنینەوە، بۆ دروستکردنی حکوومەتێکی کوردستان نێررابوون و کەچی، لە یەکەمین ڕۆژی هاتنیانەوە کەوتنە فروفێڵی مل شکاندنی کورد.

١- مێجەر نوئێل: فریشتەی بێ فەڕ و تەڵە دانەری گیانی کورد.

٢- مێجەر گرینهاوس:
٣- مێجەر دانلیس:
٤- مێجەر سون.
(لەم نووسراوەدا لەمەوپێش باس کران.)

٥- کاپتان هۆلت: موعاون حاکم سیاسی و سەیرکەری گوزارش.

٦- کاپتان کووك: لە ڕانیە، بەرپاکەری ئاشووب و بە دەستی خۆی فەتاح بەگی کوشت.

٧- کاپتان لیس: دوژمنی کورد و نۆکەری هەڵەبجە.

٨- کاپتان بوند: حاکمی چەمچەماڵ و گێرە شێوێن.

٩- کاپتان چەپمەن: تەڵەتەقێنی ڕاوی خوێنی کورد.

١٠- کاپتان لاین: هەڵسووڕێنی سیاسەتی ئاڵۆزانی مافی کورد، ماکی جنێو و بێ ئابڕوویی.

١١- مێجەر ئیدمۆندس: حاکمی ڕانیە و قەڵادزە و پسپۆڕی ڕۆژهەڵات و هونەرمەندی دروستکردنی دەزگای جاسووسی.

---

١. القضية الكردية وخناجر وجبال.

**دوایی شەوی سلێمانی**

شەوی ٣/٢ مارت ١٩٢٣ کاتژمێر ٩ پاش نیوەڕۆ شاری سلێمانی چۆڵ کرا.

دوو ڕۆژ لەوەپێش لە ترسی بۆمباباران و فڕۆکەی ئینگلیز و دیمەنی کەلاوەی خانووەکەی کەریم بەگ، هەرکەسە بە ژن و منداڵیەوە تەنیا سەری خۆیان دەربەکرد، خانووی پڕ لە کەلوپەل بە مۆڵی بەجێ ئەما.

هەر لە ترسی فڕۆکە، لە شەوەزەنگ و تاریکیدا بە درێژیی ڕێگا بە زاڕەلە و گریانەوە ژن، منداڵ بە برسێتی و پێخاوس، بیابانیان دەگرتە بەر بۆ دێهات و چیاکان و سلێمانی بوویوو بە کوورەی ئاگر. لەسەر بڕیاری پیاوە دەم ڕاژەکانی شار، شێخ مەحموود بڕیاری بەجێهێشتنی سلێمانیی دا، کە بچێت بۆ کەرکووك. فەرمانی جمانی دا بە فەرماندەی سوپا.

یەکەمین کەس شێخ مەحموود بوو، کە پێی چەپی نایە ناو ئاوزەنگی و سواری ئەسپەکەی بوو و وتی:

ما بعزم این سفر پا ازمیان بەر داشتیم

تاکە زەنگی کفر از کوردستان بەر داشتیم

جێگای ئێمە ئێرانە ئێرانی خۆمان، پەنادەری گەل و مێژووی کورد.

ئیتر سوپای کورد بۆ چەك بەکارهێنان بەم پێیە کەوتە ڕێگە:

١- ٥٠ سوارەی سوپای پێشدار.

٢-مەلیك و فەرماندەی گشتی مەحموودی یەکەم و ٥٠ سوارەی سوپایی و ٥٠ سوارەی عەشایر

٣- پیاوە ناودارەکانی سلێمانی.

٤- تیپێك سوارەی عەشایر.

٥- فەرماندەی سوپا و زابتەکانی سوارە.

٦- سوارەی سوپایی.

٧- پیادەی سوپایی و زابتەکانیان.

٨- مەترالیۆز و چەك و بەشی گواستنەوە (نقلیات).

٩- تیپێك سوارەی سوپایی.

١٠- بارخانەی دەرمان و نەخۆشخانە و پزیشك.

سوارەی عەشایر: ١- پشدەری. ٢- هەمەوەند. ٣- جەباری. ٤- سمایل عوزەیری - تیرەکانیان.

١١- پیادەی عەشایر لە هەمو تیرەیەك بە هەرەمەیی. وا خەمڵ دەکرا کە لە (٥ پێنج هەزار) چەکدار کەمتر نەبێت.

١٢- لە سلێمانی: بۆ ئاسایش و ئاگاداریی شارە چۆڵەکەی پڕ لە کەلوپەلی ڕاکردووی ترسی فڕۆکەی دۆستەکەمان، ٧٠٠ چەکداری سوارە و پیادە لە فەرماندەی سەید ڕەزا و یوونس عەبدولقادردا بەجێ ما.

سەرەتای سوپا گەیشتە قلیاسان لەوێوە بە بەشداریی مەلیک و فەرماندەی گشتی ڕوو بە دۆڵی سووورداش جڵەو وەرگێڕا لە نزیک کانی بەردینە گەیشتمە نزیک مەلیک بۆ ئەوەی ئەگەر فەرمانێکی هەبێت.

لە نزیکی ڕۆژەوەبوونا گەیشتینە هەناران. ئەم کۆمەڵە نزیکەی ١٠٠ سوار زیاتر دەبوو و چاوەڕێی هاتنی خواردەمەنی دەکرا. بەڵام منیش لە ترسی بۆمبا لە پاش بەڕێکردنی خێزانەکەی خۆمان و هەموو خزمان نزیکەی ١٠٠ ژن و منداڵ و پیاو تا (کەڵەکن)، کە گەڕامەوە لە سلێمانی هەگبەکەم وەرگرت لەم کاتەیشدا دەستم تێدا گێڕا بینیم، کە پڕە لە پێویست وەکو کولێرە بەڕۆن، شەکر و چا و قۆریەیەکی بچووک و یەک پیاڵە و کەوچک و هەندێک شتی تریش، بردم هەڵم ڕشت. زۆریان پێ خۆشبوو، تا ئەم نەختە خورا، خواردەمەنیش گەیشت زۆر بە خۆشی هەگبەکە دەستاودەست دەڕۆیشت.

جا لەو کاتەدا مەلیک شێخ مەحموود فەرمووی. من دوو جار سوپاسی ئەحمەد دەکەم:

١- باوەڕم نەدەکرد هاوڕێییمان بکات.

٢- ئەوەندەیش کار ئامادە دەرچوو، کە لەم کاتەدا فریامان کەوت لە بەر ئەوە بە هەڵە نەچووم و پرسی، تۆفیق وەهبی بەگ دیار نییە؟ وتیان هەر شەو ڕۆیشت بۆ هەڵەبجە.

شەو چووینە قزلەر[1] باران زۆر بەخوڕ دەباری بەڵام هێزەکە بەم جۆرە بڵاو بوویووەوە:

١- شەدەڵە: بارەگا.

٢- قزلەر: فەرماندەی سوپایی ساڵح زەکی و زابتەکانی.

٣- دێی سورداش و دێهاتەکانی نزیکی ئێمە ئەو شەوە لەگەڵ ڕەئووف ئەفەندیی ئامۆزام لە قزلەر بووین. کە ڕۆژ بۆوە چووین بۆ شەدەڵە دوو فڕۆکە گەیشتە سەرمان، دەسووڕایەوە بۆ دۆزینەوەی سوپاکە، ئەو فڕۆکانە ئینگلیزیان تێدا بوو نەک دۆست، بەڵام بەبێ وەزنگ ڕۆیشتن.

شەوی ٥/٤ جاسەنە، قەمچوغە و دێهاتەکان تا دووکان و ئەشکەوتەکەی جاسەنە کرا بە بارەگا، لە جیاتی پایتەختەکەی سلێمانیی بەدبەخت.

چیا، دۆڵ و چۆڵ، بوو بە جێگەی ژیانی گەل و سوپا. هەروەها هەموو دێهاتەکانی دۆڵی

١. ئەڵێن ناوە ڕاستەکەی (قەدلار). تورکەکان گۆڕیویانە چونکە بەقەدپاڵەوەیە.

سورداشیش چۆڵ کرا. بە درێژایی ڕۆژ فڕۆکە دار و بەردی بە بۆمبا شی دەکردەوە. ئاژەڵ، خانوو، پیاو، ژن، منداڵ وەکو یەك بە مەترالیۆز و بۆمبا دەکوژرا.

بارەگا و بەڕێوەبردن

بارەگا چووە ئەشکەوتی جاسەنە. لە ژێر چاودێریی مەلیك و فەرماندەی گشتیدا و لە لایەن فەرماندەی سوپا ساڵح زەکی بەگەوە کار بەڕێوە دەبرا.

فڕۆکە بەبێ پشوو بۆمبایاران دەکات. بەڵام لە ئازایی و نەترسیی سوپاییەکان سەر سوڕ دەما. بە چاوی خۆم دەمبینی، لە کاتێکدا، کە فڕۆکە هێرشی دەهێنا و ڕووی ئاسمان بە فڕۆکەی ئینگلیز دەپۆشرا، گوللەی مەترالیۆز و بۆمبا وەکو باران دەباری، سوپاییەکان لە جێگەی پێسپێرراویاندا وەکو مۆمی داگیرساو لە جێگەی خۆیان چەقاو بەبێ خۆشاردنەوە و بزووتن چاوەڕێی فەرمان بوون، جا ڕێکوپێکی (تنظیم) لەوپەڕی باشیدا بوو.

تەرتیبات

بەپێی فەرمانی مەلیك و فەرماندەی گشتی ئەم تەرتیباتەی خوارەوە لە بارەگاوە دەرکرا:

لە بارەگای گشتی: ئەشکەوتی جاسەنە.

١- فەرماندەی سوپایی ساڵح زەکی لەگەڵ کار گوزاران سێ (٣) زابت: أ- فائیق کاك ئەمین. ب- ئەمین ڕەواندزی. ج- عەزیز قەزاز.

٢- ڕەزا بەگ و عیززەت تۆپچی: دانشمەندان

٣- سوپای پیادە: ١- زابت عەزیز کوردی و ١٠٠ سوپای پیادە لە دوکان. ٢- زابت ڕەمزی عەبدولکەریم ١٠٠ سوپای پیادە لە قەمچوغە. ٣- زابت ئیبراهیم زۆری. ٥٠ سوپای پیادە لە کۆتەڵ. ٤- زابت عەبدولعەزیز ئەفەندی ٥٠ سوپای پیادە لە تابین. ٥- زابت ڕەشید سدقی غەفوور ٥٠ سوپای پیادە لە دێی سووورداش. ٦- هەموو پیادەی بارەگا لە لایەن فەرماندەی گشتی تەماشا دەکرێت.

٤- خالد سەعید فەرماندەی پیادەی سوپایی لە دێی خووردەلووك و دامەزراندنی پیادەی سوپایی لە لایەن خۆیەوە دەکرێت لە تابینەوە تا دووکان و بەسەر چیاکاندا.

٥- ڕەشید ئەفەندیی یوزباشی: سەرۆکی دەنگ و باس (ئیستیخبارات).

زابت ڕەشید عەبدولکەریم یاریدەدەرە

٦- سوارەی سوپایی:

٦- فەرماندەی گشتیی سوارە ماجد مستەفا لە تەلان و ٣٠٠ سوارە و بەم پێیە تەرتیبات دەکات:

أ- زابت عەزیز حیکمەت و ١٠٠ سوارە، شەوگەڕ تا سلێمانی.

ب- زابت عەبدوڵڵا ئاغا و ٥٠ سوارە لە دۆڵی سووورداشدا.

ج- ١٥٠ سواریش لە تەلان (إحتیاط) لە فەرماندەی ماجددا.

٧- فەرماندە عەلی کوردی - سوپایی سوارە (٢).

بە ١٥٠ سوارەوە لە دووکانەوە تا ڕانیە. بەدوو بەش و هەموو ماوەکەی سوارەی سوپایی لە لایەن فەرماندەی گشتییەوە تەماشا دەکرێت.

٨- هێزی نیگاهداری سلێمانی، لە ژێر فەرماندەی سەید ڕەئوف، سەید ڕەزا یوونس عەبدولقادردا.

سوارەی سوپایی ٣٠٠.

سوارەی عەشایر ١٠٠-٤٠٠ سوارە.

پیادەی سوپایی ١٥٠.

پیادەی عەشایر ١٥٠-٣٠٠ پیادە.

٩- هێزی سوارەی عەشایر:

أ- کەریم بەگ، سوارەی هەمەوەند لە بازیان.

ب- خەلیفە یوونس ڕوغزاییی جاف لە شارەزوور (١).

ج- حەمە عەلی ڕۆستەم ڕوغزایی جاف لە شارەزوور (٢).

د- مەحموود خاتر، سمایل عوزەیری لە سەرچنار.

هـ- مەحموود دەوڵەتیان: سمایل عوزەیریی هەمەوەند لە دەربەند، چەمچەماڵ.

و- سەید محەمەدی جەباری: سوارەی جەباری لە دەوروپشتی چەمچەماڵ.

ز- تۆفیق حسێن ئاغا: سوارەی هەمەوەند لە دەوروپشتی سلێمانی.

ح- حەمە ئاغای عەلی ئاغا: سوارەی پشدەری لە ناحیەی مەرگە.

ت- سوارەی تایبەتی: ٥٠ سوپایی و ٥٠ عەشایری لە جاسەنە و قەمچوغە.

#### دێهاتەکان

هەموو پیاوێکی دێهاتەکان لە ماڵی خۆیاندا سەرباز بوون و بە چەکەوە ئامادەی فەرمان بوون. عەشایری لیوای هەولێر و کەرکوکیش هەمیشە لە ئامە و تەتەر ناردن دوا نەدەکەوتن و پەیوەستی زۆریان هەبوو بەڵام تاڵەبانی کەمتر.

لە کاتێکدا، کە سوپای کورد زۆر بەهێز و ڕێك بوو، لە لایەن ڕەزا بەگ و عیزەت تۆپچی و حاجی ڕەسوول ئاغای پشدەرییەوە بڕیاری خۆیان دا بۆ چوون و گرتنی کۆیە و بە مەلیك گەیەنرا بۆ ئەوەی ببێت بە هەڕەشە و ترس و کۆسپێکی گەورە بۆ ئینگلیزەکان. بەڵام شێخ مەحموود ئەم بیر و پرۆگرامەی پەسند نەکرد و وتی:

١- ئێمە دەمانەوێت خوێن نەڕژێت ئێستایش بە هیوای بەڵێنەکەیانم بۆ ڕێککەوتنەوەمان لەگەڵ ئینگلیزەکان هیوادارم.

٢- لە شاری کۆیەدا پۆلیس و چەکدارەکان هەموو کوردن و بادینان و سۆران هەموو هاوپەردمانن، جا دەبێت لە کۆیەدا بکەوینە یەکتر کوشتن، کە هەر لە خۆمان دەبڕینەوە ئێستە جاریٚ چاوەڕێی دوا وەلام بکەین.

بەڵام؛ داخەکەم پاش سێ (٣) مانگ پەشیمان بووەوە، کە هەلێکی گەورەی دۆڕاند. لە پاش ڕابووردوو، چارە نییە و کردەکەی خۆی بەڕاست دانەنا.

**گوزارش**

هەموو یەکێك لە چەکداران بێجگە لەو سوپایانەی کاریان پێ سپێرراوە و بەبێ خۆشاردنەوە، دەبێت قەڵەوزی ئەو جێگا گرنگانە بن، کە دراوەتە دەستیان. لە پێش تاریك و ڕوونی شەودا هەر کەسە بۆ پەنا و ئەشکەوتی خۆی دەڕۆیشت چونکە بە ڕۆژ فڕۆکە ماوە و دەرفەتی ئەوەی نەدەدا، کە کەس بتوانێت سەر دەربهێنێت و یان بسووڕێتەوە و فەرمان بەجێ بێنێت. بە درێژایی ڕۆژ فڕۆکە بە سەر دۆڵی سووورداشدا دەسووڕایەوە و ئاگرباراني دەکرد. بەتایبەتی ئاژەڵ و منداڵی نەهێشت لە دەربەندی بازیانەوە تا حدوودی ئێران، کورد دوژمنی ئینگلیز بوو و بۆمبابارانی دەکردن. لە ئینگلیزەکانیان گەیاند، کە شۆڕشگێڕ و سوپاییەکان لە جێی پەنهاندا پارێزگاریی خۆیان دەکەن و پاش گەڕانەوەی فڕۆکەکان شەو دێنە دەرەوە و دەگەڕێنەوە بۆ ئاوایی، جا بۆ کوشتاری بە کۆمەڵ بۆمبای (کاتی: توقیت)یان فڕێ دەدا. لە مەوپێش نووسراوەکەی ئەمرۆ لە (لمحات في تأريخ العالم)[1]دا، کە بڵاوی کردۆتەوە خوێنرایەوە، بەڵام ڕۆڵەی زیرەك ئەم پیلانەشیانی بە با دا.

ڕۆژێك پاش بانگی شێوان گەڕامەوە بۆ ئاوایی جاسەنە. دوور بووم بانگیان کرد، کە نەچمە ئاوایی بۆمبایەکی نەتەقیو لەبەر قۆناغەکەمدایە و وڵاخەکانیش لە ژوورەوە بەبێ ئاو و لەوەڕ ماونەتەوە و کەریمی مەیتەریش لە ناو چاڵە گەنمەکاندایە. سڵەمیمەوە، بەڕاستی زۆر سەخڵەت بووم. لەو کاتەدا کوڕێکی جاسەنەیی هات وتی: چوومە سەر بۆمباکە هێشتا زۆری ماوە بۆ

١. لاپەڕە (٩٩) چیم دی.

تەقینی، وەرەوە با بچین، من شەرمم کرد نەچم.

کوڕەکە حەمە شەریف ناوێکی جاسەنەیی گازێکی لە باخەڵیا دەرهێنا. چووە سەر بۆمباکە گزە گزێکی زۆری لێ دەهات لەبڕ ئاسنێکی درێژ و گەورەی دەرهێنا و فڕێی دا. باروت و وردە ئاسنێکی زۆریشی لێ دەرهێنا و قاوخەکەی بۆ هێنام وتی فەرموو ئیتر لەچی دەترسیت، ئینگلیز بە پارەیەکی زۆر دروستی دەکا و ئێمەش بە گازێکی نیو روپیە بایی بۆی هەڵدەوەشێنین. بۆمبایەکی نەتەقیوی تریش لە خواری ئاواییدا کەوتبوو حەمە شەریف چوو بە پەلە هاتەوە وتی ئەنێستە ئەتەقێت، خۆمان شاردەوە و تەقی.

زۆر بەلامەوە سەیر بوو ئەم کوڕە لادێییە، کە کارگە پیشەسازییەکانی بەریتانیایشی نەبینیوە، لەم ماوە کەمەدا چۆن فێر بوو و چۆن ئەوێرێت ئەم کارە بکات. لێم پرسی؟ وتی نەترسان هەموو مەرامێك دەهێنێتە جێ و بە چزە چز و گزە گزیا تێ ئەگەم، کە کەی دەتەقێت.

دیسان ئوێز دەمیر و نامەکەی بۆ شێخ مەحموود

بە بۆنەی بانگی شۆڕش و گەیشتنی سوپای کورد بە ناوچەی سورداش و ڕانیە، باوی چاو و ڕاوی (ئوێز دەمیر عەلی شەفیق) نەما. ئەو کوردانەی کۆمەکییان کردبوو، لە ڕقی ئینگلیزەکان بوو، لەوەپێش بە تورك خواهەکان دەوترا (جل خوار)، خۆ وەنەبێت کورد لە دۆستایەتیی ئینگلیزیش سوودێکی وەرگرتبێت، کە لەبەر دڵی ئەوان ناو و ناتۆرە لە تورك خواهەکان بنێن.

ئەو عەشایرانەی کۆمەکی (ئوێز دەمیر)یان کردبوو لە سەدی (٧٠)ی گەڕایەوە بۆ ناو سوپاکەی کورد و لای شێخ مەحموود. ئیتر زانی، کە بیروباوەڕی گەلی کورد لەوەدا نییە کۆمەکی تورك و یان ئینگلیز و هیچ بێگانەیەك بکات، نائومێد بوو جا بە هۆی غەفوورخان و سەرۆکێکی تری (ئاکۆ)وە ئەم نامەیەی نارد بۆ شێخ مەحموود:

(دەستتان ماچ ئەکەم ئارەزووی بینینتانم هەیە چاوەڕێی فەرمانتانم)

نیسان. ئوز دەمیر

وەڵام، بۆ هاتنی ئوێز دەمیر

نامەکەی پێشان بە ساڵح زەکی و هەموو سەرۆکەکانی عەشایر و سوپاییەکان دا، بڕیاری هاتنی درا، بۆ هاتنی فەرمان دەرچوو.

لێرەدا وتووێژێکی مێژوویی

لە پاش وەڵامەکەی کە نێرایەوە بۆ ئوێز دەمیر، شێخ مەحموود و حاجی ڕەسوول ئاغای سەرۆکی پشدەر لەبەر زاری ئەشکەوتەکەدا دانیشتبوون، وتی: «حاجی ئاغا چەند خۆش بوو

ئێمەش حکوومەتێك بووینایە و منیش سوپاییەك بە لوولەی تفەنگەکەم بجەنگم. چیت دەکرد»؟

چیای گەلییەکە زۆر بڵندە، کۆترە شینە (گاپەلە)کان ئەمبەر و ئەویەریان دەکرد. پەلاماری تفەنگەکەی دا لەگەڵ تەقەدا و لە فڕیندا کۆترێکی هێنایە خوارەوە. حاجی ڕەسوول ئاغا هەڵستا و دەستی ماچ کرد. وتی: پەیمانم بێت تا ماوم نۆکەری ئەو بیر و باوەڕ و ئەو دەست و چەکەت بم. ( ئە ئاوا باڵی دوژمنی کوردم دەپەڕاند)، شێخ مەحموود وەڵامی دایەوە.

**نۆێزدەمیر گەیشتە بارەگا**

زابت عەزیز کوردی، کە لە پارێزەری بەشی دووکان بوو تەقەرێکی نارد، کە ئۆێز دەمیر گەیشتۆتە سەر قایغەکەی دووکان.

عیزمت تۆپچی بۆ بەڕێوەبەری و ڕێکوپێکی، بە پیرەوەچوونی گرتە ئەستۆ. چونکە خۆی هاوشانی بووە لە قوتابخانەی جەنگی لە ئەستەمبۆڵ و دەیناسی.

(٢٠ سوپایی و چەند زابتێك بە ئاڵای کوردستانەوە)، لە بەر دەرگای بارەگا (ئەشکەوت)ەکەدا وەستان لەگەڵ گەیشتنی، بە سروودی سوپایی و نیشتمانی خۆشهاتنی لێ کرا.

**ساڵح زەکی نیشانەکانی کوردستانی دانا**

لەو کاتەدا شێخ مەحموود لە ناو ئەشکەوتەکەدا لە پشت ساڵح زەکی بەگەوە وەستا بوو. ساڵح زەکی بە بیستنی گەیشتنی ئۆێز دەمیر، ئەستێرە و تاجەکەی سەرشانی (نیشانەکانی کوردستان)ی کردەوە و خستیە گیرفانی، شێخ مەحموود زۆر دڵ تەنگ بوو. وتی ئەگەر نەمردم ئەم تۆڵەیەت لێ دەکەمەوە.

میوان گەیشت دەستی مەلیکی ماچ کرد. خۆی ساڵح زەکی، پێشکێشی کرد فەرمووی (فەرماندەی گشتی و ڕەهبەری جەنگی چەتەیی و سوپایی و عەشایری کورد ساڵح زەکی بەگ)، دەستی گوشی لە وەڵامدا وتی یەکتر دەناسین. شێخ وتی: زەکی بەگ زۆر زیرەك و وریایە. بەڵام، زەکی بەگ شڵەژا.

لەگەڵ ئۆێز دەمیر شەش نەفەر سوپایی تورك بە یەك مەترالیۆزەوە هاتبوو. دەستبەجێ بەرگە کۆن و شڕەکانیان گۆڕا بە بەرگی تازە و پێڵاو.

لە هەموو لیوای سلێمانیدا ئاسایش زۆر تەواو بوو، دەزگای حکوومەتەکەی کە لە سلێمانی دانرابوو زۆر بەهێز و ڕێك بوو، دانیشتوانی شار یاریدەدەرێکی زۆر دڵسۆز بوون بۆ بەڕێوەبردنی یاسا و بە تایبەتی بۆ یارمەتیی سوپاکەیان لە پێویست تا خواردەمەنی.

## بۆ تەشکەوتەکانی شێخ باخ

بۆ لە کار و گوزارش دووان، بڕیار درا، کە لە ئەشکەوتەکانی شێخ باخ، شێخ مەحموود و ئویێز دەمیر کۆببنەوە و ئەم کۆبوونەوە و گفتوگۆیە نهێنی بێت. ئەوانەی لەم کۆبوونەوەدا بەشدار بوون، ئەمانە بوون:

١- ڕەزا بەگ.

٢- عیزەت تۆپچی: دانشمەندانی مەلیك.

٣- سالّح زەکی: فەرماندەی سوپا.

من خۆیشم لەگەڵیانا بووم تەنیا بۆ نووسین.

ڕۆژی دووەم، فڕۆکە بەری ئاسمانی گرت لە سپێدەی شەوەوە، بەبێ کوژانەوە تا تاریکەی ڕۆژ فڕۆکە بۆمبابارانی کرد. ئویێز دەمیر وتی: ماوەی سێ ساڵ لە جەنگی گەورەدا بووم، ئەم بەدخواییە و زەبر و زەنگەم نەبینی، کە ئێستە ئێوە تێیدا دەژین. گەلێك ئەم ئەرکە بەم جۆرە بنۆشێت نابێت بە ئاوات نەگات.

دوای چوار کاتژمێر کۆبوونەوە و لە گوزارش دووان، شێخ مەحموود فەرمانی پێم دا فەرمووی نامە بۆ عەباس ئاغای مەحموود ئاغای پشدەر و غەفوورخانی ئاکۆ بنووسە کە ئویێز دەمیر لە کۆیە و ڕانیە دەکشێتەوە بۆ (کانیە ڕەش)، چی پێویستە یارمەتیی بدەن، لە ئازووقە، وڵاخی سواری درێغییان لێ نەکەن، چاوەڕێی نامەی دووەمم بکەن.

پاش پێنج ڕۆژ مانەوەیان نامەکانی وەرگرت و گەڕایەوە و بەپێی دەستوور گەڕانەوە بۆ کانیە ڕەش.

ئینجا شێخ مەحموود وتی ئەوا دەستمان پێوە نان، گەڕانەوە بۆ سنووری خۆیان، بزانین ئینگلیزەکان لێمان ڕازی دەبن؟

## هەڵەکانی شێخ مەحموود

لێرەدا هەڵەی شێخ مەحموود بوو بە دوو جار:

١- لەوە پێش نەیویست بچێت کۆیە بگرێت. هەم دەری دەکردن و هەم ئینگلیزەکان ناچار دەبوون بە گۆڕینی سیاسەتیان.

٢- لە پاش ڕەنجاندنی ئینگلیزەکان، دەرکردن و گەڕانەوەی ئویێز دەمیر سوودی چییە؟ ئەمەی لە سلێمانییەوە بکردایە ئایا کار بە جۆرێکی تر ڕووی ئەدا؟ بەڵام پاش ڕابووردوو هیچ ناوترێت و وا دەزانم شێخ مەحموود خۆی باشتری دەزانی چونکە هیچ هیوایەك لە ئینگلیز نەدەکرا.

## من و شێخ سەلام، سەلامی بوێژ

یەکترمان زۆر خۆش دەویست، وا ڕێ کەوت، کە لەگەڵ شێخ سەلام لە دێی جاسەنە لە بنێژمیەکدا بەیەکەوە دانیشتین، هەموو ڕۆژێك شەوی ئەما ئەچووم بۆ ئەشکەوت، کە ماوەی نیو سەعات بەڕۆیشتن دوور بوو تا ئێوارە لە سەلام بێ ئاگا دەبووم. ڕۆژێك لە ڕۆژان درەنگ کەوتمە ڕێگا، کە دەڕۆیشتم، سەلام دەیگوت: «ئەحمەد گەردنم ئازاد کە ئەوەك یەکتر نەبینینەوە، بکوژرێین». گەیشتمە پشتی ئاوایی و سەر گردەکە فڕۆکەیەکی زۆر گەیشتە سەرمان، کەوتمە ژێر گوللەی مەترالیۆز، بە هەر چوار لامدا زرمەی بۆمبا. پاش نزیکەی یەك کاتژمێر بە جێگا گۆڕکێ خۆم گەیاندە ئەشکەوت، خۆم بەخۆمم دەوت ئیمڕۆ سەلام لە ئاواییدا کوژراوە و من ڕزگار بووم ئیتر یەکتر نابینینەوە. لەسەر ئەوەی کات گۆڕینم کرد و تووشی ئەم چورتم و سەغڵەتییە بووم، شێخ مەحموود زۆر تووڕە بوو وتم بەس نییە من ڕزگاربووم سەلامم لە ئاوایی بەجێ هێشتووە. هەر کە وتم سەلام شێخ مەحموود بوو بە ئاگر وتی کێ؟ سەلام؟ شێخ سەلام؟ هاتووە؟ لەگەڵمانە؟ من حەپەسام، زمانم بەسترا بەبێ وەڵامی من، بە ساڵح زەکیی وت هەر ئێستا بنێرە لە هەرچی جێگایەك بێت بیگرن و ئێوارە بیهێنن. بە تەلەفۆن لە جاسەنەیان پرسی وتیان چووە بۆ قەمچووغە. بە تەلەفۆن بە ڕەمزی عەبدولکەریمیان وت بیگرێت و بینێرێت بۆ بارەگا.

شەو بە کەلەپچەکراوی سەلامیان هێنا. کە بینیم ئێجگار دڵتەنگ بووم نەموێرا نزیکی بکەوم. بەڵام ئەو بانگی کردم وتی خەنجەرەکەم وەرگرە لای خۆت بێت.

لە پڕ دە چەکدار هات و دایانە پێش و بردیان. زانیم کە بردیان بۆ سلێمانی بۆ ڕۆژی دوایی. شێخ مەحموود فەرمووی سەلام زیرەکێکی بەدبەختە لەگەڵ ئیستیخباراتی کەرکووك نووسینیان هەیە، نەمویست هیچی لێ بکەم، ناردمەوە بۆ سلێمانی.

پاش پێنج شەش ڕۆژ پێش گەیشتنی فڕۆکە گەیشتمەوە ئەشکەوت. بینیم سەلام بەرامبەر بە ساڵح زەکی دانیشتووە و بەرچایی دەخوات. کە منی بینی پێ کەنی وتی خۆش بوو؟ ترسام وام زانی لە منی زانیوە و وتی چووم بە حەپسی یوونس ئەفەندیشم بۆ هێنایت و بە دزیشەوە وتی ئیدمۆنس ئەبودووجانەی بۆ نووسیوم، لە ملمدایە لێم مەترسە خەنجەرەکەی لێ نەساندمەوە بەڵام من سەلامم نەبینییەوە تا چوار ساڵ. یوونسیش نێررا بۆ بەندیخانەکەی ڕانیە. بەڵام لە کاتی گەیشتنی سوپای ئینگلیزدا بە کۆیە لە ڕانیەوە مەردانە بە خۆی و سوپاییەکان و بەندییەکانەوە هاتەوە بۆ ئەشکەوت.

**سوپای ئینگلیز، ڕۆیشتنەوەی زابتەکان بەهێزی پیادەی سوپاییەوە**

ئینگلیز گەیشتە کۆیە، ڕانیە و مەرگەی سووتان. دێهاتەکانی یەك بەدوای یەکدا بە بۆمبا و سووتان و تالان و کوشتن پەرێشان کرد، کار ناخۆش بوو، شێخ مەحموود بڕیاری نەجەنگدانی دا، نەیدەویست ئەمجارەش خوێن بڕژێت. زانیم، کە لە سووورداشدا نامێنین و سەمتیش کوێیە؟ نە دەزانرا. هەروەها ئینگلیز سوپای دووەمیشی ڕوو بە سلێمانی هاتبوو، جا بۆ ئەو دوو ڕۆژە چوومەوە بۆ سلێمانی و گەڕامەوە نە سوپا و نە شێخ مەحموود نەمابوو. ١٤ نیسان ١٩٢٣.

لە جاسەنە پیادەی سوپاییمان هەبوو. وتیان بچۆ بۆ هەڵەدن. ئەو ڕۆژەم لەگەڵ سوپاییەکان لە ژێر بۆمبا و مەترالیۆزدا ڕابوارد. شەو سوار بووم. لەم کاتەدا سوارێکی تریش هات وتی بە یەکەوە دەڕۆین و پیاوێکی جاسەنەییش، وتی پیادە سوپاییەکە لەبەر ئاواییدا مۆڵ دراون ئیتر ئێمەش وامان بە باش زانی ئاوێتەیان ببین. بەڵام لە پێش گەیشتنی ئێمەدا ڕۆیشتبوون. بەرەنگاری ماجید بووم ٢٠ سواری لەگەڵدا بوو و لەو کاتەدا زابتە پیادەکان گەیشتنە لامان. ماجد وتی بۆچی وا دوا بەدوا دەڕۆن؟ عەسکەرەکان ئێستە گەیشتوونەتە ئاوایی سووورداش و نێوە ئێستە دێن.

زۆر بە تووڕەییەوە وەڵامیان دایەوە، وتیان ئێمە لە سووورداشەوە ناڕۆین، دەچینەوە بۆ سلێمانی بۆ لای حکوومەت. زۆر هەوڵمان دا بێ سوود بوو و هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردین. ئەم زابتانە بوون، کە شۆڕشەکەیان بە جارێك شێواند و فوویان کرد لە چرای هیوای کورد:

١- خالید سەعید ٢- ڕەشید سدقی غەفور ٣- عەلی کوردی ٤- ئیبراهیم زۆری ٥- عەبدولعەزیز ئەفەندی ٦- فوئاد مەستی ٧- مەجید خانەقین.

ئەمانە بوون جێ هیوا و ئومێدی پارێزگاری نیشتیمان. ئەمانە بوون بەرگری دوژمن بۆ سەر خاك و نیشتمانەکەیان. ئەمانە بوون لاو و دلاوەرانی کورد و سوێند خۆرەکان، کەچی بەناپاکی و خائینییەوە بینران.

خالید و ڕەشید سدقی وتیان: «بۆ سلێمانی دەچین. بۆ سلێمانی دەچینەوە ناو دوژمن، ٧٠٠ سوپای پیادە بە هەموو پێویستێکیانەوە و بارخانەیانەوە، بە ٧٥ ئێستری بارکراو و مەترالیۆز و تفەنگ و فیشەکەوە لەگەڵمانە. دەچینەوە بۆ ناو ئینگلیز، بڕۆن ئەگینا یان بە یەخسیری دەتانبەین وەیان فەرمانی کوشتنتان دەدەین».

منیش بە ڕەشید سدقیم وت: «تۆ دەڵێیت شیر برای شێخ مەحموودم، چۆن برا برا بەجێ دەهێڵێت؟». وتی ئەمە بەفڕۆکەکان بڵێ. ئیتر ئەوان ڕوو بە سلێمانی ڕۆیشتن بەڵام پاش ماوەیەك بیستمان لە قلیاسان چەکەکانیان لێ ساندن و دەریان کردن.

ماجید ویستی لەگەڵیا بچم بۆ تەلان و سبەی شەو بە یەکەوە بچین بۆ لای مەلیك بەڵام من رۆیشتنم بۆ هەڵەدن بە باشتر زانی. لەگەڵ سوارەکە کەوتینە رێگا، گەیشتینە بەر ئاوایی سووورداش. ئاوایی وێران، خانووی تێدا نەمابوو، هەمووی کەلاوە و چۆڵ. سوارەکە لە پێشمەوە بەدەنگێکی پڕ پەژارە و ناسۆرەوە وتی: «فدای خانەی وا بەسته ئەت شوم مجنون بەهەر کوچا کەنگاە میکنی بیابانست»، لەسەر شێوەی ئای ئای ئەم وتارەی وت و پرسی باشم وت؟ زۆر کاری لێ کردم، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسك لە چاوم دەردەپەڕی، دیسان وتی کاکە وا دەڕۆین باوەڕ مەکە جارێکی تر بە ئاسوودەیی لەم هێلانەیەدا بتوانین هەڵنیشین، ئاغایەتیمان چوو، خوێنمان بەسەر دار و بەردا ڕژا، ئاراجمان تێك چوو. ئاوارە بووین، ئەوەش کردەوەی دانا و زانا سوپاییەکانمان بوو، کە شەرەف و ناموسی کوردیان پێ سپێررابوو. کاکە ئێمە بۆچی خۆمان وڕ و گێل بکەین ئەم زابتە گودلە بەسەرانە بۆ بەرێوەبردنی لەشکری کورد و پارێزگاریی کوردستان و ئیتاعەتی مەلیك نەهاتبوون، هەموویان سوێند خۆر بوون دەتوانم ۳ بە ۳ سوێندت بۆ بخۆم نێرراون بۆ تێکدان، بۆ وێرانکردنی وڵات، بۆ شێواندنی ئەم لەشکر و شۆڕشە. نازانم بۆچی ئەم پوختەخۆرانە وەڕز بوون، لە چییان کەم بوو، ئاخ بۆ دەستەیەکی مەرد بیانگرن و نەیانگەیەننە لای مەلیك چونکە ئەو دڵی نەرمە و هیچیان لێ ناکات.

جا ئەم سوارە نەناسە هاوڕێیەم هەر بۆڵەی دەهات و دەردی بە با دەکرد. دیسان ئاوڕێکی دایەوە و وتی کاك ئەحمەد خۆ بە تۆش دەڵێن ئەفەندی، تۆ لە چ بیر و فروفێڵێکدایت؟ وتم: من تێرم، برسی نیم، ئاچمەوە بۆ قەسابخانەکانی سلێمانی. لە وەڵامدا وتی: دەك باوك و هەموو کەسم بە قوربانت بێت بە خوا منیش ئارەزووی ئێسقان کرانەوە و پلاری برزووە کەچڵی قەسابیم نییە. لەم قسانە زۆر وترا. وتی تۆ بڵێیت ماجید ئەفەندیش نەڕواتەوە؟ وتم نا، چونکە لە منی نەدەشاردەوە. دەستی کرد بە گیرفانیدا لەتێك کولێرەی رەق و یەك هێلکەی کوڵاوی دەرهێنا دایمێ. وتی بەخوا و خوا دەیزانێت ئەمە ئیشووی دوو رۆژە لە گیرفانمدا، فەرموو تۆ بیخۆ گەورەم. تورکەکان بە زمان نەزانی، پێخاوسی، بە رووتی، برسیەتی بردیانین بۆ سووریا، چەناق قەلعە، وەکو ئەم دڵتەنگییەی ئیمشەوم بەخۆمەوە نەبینی ئایا خوا لەم کارەیش بێدەنگ دەبێت؟

دووبارە بە ئاوازی ئای ئایەوە بەدەنگێکی پڕ سۆز و خرۆشەوە وتی:

ئەی خوای بانی سەر، کوشندەی هەزار
تاکەی دەمانکەیت، لە گیانمان بێزار
بۆچ نییە لەم دونیا، بێکەستر لە کورد
خۆی پێ بناسێت، وەها دەستوبرد؟

ئینجا من وتم، کاکە تۆ ناوت چییە؟ وتی وەکو قەومەکەم بێ ناوم. گەیشتینە سەر کەلی (دابان)، شەو ڕوون بۆوە. وتی ناوم حەمە کوردەیە، مزگەرم، دراوسێی جوولەکەکانم، گوێت لەم حەیرانە بێت. حەیرانەکەی تەواو کرد. بەڵام من خوێن لە جگەرم دەتکا وتم حەمە گیان لێم دوور مەکەوە.

وتی ئەم نیازەت بە فرۆکەکانی مامە بەریتانیامان بڵێ، لەگەڵ هەتاوا دەبین بە کەوی برا برا کێ کێ دەبینێت.

هەڵەدن

گەیشتینە بارەگای تازە لە هەڵەدن. شێخ مەحموود لە نوێژی بەیانی بوویۆوە. هێشتا دوور بووین، دەستی هەڵتەکاند و فەرمووی زوو ولاخەکانتان بشارنەوە کاتی هاتنی فرۆکەیە. لە پڕ دوو فرۆکە هات لە بۆمبا و ٦٠ تیر خۆیان داتەکاند و گەڕانەوە، ئیتر تا چایی خورایەوە بەبێ ئەم ڕەوانەوە چوار چوار دەهات لە هەموو لایەك زرمەی بۆمبا و شریقەی مەترالیۆز بوو. چەکی کوردیش خەنجەر و تفەنگەکانی دەستیان بەچەند فیشەکێکەوە. مەلیك فەرمانی بە حەمە کوردە دا، کە لێم جیا نەبێتەوە بەڵام داخەکەم، لە گەڕانەوەدا لە سلێمانی بینیمەوە.

چوونم بۆ بالخ و کوشتنی مەلا عارف

وەکو هەموو ساڵێك ئەمساڵیش خێزانی ئێمە لەگەڵ دایکم لە بالخ بوون، بۆ دووسێ (٣) ڕۆژ چووم بۆ بالخ. پاش دوو ڕۆژ سوپا و شێخ مەحموود هاتن. لەوێوە بوومەوە بە هاوڕێیان لە دەشتی (شێخ ڕەش) تووشی شاکر موجریم مودیری تەلەفۆن بووم، وتی دەزانیت مەلا عارف – عارف سائیب نووسەر و باوەڕ پێکراوی مەلیك، لە یالانقوز، لە لایەن حەمەی سەیدە بچکۆلەوە کوژرا؟ بەم باسە بە تەواوی وشك بووم زۆر ئامۆژگاریی کردم، کە منیش ئاگاداریی خۆم بکەم.
٢٠/٢١ نیسان

بارەگا لە بابەکر ئاوا

لەگەڵ ڕۆژهەڵاتبووندا گەیشتینە ناو چەم و چووغرەکەی بابەکر ئاوا، لە بن دارو بەردا خۆمان شاردەوە. لە پەنا بەردێکی گەورەدا لەگەڵ ولاخەکەم بووسەم دابوو و خەوم لێ کەوت. لە پڕ حەمەی سەیدە بچکۆڵە بە ئاگای هێنام وتی من و تۆ لە منداڵییەوە وەك برا بووین، ئەو کارە خراپەم لە دەست قەوما و شێخ فەرمانی کوشتنمی داوە ناتوانم بچمەوە بۆ سلێمانیش. چارەم بکە.

بەڕاستی من زۆر ترسام و دەترسام خۆم ئامادە کرد بەڵام زانیم ئەگەر بیویستایە، لە خەودا حیکوشتم و تێ گەیشتم پاڕانەوەکەی ڕاستە، بەڵێنم دایە، کە هەوڵی بۆ بدەم.

بە دوا حەمەی سەیدە بچکۆڵەدا، سەید عەبدوڵڵا هات وتی ئێستا ئێمە دەچین بۆ کوێ؟ چیمان بەسەر دێت؟ کەس نازانێت. تۆ بەم منداڵییە دوای چی کەوتوویت؟ بۆچی ناچیتەوە بۆ سلێمانی؟

زۆر کەوتمە بیر و ئەندێشە. چووم بۆ لای ڕەزا بەگ، کە لە جیاتی ساڵح زەکی فەرماندە بوو، کە لە ئەشکەوتی جاسەنەوە بە هۆی عەلی کەمالەوە نێررابوو بۆ بەغداد، کارەساتم بۆ گێڕایەوە وتی گوێ مەدەرێ ئەو خۆی بۆ کوێ دەچێت با بچێت.

**تەرتیبات لە لایەن حوکمدارەوە**

لەم کاتەدا شێخ مەحموود هات زۆر بە پەلە وتی: ڕەزا بەگ، مەلا عارف خۆشەویستم بوو، لە هەموو ڕاز و نهێنیم ئاگادارم دەکرد زیرەك و بە جەوهەر بوو. خوا حەمە بگرێت. دەبێت بکوژرێتەوە فەرمووی:

ڕەزا بەگ بنووسە: سوارە و پیادەی دابەش کرد و ڕێگەی ڕۆیشتنی بۆ دانان، کە ڕەزا بەگ جێبەجێی بکات. گەڕایەوە و فەرمووی ئەحمەد وەرە چووەوە جێگاکەی خۆی وتی: بە کەس باوەڕم نەما. نامەوێت هیچ لە کەس بپرسم. کەس بۆ قەومەکەی ناکات هەمووی بۆ پارەیە.

لەگەڵ ڕووسدا هەوڵم دا، داوای حەقی کوردم لێ کردن، بەڵام لە پێش بەجێهێنانی ئاواتەکەی ئێمەدا، ئەوان شێوان. مەلا عارف و ڕەشید ئەفەندی ئەمین ئاغام ناردە تەورێز تا ئێستا کار بەنهێنی مایەوە.

لە کاتێکدا تورکەکان بە ناوی کافر کوشتن و ئیسلامەتییەوە بەهەشتیان پێ دەبەخشین و گیانی خۆمان پێیان دەفرۆشتین، من خەریکی دروستکردنی کوردستان بووم. گیان، دارایی خۆم و ماڵ و منداڵم لەم ڕێگەیەدا دانا. پشوویەکی خۆشیمان نەدا.

کورد پچڕ پچڕە، بێجگە لە ئینگلیز سێ حکوومەت لەسەر پێستی ئێمە دەجەنگن و بە پێتی کورد دەژین. ئێمەیش لە بن بەردی چیاکاندا و خوا دەزانێت لە چە کۆڵەشێوێنکدا دەکوژرێین و دەبین بە خۆراکی داڵ و جانەوەر، وا زانیمان ئینگلیز هیچ بە کورد نادات، نە تورك و نە ئێران و نە عێراقیش خۆی بە دۆست و برامان نازانێت. کەوابوو

کورد دەبێت یەك بگرێت، ئەگەر وڵاتی مووسڵ بدرێتەوە بە تورك و لەگەڵ کوردەکاندا

ببینەوە بە یەك، ئێمە لە تورك پترتر دەبین. دوور نییە ئەوکاتە کارمان ئاسان نەبێت، ئێستا دەبێت چاوەڕێی هەل بکەین.

**سویا**

لە بابەکر ئاواوە سوارە تیپ تیپ، پیادە بلووك بلووك کەوتە ڕێگا، فەرمان لە لایەن ڕەزا بەگەوە دەردەچوو لەگەڵ سەید برایم بەیەکەوە ڕامان دەبوارد.

گەیشتینە چنگیان، خواردەمەنی بۆ پیادە ئامادە کرا و پاش نیو سەعات حەسانەوە، سوارە بۆ حاجی مامەند فەرمان درا و خێزانی مەلیك دەست و پێیەکانیش لە گەلاڵەوە بۆ دزڵی ڕۆیشتن.

۲۲ /۲۳ نیسان

**قۆناغی تفەنگەکەم شکا**

ڕێگا تا باراو خۆش نییە، پاش نیوەشەو بوو لە ڕێگا بەسەر سواریوە وەنەوزم دا، تفەنگەکەم (تەیارە شکێن) زۆر تازە و نایاب بوو کەوت و قۆناغەکەی شکا. زۆر دڵ تەنگ و تووشی پەژارە بووم. چونکە هەر بۆ تفەنگەکە نا، بۆ شوورەیی ئەوەی بەدەم وەنەوزەوە کاری وام بەسەر هاتووە. بەڵام لە حاجی مامەند کابرایەکی زەرینگەر چاکی کردەوە و بە تەلی زیو پێچای، لە پاش یەك شەو و ڕۆژ (٥٠٠) سوارە لە حاجی مامەندەوە بۆ سەرکان ڕۆیشتین.

سەید ئەحمەدی حاجی مامەند سەر بە ئینگلیزەکان بوو، نەیدەویست نزیك بە شێخ مەحموود ببێتەوە. بەڵام چارەی ئەم هێرشە و لافاوەی پێ نەدەکرا بێجگە لە میوانداری، لە کاتی نزیکبوونەوەی مەلکیدا سەید ئەحمەد ماوەیەکی زۆر چوو بە پیریەوە. شێخ مەحموود وتی خاڵە بە میوان ڕامان دەگریت؟ بەڵام حاجی ڕەسوول ئاغای پشدەری، زوو وەڵامی دایەوە و وتی بە میوانیش نەبێت بە کێزری (بە زۆر و بە هێز)، دەبێت ڕامان بگرێت. حاجی ڕەسوول ئاغا پیاوێکی زەلام و ڕێکو پێك بوو. بۆ ئەوەی لاواز ببێت تریاکی دەکێشا، بەڵام زیاتر قەڵەو دەبوو.

**حاجی مامەند - سەرکان**

بە ڕۆژ کەوتینە ڕێگا، نزیکەی بانگی شێوان گەیشتینە سەرکان. مەحموودخانی دزڵی بە چەکدارێکی زۆرەوە هاتبوو بەپیر مەلیك شێخ مەحموودەوە و نزیکەی ٥٠ ئێستر، کە خێزانەکەی گەیاندبووە دزڵی، بۆ کاروانی دووەم دەگەڕانەوە بۆ گەلاڵە. نزیکەی هەزار چەکدار میوانی شێخ عەولی سەرکان بوو.

شێخ باقری برای شێخ عەول، من و سەید برایمی بردە ماڵەوە زۆر ڕێزی لێ گرتین. شەو درەنگ

ڕەزا بەگ گەیشت. چووە خزمەت مەلیك بەپێی دەستووری سوپایی وتی سوارە و پیادەی سوپایی بە خۆشی و بەبێ وەی گەیشتە سەرکان، پیادە لە دووری ئاوایی دامەزرا. خواردەمەنی بۆ چەکدار و ولاغ لە لایەن شێخ عەولەوە دروست کرا و دەدرا. لێرەدا تێ گەیشتین بارەگا دەچێت بۆ هەورامان. پاش ٢٤ سەعات سەرکانیش بەجێ هێڵرا.

٢٤–٢٥ نیسان

### دکتۆر محەمەد وەفا

خۆی برینپێچ (مضمد) بوو بەڵام زۆر وریا و کارزان و ئارەزووی نیشکردنی هەبوو. فەرمانی دکتۆریی بەجێ دەهێنا، دەرمان زۆر بوو ئەویش شارەزاییی پەیدا کردبوو. لەڕێگا ئێسترێك لە ولاغی باری دەرمانەکە تۆپی. دووتا دەرمانەکە لە گایەك بار کرابوو، لە سێ بواران ئاو زۆر بوو تا گایەکە گەیشتە ناو ئاو ولاخەکان تێپەڕ بوون، ئیتر دوکتۆر ناچار بوو سواری گایەکە بوو لە نێرینە ئاوەکەدا گایەکە نووست. ئێمە سێ سوار دکتۆرمان لە خنکان ڕزگار کرد کەچی بەچەپۆك لە خۆی دەدا بۆ دەرمانەکان و دەیوت ئۆردووی کوردستان لێم دەپرسێتەوە. بەڕاستی کوڕێکی دڵپاك و هونەرمەرد بوو.

### سەرکان – برنجە

سوارە تیپ تیپ و پەل پەل بڵاوکرایەوە لەگەڵ شێخ محەمەد غەریب و ٥٠ سوار چووین بۆ کۆڕی گەپڵە. لادێیی ئەم دێیە ئێجگار هەژار و نەدارا بوون. نانی گەنمیان نەبوو، خواردنیان هەرزن و گیتکەی کەڵدر و بە دەگمەن نانی جۆیان دەخوارد. کاکە برا ئاغا، کوێخای ئاوایی توانی نانی جۆ و بەشی چوار پێنج کەس چێشتی ساوەر دروست بکات. بە شێخ محەمەد غەریبمان گەیاند، کە پێویستە پارەتیمان بدرێت.

### سوپاییەکان بە حەپسی

من و سەید برام لە چۆڵ ماینەوە چونکە خۆراکی ولاخەکان لە خواردنی خۆمان پێویستتر بوو. لەوەڕی وێنجە زۆر بوو، لە بەرەبەیاندا چووین بۆ پیران من خەریکی چای خواردنەوە بووم، ماجیدیش گەیشت. زۆر بە پەرۆشەوە هات وتی ئەحمەد ئێستا زابتەکان دەگەن بزانە خواردن و حەسانەوەیان بۆجێبەجێ بکە تا دەڕۆن. ئەمەی وت و ڕۆیشت بەڵام زابت کێیە و کەی دێن؟ نازانم. پاش ماوەیەك ئەم زابتانەیان لە ژێر چاودێری ١٥–٢٠ چەکداردا هێنا.

١– عەزیز قەزاز. ٢– ئەمین ڕەواندزی. ٣– فائیق کاك ئەمین. ٤– شێخ سەلام – نووسەری سوپایی.

له پاش حەسانەوە و خواردن زانیم، کە حەپسن، نە هیچم لێ پرسین و نە هیچیان وت. بردیانن بۆ دزڵی بەڵام تووشبوونەوەی سەلامم زۆر بەلاوە گرنگ بوو. ماجید هاتەوە لێم پرسی وتی لە هەڵەدن هەموو سەربازی پیادە و سوارە و زابتەکانی بانگ کرد، مەلیك پێی وتن کێ دەیەوێت بڕواتەوە بۆ سلێمانی بە خۆشی بڕوات بەڵام ئێستا چەکەکەی دابنێت. لە ناو هەموویاندا تەنیا پیادەیەکی نەخۆش هاتە دەرەوە شێخیش پێی خۆش بوو پارەشی دایە و ڕۆیشت. لە کارەساتی نامەردەکانی ڕۆیشتنەوە، کە عەسکەرەکانیان بردەوە زۆر قسەمان کرد، وتی ئەمە پیلانێکی زۆر گەورە بوو بەڵام هەر ئەوەندەیان پێ کرا، کە کردیان و دەسیسەی خالید و ڕەشید سدقی غەفوور بوو، ئەم نامەردانەیش هاوپەیمان و سوێندخۆریان بوون. ئەمە لە ئەمین ڕەواندزییەوە زۆر دوور بوو بەڵام دەرکەوت، کە پیلانگێڕ سەلامە. ئێستە نێرران بۆ (سیاکۆڵە)، کە لەوێ حەپس بن بەڵام ئەگەر بتوانین کار لە شێخ بکەین زۆر باش دەبوو، کە بەرەڵایان بکات و بەڕووپەشی بڕۆنەوە. ماجید لەم بابەتەوە زۆر قسەی کرد بەڵام کار لە کار ترازا بوو و هیچ جێی باوەڕیش نییە هەروا بە ئاسانی بەرەڵا بکرێن چونکە ئەوانەی ڕۆیشتنەوە قەڵای شۆڕشەکەیان ڕماند. خۆ ئەگەر ڕاست بێت ئەمانەیش هاوپەیمانن هیچ ڕاست نییە داوای بەرەڵاکردنیان بکرێت.

بارەگا لە برنجەی هەورامان

(برنجە) لە ناو چیای هەوراماندا جێگەیەکی ناودار و خاکی ئێرانە. ترسی فڕۆکە نەما جار جارێك تا سەرکەل دەهات چونکە دیوی ڕۆژئاوای چیاکە شارەزوورە.

جا سەرلەنوێ دەست کرایەوە بە دامەزراندنی دەستگا و جێ دیاریکردنی سوارە و پیادە و ئەم فەرمانە دەرکرا:

فەرمانی مەلەکی: لە برنجە

پشت بەخوا

ژمارە ٨

ڕۆژ ٥ مایسی١٩٢٣

بۆ فەرمانەدەی سوارە و پیادەی سوپایی: ڕەزا بەگ

بە پەلە و بەبێ وەستان ئیمڕۆ سوارە و پیادە، بنێرن بۆ ئەو جێگایانەی بڕیاری دەدەن و وێنەیەکی دابەشکردنەکە دەستبەجێ بنێرن بۆ ئێمە.

مەحموود

مەلیك و باش قوماندانی کوردستان

ـە لایەن ڕەزا بەگەوە ئەم تەرتیباتە کرا:

بەشی سوارە

١- ماجید: سوارەی سوپایی – بۆ سەرچنار و تانجەرۆ (هەموو زابتەکان فەرمان لە ماجید وەردەگرن) چونکە لە شێخ ئەلمارین دەمێنێتەوە، تا ئەشعاری دواییمان.

٢- کەریم بەگ و مەحموودی دەوڵەتیار و سەید محەمەد تۆفیق ئاغای هەمەوەند (فەرمان لە کەریم بەگەوە وەردەگرن)، لە بازیانەوە تا کەرکوک.

٣- خەلیفە یوونس و حەمە عەلی ڕوغزایی، بە دوو پەل: شارەزوور.

٤- مەحموود خاتر، سمایل عوزەیری (پەیوەستی بە ماجیدەوە دەبێت): دۆڵی سووورداش.

٥- سوارەی تایبەتی و ئەمین حەمەی ئیمام: لە بارەگا دەبن.

ماوەی هێزی سوارە لە بارەگاوە فەرماندەی گشتی تەماشایان دەکات.

بەشی پیادە

١- عەزیز ئەفەندی زڕە و جەلال ڕەشید ئەفەندی و ٥٠ سوپایی: پێنجوێن.

٢- ڕەشید عەبدولکەریم و ٥٠ سوپایی: ناڵپارێز.

٣- ڕەمزی ئەفەندی و ٥٠ سوپایی: ملەکەوە.

٤- عەبدوڵڵا ئاغا و ٥٠ سوپایی: شێخ ئەلمارین.

٥- عادل ئەفەندی لە گۆیژەوە و ٢٠٠ سوپایی: شارباژێر تا پێنجوێن.

٦- پیادەی سوپاییەکەی تریش: لە بارەگاوە تا ناڵپارێز دەمێنێتەوە.

کۆبوونەوەیەکی گشتی

بڕیاردرا کە هەموو زابتەکان و کارزاناکان کۆ ببنەوە و بە بڕیاری گشتی پرۆگرامێك دابنرێت و مەلیك دەبێت قبووڵی بکات. چەند مادەیەکی ناوخۆیی بڕیاردرا، بەڵام بە بڕیاری هەموو وا بە باش زانرا، کە یەکێك بچێت بۆ تاران، مڵۆزمی و بەدبەختیی ئینگلیزەکان بە سەفارەتەکانی بێگانە بگەیەنێت و دادنامەیەکیش بە ناوی گشتیوە بنووسرێت و بنێررێت.

مەلیك هەموو بڕیارەکانی پەسند کرد و بۆ ئەوەی بە تەواوی ئەم کارە بەجێ بێت، من خاوەنی (چیم دی)یان هەڵبژارد. بەبیروباوەڕی هەموویان بە تورکی ئەم نامەیە نووسرا و ئەمەیش کوردییەکەیەتی بەبێ کەم و زیاد و کۆمەڵەکەیش ئەمانە بوون: ١- عیززەتی تۆپچی ٢- ڕەزا بەگ ٣- سەید ڕەزا ٤- سێ زابت ٥- سێ سەرۆك عەشایر.

بۆ باڵیۆزی:

ئەمەریکا، تورکیا، ڕووسیا، ئیتاڵیا، فەرەنسا، ئینگلتەرا و سەرۆك وەزیری ئێران:

لە دوای جەنگی ١٩١٤ و کوژانەوەی برووزی عوسمانی، بە تەواوبوونی جەنگ، نیشتمانی ئێمە (کوردستانی جنووبی) لە سوپا و ئیدارەیان چۆڵ کرا. هێزی سوپای ئینگلیز بە هەلی زانی خۆی هاویشتە ویلایەتی (مووسڵ) و کوردستانی جنووبیشی داگیر کرد بەڵام بەو پەیمانەی، کە بە پێی پەیمانی (سیڤەر) هەموو حەقێکی قەومیمان بدەنێ و لە کوردستانی جنووبیدا حکوومەتێکی کوردی دروست بکات و هەموو چەشنە یارمەتییێکمان بدەن، ئینجا بە تەواوی ڕێگەی ئینگلیز درا هاتنی بۆ سلێمانی.

سێ مانگی بەسەرا نەڕۆیشت، بە پێچەوانەی پەیمانەکەیان بۆ کاروباری چە سیاسی چە ئیداری و چە ئابووری، لە ئینگلیز و ئێرانی و عەرەب و ئەفغانی و هیندی، هەرەمە پیاو و مەئموورانی هێنا بەناو کیشوەرەکەماندا بڵاوی کردەوە، بەڵام کوردەکان هەر لە دوورەوە تەماشایان دەکرد ئەو یارمەتییەی کورد بە هیوای بوو و ئەو پەیمانەی دابووی، کە حکوومەتێك بۆ کورد دروست بکات گۆڕرا بە زۆرداری و بێ بەزەیی و ئەو هێزە بێ شومارەی، کە لە جەنگی گەورەدا بەرامبەر بە تورك و ئەڵمان بەکاری دەهێنا، بەری دایە وێزەی کورد، بە کوشتن سووتاندن و تاڵانکردن وڵاتی وێران کرد بەچەشنێك دڵی هەموو ئادەمیزاد بگریەنێت. زۆر کردەوەی زۆرداری و ناپەسندیان نواند تا هەموو کوردی ناچار کرد بۆ پاسی خاك و دارایی و نامووس بەرامبەر بەو ئینگلیزەی، کە بە دۆستی کورد خۆی پێشان دەدا، دەست بداتە چەك و داوای مافی خۆی (ئیستیقلال) بکات. ئینگلیز خۆی کرد بە دوژمنی خوێنینی کورد.

لە ڕۆژی ٢٢ مایس ١٩١٩دا کورد بە چەك کەوتە بەربەرەکانیی ئینگلیزەکان بەڵام تەنیا بەچەکی تفەنگ و خەنجەر. ئینگلیزیش بێجگە لە تۆپ و فڕۆکە، بە هێزێکی کوشندەی ٣٠ تا ٤٠ هەزار سوپاییەوە ڕۆژی ١٨ حوزەیران ١٩١٩ کوردی پەرێشان کرد و ئەو حوکمدارەی، کە بە فەرمانی خۆیان بۆ کوردستان دانرا بوو، بە برینداركراوی، لەگەڵ نزیکەی هەزار مرۆڤ و زابتانی کوردا کوژران و بە یەخسیری گیران و بران.

لە بڕیاری خنکاندنەوە بۆ دە ساڵ بەندی، حوکمداریان ئاوارەی هیند کرد. سێ شەو و سێ ڕۆژ شاری سلێمانی تاڵان کرا، لە کۆڵاناندا کوژراو فڕێ دەدرا.

دێهات و کشتوکاڵ، پرد و مزگەوت، بە بۆمبا وێران کرا. ئاژەڵ بە مەترالیۆز و فڕۆکە بەقڕ هێنرا. ژن پیاو منداڵ بە هەزاران لە ناو ئەشکەوت و سەر چیاکاندا کوژران، مردن. حوکمدار لە بەندییەکەی سێ ساڵ بەسەر نەچوو بەبێ داوا و دەنگی کورد لە ڕۆژی ۲۲ ئەیلول ۱۹۲۲دا دووبارە بە ناوی بەجێهێنانی پەیمانەکەیانەوە، حوکمدار شێخ مەحموودیان لە هیندەوە هێنایەوە و بەناوی حوکمداری کوردستانەوە لە سلێمانی دایان نا. ئەمجارەیش، پەیمانی دروستکردنی حوکوومەتی کوردستانی بڵاوکردەوە.

بەڵام ئەو داوایەی، کە ئینگلیز لە کوردی دەکرد لە توانای کوردا نەبوو، کە بەپێی پێویست لە تورکیا و ئێراندا شۆڕش هەڵگیرسێنێت، ئینجا دیسانەوە لە پاش شەش مانگ کەوتەوە بیانوو. بە بۆمبا شاری سلێمانی، دێهات، چیا و دارستانەکان و باخ و ڕەزی سووتاند، وێرانی کرد. لە ئادەمیزاد و ئاژەڵ کوشتار لە ژمارە نایەت. خێزانی کورد بە پیاو، ژن، منداڵ و پیرەوە کەوتنە چیا و ئاوارەی ئەشکەوت و مەغارەکان بوون. بە ڕووتی برسیەتی گەرما سەرما، ژیان تاڵ بوو. فڕۆکە، ماوە و دەرەتانی پەیداکردنی ئازووخەی نەدەدا.

لە ئادەمیزادپەروەری و دڵسۆزیتان تکا دەکەین، کە دڵسۆزیی خۆتان بەرامبەر بەم گەلە ئاوارە و پەرێشانە پێشان بدەن، کە بە هەزاران خێزان لە چیاکاندا بەبێ پیاو بە سەختی گوزەران دەکەن و دەژین و پیاوەکانیان بەرامبەر بە بەدبەختی و جانەوەریی ئینگلیزەکان سنگیان ناوە بەبەر گوللەی ناگەهانیانەوە و بەبێ بەزەیی لە کوشتاری کورد دەستپارێزی ناکەن، چارەیەك بکەن. کورد دەیەوێت بگات بەمافی خۆی، دەستبەرداری چەك نابێت، تا وەکو ئەم دوژمنەمان لێ دوور نەکەوێتەوە.

۱۱ مایس ۱۹۲۳

| | | |
|---|---|---|
| حەمە ئاغای عەلی ئاغا | حاجی ڕەسوول ئاغا | مەحموود |
| دیسان | سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر | سەرۆك و فەرماندەی گشتی |
| سابر بەگ | ساڵح ئاغای حەمە ئاغا | کەریم فەتاح بەگ |
| سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند | سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر | سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند |
| ئاوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا | سەید کەریم سەید ئەحمەد | ئەمین حەمەی ئیمام |
| لە ئەشرافی سلێمانی | لە ساداتی بەرزنجە | لە سەرۆکانی هەمەوەند |

| | | |
|---|---|---|
| ڕەزا بەگ | ئەحمەد مەدحەت | |
| لە ئەشرافی سلێمانی و فەرماندەی سوپا | مەبعووسی ڕەواندز | وە ٢٨ ناوی تر |

پەیغام

جا بۆ بەجێهێنانی ئەم نامەیە من (ئەحمەد خواجە) نووسەری چیم دی هەڵبژێررام، بۆ ئەوەی بگەمە (سنە) و لەوێوە بۆ تاران. ڕۆژی ١٢ مایس لە (برنجە) کەوتمە ڕێ لەگەڵ محێدین و لە دزڵی پاش چوونم بۆ سیاکۆڵە و هەندێك ڕاسپێریی خێزانی مەلیك. کۆخە حەمە ڕەحیم دزڵیشم کرا بە هاوڕێ بۆ ئەوەی لە (سنە) ڕێ پیشانیەرم بێت بۆ لای شێخ عارف کوڕی حاجی شێخ شوکروڵلا.

نیوەڕۆ گەیشتینە (تفڵی) لای حەمە عەلی بەگ لاوێکی بەنرخ و تێگەیشتوو، پاش نیوەڕۆژە خواردن کەوتینە ڕێ.

شەو لە (کەڕاوا) لە ماڵی (حەمە عەلی بەگ) برای (حسێن خانی ڕەزاو) لە دیوەخانێکی پاك و ڕێك، زۆر بەڕێز گیراین وتی ئێمە هەموومان ئامادەی فەرمانی مەلیکی کوردستانین. خوێندەوارێکی زۆر باش، بەڵام هەردوو گوێی کەڕ بوو، کەم دەیبیست. کەوتینە ڕێ.

ڕۆژی ١٣ مایس بۆ دێی (ئەوی هەنگ)

بەڕاستی بە ڕێگایێکدا ڕۆیشتین، هەرگیز وەڕز نەدەبووین چونکە (دەرە زنجیر) ماوەی ٧:٣٠ سەعات بە تەواوی درێژە، بەڵام بە درێژیی ڕێگا باخ و باخاتی میوە و بەتایبەتی دارگوێز و توو، دڵ و چاوی ڕوون دەکردەوە، لە هەموو کۆڵەشیوێکەوە ئاو بەهاڕە و هاژە دەهاتە خوارەوە، لە پاش نانی نیوەڕۆ کەوتینە ڕێ. لەوێوە بۆ دێی (وێسەر). چامان خواردەوە و پاش حەسانەوە کەوتینە ڕێ

بۆ دێی کەرجۆ

لەگەڵ بانگی ئێوارە گەیشتینە دێی (کەرجۆ)، لەوێوە چووینە بەر ماڵی کوێخا، کە چاوی پێمان کەوت وتی جێگا نییە و وردە وردە باران دەباری، زۆر سووڕاینەوە کەس دای نەکردین، کە ئەمە لە ڕەوشتی کوردەوە زۆر دوور بوو. لەپڕ لەناو ئاواییدا، کە دەسووڕاینەوە و بە پارەیش جێگەیان نەداینێ، ڕووتەیەکمان تووش بوو و پەلاماری دام دەستمی ماچ کرد وتی کاك ئەحمەد لە کوێوە هاتوویت.

داوای جێگام لێ کرد بردینیە دیوانخانەیەکی زۆر گەورە و پۆشتە لە قاڵی و فەرش و هەموو

پێویستێك و جێگایەكی باش بۆ وڵاخەكانمان، كوێخا حەمە رەحیم لە پێشمانەوە بە پیاسەیی ڕۆیشت.

هەموو پێویستێكی پێك هێنا، ئەم پیاوە لە سلێمانی شاگردی ڕابیعەی نانەوا بوو و ئەم ئێمەیش هی فەتح عەلی خان شابەندەری ئینگلیزە لە سنە، وتی ئێوەیان ناسی، كە لە سلێمانی و لە لایەن شێخ مەحموودەوە هاتوون لە هەورامان و لەبەر ئەوە نەیانوێرا داتان بكەن. بەرامبەر بەم چاكەیە هیچ پارەیەكی وەرنەگرت، وتی بابمێنێت تا یەكتر دەبینینەوە و ناوی (حەمە عەلی) بوو و لە وێوە ڕۆیشتین.

بۆ دێی نەوەڕە، شاری سنە و حەپسیمان

نیوەڕۆژمان بردە دێی (نەوەڕە)، ماڵی خەلیفە نەبی خەلیفەی شێخ عەبدولكەریمی كرچنە پیاوێكی زۆر چاوتێر و بەرێزە، ئەم دێ بچووكە لە وێنەی بەهەشتدایە لە ناو دۆڵێكی بچووك پڕ لە دار و درەختی میوەدار. لە جیاتی چۆلەكە و لەق لەق، دار و بەرد و سەربان و ناو ماڵ پڕە لە ڕیشۆڵە. تا ڕۆژ [بووەوە] دەنگی مووزیقەی ڕیشۆڵە دڵی دەگەشاندەوە. بەرچایی و نیوەڕۆژەیشی دەرخوارد داین، پاش نیوەڕۆ پێشمان كەوت بۆ شاری سنە.

نزیكەی سەعاتێك ڕێگا ڕۆیشتین لە سەعات ٢:٢٠دا گەیشتینە بەر ماڵی حاجی شێخ عارف، یەكە پیاوی سنە و خاوەنی مزگەوتی (هاجەرە خاتوون)، هات بە پیرمانەوە، كاغەزەكانی بۆ خۆی نووسرابوو پێشكەشم كرد. ئەمانە بوون:

١- لە شێخ مەحموودەوە. ٢- لە مەحموودخانی دزڵیوە.

حاجی شێخ عارف خەزووری حسێن خانی ڕەزاوە. لە كارەساتم گەیاند، فەرمووی پێویست نییە بچیت بۆ تاران، ئەم نامەیە لێرە (سنە)وە بە تەلگراف دەنووسین، وەكو چوونی خۆت كار دەكات. لە پاش دوو ڕۆژ تەلگرافەكان نووسرا و بڕیاری گەڕانەوەمان دا، وتمان بۆ نیوەڕۆژە ناگەڕێینەوە، چووین بۆ بازاڕ بۆ كەباب خواردن.

ڕاسپێریی كەبابمان كرد و لە چایخانەكەی (ئەفەندم) دانیشتین و چاوەڕێی كەباب بووین. دوو پۆلیس هات و بردیانین بۆ دەرماڵ. بەبێ لێپرسین خراینە ساردواوێكەوە و زنجیر و پالەهەند كراین تا نیوە شەو كەس بەلاماندا نەهات. لەپڕ سەربازێك هات بە فارسی وتی: نان دەخۆن؟ بۆ خۆی و نان و ئاو، پارەم دایە و نەهاتەوە دووەمیش هەروەها، بەبرسی و تینوو ماینەوە.

تا بەرەبەیان نۆبەدارەكان دەگۆڕرا. گوێم لێ بوو وتی لەم ساردناوەیشدا دووكەسی لێیە. پاش نیو سەعات یەكێك هاتە بەر دەرگاكە وتی چەند كەسن؟ وتمان دووانین. بە شێوەی قسەكەماندا

وتی: ئەوە ئێوە کوردی سلێمانین؟

دەستبەجێ دەرگاکەی کردەوە و تەوق و زنجیری ترازاند لێمان گەیاند، کە برسی و تینووین. بردینیە سەر ئاوە جوانەکەی حەوزەکەی حەوشی پۆلیسخانە. ئاومان خواردەوە. یەکی سێ هێلکە به هێلکه و ڕۆن و نانی تازەوە دەرخوارد داین وتی منیش به منالّی لە سلێمانییەوە هاتووم، ئێستا سەردەستەی سەربازم. ئەوە ڕێگە برۆن. تێم گەیاند ناتوانین و نابێت ڕاکەین چووینەوە ژوورەوە تا مەئموورەکان هاتن. منیان برد بۆ پرسیار.

وتم: پێنجوێنیم کەلوپەل دەکڕم، دانیشتووی ئۆمارم و نەخوێندەوارم و کەمەر بەندەکەم کردەوە پارەکەم لیرەی عوسمانی زێڕ خستمە بەردەمیان ژماردیان (٨٥ لیرە)، نووسییان. کە نووسین تەواو بوو و پەنجەم پێدا هێنا، نووسەرەکە وتی: ئاغا ئێمە خەشیم نین، با وا بێت بردیانمەوە ژووری ساردادوەکە.

زۆری پێ نەچوو لە پیاوە گەورەکانی سنە، حاجی شێخ عارف و ناسیفولمولك و ناسیفودیوان هاتن. بانگ کرام، وتیان ئەوا ناسیفولمولك بەڵێنی (دە هەزار) تومانی داوە، تۆمان سەربەست کرد، بەلاّم بەبێ ئاگای حکوومەت لە سنە نەچیتە دەرەوە. کە هاتینە دەرەوە ئێجگار زۆر لە دانیشتوانی شار لەبەر دەرگای دەرماڵ وێستابوون و چاوەڕێی ئێمە بوون. پارەکەیشم بەتەواوی وەرگرتەوە. پاش سێ ڕۆژ حاجی شێخ عارف فەرمووی ئێوە بڕۆن من وەرەقەی قەبزی تەلگرافەکان دەنێرم. چوار باری ئێستری لێفە و دۆشەك و پێڵاو و پێویستیم کڕی. چووینە دەرماڵ هەموویان کردەوە و بارمان کرد. لە (کەمێز) نیو سەعات کەمتر دووبارە بارەکانیان هەڵوەشاند بەلاّم دوو سەربازی سوارەیان لەگەڵ ناردین تا نەوەرە. هەر بە بازرگانی پێنجوێن دەناسراین

لە نەوەرە سوارەکان ناسراوی خەلیفە نەبی و کورد بوون. کاتێك بەرگەکەی خۆمان گۆڕی حەپەسان، یەکی یەك لیرەم دانێ ویستیان لەگەڵمان بێن نەمهێشت و بەرێگەی پێدا هاتبووین گەڕاینەوە.

### گەڕاینەوە بۆ بارەگا

لە دەربەند دزلّی گلام، لە هۆش خۆم چووم لە پاش یەك شەو، کە چاوم کردەوە لە پێستی بزنێکەوە پێچراوم و لەناو لێفەدا کەوتووم بەبێ هۆشی گەیاندمیانە سیاکۆڵە. دەستبەجێ بزنێکیان سەر بڕیبوو و پێستەکەیان لە لەشی من پێچابوو. ١٩ مایس

لە پاش ئەوەی کەلوپەلەکەم دا بە ئایشەخان، دایکی شێخ لەتیف، بەو ئازارەوە گەڕامەوە بۆ (برنجە) و کارەساتم بۆ مەلیك گێڕایەوە. داوای وەسڵی تەلگرافەکانی کرد. وتم: حاجی شێخ

عارف لەگەڵ پیاوی خۆی دەینێرێت، نەیوێرا بمانداتێ. شێخ مەحموود تووڕە بوو ئاگری کردەوە. حەمانچەی کێشا بمکوژێت. عیزەت تۆپچی وتی: یا شێخ ڕاوەستە بزانین دواییەکەی چییە بەڵکو ڕاستە. وتی: تۆش بۆ کوشتن باشیت.

بەڵام شێخ مەحموود پەشیمان بۆوە وتی: بەڕاستی زۆر ماندوو بوویت. ئیتر من ماوەم نەدا هیچ بڵێت. وتم سبەینێ دەگەڕێمەوە بۆ سنە و چی دەنووسم ئیمزای بکە و عەلی ئەفەندی (عەلی باقی) مەئمووری پۆستە و تەلگرافیش دەبەم.

تێ گەیشتم کە ساڵح زەکی هاتۆتەوە و بە مەرامی ئەو نەهاتۆتەوە و ڕقی ئەوی بەمن ڕشت. ڕۆژی دوایی من کاری خۆم تەواوکرد و بڕیارم دا پاش نیوەڕۆ بۆ شەو بێینەوە دزلی و بەڕێگای پێشووماندا بچینەوە بۆ سنە.

پێش چایی خواردن لە جێنیشتەیەکەی شێخ مەحموود کۆبووینەوە، ساڵح زەکی هەڵسا چوو بۆ سەر ئاوەکە. لە گیرفانی نووشتەیەکی دەرهێنا وردی کرد و خستیە ناو ڕووبارەکە. عیزەت: وتی یا شێخ، نەموت بیگەڕێ ئەوا دڕی و دای بەدەم ئاوەوە و هەموو قسەکانی درۆیە. ئەو بەدبەختە تەنیا کاری کرد و گەڕایەوە بۆ ئەوەی کاری خۆی تەواو بکات. بە ناموسم ئاگای لە ڕۆیشتنەوەی زابت و سوپاکەی سووڕداشیش هەیە.

لە وەڵامدا وتی فەرمانم داوە بە ڕەزا بەگ. ساڵح زەکی هاتەوە و دانیشت لە پڕ دە سوپایی هات و بردیان بۆ ئەشکەوتەکەی سیاکۆڵە.

**دووبارە چوونم بۆ سنە و میوانیم لای والی**

ئیتر منیش کاغەزەکانم وەرگرت.

١- ئیعتیماد نامە بۆ خۆم.

٢- نامەیەکی شیرین نووسراو، بۆ والی شیهابودەولە.

لەگەڵ عەلی ئەفەندی کەوتینە ڕێگا. عەلی ئەفەندی پیاوێکی لەسەر خۆ بوو، هێمن و کەم دوو و بێدەسەڵات بوو. بەدوو ڕۆژ گەیشتین. بانگی ئێوارەی دابوو تاریک بووبوو، یەکسەر چوومە بەر دەرماڵ (سەرای) و وتم میوانی والیین. چوون پێیان گەیاند وا دەزانم پاش یەك سەعات والی هات. بەپێی دەستووری شاهانی کۆن قەواسیك بە دارێکەوە لە پێشەوە و بەپێش ئێمەدا ڕابورد. بەڵام ئێمە نەماننناسی. چووە ژوورەکەی خۆی. پاش ماوەیەك داوای کردین، چووین زۆر بەڕێز هات بەپیرمانەوە. خۆی لە خێزانی قاجارییەکانە.

نامەکانم دەرهێنا پێشکەشم کرد. زۆر بەڕێز وەری گرت خوێندیەوە و ئیعتیماد نامەکەی دامەوە و زۆر چۆنیەتیی شێخ مەحموودی پرسی، زۆر دەیپوانییە بەرگ و چەکەکەم. هۆی هاتنم

بۆ سنەی پرسی چونکە نامەکەی شێخ مەحموود تەنیا هەواڵپرسی و خۆپێناسین بوو منیش زۆر پەلەم کرد. کارەساتی تەلگرافەکەم پێش هەموو وتووێژێك گرت. تێ گەیشت.

دەستبەجێ بە تەلەفۆن ڕەئیسی ئەزمییە (مودیری پۆلیس)ی بانگ کرد هات. وتی ئەمە دەناسیت. وتی: بەڵێ و بەبێ کەم و زیاد هەمووی بۆ گێڕایەوە، کە چووغڵیان کردووە. من زانیم کە ئەم فەرمانە و کارە پەخەی حاجی شێخ عارف دەگرێتەوە. وتم تکایە تێکەڵ بەم کارە مەبن، خۆم جێبەجێی دەکەم. بە ڕاستی زۆر پیاوانە قسەکەمی وەرگرت، ئیتر لە بابەت، هێز و جێگای نیشتەنی و بارەگا و هۆی ئازووخە و چۆنیەتیی چەکەوە پرسیاری کرد. بێگومان چی بۆ خۆمان باش بوو وەلامم دایەوە بۆ ئەوەی دڵی پێمان بسووتێت. ئینجا وتی لای خۆم میوان دەبن یان لای ئایەتوڵلا، کە باوەڕ پێکراوی شاهە.

من لای ئایەتوڵلام بە باش زانی. ئەویشی بانگ کرد و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ماڵەوە.
٢٣مایس.

والی پاش سێ ڕۆژ وتی وەزیری جەنگ ئەحمەد خان دێت بۆ سنە بۆ بینینی ئێوە و پاش چوار ڕۆژ چاوەڕێی وەزیر، چوومە لای میرزا فەتحوڵلا پێنجوێنی و لە بابەت کارەساتەکەی خۆمان و گەیشتنی بەرقیەکەوە داوام لێ کرد، کە لەگەڵ سەفیری تورکی لە تاران قسە بکات. خۆی وەکیلی شابەندەری تورکە هیچی بۆ نەکردین.

والی لە بابەت مانەوەمانەوە لە ناوەڕێژی عێراق – ئێراندا زۆری پێ خۆش بوو. ئەو داوایانەی لە لایەن هەردوو لاوە کرا ڕێك کەوتین. بەڕاستی زۆر یارمەتیی داین. ماوەی ٢٤ ڕۆژ لە سنەدا مامەوە و هەروەها بە ئیشوکارەوە خەریك بووم ڕۆژی ١٨حوزەیران لەگەڵ حەمە سەعیدا.

ئەم نامەیەی شێخ مەحموودم وەرگرت:

«نووری چاوم کوڕم ئەحمەد. زۆر زەحمەتم دایت، پاش ڕۆیشتنت مەقبوورزەکان هات لێم ببوورە ئیمڕۆ ڕۆژی ١٦حوزەیران ١٩٢٣ ئینگلیز سلێمانیی تەخلیە کرد، تۆیش وەرەوە بۆ سلێمانی. چاوەڕێت دەکەم، کوڕی خۆم».

مەحموود

١٦ حوزەیران ١٩٢٣

دیسان گەڕانەوەم بۆ بارەگا

چووم ئایەتوڵلام تێ گەیاند. وتی بەڵێ دوێنێ زانیم، بەلام چاوەڕێی بیستنی دوا جار بووم، دەستیم ماچ کرد و ماڵئاواییم لێ کرد.

بەڵام ئەو پەرۆشە لە دڵم دەرناچێت، کە ڕووم نەهات بچمەوە بینینی حاجی شێخ عارف. بە پێویستی دەزانم، کە نە خۆم و نە ئەوانەی ڕێزی پیاوەتی دەزانن هەرگیز چاکە فەرامۆش نەکەن. من ئەو گەورەیی و ڕووخۆشی و کارە مەردانەیەم لە ئایەتوڵڵا و حاجی شێخ عارف بینی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە و بووە بە وێنەیەکی پەیکەری گەورە و هەمیشە لە پێش چاوم ون نابێت. خوا وێنەی ئەم پیاوە مەزنانەمان پتر بکات.

هاتمەوە دزلی. چوومە سیاکۆڵە. فاتمەخانی خێزانی شێخ محەمەد غەریب و خوشکی شێخ مەحموود کوڕی بووبوو، ناویان نابوو (تاڵیب) بەڵام هەر بە سیاکۆڵە ناو دەبرا. باریەستە بوون بەڵام لەبەر فاتیمەخان مابوونەوە تا وەکو ناساغیی بەسەر دەچێت. ڕاسپاردەکەی ئایشەخانم وەرگرت ڕوو بە شاربازێڕ گەڕامەوە.

شەو هاتمەوە ئەسکۆ. ٢٠ حوزەیران. نیوە ڕۆژەی ڕۆژی دوایی، چنگیان و زانیم، کە مەلیك لە دێی خەمزەیە. چووم. لەگەڵ گەیشتنم خۆی هات بەپیرمەوە وتی کوڕم ئەحمەد لێم ببوورە زۆر ماندوو بوویت. بەڵام بۆمان ڕوون بۆوە، کە ئێران باوانی کوردە

رۆژی ٢٦ حوزەیران

لە خەمزەوە بۆ سلێمانی، ئەمجارەیش مەلیك گەڕایەوە بۆ پایتەختەکەی. سلێمانی ژن و پیاو و منداڵ تا (ناو گردان) هاتبوون، فەرمووی: ئەحمەد بنووسە. بە ئاهوداخێکی زۆر گرانەوە وتی وەڵڵا:

من کوردم و بە کوردی دەڵێم و بڕایەوە
دڕك نەما گوڵی هیوامان گەشایەوە

وەختێ بە پەنجەی دوژمنی بەدنیهاد
کە خونچەی ئەمەلمان ئەشکایەوە

ئیمڕۆ بە نووکی خەنجەری تیژی خۆی
مەردانە بۆ کورد ئازادی سەنرایەوە

دوژمن ڕۆیشت و دۆست دوایان کەوت

لەم ماوەیەدا لە ڕۆژی ٣ مارت تا ١٦ حوزەیران ١٩٢٣ هەر بە هیوای ئاوڕێکی خۆشی خۆشییانەی بەریتانیا، کار و جەنگێکی وا ڕووی نەدا، کە ئێستا لێرانەدا پێشان بدرێت. نووسین و نامەیەکی زۆر نێررا بۆ مەندوویی سامی و ئەدمۆندس و نوئێل زۆر کەسانی تر بەڵام بێ سوود و بێ وەڵام بوو. تا وەکو سەفارەتەکان لە تارانەوە پاڵیان پێوە نان، جا وەکو دەڵێن کتێب

بۆ دوایی بگرینەوە.

بەڵام داخەکەم هەندێك لە بازرگانانی تووتن و هەندێك لە مەئموورە بەلاش و مووچەخۆرەکان کەوتنە دوای سوپاکەی ئینگلیز و زۆر خێزانیش بە نەزانی دوایان کەوتن.

شێخ مەحموود لەم کارە زۆر دڵتەنگ بوو. بە پەلە و پەرۆشەوە نامەی بۆ زانین بڵاوکردەوە، بۆ ئەوەی بەبێ ترس و لێکدانەوە بگەڕێنەوە و بێنەوە بۆ نیشتمانەکەیان. نامەکە زۆر کورت نووسرا. ئەمەیە:

برا ڕۆیشتووەکان

وەرنەوە بۆ شار و ماڵی خۆتان لێرانە کەس دوژمنتان نییە. لەوێ و لە دوژمن دوور کەونەوە. هەموو کوردین و کورد هەموو بران، وەرنەوە.

مەحموود

٢٨ حوزەیران ١٩٢٣

نامە و وەڵام:

ڕەشید مەستی بەنامە داوای گەڕانەوەی کرد. لە وەڵامدا:

خۆشەویستم ڕەشید ئەفەندی مەستی، بۆچی ڕۆیشتیت؟ ئەم برایانەی خۆت بەجێ هێشت؟ گوناح نییە؟ کەوابوو (نۆیەی تۆیەتە دووبارە مەستی مەکە، هەر وەکو زیافەتەکەی... ئیتر خەستی مەکە). وەرەوە چاوەڕێتم. خۆشەویستم.

مەحموود

٢٠ تەمووز

لە سلێمانیدا حکوومەتی کوردستان

دوور لە پەنجە و هەناسەی ئینگلیز، لە سلێمانیدا حکوومەتێکی پوختی تازەی کوردستان دامەزرایەوە. کەس لە کەس نەدەکەوت، یاسا و شەریعەت لە کارا بوو، وڵات بووەوە بە بەهەشت، یەکێتی و دڵپاکیی کورد گەڕایەوە. ڕۆیشتووەکان هاتنەوە. لە ژیانێکی ئاسوودەدا ڕادەبوێرا، وەزارەتەکەیش دامەزرایەوە. نانەوا و خواردەمەنی فرۆش وایان زانی، کە دەرگای هاتوچۆ داخرا، شت گران بوو، جا مەلیك فەرمانی دا، کە بۆ هەموو شتێك نرخ بڕیندە بکرێت و ئەوانەی شتیان شاردەوە و گرانیان کردووە لە هەر تیرەیەك یەکێك بگرن و گوێچکەیان بە دەرگای قەیسەرییەکاندا بە بزمار دابکوترێت، بەڵام لە پێش بەکارهێنانی ئەم فەرمانەدا ترس هەموو پێویستێکی هێنایە جێ.

**ئاسایش و هاتنی بەگزادەکانی جاف بۆ سلێمانی**

لە ماوەی دوو ڕۆژا دائیرە پڕ لە فەرمانبەران، شەوگەڕ و قازی و یاسا، حکوومەتی کوردستان کەوتەوە گەڕ نیشی گەل بەبێ وەستان و دڵهاکی بەڕێوە دەبرا. بۆ پیرۆزی و خۆش هاتنەوە یەکەم کەس بەگزادەی جاف هات بۆ سلێمانی.

بە سەرۆکایەتیی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، هەموو بەگزادە ناودارەکان بە ٤٠ سواری تیرەکانی جافەوە هاتن بۆ سلێمانی و میوانی تایبەتی خۆی (مەلیك) بوون. شەو تایبەتی کۆبوونەوەیەکی گرنگ کرا، کەریم بەگ و هەموو سەرۆکە بەگزادەکان و مەلیك شێخ مەحموود. کەریم بەگ: بۆ ئەوەی باوەڕ بکەن هەموومان سوێندت بۆ دەخۆین، کە بەم چەشنە لەگەڵتین وەکو:

١- تا یەك ساڵ بەبێ داوای هیچ یارمەتییەك.

٢- تەنیا لە ساڵی دووەمدا بە چەك یارییە بدرێین.

٣- لە ساڵی سێیەمدا بە سوپایی بزانرێین.

بەڵام، شێخ مەحموود وتی: زۆر سوپاستان دەکەم. من نامەوێت بە سوێند و یان زۆرداری ئێوە بکرم، من و ئێوە دەبێت وەکو یەك گیان و دارایی بەخت بکەین بۆ ئازادی. ئازادیش بە خۆرایی و بەبێ ئەرك دەست ناکەوێت چونکە دەبێت بیسێنین، سوێند خواردن پێویست نییە. مادام ئێوە وا دڵهاکن زۆر سوپاستان دەکەم منیش لە ڕێگەی ئازادیی کوردا بچووکتانم.

کەریم بەگ: پەیمانمان بێت دۆست یان دوژمنی هەرچی عەشیرەت وەیان حکوومەتێك بێت لەگەڵتین.

بەڵام داخەکەم ئەو پیاوە گەورە و خانەدانانە، لە پاش ئەو بینینەی مەلیك و گەڕانەوەیان، هەر بەنیازی بردانی هەڵەبجە و خستنە سەر کفری، خۆیان لە ژوانەکەیان دوور خستەوە و هانی خەلیفە یوونسی ڕۆغزاییان دا، کە پەلاماری ئەو هێزە بدات، کە لە شارەزوورا بۆ ئاسایش دەسووڕانەوە.

ماجید بە ٥٠ سواری سوپاییەوە لە نزیك گریزە بەرەنگاری جەنگی خەلیفە یوونس بوو بەڵام خەلیفە گیرا و لەشکرەکەی پەرش و بڵاو بوو و هێنایان بۆ سلێمانی بەڵام مەلیك بەرەڵای کرد. خەلیفە بەخۆی و خزم و کەسوکاریەوە تێکەڵ بە سوپا و شۆڕش بوو نەگەڕایەوە ژوانی پیاوانەی بردە سەر.

لەو عەشیرەت و ئەو تیرانەی، کە تێکەڵ بە شۆڕش نەبوون و وزنگیشیان نەبوو، بە پێویست دەبینرێت پێشانیان بدەین، کە بە مفتەخۆری دەژیان:

١- لە هەڵەبجە: بەگزادە و تەنیا عەشیرەتی مکایلی جاف.

٢- لە پشدەر: بەشی بابەکر ئاغای سەلیم ئاغا.

٣- لە قەرەداغ و سەنگاو: شێخانی کرێچنە و قادر کەرەم.

٤- لە هەمەوەند: فەقێ محەمەد و موشیر ئاغا.

٥- لە سروچک: بەشێك لە شێخانی بەرزنجە.

٦- لە سووورداش: شێخانی سەرگەڵوو (بەشێکیان).

لەو شەش بەشەی سەرەوەدا هەبوو زۆر پەیوەستییان بە شۆڕشەوە بوو، بەڵام بە ژمارە کەم بوون و لەناو خزمەکانیاندا، کە دەستنێژی ئەدمۆندس بوون و تەفرە درابوون، توانای جیابوونەوەی عەشیرەتەکەیان نەبوو، چونکە مێجەر ئەدمۆندس ئاودێری چاندگەی خراپە و ڕووخاندنی هیوای کورد بوو.

### فرۆکەی دۆستایەتی

لە چوار پێنج مانگی دواییدا ئینگلیزەکان زانییان، کە دۆستە کوردەکانیان ناتوانن ئاژاوە و یان پشێوییەك بەرپا بکەن، جار جارێك بۆ ژیان تاڵکردنی دانیشتوان چەند فڕۆکەیەکی دەناردە سەر سلێمانی و ژن و منداڵ دەکەوتنە ترس و ئاوارەیی دەشت و کێو.

### سەردار ڕەشید

لە ئەمیرەکانی ئەردەلان، سەردار ڕەشید بە بۆنەی ناکۆکی لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا جێگەی نیشتەنییان بەجێ هێشت و بە خێزانەوە هاتە هەورامان (ڕەزاو) لای حسێن خان و لەوێوە خۆی هات بۆ سلێمانی و خۆی خستە بەختی شێخ مەحموود بۆ ئەوەی فەرمانی لێبووردنی لە ڕەزا شاوە بۆ بهێنێت. لە پاش ڕێزێکی زۆر گەورە و گرنگ، شێخ مەحموود پێویستی بەجێ هێنا. بەو مەرجە سەردار بچێت لە تاران دانیشێت، فەرمانی لێبووردنی شاهی بۆ هات، خێزانیش بچێتەوە جێگەی خۆی. لەسەر ئەم فەرمانە سەردار بۆ تاران و خێزان بۆ نیشتەجێی خۆیان گەڕانەوە.

### چاپەکەی سلێمانی

کە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی لە پیت ڕێکخەرەکان، تەنیا محەمەد زیهنی مابۆوە ئەوانی تر دوای ئینگلیزەکان کەوتبوون وتیان ئینگلیزەکان چاپەکەیان شکاندووە. جێی باوەڕ نەبوو ئەم کارەش بکەن.

چووم لەبەر ئەوەی من هیچم لێ نەدەزانی، محەمەد زیهنیم بانگ کرد تێی گەیاندم، کە مەردەکانی خۆمان (میل) ئاسنێکیان لێ دەرهێناوە و نازانێت چییان لێ کردووە. لە سلێمانیدا

یمستا ساڵح سلێمان جەژنی ناو تۆکمەچییەکی زۆر دانا بوو، بردم محەمەد زیهنی پێشانی دا. ـە نوو ڕۆژ وەکو خۆی بۆی کردەوە و خستیەوە کار. لەوەوپێش بەو چاپە لە سلێمانیدا ئەم ڕۆژنامانەی پێ دەرکرا بوو:

١- پێشکەوتن: حکوومەتی ٢- بانگی کوردستان: حاجی مستەفا پاشا ٣- ڕۆژی کوردستان: مـ نووری: نووری شێخ ساڵح ٤- بانگی حەق: لە ئۆردووی کوردستان، ئەشکەوتی جاسەنە.

ئینجا کە وەستا ساڵح چاپەکەی خستەوە کار ئەم نامەیەم نووسی و لە لایەن محەمەد زیهنییەوە، ڕێك خرا، چاپی کرد:

بۆ پێشگاهی مەلیکی کوردستان:

لە ڕووی بەخشندەیی و گەورەیی خوای میهرەبان و دڵسۆزیی ئێوە بۆ گەلەکەتان، بۆ چاپکردنەوە و بەکارهێنانی چاپەکە دەسەڵاتمان پێ بەخشرا تاوەکو بتوانین دەنگی کورد بگەیەنین بە گوێی خاوەن بەختاندا، ئیتر داوای بەرزیی شکۆهتان.

بەندەتان

خواجە ئەفەندی زادە ئەحمەد سەبری

١ تەمووز ١٩٢٣

ئەم نامەیە پێشکەش بە مەلیکی مەزن کرا. بۆ هەموو یارمەتی و کارئاسانی فەرمانی دا. بۆ ناوی ڕۆژنامەکە لە سلێمانیدا دەربکرێت کۆبوونەوەیەك کرا و لەم ناوانە (کورد. کوردستان. تۆڵە. دەنگی کورد. ڕۆژی کورد. گزیزە هیوا. ئومێدی ئیستیقلال. پەیمان)، ناوی ئومێدی ئیستیقلال ڕاکێشرا و ناونرا، هەموو ڕۆژی پێنجشەممەیەك بڵاو دەکرایەوە.

خوێندەواری بەڕێز

لە نووسینی گوزارش و بەسەرهاتوودا. لەم نووسراوەی (چیم دی)دا لایەنی کورت گرتنەوەمان گرت، چونکە دەرد زۆرە، نووسین تەواو نابێت.

بزانین دوا بەدوای باسدا چیتر دەبینن. کارەساتەکەت بخوێنەرەوە کۆڵ مەدە لە ئەنجامی ناونانی ڕۆژنامەکە بە (ئومێدی ئیستیقلال) لە لایەن مەلیکی مەزن شێخ مەحموود بۆ کڕینی کاغەز و بۆیە و پێویستی ٢٠٠ ڕووپیە بەخشرا بە چاپخانەکە. پیاو نێررا بۆ کەرکووك ئەوەی پێویست بوو کڕرا و هێنرا. بە ناوی مژدەوە بۆ ئامادەی نووسین و یارمەتیی خوێندەوارانی ناو شار ئاگادار کران بەو هیوایەی بێنە ڕیز و کایەی یاریدەدان لە نووسین و بەکارهێنانی بیر و ئامۆژگارییان.

ئینگلیز بۆ مەرامی خۆی منی ئەوێت، منیش بۆ مەرامی گەلەکەم ئەژیم.

شێخ مەحموود

### ڕۆژنامەی ئومێدی ئیسیقلال

بەڕێوەبەریی ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیسیتقلال) کەوتە ئەستۆم. لە ژێر چاودێری و لە لایەن منەوە، یەکەمین ژمارەی لە ڕۆژی ٢٠ ئەیلول ١٩٢٣دا کەوتە ناو گەل. ئەم ژمارەیە پلەیەکی زۆر بەرز و بڵندی بڕی و گەل زۆر بە تاسە و دەروونێکی گەرمەوە پەلاماریان دا و پتر لە چوار هەزار دانە فرۆشرا. لە جیاتی نیو ڕووپیە نرخی دانەیەك بە ناوی یارمەتییەوە لە سێ ڕووپیە کەمتر نەئەدرا.

ئەم هەڵمەتی یارمەتییەی گەل، هەموو پێویستی چاپخانەکەی پێك هێنا. بێجگە لەو ژمارەیەش ٥٠٠ دانە لە پۆستەخانەی کفرییەوە ئەنێررا بۆ ئینگلیزەکان و پیاوە ناسراوەکان لە بەغداد و هەموو هەفتەیەك بەم دەستوورە ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال بڵاو ئەکرایەوە.

دەستەی نووسەرمان زۆر بوو، لە پاش ئەوەی توانیمان چاپەکە بخەینە کار و ڕۆژنامە دەربهێنین، تووشی ڕقەبەری بووین، دەیانویست دووچاری تەگەرە بێت، هەندێکیان بە پەڵپی ناوێتەی نووسینی تورکی و فارسی یان عەرەبی و هەندێکیشیان بە ڕەخنە لە نووسین و سروشت گرتن، کەوتنە چاو و ڕاو.

بیری ئەوەیان نەئەکردەوە کە نووسەر تەنیا خۆم و ڕێزگەر و ڕێکخەر تەنیا محەمەد زیهنییە و هەرگیز خۆیان نزیکی یارمەتی نەئەخستەوە.

### پوولی کوردستان

لە ناو ئیدارە و حکوومەتەکەی ناو سلێمانیدا ئیش و کار ئێجگار زۆر بوو وەکو ئیشی: ڕێژی، دادپرسی، بەلەدییە، بێگومان هەموو نووسینەکانیان ئەبێ پوول بەڕێوە ئەچوو جا بۆ ئەوەی ئەم کارانەیش بچێتە ڕیزێکی پەسند دروستکردنی پوولم بڕیار دا:

لە کاغەزی بریقە و ڕەنگدار پوولم دروست کرد:

لە ڕەنگی سەوز ٨ ئانەیی – نیو ڕووپیە.

لە ڕەنگی شین ١ ڕووپیەیی.

لە ڕەنگی مۆر ٣ ڕووپیەیی.

زۆر سوپاسی شێخ لەتیفی دانساز ئەکەم کە زۆر یارمەتیی دام.

ـریکەی سێ هەزار پوولی چاپکراوم برد بۆ مەلیک، دامە دەستی. بینی وتی:

ئەحمەد، نازانم بە چ چەشن و زمانێك سوپاست بکەم، خستیە ژێر سەجدە و وتی: خوایە تۆ پشتیوانی کوردیت ئەم خۆشییە لەم گەلە نەشاریتەوە. منیش پەیمانم بێت بە سەر و ماڵ دریغی نەکەم.

ـلوای پێنووس و کاغەزی کرد: نووسی:

«دەروێش شەریف، لە پارەکەی خۆم هەزار ڕوپیە بدە بە ئەحمەد ئەفەندی».

مەحموود

٢٠ی تشرین یەکەم ١٩٢٣

پارەکە هەزار ڕوپیەم وەرگرت، چووم بۆ لای ڕەفیق حیلمی، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی مەحموودی بوو دەستبەجێ ٥٠٠ ڕوپیەمان بە سەر قوتابییە هەژارەکانی هەر چوار قوتابخانەکەدا دابەش کرد.

کاك ڕەفیق دەیویست ئەو کارانە خۆی بیکردایە. بە پێویستم زانی، کە پێی بڵێم ڕۆژنامەکە بگرێتە ئەستۆی خۆی، داوای فەرمانی کرد، کە مەلیك پێی بسپێرێت، بەڵام پەسند نەفەرموورا.

پوولەکان کەوتە کار و لە هەموو پێویستێکی حکوومەتیدا بە کاردەهێنرا و بۆ ئەوەی بەبێ پوول هیچ ئیشێك بە دەستووری یاسایی نەزانرێت فەرمان دەرچوو و بڵاوکرایەوە.

بەرەڵاکردنی سوپاییەکان

بە بۆنەی ڕۆژی بەسەر ڕابووردنی چۆڵکردنی سلێمانی و گەڕانەوەی حکوومەتی کوردستان، ڕۆژی ٢٣ی تشرینی یەکەم بوو. لە پاش ئاهەنگێکی خۆشی سوپایی، فەرمانی بەرەڵاکردنی زابتە بەندییەکانیش دەرچوو، فائیق کاك ئەمین، ئەمین ڕەواندزی و عەزیز قەزاز و شێخ سەلامیش بەو مەرجەی لە سلێمانیدا دانەنیشێت بەڵام بە ساڵح زەکی بەگ وترا: «لەبەرئەوەی ڕوتبە و نیشانی کوردستان بە شوورەیی دەزانێت دەبێت چاوەڕێ بێت. چونکە ئوێز دەمیر ناتوانێت هیچت پێ ببەخشێت، خوای کورد تۆڵەت لێ بسێنێت. بە پارەی کورد و بۆ ئاواتی کورد چوویت بۆ بەغداد، دانیشە جێگات خۆشە».

ئەمە فەرمانی مەلیك بوو، کە بە ساڵح زەکییان گەیاند.

زابتەکان چوونە دیوان، بۆ بینینی مەلیك. پاش ئەوەی کە مانگانەی ڕابوردوویان پێ بەخشرا، وتیان ئێمە سوێندخۆرین. خالد بەگ تەفرەی داین بەڵام بەختی ئێمە باش بوو. بەم حەپسییە لە ڕووڕەشی ڕزگاربووین، پشتمان نەکردە شۆڕشەکەمان، ڕووی دۆستی لە دوژمن.

زۆر ڕووی خۆشیان بینی و مەلیك پێی وتن:

لەبەر كارێزەكە و ژووڕووی مەڵكەندی باخێكی نایاب نەخش بكێشن لەگەڵ حەوزێكی گەورە. لە پاش تەواوبوونی نەخشەی باخەكە لە زەویەكی (١٠٠) دۆنمیدا، لە مانگی كانوونی دووەمدا نەمامی داری میوەی لە شاربازێڕەوە بۆ هێنرا و نێژرا بەڵام داخەكەم لە ڕەگ و ڕیشە بەدەرهێنانی دار و نەمامەكانی ئەم باخە نایاب و مەزنە و پڕكردنەوەی حەوزەكە لە لایەن سكرتێری مالییە، سالّح پاشاوە، دوژمنایەتیی خۆیان بەرامبەر بە شێخ مەحموود پیشان دەدا، بۆ دڵنیایی و خۆبردنە پێشەوە لە لای ئینگلیزەكان، كە نەیدەزانی دەبێت بە پەڵە و لەكەیەكی گەورە بۆ یادی خراپی لە مێژووی شاری سلێمانیدا و هەرگیز بە باش یاد ناكرێت.

## چوونم بۆ بازیان، ڕۆژنامەكە و كاك ڕەفیق حیلمی

بە بۆنەی پێویستی چوونم بۆ كۆكردنەوەی مزی دێهاتەكانی خۆی (شێخ مەحموود)، بەڕێوەبەری ڕۆژنامەكە، ئومێدی ئیستیقلالم سپارد بە كاك ڕەفیق و بە فەرمانی مەلیك منیش بۆ داچەندنی مەرەزە لە گردە سپیی بازیان و كرێكردنی چەڵتووكی ئەمبارەكان، ڕۆیشتم. بەڵام هەرچەندە بە هاندانی فەقێ محەمەدی هەمەوەندی مودیری مورتكە لە لایەن شنێكی و هەمەوەندەكانی بازیانەوە تووشی ماندووبوون بووم، ئێمە بە شێنەیی و دۆستانە بزووتینەوە، بردمانە سەر، ئاوی جۆگەی تەینالّمان ڕاكێشا.

فەرمانم پێ درا، كە هەموو گەنم و جۆ و برنج بە مۆڵی داریكەلی بكەمە ئەمبارەوە بۆ ڕۆژی ڕەشی دوایی، پارەی مزی دێهاتەكەم هێنایەوە بۆ سلێمانی و سپاردم بە گەنجینەی تایبەتی. لەو كاتەدا بینیم كە لەسەر سەربانی مزگەوتی گەورە و منارەكەوە بە دووربین دەڕوانن ئەو فڕۆكانەی كە شەمێران بۆمبابارانی دەكەن. چونكە حەمەی سان ئەحمەد سوێندخۆری شێخ مەحموود و گەلی كوردە. زانرا كە خانوو و دێهاتیان وێران و خاپوور كرا. ئاژەڵ و ژن و پیاو و منالّ ئێجگار زۆر كوژراوە، فڕۆكە ماوەیان نادات.

## ئینگلیز و فڕوفێڵەكانی

ئینگلیزەكان بۆیان ڕوون بووەوە، كە بە جەنگ و سوپا چارەی شێخ مەحموود ناكرێت، ئینجا كنەیان لە عەشایر و هێزەكانیان دەكرد. لەمەوپێش ناوی چەند تیرەیەكمان هێنا، كە لەسەر بەرنامەی مێجەر ئەدمۆندس و چەپەمەن دەبزووتنەوە و ئەمجارەیش حاجی شێخ عارفی سەرگەڵووشیان ئاوێتە كرد.

بەڕاستی حاجی شێخ عارف، پیاوێكی بەڕێز و خاوەن جەوهەر و قۆناغ و پیرۆزییە. كەڵكەڵەی ئیستیقلالی ناحیەی سووڕداشیان خستە پێش، لە فەرمانەی شێخ یووسف، مودیری

ـنجەی سوسێدا لەشکرێکی زۆری ناردە یالانقوز و قەرەچەتان و داوای جیابوونەوەیان کرد.

بەم بۆنەیەوە نامەی شێخ مەحموود بۆ حاجی شێخ عارف لەگەڵ مەلا ڕەسوولی خوورمەلووکیدا بۆی نارد و ڕاسپێرێکی زۆریشی کرد بەڵام بێ وەڵام مایەوە.

زۆر محترم خاڵە شێخ عارف

دەستتان ماچ دەکەم، ئێوەم بە قەڵایەکی بەرز و سەخت داناوە بۆ خۆم، بە قسەی ماموستاکەت بزووتنەوە، مایەی ڕەچەڵەك بڕاننەوەمانە، بە هیوای گەلی کورد خستنە ژێر پێی ئەدمۆندس کار تەواو نابێت. دەبێت بە هەموومان کۆسپی بەدی کورد لە ناو ببەین. مەبن بە هەوێنی خوێنڕژاندنی لادێیی هەژار. ئەمر بفەرموون لەشکرەکە بڵاوە بکاتەوە و لە چ جێگایەك دەفەرموون ئامادەم بێمە دەست ماچکردنتان.

مەحموود

٢٥ مایس١٩٢٤

زۆر چاوەڕێی وەڵام کرا، دوایی بڕیار بە ناردنی لەشکرێك درا بۆ بڵاوکردنەوەی هێزەکەیان، ئەم لەشکرە بەم جۆرە نێررا:

سابیر کەریم بەگ: هەمەوەند بە ١٥٠ سوارەوە.

مەحموود خاتر: سمایل عوزەیری بە ٣٠ سوارەوە.

ماجید: سوارەی سوپایی بە ٥٠ سوارەوە و ٢٠ ئێستر سوار.

ئەم ١٥٠ چەکدارە سوارەیە لەگەڵ ڕۆژا گەیشتنە سەر مەکۆکەیان. پاش جەنگێکی دوو سێ سەعاتی، بە بریندارکردنی برایەکی شێخ یووسف و گرتنی کوێخاکەی یالانقوز دوایی هات. جا ئەمە وێنەیەك بوو لەو کەسانەی، کە ئینگلیزەکان دەچوونە بن کلێشەیان بە پارە خوێنی دەڕشتن و دەیانتوانی تەفرەیان بدەن.

### ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال

لە بازیان مامەوە ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال کەوتە دەست نووسەری مێژووی بابان حسێن نازم، کە یەکێك بوو لە دانا و زاناکانی سلێمانی، فارسی و تورکیش ئاوێتەی نووسینی کوردییەکەی کرا. ئیتر هیوای ئەوەم نەما، کە جارێکی تر بتوانم کاری ڕۆژنامەکە بگرمەوە دەست چونکە مانەوەم لە بازیان پێویستتر بوو.

سوپای لیڤیی ئینگلیز لە چەمچەماڵ و کوڵەبۆر، مۆڵگەیان دابوو و بە پێی ئەو یاسایانەی

بۆمان دەهات گوایا ئامادەی گرتنەوەی سلێمانین و دوایی بە ژیانی حکوومەتەکەی کورد، کە ئافەریدەی خۆیانە.

جا فەرمانم پێ درا، کە لە بازیاندا بە پێشداری و بەریەستی هاتنی ئەو هێزە بمێنمەوە و ئاگاداری پرۆگرامیان بم. بەدخوا و بەدخووی کورد، کە لە دوژمنە ڕاستییەکەمان بە زیانتر بوون. زۆر لە هەمەوەندەکان بەرهەڵستیکار بوون هەموو ڕۆژێك پیاوی ژیر و کارئامەم بەرێوە بوو. لە هەموو بزووتنەوەیەکی دوژمن ئاگادار بووین. ڕۆژی ۲۳ی مایس ۱۹۲٤ فڕۆکەی ئینگلیز دەستی کرد بە هاتوچۆ و هەڕەشە. ئاژاوەی خستەوە ناو وڵات و ئەم بەیاننامەیەی لەسەر سلێمانی فڕێ دا، کە چەشنی بەیاننامەکەی پێشوویەتی:

ئیعلان بۆ شێخ مەحموود ئەفەندی و خەڵقی سلێمانی

خەبەرتان بێت، کە لەپێش ڕۆژی یەکشەنبە بیست و پێنجەمی ئەم مانگە، موتابیقی بیست و یەکەمی شەوال، شێخ مەحموود لە چەمچەماڵ یان لە کەرکووك دەخالەت بکات. بۆمباردنی مەرکەزی سلێمانی ئیجرا ناکرێت بەڵام ئەگەر حەتا ئەو وەختە دەخالەت نەکات، بۆمباردنێکی شەدید واقیع دەبێت.

بۆ ئەوەی بەبێ کەم و زیاد بکەوێتە پێش چاوی خوێنەوارە بەڕێزەکان بە زینکۆگراف دەرهێنرا و پێشان درا. جا بە دوای ئەم بەیاننامەیەدا چوار ڕۆژی تر مۆڵەتیان دا.

بەڵام ئەم هەڕەشەی گیان کێشان و وێرانکردنە لە کوێوە، لە لایەن کێوە کراوە؟ نازانرێت. تەنیا فڕۆکەی ئینگلیز پەیام و نێرراو بوو چونکە بەیاننامەکە بێ ناو بوو.

## ڕۆیشتنی شێخ مەحموود بۆ چەمچەماڵ و بۆردومانی سلێمانی

بەرامبەر بەم هەڕەشە و زاڵیەتییە شێخ مەحموود بەبێ وێستان نامەیەکی نارد بۆ ئەدمۆندس لە کەرکووك، کە ئامادەیە بۆ هاتن بۆ چەمچەماڵ و لەوێشەوە بۆ کەرکووك.

ڕۆژی ۲۰ی حوزەیران شێخ مەحموود گەیشتە قەرەداخ، بێگومان بە سواری وڵاخ و بە ناو عەشایری کوردا و ڕێگەی سلێمانی – کەرکووك بۆ سواری لە ۳ ڕۆژ کەمتر نییە. بەڵام بۆ شێخ مەحموود، کە پتر لە هەزار سوار کۆبوویوو دەرفەتی ئەوەی نەدەدرا کە یەکسەر بکەوێتە ڕێگە.

ڕۆژی ۲٦ گەیشتە سەنگاو، کە هەموو شێخان و پیاوە ناسراوەکانیان مووچەخۆری ئینگلیز بوون. ئیتر ئەدمۆندس یا ئینگلیزەکان هەموویان بە هەلیان زانی و بە شیدەت سلێمانییان بە بۆمبا دابێژا، کۆڵانانیش پڕبوو لە لاشە.

بەبێ ماوەدان هەمیشە چوار فڕۆکە لەسەر شارە بێوڵەتەکە بۆمبای فڕێ دەدا، ڕۆژی ۲٦ و ۲۷ و ۲۸ی حوزەیران سلێمانی لە ژێر بۆمبا و ئاگردا دەژیا.

گەل، کە لە چاوەڕوانیی مژدەی خۆشی و پێکهاتندا و لە خەوی ئاسوودەگیدا بوون، ڕۆژی ٢٦ی پێش گزنگ فڕۆکەوانی پیاوانی ئینگلیزی بەدبەخت سلێمانیی کرد بە جەهەنەم.

من لە بازیان لە کاروانەی فڕۆکەکان وام زانی، کە سوپاکە دەهێنێت و لە سلێمانیدا دای دەبەزێنێت. بەو هیوایەی کە لە پێش خۆ دامەزراندنیاندا پاش بانگی ئێوارە بە سوارەی عەشایر و هێزەکەی خۆمەوە، شەبەیخونیان بکەین. بڕیارم دا بەبێ چاوەڕێی هاتنەوەی پیاوەکان ئەو ڕۆژە لە چەمچەماڵ، بە ١٠٠ سوارەی هەڵبژاردەوە چووین بۆ سەر سلێمانی، لە کانی گۆمە تێ گەیشتین، کە تەنیا بۆمباردمانە. گەیشتینە ناو شار. لە هەموو سەریان و ماڵێك پلێسەی ئاگر هەڵدەستێ، خانوو وێران و کاول بە سەریەکدا ڕووخاوە، شاری چۆڵ و بێ خاوەن. لە ژێر بۆمبا و مەترلیۆزدا ژن و منداڵ و پیاو کەوتبوونە دەشت، بەبێ خۆراك و ئاو، بە پێی پێخواسی.

چۆنیەتیی کارەسات بە نووسین تەواو نابێت. ئەم کردەوە کێویە لە دەست پیاوە دڵڕەقەکانی ئینگلیز بەولاوە، باوەڕ ناکرێت لە ڕەوشتی هیچ ئادەمیزادێك بوەشێتەوە.

گەیشتمە سەرای حکوومەت، ئەو دیمەنەی بینیم جێی باوەڕ نییە فەرامۆشی بکەم، ئەوانەی کە بۆ بەڕێوەبەری سلێمانی و ئاسایش دانرابوون، سەید محەمەدی مفتی و سەید ڕەئووف و یونس عبدولقادرم بینی بێهۆش کەوتبوون. زۆر ماندوو و پەرێشان بوون وتیان بە درێژایی ڕۆژ بە ٥٠٠ چەکداری سوپایی و لە ژێر بۆمبادا خەریکی پارێزگارین لە دز و جەربەنامەردەکانی خۆمان، ئەوانەی بە پرۆگرام و قسەی ئینگلیزەکان تەفرە درابوون. ٢٧/٢٦ حوزەیران.

لێرەدا لە باسەکەمان لا دەدەین و پرسیارێك لە ڕاستگۆیان دەکەین:

١- کێ دوژمنی ئینگلیز بوو؟ یان کێ ماڵی خواردبوو دانیشتوانی سلێمانی؟ یان مزگەوت و بازاڕ و خانووی شارەکە، چە خراپەیەکی کردبوو بەرامبەر بە حکوومەت و ئینگلیزەکان؟

٢- ئەگەر شێخ مەحموود دوژمنی بوو، کە گرتی بۆچی هێنایەوە؟ کە هێنایەوە بۆچی ئازاردەی دەکات؟ چیی دەوێت نایداتێ و دەسەڵاتیشی نییە بیگرێت، یان لە ناوی بەرێ؟ گەل و شاری سلێمانی چی بکات؟ بەڵێ، دەزانێت گەلێکی پاشکەوتوون، دەنگیان بە هیچ لایەکدا ناگات و هیچ دادپەرستێکیش نییە لەم زۆرداری و ملهوڕییە بپێچێتەوە. ئەوانیش لە خواگیری ناترسن، ئەگەر هەوێنی ئەم کارەساتە ئەدمۆندس یا چەپمەن و یان نوئێل بهاتایە و بەسەراهاتووی شاری سلێمانیی ببینیایە، یا ئینگلیزیش بن ئایا گومان هەیە، کە جگەریان نەئەسووتایەوە؟

## شێخ مەحموود گەڕایەوە بۆ سلێمانی

لە پێش گزنگدا گەیشتینەوە تەپە شوانكارە، بازیان. ڕۆژی ٢٧ و ٢٨یش فڕۆكە ماوەی هاتوچۆی بڕی. بەبیستنی بۆمباردمانی سلێمانی شێخ مەحموود گەڕایەوە لە تەنگیسەرەوە ئەم نامەیەی نارد، وەرم گرت.

كوڕی خۆم ئەحمەد:

ئەوا ئەمجارەیش كەوتینەوە ژێر بۆمبا. زوڵمی ئینگلیز گەیشتە ئەوپەڕی بێ وجدانی. دەچمەوە بۆ شارە وێران و لێقەوماوەكەمان. سبەینێ ئێوارە وەرەوە بمبینە.

مەحموود

١٣ تەمووز ١٩٢٤

لەسەر فەرمان و نامەكە ڕۆژی دوایی چووم بۆ سلێمانیی شاری چۆڵ و وت و وێران، كۆڵانان پڕ لە ئاو و خانوو ڕووخاو، بێجگە لە سەرباز و چەكدار كەس نەدەبینرا.

## چوونم بۆ سلێمانی

گەیشتمە خزمەت مەلیك، زۆر مات و دڵتەنگ بوو بەلام لە قسەكردن و بزووتنەوەی ئاگر دەباری. فەرمووی ئایا لە پاش ئەم كارەساتەیش ڕەنجەڕۆ دەبین؟ نا، چونكە ئەمە بەشی كوردە هەر دەبێت بیسێنین. بەلام ئەم دوژمنەتان زۆر گەورە و بەهێزە، بەدخوو و بەدبەختن، بێ بەزەیین، پیاوی خراپیان زۆرە. نووسراوێكی دایە دەستم و فەرمووی بەپێی ئەم مادانە ئیشی خۆت تەواو بكە و زۆر بەنهێنی بگێڕێت.

١- كرەی چەڵتووك.

٢- باری ٤٠ ئێستر گەنم ئامادە بكرێت لە گونیەدا.

٣- هەموو ڕۆژێ جومعەیەك باری ٤٠ ئێستر لە گەنم و جۆو برنج لە گونیەدا ئامادە بێت.

بێجگە لەم مادانە، مادەی نهێنی (ئەوا دوژمن كەوتەوە حەرەكات. لە فەرماندەی نووری سەعید پاشای وەزیری دیفاعدا سوپای لیڤی، ئاسووری لەگەڵ سوپای عێراق، لە كوڵەبۆرەوە دێن بۆ سلێمانی ڕەنگە دوو ڕۆژی تر بگەن. ئەم پرۆگرامە بەم ناوانەی ژێرەوە دەگەیەنرێت و بەبێ وێستان لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا بەجێ دەهێنرێت:

١- ماجید بە سوارەی عەسكەرییەوە: پشتی تەپە شوانكارە- تاسڵووجە.

٢- سابیر بە سوارەی هەمەوەند: پشتی ئەلایی- تاسڵووجە.

٣- مەحموود خاتر بە سوارەی سمایل عوزێری، پاشداریی ماجید.
٤- حەمە ئاغا و خەلیفە یونس بە سوارەی پشدەری و جافەوە: پاشداریی سابیر.
٥- ئەحمەد خواجە و میرزا شەل بە سوارەکانی خۆی و مەندمی لەگەڵ هەموو پیادەی بازیان لە دەروێشان و گردەسپی پێشدار دەبن و یەکەمین جار بەرەنگاری دوژمن دەبن.

**گەڕامەوە بۆ بازیان و هاتنی سوپای ئینگلیز بۆ سلێمانی**

ئەم نامەیەم پێ سپێررا و دەبێت ئەم شەویش بە هەموویانی بگەیەنم. بۆ لای هەر یەکێکیان دوو سوارم نارد و پێیان گەیەنرا. دەستبەجێ گەڕامەوە بۆ بازیان. تا پاش نیوەڕۆ لەشکر ئامادە کرا و ئێوارە گەیشتینە تەپە شوانکارە و مەلا عەلی و دوو سوارەم نارد بۆ تاسلووجە. داخەکەم کەس نەهاتبوو لە پێش گزنگدا. ١٤ تەمووز ١٩٢٤.

دوو فڕۆکە گەیشتە سەرمان. سوارە و پیادە نزیکەی (٢٠٠) چەکدار لە ژێر کەپرەکانی تەپەشوانکارە و چۆڵداو نزیك لە شەقام، مەزنگە ٤٠٠ مەترە دوور ماینەوە. بەڵام وڵاخ بە جارێك پەتیان پچڕی و کەوتنە دەشت و ئێمەش بە پیادەیی ماینەوە و نازانین چیمان بەسەر دێت. فڕۆکە ماوەی نەدەدا خۆمان دەرکەین. لە سەعات ٩دا پێشدارییان، چوار زرێپۆشی گەیشتە سەر کانییەکەی تاسلووجە. پاش یەك سەعات نزیکەی ٥٠٠ ئاسووری (تیاری) هاتن و چوون لەسەری تاسلووجە مۆڵیان دا. هەروەها لە چیا و پشتی (ئەڵایش)ەوە ئاسووری گەیشتە سەری تاسلووجە بۆ سەعات ١٢ هێزی ئۆتۆمبێل و پیادە و سوارە و بارخانەیان پەی دەر پەی هات و ڕابوورد. بەڵام ئێمە توانای هیچمان نەبوو. جێگامان دەشت، فڕۆکە و زرێپۆشییان زۆر بە ئاسانی لە ناویان دەبردین و هیچ هیوایەکیشمان نەبوو بە هێز و چەکداری خۆمان. جا خۆمان پاراست تا ئێوارە.

گەڕاینەوە بۆ داریکەلی. وڵاغەکانمان لە ئاواییەکانەوە بۆ هێنرایەوە. ئەو شەوە سوپاکەیان گەیشتە کەندە کەوە و مۆڵیان دا بەڵام من لە داریکەلی ئاشەکەم ڕێك خست و دەستم کرد بە کڕەی چەڵتووکی ئەمبارەکە. خەرمانی گەنم زۆر گەورە بوو و گێرەی لەسەر بوو. بە پەلە باری (٤٠) ئێسترم لە برنج و گەنم پێك هێنا. لەگەڵ ئێسترەکاندا بەبێ وەستان بار کران و گەڕانەوە. بارخانەی کاروانی دووەمیشم پێك هێنا و لە ئەمبارەکەدا دام نا بۆ گەڕانەوەی ئێسترەکان و سپاردم بە مەلا حسێن و لەگەڵ سوارەکان ٤٥ سوار بووین، بازیانم بەجێ هێشت و ڕوو بە شاربازێڕ کەوتمە ڕێگا. ١٨ی تەمووز ١٩٢٤.

ئەمجارەیش خونچەی هیوای کورد بە ئاگری سوپای لیڤی و فەرماندەیی نووری سەعید هەڵپرووکا. تەخت و تاراج تێك چوو، ڕۆژی ١٨ تەمووز پاش نیوەڕۆ ئینگلیز بەهێز و چەکی ئاگرینەوە هات و سلێمانیی داگیر کردەوە.

## چۆڵکردنی سلێمانی

ڕۆژی ١٦ تەمووز ١٩٢٤ شێخ مەحممود سلێمانیی بەجێ هێشتبوو، کە بازیانم بەجێ هێشت گەیشتینە شارباژێڕ، دێی سیتەك، زانیمان بارەگا لە قەڵاچوالان و ماجید و سوارەی سوپایی لە تەگەران. چووم ماجیدم بینی و هۆی گۆڕینی پرۆگرامەکە چی بوو پرسیارم کرد.

وتی: لەسەری تاسڵووجە جەنگ کردن لە ناوچوونی هەموومان بوو چونکە سوارە بەرامبەر بە پیادە و فڕۆکە ناتوانێت بجەنگێت. چیاکە ڕووت و بێ پەنایە. من چووم بۆ ئەشکەوتەکانی کەڵەوانان، شەو لە کەندەکەوە گاڵەمان پێ کردن، لە دوایشدا ئاگرمان نا بە پووشەکەوە، زۆر شپرزەی کردن، ئێمە بە ئاسوودەوە گەڕاینەوە و ئەوانیش بە ئاواتەوە گەیشتن و چوونە سلێمانی. قەی ناکا تۆفیق ئەفەندی بریندارە.

وتی: ئەحمەد نازانم ئێمە دوای چی کەوتووین، هیوامان ئینگلیز بوو وا دەرکەوت هیچمان ناداتێ. تورك و ئێرانیش لە ئێمە پەرێشانترن و هیچ ئومێدێکیان لێ ناکرێت، کەوابوو دەبێت هەر خۆی (مەلیك) چارەیەك بدۆزێتەوە. چونکە ئەمجارە وەك جاری پێشوو نییە. وتم: شەو دەچم بۆ قەڵاچوالان، قسەی لێ دەچێژمەوە بزانم بیری چییە، ئاگادارت دەکەم. گەیشتمە بارەگا.

لەگەڵ گەیشتنم فەرمووی بۆچی بازیانت بەجێ هێشت؟ تێم گەیاند، کە پێویستە لە پرۆگرامی تازە بگەم. لە بابەت قسەکانی ماجیدەوە پرسیارم کرد، فەرمووی: لەم کاتەدا، بەهێزین سوپامان یەك ڕەنگە، ئەو گەلەی گیان نەدا ماف وەرناگرێت. تا چەمچەماڵ بە سوارە و چیاکان بە پیادە تەنراوە. تا دواکەس دەجەنگین. ئێمە لە ئیمڕۆوە مێژووی کورد دادەنێین، چش لە ڕابوردوو.

لەم بابەتەوە زۆر دوا، فەرموودەکانی تیژ و کاریگەر بوو. پاش ماوەیەك ماجیدم بینییەوە و تێم گەیاند.

فڕۆکە ماوەی نەدەدا. ڕۆژ ڕێگەی بزووتنەوەی نەدەدا و فەرمانیش درابوو، کە تەقە لە فڕۆکە نەکرێت.

لە فەرماندەی سوپاییەوە

قەڵاچوالان

ژمارە ١

ڕۆژ ١ ئاغستۆس ١٩٢٤

بۆ پێشگاهی مەلیك و باش قوماندان

لەسەر فەرموودەکانتان. تەرتیبات کرا و لە ژێرەوە عەرز دەکرێ و ئەم پرۆگرامە بە هەموو

فەرماندەکان گەیەنراوە. جا بۆ ئەوەی هەر کەسە بۆ جێگای خۆی بچێت و بە زووترین کات بگەنە جێی پێسپێراوییان: چاوەڕێی فەرمانتانین.

ڕەزا

قومانداں

| | سوپایی | عەشایر |
|---|---|---|
| ١- بۆسەر کەڵکی قەیوان: عەزیز ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٢- بۆ پشتی خەمزە: ڕەشید ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٣- بۆ سەری ئەزمڕ: ڕەمزی ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٤- بۆ چاڵە بەفرەکان: عومەر ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٥- بۆ کەلی گۆیژە: جەلال ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٦- بۆ ڕێی قرگە : حیکمەت ئەفەندی | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |
| ٧- بۆ کلکەی خەراجیان: عەبدوڵلا ئاغا | ١٣٠ پیادە | ١٣٠ پیادە |

١- لە شاربازێڕ: ماجید ئەفەندی تەرتیبات لە لایەن خۆیەوە دەکرێت.

٢- بۆ شارەزوور: خەلیفە یونس و سوارەکانیان.

٣- بۆ قەرەداغ: سەید محەمەدی جەباری و سەیدە و سوارەکانیان.

٤- بۆ بازیان: سابیر بەگ و سوارەکانیان.

٥-بۆ سەرچنار: مەحموود خاتر و سوارەکانیان.

٦-بۆ سرۆچك: حەمە ئاغا و سوارەی پشدەری و شیوەکەڵ.

١- پیادەی هەورامی. ٢- پیادەی شاربازێڕی، لە جێگای خۆیاندا چاوەڕێی فەرمان دەبن

لە لایەن مەلیکی مەزنەوە بەم جۆرە فەرمان درا.

پشت بە خوا، لامان باشە

مەحموود

فەرمانی مەلەکی

ژمارە ١ قەڵاچوالان

ڕۆژ ١٠ ئاغستۆس ١٩٢٤

پشت بە خوا

بۆ قوماندەی سوپایی: ڕەزا بەگ

ئەمجارەیش دوژمنی خوێنمژ، لە شار و نیشتمانەکەی خۆماندا ئاوارەی چیاکانی کردین. خوا پشتیوانی ئێمەیە و پەشیمانی بەشی ئەوان. ئێمە ڕۆڵەی ئەم نیشتمانەین. ئەمێت بە ئازادی تێیدا بژین بەڵام هیوادارین، گۆڕستانی دوژمنی بەدبەخت لە ژێر پێی دلاوەرانی کوردا ببینین. تکایە بودجەیەکی کاتی و (موقت) بە پێی پلە و ڕوتبە بۆ هەموو سوپایی و عەشایرەکان بە پەلە دروست بکەن و ڕۆژانەیان بۆ دابنێن و بۆمان بنێرن.

مەحموود

لە لایەن فەرمانده و لێژنەی سوپایی و عەشایرەوە ئەم تەرتیباتە کرا:

١- بەشی سوپایی: پیادە

لەگەڵ خواردەمەنی و بەرگ و پێڵاو بۆ یەك سوپایی: ڕۆژی ٨ ئانە[1]

لەگەڵ خواردەمەنی و بەرگ و پێڵاو بۆ یەك سەر دەستە: ڕۆژی١٢ ئانە.

لەگەڵ خواردەمەنی و بەرگ و پێڵاو بۆ ملازمی سانی و ئەوەل: ڕۆژی٢ ڕوپیە.

لەگەڵ خواردەمەنی و بەرگ و پێڵاو بۆ یوزباشی و بەرزتر: ڕۆژی٢ ڕوپیە ونیو.

٢- بەشی سوارە: سوپایی

بۆ یەك سوپایی سواری: ڕۆژی ٢ ڕوپیە

بۆ یەك سوپایی سەردەستەی سواری: ڕۆژی ٢ ڕوپیە و نیو

بۆ یەك ملازم سانی و ئەوەل: ڕۆژی ٣ ڕوپیە

بۆ یەك یوزباشی و بەرزتر: ڕۆژی ٤ ڕوپیە

٣- بەشی سوارەی عەشایر

ئەگەر لە بارەگا بن وەکو سوارەی سوپایی ڕۆژانە وەردەگرن و ڕۆژانی جەنگ یەك ڕوپیە پتر.

٤- فەرماندەکانی عەشایر: ئەگەر لە بارەگا بن وەکو سوپایی و ڕۆژانی جەنگ یەکی: پیادە ڕۆژی ٤ ڕوپیە. سوارە ڕۆژی ٧ ڕوپیە.

٥- لێژنەی کڕینی ئازووخە و پێویست:

١- ڕەزا بەگ ٢- یونس ئەفەندی ٣- عیزەت ئەجیب ٤- ئەحمەد خواجە ئەفەندی.

١٢ ئاغستوس ١٩٢٤

---

١. ٨ ئانە: ٣٧ فلس و نیوە

لەسەر بڕیاری لێژنەی جەنگی سوپایی و عەشایر، بۆ چوونە سەر سوپای حکوومەت لە سلێمانی بڕیاردرا:

لە ژێر فەرماندەی ماجید: لە هەر چوار لای شارەوە:

١- سوارە - ڕوغزایی ٢- پشدەری ٣- سوپایی ٤- لکە پیادەکانی چیای گۆیژە و ئەزمڕ.

ئەم هێزە نزیکەی ٣٠٠ چەکدار، شەو چوونە سەر سوپاکەی سلێمانی. لە کاتژمێر (٩) پاش نیوەڕۆدا تەقە دەست پێ کرا. لە ماوەیەکی کەمدا هەموو (نقطة)کانیان بەجێ هێشت، تەنیا بنکەکەی (خانی شیخ ئەحمەد لە سابوونکەران) گیرا. مەترالیۆزەکەیان و (٣) سەربازیان گرت. بەلام لە جوولەکان سوپاییەکی بێ چەك گیرا و بەرەڵایش کرا. لە سەعات ١پاش نیوەشەو گەڕانەوە بۆ شاربازێڕ، بارەگا لە کانی سارد.

لە سلێمانییەوە

لە ڕۆژی ١٠ تشرین یەکەمدا لە ژێر پارێزگاریی دوو فڕۆکەدا لە کاتژمێری (٦) پێش نیوەڕۆدا نزیکەی ٢٠٠ سوارەی سوپایی لە شەقامەوە بۆ کەلی گۆیژە و تابوورێکی پیادە بۆ چاڵە بەفرەکان هێرشیان هێنا.

لە کەلی گۆیژە لە فەرماندەی جەلال ڕەشید ئەفەندی عاسیەخاندا بە ٦٠ چەکدارەوە بەرامبەریان وەستان. تا بەرایی سوارەیان دەگاتە سەرکەل، لە لایەن هێزەکەی جەلالەوە پەلاماریان درا و ناچاری گەڕانەوە کران. هەرچەند لەبەر نزیکیی هەر دوولا بە یەکتر، فڕۆکەکان هیچیان پێ نەدەکرا، بۆ ترس و مەترالیۆز بەکارهێنان نزیکیان دەبوونەوە فڕۆکەیەکیان پێکێنرا و لە دێی ژاڵە کەوت. بەلام سوارەکانیان لە گەڕانەوەدا کوژراوی سەریان، وڵاغ بەسەر یەکدا تێکەڵ بوو و ئێجگار زۆر بوو (٣ تفەنگ بەفیشەکەکانیەوە) دەست کەوتیان بوو.

پیادەکەیشیان

هەروەها لە فەرماندەی عومەر ئەفەندی، بە ٦٠ چەکدارەوە بەرەنگاریان بوون، پاش ماوەیەکی کەم و کەوتنی فڕۆکەکە، ناچاری گەڕانەوە بوون. کوشتاریان زۆر بوو. ئەمانیش دە تفەنگ و هەندێك فیشەك و مەترالیۆزێکیان دەست کەوت و سوپای میری بە دڵ شکستەیی گەڕانەوە بۆ سلێمانی.

### ئەمجارە سوپای عێراقی هێنا

ئینگلیزەکان ئەو پیلانەی کە بەدوایدا عەوداڵ بوون، تازە دۆزییانەوە. لەگەڵ ئەوەدا، کە وڵسن لە یاداشتەکەیدا دەڵێت کورد و عەرەبی عێراق هاودەرد بوون، بە برسێتی و تونیەتی هاوبەشت و چاکەخوازی یەکتر، لەمەوپێش خوێندتانەوە، بەڵام ئێستا بناغەی دوژمنایەتییان بۆ ئەم دوو گەلە دامەزراند بۆ ئەوەی بگەن بە مەرام.

ئەمجارە بە ناوی دڵسۆزیی عەرەبەوە و بە ناوی حکوومەتی عێراقەوە، بە فەرماندەی نووری سەعید هاتەوە سلێمانی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ کرا بە موتەسەڕیف. بەڵام ئەحمەد بەگ پیاوێکی ڕاست، لە هەموو کردکار و ڕەوشتێکدا مەردانە و بەڕێز بوو تەنیا ئارەزووی گەورەیی تووشی هەڵەی دەکرد. بیری کوردایەتیی ئێجگار بەرز و لە هەموو داوا و کارەساتێکدا هاوکار و هاوبەشیی کرد. بە تایبەتی خۆشەویستی شێخ مەحموود بوو، زۆر بەڕێز و بەرزی دەبینی. بەڵام ئەدمۆندس بەهێزتر بوو، لە شێخ مەحموودی پچڕییەوە، ئیتر بە هۆی چەند پیاوێکی باوەڕ پێکراوی خۆیانەوە ئینگلیزەکان ناوی مافی کورد و حکوومەتی کوردستانیان لە تۆماری خۆیاندا سڕیەوە و بە ناوی حکوومەتی عێراقەوە سلێمانی ناو نرا لیوا. بەناوی خۆیانەوە بە فڕۆکە بەیاننامە بڵاوکرایەوە و ئەمە یەکێکە لە یەکەمین جار دامەزراندنی حکوومەت:

بۆ عموومی ئەهالیی قەزای هەڵەبجە

ئەوا تەبلیغتان ئەکرێ بۆ ئەوەی تەئمینی ئیدارەی قەزا چاکتر بکرێ، ئەحمەد بەگ، قائیمقام و حەمید بەگ معاون، لەگەڵ مەئموورانی کە ئیجاب بکا نێرانەوە بۆ هەڵەبجە. ئەبێ لە ئیجرای وەزائیفدا معاوەنەتی مەئموورەکان بکەن و موتیعانە ئەوامری ڕەسمییەی حکوومەت بەجێ بهێنن.

۲۰ ئۆغستۆس

وەکو لەمەوپێش خوێنرایەوە، بەگزادەکانی جاف پاش سوێندخواردنیان بۆ شێخ مەحموود، قەزای هەڵەبجەیان خستە سەر (کفری) کەرکوک و لە سلێمانی جیابوونەوە. ئەمجارە بە گەڕانەوەی سوپای حکوومەت لە لایەن متەسەڕفەوە، هێنرایەوە بۆ سەر سلێمانی. بەڵام دەسەڵاتی حکوومەت تەنیا لە ناو شاری سلێمانیدا بوو.

### جەزرەبەی (كتيبة الهاشمي)

لە ڕۆژی ۱ی ڕەمەزاندا، لە کاتی گەردوش لە شارەزوورا، نزیکەی ٥٠ سوارەی تایبەتیی سوپایی و عەشایری جاف، لە ئاوایی ڕەمەزاندا بەرەنگاری حاجی ڕەمەزان پاشای فەرماندەی کەتیبەی (الهاشمي) بوون. لە پاش جەنگ و کوشتارێکی زۆر، لە سوارەی میری نزیکەی ۱۰۰

سواریان توانییان پاشا ڕزگار بکەن بەڵام نزیکەی ٣٠ سواریان، کە کەوتنە ناو هۆزی جاف، لە لایەن ژنانەوە لە ژێر ڕەشماڵدا بە مێکوت زۆریان لێ کوژرا و ئەوەی دەرچوو بەبێ چەك خۆیان گەیاندەوە سلێمانی. جا ئەم ڕووداوە کرابوو بە گۆرانی: (لە ئاوایی ڕەمەزان، ڕۆژی یەکی ڕەمەزان درا لە حاجی ڕەمەزان). بوو بە بەستەی جەنگی و پاش شەوێك ماوەی سوارەکانی خۆیان بە پەراگەندەیی گەیاندەوە سلێمانی.

ڕێگەی هاتوچۆی سلێمانی – کەرکوك لە سوپای میری گیرا. تەنیا فڕۆکە هۆی هاتوچۆیە. بەڵام هەفتەی یەك جار کاروانی ئوتۆمۆبێل هەبوو، کە لە پارێزگاریی تابوورێك چەکدارا دەرۆیشت و دەهێنران بە پێی نامەی باوەڕ پێکراوەکانی ناو شار. سەربازە عەرەبەکان کردەوەی باشیان لە سەربازە کوردەکان زۆرتر بوو، سوپای میریش زۆری کوردە. لە سلێمانیدا باوەڕ پێکراوەکان زۆر تر بوون و کاك نەریمان سەرۆکیان بوو، بێگومان بە ناوی نهێنییەوە ناو نەبران. وەکو: سەرۆك نەریمان. ئەندام یادگار. ئەندام کاوە ئەندام زەردەشت. ئەندام خەنجەر.

ئەم چوار ناوە ئەندام و بۆ هەر یەکە لکێك دروست کرابوو لە ناویاندا لە پۆلیس، سەرباز، زابت، مەئموور، دوکاندار، ئۆتۆمۆبێلچی، هەبوو، کارە نهێنییەکانی حکوومەت سەدی (٧٠)ی دەگەیشت بە شۆڕش.

### نەخۆشیم و دەرمانەکەی پوورە زێڕین

بۆ بەسەرکردنەوەی ئازووخە ئەمبارکراوەکەی ژمارە ٢ چووم بۆ پارەزان. لە ڕووی زۆر خواردنی فەریکە گوێزەوە تووشی ئازار بووم. پوورە زێڕین گیایەکی جۆش دا، دوو پیاڵەی دەرخوارد دام، ڕزگاری کردم. بەرامبەر بەو چاکەیەی پێنج ڕووپیەم دایە، وتی تکایە کوڕم ئەم پارەیە بدە بە فیشەك و بیدە بە عەسکەرێك و لە جیاتی من بیتەقێنێت و ئینگلیزێکیش بکوژێ بەسمە.

### شکستەی سوپای میری

حکوومەت زۆر هەوڵی دەدا، کە بێتە شارباژێڕ بەڵام وەی بە سوپا سوارە و پیادە تابوورێکی ئێستر سوارەوە لە کەلی گۆیژە و ئەزمڕەوە ویستیان ئەو ئاواتە بێتە جێ. لە ڕوونەوەبوونی شەوا گەیشتنە سەرکەل. بە شکستەییەکی زۆر خراپ گەڕانەوە بەڵام سەیر ئەوەبوو لە ناو گوردانیدا دوو پیاوی قەرەوەیسی بە دوو باری گا گەنمەوە بەرەنگاریان دەبن. بارەکان لە گایەکان فڕێ دەدەن و دەچنە بووسەوە، پاش کوشتارێکی زۆر لە سەربازەکان یەك ئێستر بە بارە فیشەکەوە و هەشت تفەنگیان دەست دەکەوێت و لەسەر ڕێگایاندا عومەر ئەفەندی لە بنکەی ئەزمڕ، کە فەرماندەیە، تاڵانەکەی بۆ دەبەن. ئەویش بەم نامەیەوە ناردی بۆ بارەگا بۆ فەرماندەی سوپایی، ڕەزا بەگ.

مادەیەك لە نامەكە:

«ئەوا ئەم دوو پیاوە و دوو گا و كەلەپوورەكەیان نێررا. تكایە درێژەی باسەكەیان لێ بچێژنەوە. گا هەیە درۆ نەكەن، ئەگەر پرسیاریان لێ بكەن».

ڕەزا بەگ لەم نووسینە توورە بوو وتی: چۆن زاتێك بۆ فەرماندەكەی دەنووسێت لەگەڵ (گاە) قسە بكە بۆچی ئێمە گاین. تێیان گەیاند گا: ڕەنگە. ۲۸ ئاغستوس.

بارەگا و بۆمباردمانی نۆدێ

لە كانی ساردەوە، بنكە و بارەگا گوێزرایەوە بۆ نۆدێ. ماوەی ۸ ڕۆژ بەبێ ترس و بەبێ ئەوەی فڕۆكە بێتە سەرمان، ڕامان بوارد.

هەموو كەم و كوڕیی سوپا و عەشایرەكان تەواو كرا. بۆ زستان چی پێویست بوو پێك هێنرا. لە ڕۆژی ۹یەمدا لەسەر فەرمانی مەلیك، دەبێت لە ماوەی نیو كاتژمێردا نۆدێ چۆڵ بكرێت و بگەڕێنەوە بۆ كانی سارد. فەرمان دەرچوو بۆ بەڕێكردنی بارخانە و كەلوپەل تا دوایی كار لەگەڵ ۳۰ سوارا مابوومەوە. لە ناكاو دوو فڕۆكە هات و یەكسەر دێی نۆدێی دایە بەر بۆمبا و مەترالیۆز. بەڕاستی لەو كاتی بێ ئاگاییەدا زۆر شپرزە و پەرێشان بووین و فڕۆكەكان ئەم كارەساتەیان بۆ بەجێ هێشتین و گەڕانەوە:

۱– دوو پیاو: بریندار. ۲– نۆ ئەسپ: كوژراو. ۳– پێنج ژن لەگەڵ ژنی شێخ تەها و خوشكی شێخ محەمەدی نۆدێ كوژرا. ٤– سێ پیاو كوژرا لە ئاوایی نۆدێ. ٥– دوو منداڵ كوژرا و یەكێك كەم بریندار. ٦– خانووی سووتاو و خاپوور زۆر بوو.

بۆ تاریكەی ئێوارە ئێمەیش و دانیشتوانی ئاوایی بە تەواوی چۆڵمان كرد. ئاوایی بە سووتاوی و ڕووخاوی كەلاوەوە، گەیشتینەوە كانی سارد و بەجێمان هێشت.

ئەمبیست، ئەیانوت شێخ مەحموود غەیبزانە و كاك ئەحمەد ئاگاداری دەكات. لەبەر ئەوە ئەیزانی، كە نۆدێ ئەم كارەساتەی بەسەرا دێت، بە پەلە چۆڵی كرد. خۆم ئەم پرسیارەم لێ كرد. وتی: ئەگەر، من نەبوومایە و یەكێكی تری پیاوچاك ڕەنگە. بەڵام من چۆن دەبم بە پیاوچاك، كە چاكەم نەبێت. ڕەنگە باوك ڕۆڵەی خۆی فەرامۆش نەكات، ئەگەر خوا بیەوێت. هەر خوا كاری پیاوە دڵێرەكانمان ڕاست بێنێ، كە ناوشاریان بۆ گرتووین. ئیتر تێ گەیشتم كە لە سلێمانییەوە ئاگادار كراوە و ئەم باوەڕەی، كە بە شێخ مەحموود بوویان بۆ شۆڕشەكەمان زۆر باش بوو.

## چوونم بۆ دزڵی

من ئاگادار نەبووم، خێزان لە چ جێگایەکە و دایکیشم لە گەڵیایە فەرمووی: خێزانەکان هەموویان لە پاڕەزان جێگایان نەدەبوووەوە نێرران بۆ دزڵی. بچۆ جێ و ڕێگەیان ببینە و ڵیکیشت ئەبینی، ئەم نامەیەش بدە بە دێوەکە. لە ئەشکەوتەکە دەریبهێنە (دێوەکە: مەحموودخان. ئەشکەوتەکە: دزڵی). نامەکەی بە دەستی خۆی نووسیبوو.

برای دڵسۆزم مەحموود خان

چاوەکانت ماچ دەکەم. وا مەزانە ئاوارە و لێقەوماوین، ئێمە لە ناو کەسوکارمانا ئەژین، کە ئێوەن. ئەحمەد ئەفەندیم ڕاسپاردووە هەموو گفتوگۆیەکتان لەگەڵ دەکات. چاوی کوڕەکان ماچ دەکەم. حورمەتم بۆ خوشکی خۆم فاتمەخان پێشکەشە. برای شیرینم.

مەحموود

١٠ ئەیلول ١٩٢٤

## بۆمباردمانێکی نەبینراو

ئەو کاتەی من لە کانی سارد جیابوومەوە ترسی فڕۆکە زۆر بوو. گەیشتینە شیوی ئاشان. ئێمە سێ سوار بووین. دوو فڕۆکە گەیشتە سەرمان. بۆمبا و مەترالیۆز ئەو ناوچەیە تا کانی ساردی دابێژا. خۆمان شاردبۆوە، تا نزیکەی ئێوارە لە مەکۆدا بووین. ئێمە نەماندەزانی، کە گاگەلی ئەو دێهاتانە نزیکمانە بۆیە فڕۆکە لێمان دوور ناکەوێتەوە. شوانەکەیان بە گریان هات. وتی ٢٧ گای کوشتووە و پێنج گایش قاچی شکاوە. ئیتر تاریک داهات و کەوتینە ڕێگا. لەبەر ئەوەی جێگای ئێمە زۆر چاڵ و نالەبار بوو نەمانتوانی هیچ بەربەرەکانی و تەقەیەك لە فڕۆکەکان بکەین، ڕۆیشتین. شەو ڕوون بۆوە، مانگ لە دەم کەل گۆشەی کێشا. کزەی پێش مانگ دڵی پڕ ناسۆرمانی گەشانەوە. دیمەنی کەژ و دارستان سینەمایی بە بەرچاوا گوزەری دەکرد. چیا و چۆڵ کش و مات بە پێشداریی سوارەکان، کە دەڕۆیشتم بە ڕاستی دیمەن لە هەموو کارەساتی گێتی بێ ئاگای کردم. کەوتبوومە گۆرانی وتن، نەمئەزانی، کە ئەم دەنگە ناسازەم بەلای هاوڕێکەمەوە خۆشە یان ناخۆش. بە درێژیی شەو، ڕۆیشتین. لە کاتی چا خواردنەوەدا گەیشتینە هەوارگەی خێزانەکە و بەر کەپرەکان. چوومە خزمەت ئایشەخان. لەبەر ئەوەی پاش مانگئاوا بە تاریکی ئەڕۆیشتین، بەبێ نووستن و ڕێگەی ناخۆش حەسانەوەمان پێویست بوو، سوارەکەم دامەزران و منیش چوومە کەپرەکەی مستەفای برام و دایکم بینی.

## ئەوەی لەبیرم ناچێتەوە

پاش نیوەڕۆ چووم بۆ دزڵی، کە زۆر نزیك بوو لە هەوارگەکە. ئەمە وێنەی یادداشت و بینینەکەی مەحموودخانی دزڵییە. من لەو باوەڕەدا نەبووم لە دزڵیدا شتێك ببینم، کە بە درێژی ژیانم یادی بکەم.

دیوانخانەکەی دوو نهۆم و بە وشکەبەرد، بەبێ گەچ و یان قوڕ بینا کراوە. لەسەر سەربانەکە ئاڵایەکی کوردستان داکوتراوە و دەشەکێتەوە. لە ژێر ئاڵاکەدا بۆڕیەژەنێك وێستابوو. کاتی نان خواردن و پێش بانگ لە هەموو کاتێکدا و ژەمێکدا بە بۆڕی، مۆسیقا ئاگادار دەکران. گەیشتمە دیوان، مەحموودخان ماوەیەك هات بەپیرمەوە زۆری پێ خۆش بوو، نامەکەم پێشکەش کرد. وەری گرت ماچی کرد ڕووی کردە کۆمەڵی پیران وتی: کوێخا زۆراب (مەلا) بانگ بکە. هات بۆی خوێندەوە. وتی: سەر، دارایی کوڕ، عەشرەت، لە هەموو لە پێشتر گیانی خۆم و فاتمەخان لە ژێر پێ و پێناوی شێخ مەحمووددایە، من هەموو کاتێك ئامادەم. تێ گەیشتم لە هەموو دێیەکی دێهاتەکانی خۆی پیاوێك، کوێخایەك بەناوی کۆمەڵی پیران لە دزڵی، بۆ پرس و پێکهێنانی کاروبار بەڕێوەبردن، وەکو خەرج، باج، زەکات، دەیەك، لای خۆی بوون و هەموو پیاوێکی هەورامی دەبێت تفەنگێك و ١٠٠ فیشەك، هەمانەیەکی بچووکی پڕ لە تێشوو، بەجووتێك کەلاشەوە لەماڵدا بێ و لەناو هەمانەکەدا تووی وشك، مێوژ، نانی دە ڕۆژی تێدا بێت.

کۆبوونەوەی لەشکر لە ماوەی شەش سەعاتدا لە ٥٠٠ چەکدار کەمتر نەدەگەیشتە دزڵی چونکە ئەو کۆمەڵی پیرانی دانشمەندانەی ئەو پێوستەیان بەجێ دەهێنا.

ئەو شەوە لە دزڵی مامەوە و دوا ڕۆژ بۆ چا خواردنەوە هاتمەوە بۆ هەوارگەی خێزانەکە بۆ خزمەت ئایشەخان. بێگومان شەو ڕاسپێرییەکانی مەلیکم بە مەحموودخان گەیاند، زۆری پێ خۆش بوو.

## گەڕامەوە

بەڵام لەشکری هەورامی لە پێش منەوە بوو. ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە شەو لە پارەزان بووم، وتیان لەشکری مەحموودخان نیمڕۆ لێرانەوە ڕابوورد. لە پێش گەیشتنەوەی ئێمەدا مەحموودخان و لەشکرەکەی گەیشتبووە کانی سارد و کارەساتی بینراوەکانم بۆ مەلیك گێڕایەوە. فەرمووی دێوی خۆمە.

پاش دوو ڕۆژیش حەمە ڕەشید بەگی وەیسەیش لەسەر ڕاسپێردنی خان دزڵی بە لەشکرەوە گەیشتە کانی سارد. لەشکری هەورامی ١٢٠٠ چەکدار لە بەینی دار و دەوەنی کانی ساردا بڵاوبوونەوە.

ـسەر فەرمانی مەلیك بۆ مەحموودخان و حەمە ڕەشید بەگ، هەریەکی ١٠٠ لیرەی زێڕم بۆ ـوـن. حەمە ڕەشید بەگ بە کەمی زانی وەری نەگرت. بەڵام مەحموودخان پاش وەرگرتنی وتی ـە جیاتی ئێمە بە بار قرانی ئێرانی بێنین بۆ شێخ مەحموود، ئەو لیرەمان ئەداتیّ؟ یەك لیرەی ـەگرت و ماچی کرد و ٩٩ لیرەکەی دایەوە دەستم وتی: ئایا ئەبێت بە گیرفانی بۆش هاتبم.

ئیتر بە پێویستم زانی تێ بگەم کە حەمە ڕەشید بەگ بەکەمی زانی وە وەری نەگرت، ئینجا ـتیەوە کەوابوو بچۆ ٩٩ لیرەکە بدە بە حەمە ڕەشید بەگ بەڵام چوومەوە خزمەت شێخ مەحموود. هەموو بیتراوەکەمم بۆ گێڕایەوە، بۆ ڕۆژی دوایی ئێوارە شێخ مەحموود چوو بۆ لای مەحموودخان و بەبەر بنکەکەی حەمە ڕەشید بەگدا ڕۆیشت، هات بەپیریەوە وتی ئەوە لێرە ـەویت؟ وام زانی ئێستا لە وەیسەیت. بەو توانجە حەمە ڕەشید بەگ شەرزە بوو. شەو لەگەڵ مەحموودخان هاتنە بارەگا، پاش ماوەیەك فەرمووی ئەحمەد: دیارییەکت پێشکەش بە حەمە ڕەشید بەگ کرد؟ دەستبەجێ خستمە پێشی.

وتی من هاتووم بۆ گیان بەختکردن و لێبووردن. دانیشتن بێ سوودە، دوژمن لە پەنامانداییە، نزیکە ئێمەیش ئامادەین.

**شەبەیخوون بۆ سەر سوپاکەی سلێمانی**

لەسەر ویستنی لەشکری هەورامی بۆ چوونە سەر سوپاکەی سلێمانی، ئەم پرۆژە و بەرنامەیە دانرا. بۆ بەجێهێنانی ئەم پرۆگرامە بە فەرمانی مەلیك فەرماندەی گشتی ماجد و یاریدەدەر ئەحمەد خواجە دانران. بەڵام عادل ئەفەندی گێرەکەی شێواند. پرۆگرام گۆڕرا، بە خۆی عادل و شێخ ڕەشیدی شێخ علی، پاش بانگی ئێوارە، لەشکر بۆ سلێمانی کەوتە ڕێ بەم جۆرە:

| | پیادە | سوارە |
|---|---|---|
| | هێزی وروژم | هێزی پاشدا |

لە ئەزمڕەوە

فەرماندە: حیکمەت ئەمین و عومەر ئەفەندی: ٢٥٠ پیادەی سوپایی ١٣٠ سوارەی ڕوغزایی

٢٥٠ پیادەی هەورامی ١٣٠ ئیسماعیل عوزێری

هەمووی: ٥٠٠ ٢٦٠

لە کانی ئاسکانەوە تا جوولەکان ١٥٠ سوارەی سوپایی و تایبەتی

لە گۆیژەوە

| | | |
|---|---|---|
| ڕەمزی عەبدولکەریم و ڕەشید ئەفەندی | ۲۰۰ پیادەی سوپایی | ۱۵۰ سوارەی سوپایی |
| | ۲۵۰ هەورامی | ۱۵۰ پشدەری |
| | هەمووی: ٤٥٠ | ۳۰۰ |

لە مەڵکەندییەوە تا جوولەکان ۵۰ سوارەی سوپایی تایبەتی

سوارەی شێخ محەمەد و شێخ محەمەدی شێخ عەلی و پەڕاگەندە ۱۸۰ سوارە لە وڵوویە و جوولەکانەوە

ناوی شەو (چەمەك)

ماجید وتی: لە سوارەکانمان زۆریان ڕۆیشتوون، ئێمە مانەوەمان دروست نییە. ئێستە هیچ کاروبارێك بەسەر شانمانەوە نییە. پێویستە بچین و تێکەڵ بە سوارەکان ببین. ڕۆیشتین گەیشتینە سەر کارێزەکەی (حسین جۆلا).

شەو تاریك بوو، هەستی سوارێکمان کرد ڕێگامان لێ گرت دەنگمان دا، وتی: چەمەك. عادل ئەفەندی بوو. وتی کەس نەما و بەغار ڕۆیشت و بە دوایدا شێخ ڕەشیدیش هات هەردووکیان ڕایان کرد ڕۆیشتن. بەڵام تەقەی لای هێزی خۆمان زۆر بە گەرم دەبیستra، لە بەر ئەوە زانیمان درۆیان کرد. جەنگ زۆر ترسناك بوو، گوللە بە لای ئێمەیشدا چزە چز دەڕۆیشت. ئیتر کەوتینە هەوڵی ئەوەی هێزەکان لە ئێمەوە فەرمان وەربگرن. خۆمان گەیاندە پاشداری سوارەی پشدەری، شیوی گردی سەیوان، لەوێوە لکی جوولەکانیشمان ئاگادار کرد. یەك بە یەکتر بۆ گردی شێخ محێدین و کانی ئاسکان و مەڵکەندی و سابوونکەرانیشمان تێ گەیاند. گەیشتینە نیوە شەو، کاتژمێر ۱۲ لە ناو شارا تەقە و هەرا ئێجگار زۆر بوو. دەنگی هاوار بۆ ژیانی شێخ مەحموود و شۆڕش زۆر بە بەرزی دەهات، بە مەنجەڵ خواردەمەنی و ئاویان دەدا بەو لەشکری پیادەیە، کە گەیشتبوونە ناو شار. لە سلێمانیدا پیادەکەمان بڵاوبووەوە بەڵام پێویست بوو، کە لە کاتژمێری (۱) ی پاش نیوە شەودا بگەڕێنەوە و لە حکوومەت گەیەنرا گرتنەوەی سلێمانی ئاسانە بەڵام فڕۆکەی ئینگلیز لە دانیشتوانی سلێمانی ناترسێت، وێرانی دەکات.

گەڕانەوە بۆ شارباژێڕ

ماجید وتی: ئەحمەد تۆ بە پەلە بگەڕێرەوە، ئێستە عادل و شێخ ڕەشید بۆ پاکەڕێزیی خۆیان شتی ڕاست ناڵێن، مەلیك و مەحموود خان و حەمە ڕەشید بەگ و هەموویان زۆر لە ئەندێشەدان، تۆ بڕۆ بگەڕێرەوە، منیش هێزەکە ڕێك دەخەم و دەگەڕێمەوە کە گەیشتمە سەرکەل، بیر و

تێبینییەکەی ماجید ڕاست دەرچوو، هات بە پیرمەوە یەکسەر چۆنیەتیی برینەکەمیان پرسی، وتم بریندار نیم. ئەی ماجید؟ ئەویش بریندار نییە و بە تەواوی کارەساتم بۆ گێڕانەوە. سەریان سوڕما. دەستبەجێ فەرمانی بەندێتیی هەردووکیان دەرچوو.

لە ترسی جەنگی ناو کۆڵان، شێخ مەحموود، بە خورتی و جەنگ نەیدەویست سلێمانی بگرێتەوە، دەیزانی دانیشتوانی شاری تێدا لە ناو دەچێت و تالان دەکرێن، دەکوژرێن.

ڕاپۆرتی جەنگی (نهێنی)

ژمارە ١

ڕۆژ ٢٥ ئەیلول ١٩٢١

لەقوماندەی هێزی سوارەی سوپاییەوە

بۆ قوماندەی سوپایی – سیتەك

١– لەگەڵ ئەحمەد خواجە بۆ تێکەڵبوونی سوارەکان چووین بۆ شەونخوونیی سەر سلێمانی.

٢– لە ڕێگە تووشی فەرماندە عادل و یاریدەدەر شێخ ڕەشید بوون فیراریان کرد. بە ناچاری ئێمە کارە پێسپێراوەکەیانمان گرتە سەر شان و ئەمەیش دواییەکەیەتی:

١ برینداری: وەیسەی هەورامی.

١ کوژراو: وەیسەیی.

٢ ئەسپ: سوارەی سوپایی.

١ ئەسپ: سوارەی تایبەتی.

بەبێ سووچ و گوناح لە گەڕەکی جوولەکان یەعقووبی حەسەنە جوو، کە لە تەمەنی ٧٠–٨٠ ساڵەدا بوو لە لایەن هێزی جوولەکانەوە کوژراوە.

٤– بە پەلە فیشەك بنێرن.

٥– نهێنییە.

دە سەربازی پیادەی ئەزمڕ لە ناو شارا ماوەتەوە، شەو دەگەڕێنەوە. عەرزتان دەکرێت.

ماجید

قوماندانی سوارەی عەسکەری

بە ڕاستی، شەو بۆ پێگەیاندنی فەرمانی فەرماندەییی ماجید، بە پیادەیی چووم بۆ بنکەکانی سابوونکەران و مەڵکەندی، زۆر ماندوو بووم. چزەی گوللەیش زۆر دەیترساندم. فەقێ ئەحمەدی درەیی پیر بوو، نەدەگەیشتە من. کە گەڕامەوە بۆ لای ماجید، کەوتم و ڕۆژی دوایی بە درێژاییی ڕۆژ تام لێ هات، ڕووم نەهات بە کەس بڵێم. چونکە یەکەمین جارم بوو، کە جەنگی وا پڕ ترس و بە تین ببینم ئەوەك بڵێن ترساوم. شەو ماجید هات، ڕاپۆرەکەیشی لە سیتەك دابووی بە ڕەزا بەگ. تێم گەیاند، کە نەخۆشم وتی: بچۆ هەتا دەتوانیت بخۆ. گاڵتەی پێ کردم.

فەرمانم پێ درا، کە بە پێنج سوارەوە بچم بۆ درزلی و خێزانەکە بهێنم بۆ شێخ ئەلمارێن، دێی خۆی (مەلیك). پاش گەیشتن بە شێخ ئەلمارێن تەنیا لەگەڵ سوارێك مامەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی دابمەزرێن.

من ناوی ئەم دێیەم زۆر بە لاوە سەخت و سەیر بوو. مام کەریم ناو، کە لە تەمەنی (٧٠) ساڵەدا بوو، لێم پرسی، وتی: ئەمە وا نییە مەئمووورانی عوسمانی وایان لێ کرد. لە ناو ئەم ئاواییەدا دەوەنی دار بەڕوو و مازوو زۆر بوو، هەڵدەهاچران بۆ ئەوەی ڕاست و زوو پێ بگەن، پێیان دەوت (شێخەڵی ماڵان) ئەوان کردیان بە شێخ ئەلمارێن. پاش دوو ڕۆژ گەڕامەوە بۆ بارەگا لە کانی سارد.

حکوومەتی سلێمانی بیستی، کە خێزانەکە هاتۆتە شێخ ئەلمارێن، پاش چەند ڕۆژێك فڕۆکەیان بۆ ناردن. بەڵام (چەمەکیان) بۆمبارددمان کرد، پاش بۆمبا و مەترالیۆزی بەکارهێنان، ئەسپێکی سەید برایم بریندار بوو، لەگەڵ ژنێك کوژراو. بەڵام ئەو منداڵەی بە باوەش ژنەکەوە بوو بەبێ وەی ڕزگاری بوو.

بۆ بینینی خێزانەکە چوومەوە بۆ شێخ ئەلمارێن، بە ڕاستی ترسیان زۆر بوو. چونکە دێی چەمەك نیو سەعات لێیانەوە دوور بوو، لە ئەندێشە و ترسدا بوون. شەو لە ئاواییدا بووین پێش تاریکە و ڕوون بردمن بۆ ئەشکەوتەکانی دێی زێیە. ئەوەك دووبارە فڕۆکە بێتەوە و بۆمبابارانیان بکات، پاش دوو ڕۆژ بەم دەستوورە من گەڕامەوە بۆ بارەگا.

لەسەر ڕێگادا چوومە دێی سوێرە لە ڕەزائاوە. ڕەزا بەگ بە ناساغی لە ماڵی کوێخا بوو و عیزەت نەجیب و سوارەکانیشی لە ئاواییدا بوون. بە ڕەزا بەگم وت: بڕۆرەوە بۆ سلێمانی و منیش چۆنیەتیتان بە مەلیك دەگەیەنم و هەروەها بە کاکە عیزەتیش گەیاند. بەڵام هێشتیانەوە بۆ ماوەیەکی تر.

ئەحمەد بەگی موتەسەریف پیاوێکی دڵپاك و خانەدان بوو. بە درۆ باوەڕی زۆر بوو، وای دەزانی هەموو کەسێك وەکو خۆی ڕاستە. ئەوانەی دەگەڕانەوە بۆ سلێمانی هەموویان بە نامەی

بەرێزگارییەوە دەرپێشتنەوە، بەڵام بە پێچەوانەی ڕاستی بە موتەسەریفیان دەگەیاند، وای حزانی شێخ مەحموود کەمدەست بووە و وردە وردە هەموو کۆمەڵەکەی دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەو ئەواتەی، هەرچی دەگەڕایەوە بە دووڕوویی ئیشی خۆی پێك دەهێنا و خۆی پێ دادەمەزراند.

بۆ ئەوەی منیش بگەڕێمەوە، ئەحمەد بەگ باوکمی حەپس کرد، بەڵام زۆر عەنتیکە بوو دەچوو دەستی ماچ دەکرد و پێی دەوت لە جێگەی باوکمیت کەچی دەیخستە بەندیخانەیشەوە. داوای نامەیان لێ کرد، کە بۆم بنووسێت و بگەڕێمەوە، شێخ مەحموود کەسی بە زۆر و خورتی نەبردبوو و گلەیشی نەدەدایەوە لەبەرئەوە هەزارانی وەکو من دەیتوانی بڕواتەوە و نامەی ڕزگاریش لە خۆی شێخ مەحموود وەربگرێت. جا باوکم ئەم نامەیەی بۆ ناردم:

«من ژیانم بە پاکی بردە سەرو تەواو بوون، تۆیش لە ڕێگەی باوەڕی پاکی خۆتدا بژی».

لەو کاتەدا باوکم، خواجە ئەفەندی، لە تەمەنی نزیکەی (٨٥) ساڵیدا بوو. بابەکر ئاغا و عەباس ئاغای سەلیم ئاغای پشدەری قوتابیی خۆی بوون و زۆر بەڕێز دەیانڕوانییە خواجە ئەفەندی. هاتنە سلێمانی هەر لە ڕێگەوە یەکسەر چوونە سەرای لای ئەحمەد بەگ و ئەحمەد بەگیان برد و لە پاش دەست ماچکردنی، هێنایانە دەرەوە بردیانە ماڵەوە.

لە کاتی ساردەوە، بارەگا چوو بۆ هەرمێلە، کاتی هێستر و ڕەمزی ئەفەندی بە ٥٠ پیادەوە هێنرایە (شیوی ئاشان) و عادل ئەفەندیش کرا بە یاوەری ڕەزا بەگ و لە بارەگا مانەوە. پاش دوو ڕۆژ لەسەر ویستنی شێخ جەلال برازای مەلیك، لە ناو ئاوی هەرمێلە مایەوە. شەو سەربازێك هات وتی مەلیك بە پەلە داوات دەکات. بە پیادەیی ڕۆیشتم، لە ڕێگادا تووشی عادل و چوار سەربازی تریش بووم، ماوەی (١٥) دەقیقە ڕێگە گەیشتینە بارەگا و چووینە خزمەت مەلیك، فەرمانی بەندێتیم درا و درامە دەست بنکەی مەترالیۆز و فەرمانیان حەسەن ئاغا. ئیتر من لە کەلوپەل و ئەسپ و تفەنگ و سەعات و پارەم بێ ئاگا مامەوە. هەروەها ماجیدیش هێنراو لە ژێر چاودێریدا بوو. حەسەن ئاغا زۆر چاکەی خستە سەرم. ڕۆژێك ئەم کارەساتەم لێ پرسی. وتی: تۆ چ ژوانێکت داوە بە سەعۆلی خەلیفە کەریم، کە نامەی چەپەمنی بۆ ناردوویت نامەکەیش گیراوە؟

بە ڕاستی کەوتمە شەپۆلی دەریای لێکدانەوە، سەرئەنجام چی بێت، من هەرگیز شتی وام نەکردووە و ئاگام لەم کارە نییە. پاش (١١) ڕۆژ حەپسیم، کۆمەڵی پرسیاری سوپایم بۆ دامەزرا:

١- ڕەزا بەگ ٢- شێخ محەمەد غەریب ٣- شێخ عەلی سەرکار.

بۆ یەکەم پلە ئەم کۆمەڵە پرسیاریان لێ دەکردم. ماجیدیش لەو کاتەدا لەوێ دانیشتبوو. نامەیەکیان هێنا و خوێندیانەوە. دەڵێت

... بەو نیشانەی لە چایخانەکەی نەعمان تفەنگەکانمان.. گۆڕییەوە: چەپەنم بینی وەرەوە.

داوای وەڵامیان کرد:

وتم: من موتەسەریف و چەپەن لەو کەسە زۆر باشتر دەناسم و ڕێگەش نەگیراوە. چ وەختێك ئارەزوو بکەم بەبێ ترس دەگەمەوە سلێمانی. بەڵام ئەو کوڕەی ئەم کاغەزەی بۆ من هێناوە دەبێت بمناسێت، بیهێنن. کوڕە، بە دارکاری هەموو لەشی شکابوو. وتیان ئەحمەد ئەفەندی کامەیە کە نامەکەت بۆ هێناوە؟ وتی. ئەوە ئێوە شێت بوون. نامەی چی و ئەحمەد ئەفەندیی چی؟ من شاگردی حەمەی عەزەی چەکوشم، شاگرد قەساب. ئەی ئەم کاغەزەت بۆ کێ هێناوە؟ ئەو بەدبەختەی بە دار کوشتمی ئەم کاغەزەی دامێ و وتی بڵێ بۆ ئەحمەد ئەفەندیم هێناوە ئەگینا ڕزگار نابیت. من دەچم بۆ کوێستان بۆ لای مێگەلی وەستام.

کار کەوتە روو، لەم وتووێژەدا، کە ئەکرا شێخ مەحموود خۆیشی دانیشتبوو لە پڕ ڕاپەڕی، فەرمووی هەموو شتێك دیاری دا. ئەحمەد لێم ببوورە، ویستیان بتنێژن. بەڵام هیوادارم خۆیان بنێژرێن کوڕە بەرەڵا کرا و منیش سەربەست کرام. عادل چوو بوو بۆ دزلی بۆ لای خێزانەکەی، کە هێشتا نەگەڕابوونەوە. لەو کاتەدا شێخ فەرەجی بانی بووك هات تفەنگەکەی منی بە دەستەوە بوو، وتی عادل خەڵاتی کردووم. وەرم گرتەوە بەڵام ٦٠ فیشەکم تێدا چوو، لەگەڵ زۆر شتی تر و پارەم.

ئەو کارەساتەم بۆ وێنەی پیاوخراپ پێشان دا، کە لە ئەنجامدا ڕسوایی بە سەرا هات، بەسەر هەموو پیاوخراپێکدا ئەبێت بێت. بەڵام تەفرەقە و بەدکاری بە باڵمان بڕاوە.

بە بۆنەی گەردوشێکی ناو دێهاتی شارباژێڕەوە شێخ مەحموود هاتە شێر – ئارێژە. بەرەو پایز دەچین بۆ نیشتەجێی زستان، بیر کرایەوە بڕیاری کەندەسوورە درا بۆ خێزانەکان چونکە لە هەموو ترس و تووشییەك دوورە و جێیەکی سەختە.

فەرمانم پێ درا، کە بچم بۆ گوڵی بۆ بینینی حەمە ساڵح بەگی نائیب لە بەگزادە و ئەمیرەکانی بانە. ئێوارە گەیشتمە گوڵێ، فەرمانی مەلیکم پێ گەیاند زۆری پێ خۆش و سەر بەرز بوو. وتی: ماڵ، گیان، لە بەر پێیاندایە. گەڕامەوە و وەڵامەکەم گەیاندەوە. ئیتر بۆ گواستنەوەی خێزانەکە فەرمان درا بۆ پاشبەرد و کەندەسوورە و زۆر لە دێهاتەکانی بەشی بانە و پێنجوێندا بڵاوکرانەوە بەو مەرجەی دێهاتی بانەیی بن. دایکم و مستەفای برایشم لە کەندەسوورە دامەزران.

بارەگا چووە دێی کەناروێ نزیك بە چوارتا، کە حکوومەتی تێدا بوو. بەڵام من دانرام بە بنکەی شێخ ئەلمارین و هاتوچۆ تا پشتی مووبرە و مامە خەلان بە ئاوێتەی لەشکری شێخ محەمەد سەعید نزارمیشەوە.

هەروەکو ڕۆژان گەیشتینە پشت دێی گۆڕەدێم. دەنگی فڕۆکە و تەقەی زۆرمان دەبیست لە چیا هاتنە خوارەوە بۆ دێی سوێرەڵە. کوێخا حەمە ساڵح خۆی ئامادە کردبوو بۆ ڕۆیشتن، وتی جەنگ گەرمە. ڕۆیشتین گەیشتینە پشت دێی سنجەڵە. بەڵام کەوتینە ژێر ئاوڕشێنی مەترالیۆز. گوللە بەجۆرێك پەرێشانی کردین ئاگامان لە خۆمان برِا و خۆمان گەیاندە ناو بەربە گەورەکان. وڵاخمان بەجێ هێشت، بە پیادەیی گەیشتینە دار و شەخسەکان، مێکوکان و نزیك ئاوایی چوارتا. لە ناکاو دیسان مەترالیۆز کارێکی خراپی پێ کردین و بەبێ کوژاننەوە گەڵای بە دارەوە نەهێشت. بە ڕاستی جەنگێکی زۆر پڕ ترس و خوێنڕێژ بوو، ئێمە لە هۆ و چۆنیەتیی نەگەیشتبووین، تەنیا جەنگە و بەس.

لە کاتێکدا لە هەموو لایەکەوە گوللە دەبارێت، خەلیفە یوونس گەیشتە لامان پەرێشان، بە تایەکی زۆر خراپەوە، تینوو و ماندوو، ئاومان دایە حەسایەوە. لێم پرسی ئەمە چییە؟ وتی:

بارەگا لە کەناروێیە دێیە. لە پێش بانگی بەیانیدا لەگەڵ سابیر بەگ و یوونس ئەفەندی هاتن بۆ سەر کانییەکە. پیادەیەکی زۆرمان بەدی دەکرد دێن بۆ ئاوایی. وامان زانی لەشکری خۆمانە و بەشەو گەیشتوون. زۆر نزیك بوونەوە. دەرکەوت بە بەرگی بادینانییەوە، لەشکرێکی زۆرە و دێن. زانیمان بێگانەن هەر لەپشت کەڵەکە بەردی کانییەکەوە دامانن بەر دەسترێژ. گێڕامانەوە. چونکە نەیاندەتوانی لابدەن ناچاری گەڕانەوە بوون.

بەڕاستی بگەیشتنایە ئاوایی تاکمان دەرنەدەچوو. چونکە ئێمە لە مێرگەکەی پشت ئاواییدا بێ ترس نووستبووین. زۆریان لێ کوژرا. دوو فڕۆکەیش هات لە یەکەمین دەسترێژا یەکێکیان لەناو خۆیاندا کەوت، زۆر بە نزمی هاتن، ئێستا شکستەیان دەکاتە ئێرە، دەگەڕێنەوە بۆ چوارتا. بەڵام لە سەرسیرەوە وچان نادرێین، چوار پێنج مەترالیۆز لەسەر سەرمان کار دەکات.

سەرەتای شکستە گەیشتە لامان و لە هەموو لایەکەوە کەوتنە ژێر لوولەی تفەنگی شۆڕشگێرانی کورد. کەوتنە تەنگانە و ناچاری، بە کوردی بانگیان دەکرد ئیمەیش براتانین. بەڵام سەیر ئەوە بوو، کە ئێمە کەوتینە تەقە لەو شکستەیە ئیتر لە سەرسیرەوە تەقە لەسەر ئێمە نەما و بانگیان دەکرد بیانکوژن. بە عەرەبی و کوردی بانگیان دەکردین. لە بریندارەکانیان چەند کەسێك بەجێ مابوو. تێ گەیشتین، کە ئەم ئۆردووە ئاسوریی لیڤی بوون بە بەرگی کوردیی بادینانەوە بۆ گرتنی شێخ مەحموود، جەنگاوەرەکانی سەرسیریش عەسکەری عیراقی بوون. بێگومان کورد و عەرەب.

لەگەڵ تاریکەی شەودا سەر لە ئێوارە لە ناو دێی چوارتادا دوایی جەنگ هات. بە تاریکی گەڕاینەوە بۆ لای وڵاخەکانمان. شێخ حەمە سەعید وتی: لەم دێهاتە وڵاخەکانمان تێر بکەین و بگەڕێینەوە بۆ شێخ ئەلمارێن. لە ئێمە دوو بریندار هەبوو ١- ئەحە قەڵەو لە هەردوو سمتی و

گوڵ محەمەد، کە لە تەمەنی ٣٥ ساڵەدا بوو، لە پووزی. لە شێخ ئەلمارێن برینەکانیانم برژانەوە زۆر لە ئەحە قەڵەو دەترسام بمرێت. چونکە زۆر دەترسا بەڵام محەمەد گۆرانیی دەوت و برینەکەی زۆر بەکەم دەزانرا. بەڵام داخەکەم لەگەڵ هەتاودا مرد و لە شێخ ئەلمارێن ناشتمان.

دێی شێخ ئەلمارێن چۆڵ بوو. لە ترسی فڕۆکە دانیشتووەکانی ئاواییان بەجێ هێشتبوو و لە چیای پشت ئاواییدا دەژیان. عادل ئەفەندی نازانم لە کوێوە هات پەیدا بوو، ئێوارە وتی من دەچمە ناو لادێیەکان، بۆ نەچوونی تکا و قسەی ئێمەی نەبیست، ڕۆیشت.

پاش بانگی ئێوارە لە دوو جێگا دوو ئاگری زۆر بڵندی کردەوە. زۆر بە ماندوویەتی گەیشتە سەر ئاگرەکان وکوژاندمانەوە. ئەمە بۆ ئەوەی کە لەشکری ئاسوری و حکوومەتی چوارتای پێ دەترسێت. بەڵام ڕاستییەکەی نیشانە بوو بۆ ئەوەی بزانن بنکەی ئێمە لەم جێگەیەی پێشتر نییە. ئەمدەزانی ڕەزا بەگ لە کوێیە یەکسەر ئەم نامەیەم نووسی و ناردم بۆ مەلیك:

١- لە پشتی مێکوکان بەرەنگاری لەشکری ئاسورییەکان بووین.

٢- شێخ محەمەد سەعید دە ڕۆژە هاتووە.

٣- لە سوارەی تایبەتی ئەحە قەڵەو بریندار و گوڵ محەمەدیش ئەمڕۆ بە برینەکەی مرد.

٤- دوو تفەنگی پانزە تیرمان دەست کەوتووە.

٥- ئەسپ و تفەنگ و کەلوپەلی گوڵ محەمەد لای کوێخا محەمەدی شێخ ئەلمارێن دانراوە.

٦- نازانم عادل ئەفەندی لە کوێوە هاتووە ئێستە لە ناو لادێکانی شێخ ئەلمارێن لە چیاکەیە. شەو دوو ئاگری کردەوە کوژانمانەوە.

٧- پارەی حەفتەیی سوارەکان نەهاتووە، لەگەڵ ئازوخەی ٦٥ سوارەدا. حەفتەیی ٤٥ سوارەکانی تایبەتیشمان بۆ بنێررێت و چاوەڕێی فەرمانتانین.

شێخ محەمەد سەعید و شێخ محەمەد و شێخ ئەحمەدی برای دەستتان ماچ دەکەن.

ئەحمەد خواجە

١٩٢٤/١٠/٢٠

وەلام:

سەلام لە شێخ حەمە سەعید و چاوی براکانی و هەمووتان ماچ دەکەم. لەگەڵ تۆفیق ئاغا ئەم شتانەی خوارەوەتان بۆ نێررا، گەیشتنی بنووسنەوە عادل

ئەفەندی بچێتەوە بۆ لای عائیلەکەی.

مەحموود

٥٠٠ روپیە. ١ فەردە شەکر. ١ کیسە چا. ٢ بار نان. ٤ گونیە ئارد (٢) بار.

کاك عادل نامەکەی خوێندەوە و ڕۆیشت.

سوارەی سوپایی و عەشایەر هەر تیپە لە جێگا پێشبینراوی خۆیدا بەرامبەر بە هێز و دەسەڵاتی حکوومەت ئامادە و چاوەڕێی لێدانی دوژمن بوون. لە شارەزوور، قەرەداخ. لە هەر چوار لای سلێمانیدا ماوەی دامەزراندنی حکوومەتیان نەدەدا و دەسەڵاتداریان، هێزە ئاسورییەکەی لیڤی لە چوارتا بە دڵشکاوی و سەرشۆڕی، قەتیس مایەوە. داوای فڕۆکەیان کرد، کە لە ژێر باڵیدا بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی.

فەرماندە ئینگلیزەکە، بە قوماندانی لیڤییەکەی وتبوو: «ئایا ئێوە بە بەرگی کوردییەوە هاتن بۆ گرتنی شێخ مەحموود و دوایی پێهێنانی شۆڕشی کورد، یان بۆ فێربوونی چەکبازی لە کوردەکانەوە»؟

دوو فڕۆکەیان بۆ هات لەگەڵ گزنگی هەتاودا، بە نیگاهداریی فڕۆکەکان ڕوو بە سلێمانی چوارتایان بەجێ هێشت. لە بناری گۆیژەدا بەرەنگاری سوارەی هەمەوەند (صابر) بوون. گاڵتەیان پێ کردن. چونکە فڕۆکە توانای هیچ کارێکی پێ نەئەکرا، تا نزیکەی بانگی ئێوارە جەنگ بە گەرمی درێژەی بەست. لە تاریکەدا سوارەکان کشانەوە بۆ سیتەك و ئەوانیش لە ئەزمڕەوە سەریان دەرکرد.

لە هەمەوەندەکان ٤ بریندار و ٦ ئەسپ کوژرا. لە ئاسورییەکان بریندار و کوژراویان بەجێ نەما بەڵام بە پێی نامەی باوەڕپێکراوان لە سلێمانی ٢٠ کوژراو و ٣٠ برینداریان بووبوو و لە پاشدارەکەیان ١٠ ئێستر بە باری فیشەك و کەلوپەلەوە گیرابوو. لەم جەنگە خوێنڕژاندن و ترسناکەدا فڕۆکە نەیتوانی هیچ چەپۆکێك بوەشێنێت.

چوونم بۆ کەندە سوورە پێویست بوو. شێخ محەمەد سەعید و سوارەکانیم ناردەوە بۆ نزارە و سوارەکانی خۆیشمم نارد بۆ دێ (ڕەندینە و چەمەك). پاش دوو ڕۆژ چووم بۆ کەندەسوورە لە بابەت کوشتنی منەوە دەنگ بڵاوببووبۆوە بەڵام لە دایکم و مستەفا برام بە پەنهان گیرابوو. بەو کاغەز و پیاوەی لە وەپێش ناردبووم و وەڵامیشم وەرگرتەوە باوەڕ نەکرابوو. بەو چوونەم ئەو باسەیش بەسەر چوو. لە پاش دوو سێ ڕۆژ فەرمانم پێ درا، کە بە سێ سوارەوە بچم بۆ بازیان بۆ ناردنی ئازووقە لە گەنم و جۆ و برنج. لە دوای ئامادەکردنی بارخانە و پێش گەیشتنی ئێسترەکان، عەبدوڵڵا، عەبە کۆڵ هات و نامەیەکی بچووکی بە دەستنووسی باوکم بۆ هێنام.

حکوومەت بڕیاری دا بە گرتنت، کەریم کاکە زاڵ بە ١٠٠ سوارەوە ئامادە کراوە. ئەمشەو دەدەن بەسەرتا، لە داریکەلی بتگرن و پاش دوو سەعاتیش لە سەرزەلیشەوە پیاوێك هات وتی: کەریم ئاغای کاکە زاڵ دەڵێت بڕوات لە داریکەلی نەبێت، ئەمشەو دەدەین بە سەریا.

ئێمە داریکەلیمان بەجێ هێشت. هاتن، پاش نیوەڕۆ گەڕانەوە بۆ سلێمانی. ١٩٢٤/١٠/٢٩.

پاش چەند ڕۆژێك بیستم کە کاپتان گاون و ٣ ئینگلیزی تریش هاتوونەتە (تەنگیسەر) بۆ لای شێخ قادر. بڕیارم دا، کە لە گەڕانەوەیاندا پیلانی گرتنیان پێك بێنم. بەڵام لە ناکاو لە لایەن حەفسەخانەوە ئەم نامەیەم بۆ هات.

برای خۆم ئەحمەد ئەفەندی

خوا ئاگادارتان بێت. لە مژدەی خۆشیتان هەمیشە خۆشحاڵم. تا ئێستە هیچ برنجت بۆ نەناردین. برام چەند میوانێکمان هەیە لە گەڕانەوەیاندا بۆ سلێمانی دەبێت زۆر ئاگاداریان بکەیت تاوەکو بە سەلامەتی بگەنەوە سلێمانی و چاوەڕێم کە شەوێك تشریف بفەرموون و سەید ئەحمەدی چایچی ئاگادارمان بکات.

خوشکت: حەفسە

١٩٢٤/١١/٥

لەگەڵ بارە ئازووخەکاندا ئەم نامەیە و چۆنیەتیی کارم نووسی و پێشکەشم کرد. بۆ دوو جاری تر کاروانی هەر چل ئێسترەکە بارم ئامادە کرد و لەپێش وەرگرتنەوە وەڵامی نامەکەم دا. دوو بارم برنج نارد بۆ تەنگیسەر و شەویش خۆم بە تەنیا سوارە چووم. لە پاش بینینی حەفسەخان، شێخ قادریشم بینی، زۆرم قسە لەگەڵ کرد و نەگەیشتینە مەرام.

پاش ئەوەی، کە نیشم تەواو بوو داریکەلیمان بەجێ هێشت و گەڕاینەوە لە دوو جێگا تووشی تەقە بووین. بەڵام لەدەم دەریەندی گۆیژە، زەوی چراغ، خراپ توویش بووین. خۆیشمان نازانین چۆن ڕزگار بووین یان چی ڕزگاری کردین چونکە تێکەڵ بە پیادەی عەسکەری حکوومەت بووین بەڵام دوژمنەکەمان ئازا نەبوو، گەیشتمەوە چەمەك. لەگەڵ سوارەکان کۆبووینەوە. بەفر باریبوو، ماوەی دەرچوونی وڵاغ نەبوو نە لە ڕەندینە و نە لە چەمەك. باشتر جێگەم نەدەدۆزییەوە، کە تێدا گوزەران بکەین. لادێیەکانیش ئەوەندەیان بەبەرەوە نەمابوو، کە بەبێ یارمەتی بتوانن ئەو زستانە، ئازووخەی خۆمان و وڵاخمان بدەن. نامەم پێشکێش بە مەلیك کرد، چۆنیەتیی خۆمانم بەتەواوی پێشان دا و بە شەو بەسەر بەفر لەگەڵ دوو چەکدارا ناردم بۆ کەندە سوورە. پاش حەوت ڕۆژ ئەم وەڵامەم وەرگرتەوە:

بۆ نوور چەشمی ئەحمەد ئەفەندی

کاغەزتان گەیشت. زۆر لە هیمەت و خەدەماتی سادیقانەتان مەمنوون بووم. جدەن سەعی و تێکۆشینتان شایانی تەشەکورە. خوا هەموو لایەك لەسەرخێر موەفەق بکا. ئەگەرچی ئەمڕۆ لەبەر بەفر ڕێگا مونقەتیعە (بڕاوە) فەقەت بۆ پیادە ڕێگا هەر دەبێ. ئیتر لازمە هەموو ڕۆژێك پیاو ڕەوانەی سلێمانی بکەن خەبەری ڕاستی لە دوژمن و ئەحوالی و حەرەکاتی وەربگرن و ڕەوانەی پاش بەردی بکەن، لەوێوە بۆ ئێمە دێت. ئەوا لە پشتەوە لیستەی تەوزیعات گیرا، کە تەحسیلات کرا، بەپێی ئەو تەوزیعاتە مەعاشی خۆتان و سائیرین سەرف بکەن. هیچ وەختێك لە ئەحوال و ئەخبار نابێ فەرامۆشمان بکەن. ئیتر چاوی هەمووتان ماچ دەکەم.

مەحموود

٣ کانوون سانی ٩٤٠

بەبێ ئەو پەیوەستەی، کە لەگەڵ باوەڕ پێکراوەکانی ناو سلێمانیدا هەبوو و نامەکانیان لەلام کۆبووبۆوە و بە تەواوی و ڕێکوپێکی نەدەتوانرا لەگەڵ کەندە سوورەدا تێگەیشتن بێت، بڕیارم دا بۆ وەرگرتن ماوەی دەیەکی دێهاتە نزیکەکانی شاربازێڕ، کە موڵکی خۆیان شێخ مەحموود و بچم ئەو ماوەیەم کۆ کردەوە و ئەوانەی هەژار و نەدار بوون نامەی لێبووردنم دانێ و گەڕامەوە بۆ چەمەك. ڕێگای، شێخ ئەلمارین – چەمەك لەبەر زۆریی ئاژەڵ نەدەبەسترا. ناچار بوون، کە هەموو ڕۆژێك لادێییەکانی چەمەك و سەیدارە، بچن لەودیوی شێخ ئەلمارین خورشتی ئاژەڵ بهێنن. پارەکەم بەسەر سوارەکاندا دابەش کرد و خۆم و یەك چەکدار بەفرەبەسەر ڕۆیشتین بۆ کەندەسوورە. شەو زەوی یەکپارچە سپی، لە ڕێگا و بەبێ ڕێگادا بەرەو کەندەسوورە کەوتینە ڕێ. بەڕاستی ماندوو بووین وەکو کوێر بەبێ هەدەف دەڕۆیشتین. شەو گەیشتینە ئاوایی. چووینە بنکەی پاسەوانانی شەو، زۆر سەرما بوو. ماندوو و برسی بووین پاش حەسانەوە و ڕۆژبوونەوە چوومە ماڵەکەی خۆمان و لە پاشان چوومە خزمەت مەلیك. چوونەکەی پێ خۆش بوو. ئەوەی پێویست بوو و نامەکان پێشکێش کرا و جێبەجێ کران.

چاوەڕێی هاتنی سەرهەنگی بانەی دەکرد. کەندەسوورە بە تەواوی لەسەر هێڵی ئێرانە. بۆ گفتوگۆ دەهات بۆ بینینی مەلیك. نازانم چۆن گەیشتە کەندەسوورە. ڕێگا لە بەفر لووس بووبوو. کەند و کۆسپ وەکو یەك دەبینرا. لەگەڵ بانگی ئێوارە گەیشت. شێخ مەحموود و مەحموودخانی سەرهەنگ دوویەدوو قسەیان کرد. لەبەر ئەوەی فەرمانم پێ نەدرا، کە بچمە ناویان، ئاگاداری گفتوگۆیان نەبووم.

ڕۆژی دوایی، سەرهەنگ گەڕایەوە بۆ بانە. خۆی بە سواریی ئێستر و چەند پیادەیەکی لەگەڵدا بوو. پاش بەڕێکردنی ئەم میوانە، فەرمووی ئەم (ئیعتمادنامە)یەت دەدەمێ و دەچیتەوە بۆ چەمەك. سوارەکان تێ بگەیەنە تا خۆم لێیان ئەگێڕمەوە نەبزوون و لەوێدیوە بچۆ بۆ بانە بۆ لای سەرهەنگ. تۆ نومایندە دەبیت بۆ بەجێهێنانی کار و پێویستیی خۆمان و ماوەی هیچ خراپە و دڵ ئازوودەی حکوومەت نەدرێت.

کاروباری سوارەکانم تەواوکرد. شەو لەگەڵ مستەفای برای وسواغا، کە شارەزابوو ڕۆیشتم بۆ بانە. ڕۆژ، هەتاو و ڕچەی کاروان زۆر خۆش و لەبار بوو. لە کاتژمێری ٩ی پێش نیوەڕۆدا لەسەر دەشتی کانی دزان، لە ماوەی نیو سەعاتدا ڕۆژمان لێ بوو بە شەو، ڕچە پڕ بۆوە، بەفر بە جۆرێك دەباری کە هەرگیز نەماندیبوو و نەمانبیستبوو. دەستمان لە ژیان شت. نەماندەزانی لە کوێین و بۆ کوێ دەچین. هەر تاو تاوێك ئەوەندە بەفر ئەکەوتە سەر سەرمان ملمان هەڵی نەدەگرت. ئەسپەکانمان ماندوو بوون و وێستان لە بەفر بڕین. هیوای ژیان نەما بەڵام ڕۆژمان تەواو نەبووبوو. لە ناکاو نزیکەی ١٥ مرۆڤی چالاك لە بەردەمی وڵاخەکانماندا پەیدا بوون. کەوتنە پێشمان. شەو گەیاندینیانە دێی (چیچۆران) بۆ ماڵی ناسیاوێکی مستەفا ئاغا. وەکو مردوو یان شەختەیەکی سەهۆڵ دایان بەزانین. من ئاگام لە خۆم نەبوو. بەڕاستی زۆر میوانداریێکی بەڕێزیان کردین و ئەو پیاوانەیشم نەبینییەوە و نەمزانی کوێندەرین. ئیتر لەو ڕۆژەوە لە هەردوو پێم لایی دوو پەنجەم سڕ بوو، لەم دوایییەدا بوو بە دەردی بێ دەرمانی باداری (ڕۆماتیزم) و پێوەی دەناڵێنم. گەیشتینە بانە. بەر یەکەم چایخانە (چایخانەی مەلا عەبە). مەلاعەبە وتی: ئەمە چەند ڕۆژە قۆناغت بۆ ڕێك خراوە و دایکت هاتووە و چاوەڕێی تۆین. چوومە ماڵەوە. وتی: مەلیك ئەم کاغەزانەی داوە بە من، کە تۆ بیگەیەنیت بە جێگای خۆی.

ڕۆژی دوایی چووم بۆ بینینی سەرهەنگ. زۆری پێ خۆش بوو. نامەکانم گەیاند. زابت و کاربەدەستەکانی کۆکردەوە و منی پێناسین، کە نومایەندەی شێخ مەحموودم.

لە پاش ئەوەی بە دوو ماینەوە. وتی: ئەمە نیشتمانی ئێوەیە. ئێران ئێرانی خۆتانە. ئێمەیش ئامادەی بەجێهێنانی هەموو فەرمان و فەرمانێکتانین. بردمی بۆ بینینی ئیدارەکان، گێڕامی. یەکەمین نووسراوی سەردەرگام بینی. نووسرابوو (ئیدارە خانەء گومرگی کوردستان). واقم وڕما وتم ئێمە عەودالی ئەم ئاواتەین، کەچی لە ئێرانە و نایزانین. ئیتر هەموو ژوور و دائیرەم وا بینی.

زۆر بەڕێزەوە ئێمەیان دەبینی. لە هیچ پێویست، یان هاتوچۆیەك بەربەستیمان لێ نەدەکرا. هەمیشە بە چاوی خۆیی دەیانڕوانییە هەموو یەکێك لە ئێمە.

ڕۆژی ٢٠ی شوبات ١٩٢٥ بۆ تەواوکردنی کەم و کوڕی و کڕینی هەندێك لە پێویستییان، ئەم

میوانانەم لە کەندە سوورەوە هات: ١- ماجید ٢- ڕەمزی ٣- جەلال ڕەشید ئەفەندی ٤- سەبری ئەفەندی ٥- کەریمی چاو.

چەند ڕۆژێك بە خۆشی ڕابوێررا. عادل ئەفەندیش هات. زابتە ئێرانییەکانیش زۆر تێکەڵمان دەبوون و بە چاوی میهرەبانی و برایی لەگەڵمان ڕایان دەبوارد. هەموویان میوانی من بوون. عادل زۆر هەوڵی دا خۆی بگەیەنێتە سەرهەنگ، من ماوەم نەدا. چونکە دەمزانی گۆیەنگێکمان بۆ دروست دەکات. باش بوو زوو گەڕایەوە.

بەڵام ئەوەی دەردی منی گران کردبوو هاتنی مەلا فەرەج بوو. نازانم ئەم مەینەتییە چۆن هات بە سەرما. ڕۆژێك لە ناکاو گەیشتە ماڵەوە. ژوورم بۆ ڕێك خست و ڕەشەم بۆ تەرخان کرد بۆ هاودەنگی و خزمەتی، بەڵام ڕووی بەڕوو وتی: ئەم لۆزەندەرە چی لێ بکەم، بزانە کارەکەرێك، کەنیزەکێکم بۆ پەیدا بکە. زۆر سەخڵەتی کردم.

بەفر زۆر بوو سەرما و سۆڵە ئێجگار بەتین بوو. شەو بەستەڵۆك و زوقم و بە ڕۆژیش دەرەوە نەدەبینرا. حەمە ئەمین و نامەی مەلیك گەیشت:

عەزیزم ئەحمەد

من ڕۆیشتم بۆ شاریازێڕ، بە هەموو چەکدارەکان، کە لە بانەن بگەیەنە بە پەلە بگەڕێنەوە و تۆیش زوو وەرەوە لەگەڵ ماجید. هەمووتان بەیەکەوە وەرنەوە. ئیتر خواتان لەگەڵ.

مەحموود

٢٥ مارت ١٩٢٥

لە بانەدا نزیکەی ٢٥ چەکدار بە خێزانەوە و ٣٠ چەکداری سەڵت هەبوو پێم گەیاندن. بەڵام پاش دوو ڕۆژ خۆ ڕێکخستن ئێمەیش توانیمان شەو بەفرەبەسەر بگەڕێینەوە چونکە ئیش و کار لای سەرهەنگ و ئامادەکردنی کاڵە و پێتاو، گۆچانی یەخەر، هەمانەی تێشوو پێویست بوو، تەواو بکرێت.

شەوی ٢٨/٢٧ مارت کەوتینە ڕێ. دایکمم لە بانە بەجێ هێشت لەگەڵ ڕەشە و ماینەکەم، چونکە بەفر ماوەی دەرچوونی نەدەدان، بەجێم هێشت. ئێمە گەیشتینە کەندە سوورە. شەو ماینەوە. لە بەر زرمە زرمی ورچ و سەگ هەتا ڕۆژ نەنووستین.

بۆ سیاگوێز، شەو ماینەوە ڕۆژی دوایی نیوە ڕۆژ لە گوڵێ بووین، سهیدارە. بابا عەلی لەماڵی قادر ئاغا بوو. ئێمەیش ئەو شەوە ماینەوە. زۆر ماندوو و پەرێشان بووین. چونکە بە پیادەیی و لە ناو بەفرا دەڕۆیشتین ئیتر لە شێخ ئەلمارێنەوە بەفر نەما، هەر بە پیادەیی، چنگیان. پۆشین،

گرێزە، گەیشتینە بارەگا و تێکەڵ بە سوپا بووین، پاش چەند ڕۆژێك بارەگا چووە سەراوی سوبحان ئاغا.

پاش چەند ڕۆژێکیش لەم بارەگایە. مەلا فەرەج بە سواری ماینەکەم لەگەڵ ڕەشە گەیشتنە لامان. ماین جەهو و بریندار و پەرێشان لە ژێر مەلا فەرەجدا نەمناسییەوە. لە ناو شێخ سمایلییەکاندا گۆڕیمەوە بە ئەسپێك کە چووینە قلرخ، شێخ سمایلییەکان لە ڕەشماڵدا بوون. ئێمە پتر لە (٣٠٠) سوارە بە ئاواییدا بڵاوبووینەوە. کۆمەڵەکەمان، سەرپەل، زابتەکان بووین ڕوومان کردە ڕەشماڵێك بەڵام چۆڵ، پۆشتە و ماڵێکی لە دەوڵەمەند دەچوو. دابەزین هەر هەشت ئەسپەکانمان داکوتا و بێ خاوەن ماڵ دانیشتین. پاش ماوەیەکی کەم ژنێك بە کوندە ئاوێکەوە هاتەوە پاش دانانی کوندەکە لەسەر هەرزاڵەکە و خۆ ڕێکخستنەوە هات و خۆشهاتنێکی زۆری کردین. حەوتجۆش و پێویستی چا لێنانی هێنا و ئاگری کردەوە و خۆی ڕۆیشت، پاش ماوەیەك کاوڕێکی چوار پەل بەستراوی بە سەرشانەوە بوو هاتەوە. چەقۆیەکی گەورەی هێنا وتی (بم وەسیاقەتان ئەم چاقۆیەم بۆ تیژ بکەن چونکە بە دەستی ژن تیغ تیژ نابێت و چەقۆ تیژ کرا و چوو مێکوتی دەوارەکەی خستە ناو گەڵی خۆی و مەڕەکەی سەربڕی. فووی دا بە سێ پای مەشکەکەدا هەڵی واسی و سپپی کرد. خستیە سەر ئاگر، دەستی کرد بە هەویر شێلان و نانکردن. هێشتا برسیمان نەبووبوو، پلاو ساوەر و گۆشتاوێکی زۆری پێشکەش کردین، لە خۆشهاتی کردنمان مەپرسن. لێمان پرسی بۆچی ئەو مێکوتەت هەڵگرت خۆ ئاوس نیت، وتی ژن تیغی لەسەر نییە، بەو مێکوتە خۆم کرد بە پیاو. ئەم باسەمان بۆ مەلیك گێڕایەوە، زۆری پێ خۆش بوو، لەکاتی ڕۆشتندا ڕووی کردە دەوارەکە، لە دەستەسرەکەیدا دە لیرەی زێڕی بۆ هاوێشت، کە ژنان عەودالی مووی کلکی ئەسپەکەی بوون، بۆ پیت و پیرۆزی ژیان و کۆششیان. مەردی و ئازایی بۆ ژن و پیاو جیاوازیی نییە.

چووینە خورماڵ و گەڕاینەوە بۆ ناو سرۆچك، لە مۆریاس دوو ڕۆژ میوانی شێخ مەحموود شێخ عەلی دورمیانە بووین و لەوێوە بۆ بەرزنجە و بۆ شاریاژێرە کلۆڵەکەی خۆمان و پێنجوێن.

من، لەگەڵ سوارەکانی تایبەتی (معیت) یەکدیگیر بووینەوە و لە شێخ ئەلمارێن بووم. شەو ماجید و کەریم بەگ هاتن و ئەو فەرمانەی کە بۆ ژمارە و ساندنی زەکات دەرچووبوو پێشانیان دام و وێنەکەی خۆمم وەرگرت. بەم چەشنە فەرمان درابوو بەو مەرجەی لە ٤٠ سەر پارەی یەك سەرژمێرە بکرێت و نرخی ئەو سەرە پارە بسێنرێ ئەم تەرتیباتە کرابوو:

١- کەریم بەگ: وارماوە و بەشی ئەویەری تانجەرۆ.

٢- ماجید: لە عەربەتەوە تا زەلم.

٣- ئەحمەد خواجە: لە عەربەتەوە تا قرگە.

پاش تەواوکردنی ئەم فەرمانەی بەشی یەکەم:

١- کەریم بەگ: سەرچنار تا تاین.

٢- ماجید: قەرەداغ.

٣- ئەحمەد خواجە: بازیان.

هەر کەسە بۆ سەرکار و پێشمەرگەی پێشڕەوی خۆمان ڕۆیشتین. لە پاش تەواوبوونی ئەو ناوچانە، بەسەر ڕۆژئاوای سلێمانیشدا، دابەشبوونمان بە فەرمانی دووەم فەرمان درا.

لە شێخ ئەلمارێن یەکسەر هاتم بۆ قرگە. ڕۆژی دووەم، کە ڕان و مێگەلیان، ئێوارە هاتەوە، دەستمان کرد بە ژمێرە، لە ناکاو کابرایەکی وێڵەدەری بە پەنهانی تێی گەیاندم، کە سوارەی حکوومەتی پشتی ئاواییان لێ گرتووین، پێویستە چارەیەکی خۆمان بکەین. نەمتوانی هەموو سوارەکان تێ بگەیەنم. لە ناژاوەی ئاوایی ترسام، نەوەك یاریدەی حکوومەتییەکان بدەن. ئەو دە سوارەی لای خۆم بوون ئاگادار کران زۆر بە شێنەیی سواربووین بەرەو ڕوویان چووین. یەکێك لە سوارەکانی لای من (نەریمان باشۆکی) یەکەمین سوار پەلاماری دا. بەڵام بەبێ ئەوەی ئێمە لە چەندێتی و یان چۆنیەتییان بزانین، کردمان بە تەقە و هەڵا. زۆر ڕووداوێکی نەبینراوم بینی. هەر وەکو ئێمە لە وان بێ ئاگا بووین ئەوانیش هەروا. ئێمەیان بە هێزێکی زۆر گەورە ژمارد. بەبێ خۆگرتن بەرەو سلێمانی کەوتنە لنگدان و ڕاکردن. من لە (٥٠٠) سوار کەمتر خەمڵم نەدەکرد و سوارەکانی خۆیشمانم پێ نەدەگەڕایەوە، بە ناچاری دوایان کەوتم. تەنیا دوو سواریان لێ گلا و بە چەك و وڵاخیانەوە گیران. تا ناوشار لە سەریان هاتین بە بێ کوشتار لە هەردوولا، ڕۆژ لە ئاوابووندا بوو.

شەو گەڕامەوە بۆ قرگە، سوارەکان زۆر لە ئاژەڵەکانیان ژمارە کردبوو. زانیم، کە زۆریشیان شاردۆتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی لە پێش کاری پێشمەرگەراوماندا تووشی بەربەرەکانی نەبین و تەواوی بکەین. بە دەمبڕ قرچاندمان و قۆچانم دانێ تا گەیشتینە دێی کۆزە ڕەقە. قۆچانی دێهاتەکانم بڕی و لەو ماوەی مۆڵەتەدا پارە ئامادە بکەن و لە گەڕانەوەدا لێیان وەربگرم ڕاسپێریم کردبوون.

لە سوارەکانی خۆم و تۆفیق حسێن ئاغا بە ١٩ سوارەوە چووینە (کۆزە ڕەقە). من لە ماڵی کوێخا مەولوود میوان بووم. لە لایەن ئێشکگر و پاسەوانەکانەوە کوڕێکی لاو گیرا و هێنایان. وتی: کاك ئەحمەد من جاسووسم، ناردوومیان بە شوێن تۆدا بگەڕێم. بزانە (سوپای میری پیادە و سوارە و جاش پۆلیس و پۆلیس پیادە و سوارە) بە کۆمەڵ دوێنێ لە شار دەرچوو. ئێستا لە (قرگە) و داربەڕوولەن. لەگەڵ گزنگدا دەگەنە سەرتان. ئیتر خۆتان کاری خۆتان دەزانن. ئینجا ئێوە من ببەستنەوە و بەجێم بهێڵن.

من ئەم قسانەم بە فڕ و فێڵی ئاوایی زانی. بۆ ئەوەی ڕانەکانیان لە ژمارە ڕزگاربکەن، کە لە

پشتی ئاوایی مۆڵ درابوون. بەڵام دیسان لێکم دایەوە پێویست بوو، کە کارئامادەییەك بکەم ئەوەك ڕاست بێت. سوارەکانم دەنگ دا ئالیك بە وڵاغ درا و خۆیان ئامادەکرد. لەگەڵ ئەوەی، کە هەموومان ١٩ سوار بووین و سوارەکانمان زۆر دووربوون، بڕیاری جەنگ و بەربەرەکانییان دا، منیش بە باشم نەبینی پێچەوانەی ئارەزوویان بکەم چونکە هەموویان بڕیاریان دا. کە ڕێگەیان نەدەن و تا مردن بجەنگێن.

لەگەڵ تۆفیق ئاغا بڕیارمان دا، کە خۆی و (٨) سوار بچن بۆگردەکانی (بووتانە) و منیش لەگەڵ (١٠) سوار بچم بۆ شینکەکانی خەراجیان. لە پێش گزنگدا سوار بووین و پێشداری حکوومەتیش نزیکەی (١٠٠) سوار گەیشتنە سەرکانی و گۆڕستانەکەی ئاوایی. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژدا، گەڕانەوە و ئێمەیش گەیشتینە سوپێرەکان.

وڵاخەکانمان درایە دەست مەجیدی قالەی حەمامچی. لە کاتژمێری ٥:٢٠ی بەیانیدا گەیشتنە ئاسووگەی پشت ئاوایی. ئێمە تەنیا نەمانتوانی بە تاکە تەقە نەیەڵین خۆیان و مەترالیۆزیان دامەزرێنن. بەڵام تا سەعات ١٠:٣٠ جەنگی بەرامبەریمان بێ سوود بوو پاش ئەوەی ناردی حەمەی ئیمام زامداربوو. بۆیشمان دەرکەوت، کە هێزی سوارەی سوپایی و پۆلیس لە لای خوارووەمانەوە دەیانەوێت ئابلووقەمان بدەن. ئیتر بە هۆی زیاتر لە دوو سێ کەس، کە نەهات بە دەنگمانەوە ئێمەش ناچار بووین بە خۆدەرکردن بۆ (بووتانە).

١- فیشەکمان هاتە کزی.

٢- نادر بریندار بوو.

٣- هێزەکەمان زۆر کەمە و دەیانەوێ ئابڵووقەمان بدەن و زۆرشتی تر بەو ناچارییە جێگەمان بەجێ هێشت و ئاوێتەی هێزەکەی تۆفیق ئاغا بووینەوە لە بووتانە.

سوپای حکوومەت هاتنە ئاوایی. ماوە دوور بوو، دووره تەقەیش بێ سوود بوو. ئێمە هیوامان بڕی، زۆر ترسی فڕۆکەمان هەبوو. چونکە جێگاکەمان ڕووتەن و بە بەرزییەوە بوو. پاش ماوەی یەك سەعات ماجید بە سوارەکانی خۆی و سوارەکانی تریشمانەوە هاتن. هەروەها کەریم بەگیش گەیشت، چونکە لە مووان کۆبووبوونەوە.

سەرۆکی درا بە کەریم بەگ. بەم پێیە سوارە دابەش کرا لە هەموو سوارەکانی کە ١٢٠ سوار بوو نزیکەی ٦٠ سواری هەڵبژارد بە ناوی ڕیتاڵییەوە. ئەو سوارانەی، کە بێکارە بوون لە چەك بەولاخدا نێرران بۆ پووشێن تا چاپخانەکەی قرگە. سوارەکان دابەش کران بەسەر گردەکانی پشت ڕێگا و ئاواییەکاندا و کاتژمێری هەموومان هێنرایە سەر ٢ی پاش نیوەڕۆ و فەرمان درا لە کاتژمێری ٤ پاش نیوەڕۆدا هەر کەسە لە ڕاستی خۆیەوە ورووژم ببات بۆ سەر ئاوایی و

سوپاکەی ناو کۆزە ڕەقە. ئەم پرۆگرامە بە تەواوی بەکارهێنرا.

ئەو سوپا پرچەك و زۆرە بەو مەرجەی مریشکی ناو مەنجەڵی لەسەر ئاگر بەجێ بهێڵن، بە سواری یان پیادەیی خۆیان و چەکیان ڕایان کرد و کۆزەڕەقەیان بەجێ هێشت. بە درێژیی ڕێگا، کە بەرەنگاری چەند سوارێکی ئێمە دەبوون لە کوشتن و تالآن زۆریان لێ بەجێ دەما و جیانگرتن.

لە ناکاو حەمە شەریف مەرگەیی بە ماجیدی وت، پاش ئەوەی دەمانچەیەکی زۆری پێوە نام، ڕەشید جەودەتم کوشت، ئیتر بۆ دۆزینەوەی ڕەشید جەودەت شەش سوار بووین تا گومەزەکەی گردی حاجی عەبدوڵلا هاتین بەلآم بێ سوود بوو.

دانیشتوانی سلێمانی هەموو بە سەریانەوە بوون. سوپاکە بە پارانەوە ڕادەبوردن. زۆر پەرێشان بوون. پاش چەند ڕۆژێك تێ گەیشتین، کە مەحموود جەودەت بوو و بریندار کرابوو.

## چۆنیەتیی جەنگەنە

شەو لە کۆزە ڕەقە کۆبووینەوە. تالآنێکی زۆر گیرا و بەجێ ما و دەست کەوت. لە لایەن سابیری کەریم بەگەوە (١٨) سوپاییی پیادە گیرابوو. ئەسپ زۆر بوو، ماینێکی زۆر جوان و نایابی فەرماندەی ئینگلیزەکەیش گیرا. کوژراویان زۆر بەجێ هێشت. دێهاتییەکانمان نارد بۆ کۆکردنەوە و بردنەوەیان بۆ سلێمانی. لەگەڵ گزنگدا چووینە (سەراوی سوبحان ئاغا)، کە بارەگا و مەلیك دوو ڕۆژ لەوەپێش گەیشتبوون بەلآم بە ڕاستی جەنگی وا مەگەر بە دەگمەن ڕووی دابێت چونکە هێزی ئێمە بە فەرمانەکانەوە (٦٤) کەس بوو. بە تێکڕایی فیشەکی هەر یەکێك لە ٦٠ دانە پتر نەبوو، بەلآم ئەوان لە ٣ هەزار چەکداری سوارە و پیادە کەمتر نەبوون بە تفاقی جەنگی حکوومەتییەوە. ئەوەی لە یەکتری جیا دەکردینەوە تەنیا (دلێری و یەك دڵی و پاکی بوو بۆ نیشتمان لە ئێمە و هەرەمەیی و ترس بۆ پارە لە وان) جیای کردبووینەوە. ئەم جەنگە لەو جەنگانە بوو، کە لە یادی مێژوو دەرنەچێت. پاش دوو ڕۆژ هەرکەسمان گەڕاینەوە بۆ سەر کاری پێسپێراومان و تەواومان کرد. ١٩٢٥.

با مەردیی سوارە عەسکەرییە کوردەکەش ون نەبێت، کە نەگەیشت ناوی خۆی بڵێت. بە پاشداری ئەو سوپا گەورەیە، ڕەش سوار بەرپەستی کردین. وەکو برووسکە سەرەوژێر و سەرەوژوور بە قیرقاچ شەنوکەوی پێ دەکردین، بە تاو و گوللەبارانمان وەکو باران پەرش و بلآوی دەکردینەوە، تا کەوتە بەر قامچ و لوولەی تفەنگی سابیری کەریم بەگ. ناچاری پیادە بوون بوو. لەوکاتەدا سوارێکی هەمەوەند گەیشت و گوللەیەکی لێ دا و کەوت. وتی کوردم، گەڵباخی. گوڵی ژیانی وشك بوویوو بەلآم بەرامبەر بەم قسەیە زانرا کوردە. سوارەی عەشایر

هەموویان فەقیانەکەیان بڕی و فڕێیان دایە سەر لەشەکەی و کرا بە هەرا و شیوەنێك، کە هەرگیز نەبیستراوە. کابرای کوشتی ڕای کرد. ترسا بیکوژنەوە. کۆتەڵیان بۆ دروست کرد تا ٣ ڕۆژ بە وڵاتا گێڕایان. کاتێ جەنگ بوو بە شیوەن، بەو بۆنەیەوە هێزەکەی میری ڕزگاری بوو، بەڵام بە پەرێشانی. بەڕاستی بە نووسین باسی ئەو دلاوەرە کوردە تەواو ناکرێت.

گەڕامەوە بۆ پێنجوێن، شاری پێنجوێن پایتەخت و پەنا و کانگەی ئابووریمان، پاش چەند ڕۆژێك فەرمانم پێ دا، کە بچم بۆ مەریوان و بهێنمی مەحموودخانی کانێسکان لە بابەت ڕێکخستنیان لەگەڵ دزڵی مەحموودخان چونکە لەسەر دێی نژمار، کە دوو بەش بوو ناکۆکییان کەوتبووە نێوان. ئەوەی پێویست بوو کرا و گەڕامەوە بۆ پێنجوێن. لەگەڵ نامەیەکی تایبەتیدا و داواکانی خانی کانێسکان بردم و چووم بۆ دزڵی پاش (٨) ڕۆژ گەڕامەوە بۆ (وڵە ژێر). پرۆگرام وابوو، کە لە وڵە ژێر بگەمەوە بە خزمەت مەلیك. بەڵام هاتوچۆیەکەی من دوایی بە بۆڵە بۆڵی هیچ لایەکیان نەدا، گوزارش بە باشی نەگەیەنرا. چونکە هەردوو خان بەهێز و دەستدار بوون.

سوارەکان لە شارباژێڕ بوون، ئەم ماوەیە، کە لێیان دابڕا بووم گەڕامەوە بۆ پێنجوێن شارباژێڕ. نزیکەی ١٥ ڕۆژ لە سیتەك و تەگەران بووم. نامەیەك لە شێخ مەحموودەوە:

کوڕم ئەحمەد ئەفەندی

چاوی هەمووتان ماچ دەکەم. ئێستا وەختی کۆکردنەوەی پارەی دێهاتەکانی بازیانە. دەچیت، چییان پێ درا لێیان وەرگرە، لە پێنج سواریش زیاتر مەبەن.

شەو لە کەلی گۆیژەوە، کانی ماسی، وڵویەوە ڕۆیشتم و گەیشتمە داریکەلی. لە ماوەیەکی کەمدا چی پێویست بوو بەجێم هێنا و ئێسترەکانیش هات، (٤٠) بار برنج و گەنمیان گەڕانەوە بۆ وڵە ژێر.

چووم بۆ بارۆیی گەورە، پەیغامێك لە تەپەشوانکارەوە هات وتی نزیکەی ٢٠٠ سوارەی پۆلیس گەیشتە ئاوایی و پرۆگرامیان داریکەلی و بارۆییە تێ گەیشتم، بێگومان بۆ پێستی ئێمە دەسووڕێنەوە. جا تا ڕاویان نەکردووین ئێمە خۆمان دەربازکەین بە باشتر زانرا. شەو خۆمان گەیاندە (دەرکان) چونکە لە ڕێی سوو - قەرەداخەوە گەڕانەوەمان بە باشتر بینی.

لە کاتی نیوەڕۆژەکردندا پیاوێکی دەوکانی هات و وتی ئۆردوویەکی زۆر لەسەر کانییەکەی خەراجییانە و سوارەکان، کە تێ گەیشتن زۆر داخیان هەڵکێشا، کە زۆر کەمن و توانامان نییە. بەڵام لەو کاتەدا نادر و حەمە عەلی ئیمام دە سوار پەیدا بوون. ئیتر سوارە قوتە قوتیان تێ کەوت و داوایان کرد، کە شەو بدەن بە سەریاندا. من چەند لێکم دەدایەوە هیچ بە دروستم نەدەزانی بە ١٦ سوار لەگەڵ ئۆردوویەکی حکوومەتیدا بجەنگین. بەڵام بێ سوود بوو. ناچار بووم بە ئاوێتەی بیریان. لەگەڵ تاریکەی ئێوارەدا لە گۆڕستانەکەی (عەربەت)ەوە بە تاو بە ٣

تیپ پەلاماری ئاواییمان دا و دەمانزانی سەرباز لە ئاواییدایە. تا ماوەیەکی زۆر کەم لە بەر تولییدا درابینە بەر دەستڕێژی تفەنگ و مەترالیۆز. ئیتر ماوەی گەڕانەوەمان نەما، بێجگە لەو ڕووژمە، کە بیگەیەنینە ناو ئاوایی، ئەو هێزی سوپاییە، کە لە بووسە و سەنگەرا بوون ناچاری ڕاکردن بوون. لە ئاواییدا یەکێکیان لێ کوژرا، مەجید و نادر پەلاماری گردەکەیان دا و لە پێش ئەواندا، کە پیادە بوون، گرتیان. ئیتر ڕێگەی ڕزگارییان تەنیا خۆ گەیاندنەوەیان بوو بە ئۆردووەکەیان. بەڵام چەکی کوژراو بە فیشەکەوە گەیشتە (٩) تفەنگ. یەك مەترالیۆزیان پێ بوو تەریان کرد. پاش دوو سەعات سابیر بەگ هات. ئیتر توانیمان زۆر زیاتر تەنگاویان بکەین. لە کاتی گەڕانەوەماندا ولاخەکانمان کە بە دەست مەجیدی قاڵەی حەمامچییەوە بوو، عەرەبییەکان گەمارۆیان دابوو، کە ولاخەکانی لێ بسێنن، دووانیان گیران. لە پاش نەختێك تەشکەنجە بەرەڵام کردن.

شەو بوو سابیر بەگ وتی ئیمڕۆ فڕۆکە بەیاننامەی زۆری فڕێ دا و ئەم دانەیەی دایە دەستم تاریك بوو خستمە باخەڵم:

بۆ عوموومی ئەهالیی ناحیەی تانجەرۆ و قەزای هەڵەبجە و هەموو تایەفەکانی جاف: لە ئێوەوە مەعلووم بێ کە ئەگەر زەرەرێك و ئەزیەتێك واقیع ببێ بۆ ئەم ئۆردووە، کەوا لە ناحیە و مەحەلی ئێوەوە موروور ئەکا، هەر فەلاکەت و موسیبەتێك کە لەو ڕووەوە بە ئێوە بگات، مەسئوولییەتی لەسەر خۆتانە.

بۆ عوموومی ئەهالیی قەزای هەڵەبجە

ئەوا تەبلیغتان ئەکرێت بۆ ئەوەی تەئمینی ئیدارەی قەزا چاکتر بکرێت. ئەحمەد بەگ قایمقام و حەمید بەگ موعاون لەگەڵ مەئموورانی، کە ئیجاب بکا نێررانەوە بۆ هەڵەبجە، ئەبێ لە ئیجرای وەزائیفدا، موعاوەنەتی مەئموورەکان بکەن و موتیعانە ئەوامری ڕەسمییەی حکوومەت بەجێ بهێنن*.

ئەم بەیان و هەڕەشە لە لایەن حکوومەتی سلێمانییەوە لە گەل دەکرێت دەرکەوت، کە خۆیان ئەو توانایەیان نییە، ئۆردوویەك لە سلێمانییەوە بگەیەننە هەڵەبجە، داوای یارمەتی لە لادێیی و عەشایر دەکەن بەڵام لەو ترسە ڕزگار نەبوون.

سابیر وتی: ئەوا تۆ هەگبەیەك پارەت پێ هەیە. ئێستا دەچینە ناو جافەکان، ماڵی کوێخا ئەحمەد ئەجە شەلی ڕوغزایی هەموویان لەگەڵ سلێمانیدا ڕێکن. دەڵێن شێخ مەحموود

* ئەمە سەیر نییە؟ لە لایەکەوە داوای یارمەتی لە گەل دەکەن و لە لایەکی تریشەوە هەڕەشە؟

ناردووینی بۆ ناونووس بە پێی سوارە و چەکدار، مانگانە دەدات. جارجارێك هەگبەکە ببزوێنە. تاکو بزانن پارەیشمان بۆ هێناون، ئیتر کارمان ساز دەبێت. چووین دوو سێ مەڕمان بۆ سەر بڕا و پرۆگرامەمان بەکارهێنا لە جیاتی (١٠) چەکدار ١٠٠ ناویان دەنووسی. هیوای پارە وەرگرتن خەوی لە چاوی ورد و درشتیان بڕی. لە کاتژمێری بینایی ٧:٣٠دا لە (بێکەسە)وە تۆزی سوارە بینرا وتمان عەشرەت ئەوە سوارەکەی سلێمانییە. ئیتر زەلام و چەکدار لە ناو مالا نەما. لە هەموو خێڵێکەوە وەکو ڕێچکەی مێروولە چەکدار کەوتە ڕێ. لە بەر ناوایی گرێزەدا بەرەنگاریان بوون. سوپای میری، سوپای لیڤی و لە ژێر فەرماندەی فەرمانداری ئینگلیز (کۆلۆنێل لۆرانس)دا لە هەر چوارلاوە خرانە ژێر لوولەی تفەنگی کورد.

لە سەعات ٨:٣٠وەوە ئۆردووی لیڤی چەسپێنرانە ناو شیوەلی بەر دێی گرێزە و لە هەر چوارلاوە گوللەیان بە گژا دەکرا. خۆم بینیم جافەکان بە پیادەیی و بە ڕاکردن خۆیان دەکرد بە بارخانەکەیاندا و بە کۆڵ کەلوپەلیان دەڕفاند و هاواری قەمچیە ڕەشیان (شێخ عەبدولکەریم کربچنە)یان دەکرد. بەڵام لیڤییەکان زۆریان کورد بوون. تیپ تیپ ورژمیان دەهێنا بە قەیارەی ڕووتەوە پەلاماریان دەدا. کوشتار زۆر بوو. خەلیفە یونس لەگەڵ ٢٠ سوارا پەلاماری تیپێك سواریان دا. لە پشتیانەوە تیپێکی تری لیڤی پەلاماری خەلیفەی دا و خستیانە ناوانی دوو هێز. لەو کاتەدا ئێمەیش بەنزیکەی (٣٠) سوارەوە لەگەڵ سابیر بەگدا پشتی تیپە لیڤییەکەمان تەنی. خەلیفە لەوێدا گەیشتنە ئێمە هەلی دەس کەوت و بە شەرزەمیێکی زۆر خراپ لە ناویاندا ڕزگار بوو و ئاوێتەی ئێمە بووەوە. لەم پێکاهاتنەدا بە ڕاستی جەنگێکی سوارەی خوێنڕێژانە ڕووی دا. لیڤییەکە دەیویست بە قەیارە – شمشێر بگاتە سەرمان و بەبێ تەقە دامان پاچێت. بەڵام دوورەپەرێز کوشتاری زۆریان دا. مەشقی شیربازییان زۆر جوان بوو بە ڕاستی لە جەنگاوەر دەچوون. پەرێزی جەنگیان ئێجگار ڕەنگین بوو، بەڵام لەگەڵ چەتەیی ئێمەدا دەسەڵاتیان نەبوو تا سەعات ٤ی پاش نیوەڕۆ جەنگێکی سامناکی خوێنڕێژ ڕووی دا. لەم کاتەدا چوار فڕۆکە گەیشتە سەر کۆڕی جەنگ. ئیتر لەو دەشتە ساکارەدا ئێمە هێزی جەنگیمان نەما و لیڤییەکە لە ژێر فڕۆکەکاندا ڕۆیشتن بۆ هەڵەبجە. سەرەڕای کوشتار تاڵانێکی زۆریش دەست جافەکان و دێهاتییەکان کەوت.

لە گەڕانەوەدا، فڕۆکەکان بە مەترالیۆز گاڵەیان کرد. عەشایرەکە لە دەشتی شارەزوورا بڵاوبوویبوونەوە، پیاو، ژن، منداڵ، ئاژەڵ، وەکو یەك کوژرا بە بۆمبا. ڕەشماڵی خێڵەکانی نەهێشت. لە ژێر ڕەشماڵی کوێخا محەمەدی باشۆکیدا ٩ کوژراوم بینی، لە کوڕ و کچ و ژنی کوێخا، کە داپۆشرابوون.

ئێمە شەو چووینە (مەحمەدخانی). لادێییەکان، نان و دۆیان بۆ هێناین و قورئانێکیان هێنا،

وتیان ئێره بەجێ بێڵن، ئەوەك بۆمباران بکرێین. چووینە دەسکرە، دێی خەلیفە یونس. سوارەکانی ئێمە پێنج تفەنگی ئینگلیزی ۲ شمشێر و ۲ سندوقی گەورە بە بارگیرێکەوە و ٤ ئەسپ بە تفەنگەکانیانەوە دەستکەوتیان بووبوو. چونکە ماوەمان نەدەدان بچن بۆ تالآن، کەمیان دەستگیر بووبوو. لەناو سندووقەکاندا وێسکی و زۆر لە خواردەمەنیی نوقڵ و بسکویت و قوتووی خواردەمەنیی زۆری تێدا بوو. لە کاتی گەرمەی جەنگ و ئاگربارانددا لەسەر کانی و ئاوەکەی مووان تووشی میرزا غەفووری حاجی مارفی عەنبەرخان بووم بە تۆی کراس و دەرپێ، بە ڕووتکراوی بینیم. ناوی سوارەکانی دەزانی، کە ڕووتیان کردبۆوە. چووم بە تەواوی تا کیسەی پارەکەی بۆم ساندەوە و دامەوە. بەڵام لێم نەپرسی چی گەیاندوویە ئێمە ناو ئەم ئاگرە.

شەو لە دەسکرە و ڕۆژ چووینە ناو گەبەڵە سەیدارەکان بۆ ئەوەی فڕۆکە نەمانبینێ. لە پێش گزنگدا دوو دوو فڕۆکە دەهات، ئیتر بەبێ پاراستن ڕەشماڵ و مێگەلە مەڕ و ژن و پیاو بە بۆمبا و مەترالیۆز شەن و کەو کرا. ئەوانەی وەکو قادر وەیسی[1] و سلێمان خان و زۆر لەو خێڵانەیش وەکو ئەوانی تر بە با درا. ئەو ڕۆژە تا ئێوارە شارەزوور لە ژێر فڕۆکە و بۆمبادا هەناسەیەك فەرامۆش نەکرا لەبەر ئەوەی دەسکرە هی خەلیفە یونس بوو و لە شۆڕشدا بوو. ئێمە ترسمان زۆر بوو کەچی تەنیا دەسکرە و ئێمە پارێزراین و چووغرد و بییەکانی مەحمەد خانیش بوو بە قەرەبرووت و بە بۆمبا داری تێدا نەما و منیش وێسکیی زۆرم لەلا بوو. بەڕاستی شارەزوور و خێڵەکانی جاف بە تەواوی دابێژرا و پەرێشان کرا.

شەو سوارەکانی لای منیش هاتن. داخەکەم عەوڵا، ئەو کوڕە لاوچاك و ئازا و دەنگخۆش و سوارچاکە بە بریندارى هێنرا و پاش یەك دوو سەعات مەرگ ماوەی نەدا. بەڕاستی پەلێکم دۆڕاند، سوارەکان پاش شین و واوەیلایەکی زۆر لە یادی ئازایی و دلێریی عەوڵا، لەش و گیانی ناوداری لەسەر گردەکەی دەسکرە بە خاك سپێررا. بەڵام بەڵگە ناودار و شیرینەکانی لە ئاسمانی کوردستاندا دەژیەت و بە بانگی ئازادی زیندووەکانی ئاگادار دەکات.

عەولامان بەداغ و ناسۆرەوە بە تاك و تەنیایی بەبێ چەك و بێدەنگ لە ئاستانەی خامۆشیدا بەجێ هێشت، لەگەڵ بیناندا (بەیان) گەیشتینە لەنجاوە.

نزیك دێی هەزارمێرد، بە نیازی حەسانەوەی خۆمان و وڵاخمان، لە مێرگ و لەوەڕدا وڵاخ داکوترا. لە کاتی خۆگەیاندن بە ڕەشماڵەکانیان، منالێکی دە ساڵان هات بەهیرییەوە، وتی: مامە عەسکەرەکانیش دێنە ئاوایی؟ لێم پرسییەوە؟ دووبارە وتی ئەی ئەوە نییە لە پشت مالان مۆڵیان داوە؟

ڕاست بوو، بەشێنەیی سوارەکانم ئاگادار کرد و خۆمان دووبارە ئامادە کردەوە. سوار بووین.

---

١. قادر وەیسی و سلێمان خان: مانگانە وەرگری حکوومەت بوون و پەلێکی خراپ و ڕوغزایی بوون.

دەشت ڕووناك بوویۆوە. خۆمان دەرکرد تا گەیشتینە پێدەشت. ئیتر کەوتینە ژێر دەستڕێژی گوللەیان. ڕوومان کردە (شێرکوژ) و چووینە هەناران. ئێوارە گەڕاینەوە تا گەیشتینە ئاوایی قولدەرەسی. زانیمان سوپا و پۆلیس و سوارەی عەشایری جاشپۆلیس گەڕاونەتەوە بۆ سلێمانی و ئێمەیش چووین بۆ بازیان.

ڕۆژی دووەم، دیسان سوارەیەکی زۆری پۆلیس و سوپایی گەیشتنە دێی تەپە شوانکارە. ئێمە لەبەر پارێزگاریی دێهاتەکان نەماندەویست، جەنگ بخەینە ئەو ناوچانە. ڕۆیشتین بۆ بەشی قەرەداغ، گەیشتینە دێی قارەمان، پێش ئێمە بە نیو سەعات سوپای پیادە گەڕابوونەوە بۆ سلێمانی و ڕێچکەیان لە (ڕێ سوور)دا دەبینرا، کە بە چیادا هەڵدەگەڕان زۆر لە خواردەمەنی و بەتایبەتی گونیە جۆیان بەجێ هێشتبوو. بۆ ئێوارە گەیشتینە دێی نەوتی، کە هی شێخ مەحموود خۆیەتی.

لە (نەوتی) دە سواری هەمەوەند لەگەڵ کەریم عەزەی ڕەحیم دوێتە، میوانی کوێخا فەرەج بوون و ئاوێتەی ئێمە بوون. ئەو شەوەمان ڕابوارد. پێش تاریك و ڕوونی بینایپیدا، سوار بووین بۆ ئەوەی بچین بۆ سێتەلان، شارەزوور.

سوارەی هەمەوەند بە قەتار و ئەڵڵاوەیسی وتن پێش ئێمە کەوتن. بەرامبەر دێی (مۆریاس) لە ناسووگە تەقە دامەزرا، بوو بە جەنگ. ئێمە جێگا بڵندەکانمان گرت و بەسەر جێگای تەقە و جەنگییەکاندا زاڵ بووین تا نزیکەی نیوەڕۆ جەنگ درێژەی بەست. دوژمن تەقەی بڕی، بەڵام دوژمن کێیە؟ نازانین. بۆمان ڕوون بۆوە، کە کشاونەتەوە. چووینە جێگاکەیان لەسەر چیاوە بە دووربین بۆمان دەرکەوت، کە لیڤیی ئاشورین و لە دێی سێتەلانیش ناوەستن، خەریکی پەڕینەوەن لە تانجەرۆ. بەڵام ئەمجارەیش کەریم عەزەی ڕەحیم دوێتەی هەمەوەند، کە بەڕاستی گوڵی لەشکر و وێنەی بێ وێنەی ئازایی و لەشکرگیر بوو، بە خۆی و ئەسپەکەیەوە کوژران و هەر لە جێگەی خۆی بە خوێنـاوییەکانی لە ژێر خاکدا، داپۆشرا و گەیشتنە ئاوایی سێتەلان. ئیتر بە تەواوی زانیمان، کە لیڤیی ئاسووری و فەرماندەی ئینگلیز بوون، کە لە پاش جەنگی گرێزە لەگەڵ لیڤییەکان ئەم تابوورەیان هێناوەتە ئەو جێگە گرنگ و ڕێبازە بۆ تۆڵەسەندن.

گەیشتینە دۆڵی (گەلاڵ). سێ ڕۆژ لە ناو چووچانی و بێسەری و ناوداریيەکاندا مامەوە. لەسەر خواهشی خۆیان لە ٤٠ سەر پارەی سەرێك مەڕانەم لێ وەرگرتن و پاش دوو ڕۆژ گەیشتمەوە پێنجوێن. کارە تەواوکراوەکانم و کارەساتی ئەو چەند ڕۆژەم بە پێشگاهی مەلیك گەیاند. چونکە لەوەپێش دەرفەتی ڕاپۆر نووسینم نەبوو. نیسان ١٩٢٥.

بە نهێنی فەرمان درا، کە لە پێنجوێنەوە بگەڕێینەوە بۆ کەندە سوورە. شەو لە (گوڵێ) میوانی حەمە سالح بەگ بووین. ڕۆژی دوایی چووینە کەندە سوورە. بڕیاردرا، کە خێزانەکە بۆ

(باشماخ) مەریوان کۆچ بکات. گەیشتینە باشماخ ١ تەمووز ١٩٢٥. دێی باشماخ لە خاکی ئێراندایە. لە کاتژمێری ٩ی پێش نیوەڕۆدا دوو فڕۆکە هاتە سەر ئاوایی و دوو سێ جار سووڕیان خوارد. لەو ماوە زۆرەدا، کە لە کەندەسوورە و پاشبەرد بووین، فڕۆکە نەبینرا، کەچی وا بە دەستوبرد گەیشتە باشماخ و سەر خاکی ئێران. لەگەڵ خێزانەکەدا تەنیا ١٠٠ پیادە و ١٠٠ سوارە تەرخان کرا و هێزەکان وەکو پێشوومان لە جێگای خۆیاندا مانەوە.

لە باشماخ لەگەڵ ماجیددا وامان بڕیاردا، کە نیوەڕۆژە لە کانی سانان لای مەحموودخان بین. بۆ ئەوەی مەلیك پەسەندی بڕیارەکەمان بکا، سەید ئەحمەد و شێخ محەمەد غەریب و شێخ عەلیشمان تێ گەیاند، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە مەحموودخان بە لایەنگیری ئینگلیز دەزانرا. ڕێباز خراپە ئەو بەری زرێبار و بەر ئاوایی سێف. نیوەڕۆژە لە دار سەیران خورا، چونکە لەوەپێش وا بڕیاردرابوو و خواردنیش ئامادە کرا بوو.

لە دار سەیران، هەندێك تەرتیبات و وەرگێڕان کرا، بۆ ئەوەی لە چۆر و نەبێ هەردوو خێزانی مەلیك و بۆ خێزانەکانی تریش دێهات دیاری بکرێت. لەگەڵ بەگزادەکان قسە کرا و لە چۆنیەتیی سەرباز و دامەزراندنیاندا هەندێك گۆڕین کرا و ئەم فەرمانەیش دەرچوو.

دار سەیران، مەریوان

ژمارە ٢٨٤٩

ڕۆژ ٨ تەمووز ١٩٢٥

بۆ جەنابی یونس ئەفەندی فەرمانده‌ی پیادە

١- لە عموومی پیادە، بیست نەفەر و قسمەن لە مولتەجایی تەفریق و بە ناوی تاقمی موعەیەنەوە تەودیع بە ئەحمەد ئەفەندی بکەین. وە موەقەتەن باشچاوش فارس داخلی ئەم مەوجوودەیە.

٢- ئێوە و سائیری زابتان لەبەرئەوەی دائیمەن لەگەڵ پیادەکە دەبن هەموو وەختێك، مووما ئیلەیهی، ئەحمەد ئەفەندی لای من مەوجوودە لەبەرئەمە بە قوماندانی مەعییەت تەعیین کراوە، ئەمڕۆ ئەم معامەلەی تەسلیمە ئیجرا بکرێت.

محمود

م. و باش قوماندان

---

* لەو کاتەدا ملازمی دووەم بووم. (نووسەر).

دەستبەجێ فەرماندەیی تیپی تایبەتی پیادەیشم لە یونس ئەفەندی وەرگرت، ئێوارە گەیشتینە باڵك، دێی باڵك زۆر گەورە و خاوەن داراییە. میوانی مزەفەر ئەلسەڵتەنە محەمەد ئەمین بەگ و ئەحمەد بەگی باڵك برازای بووین. پاش ٣ ڕۆژ لە ناو بەگزادەکانی مەریواندا گەیشتینە چۆڕ.

١- ئایشەخان و دەست و پێ لە دێی چۆڕ.

٢- بەهیەخان و دەست و پێ لە نەنی دامەزران.

لە چۆڕ خانووی شێخ چۆڕی، کە ئێستا شێخ حسێن کوڕی تێدا بووە، چۆڵ کردبوو بۆ خێزانەکە، بە ڕاستی خانوویەکی نایابی دوو نهۆم و دڵگیر بوو.

پاش دە ڕۆژ هەموو بەگزادە و ئاغاکانی هەورامان و مەریوان بۆ بەخۆشیهاتنی مەلیك هاتنە دێی چۆڕ، پاش نیوەڕۆژە خواردن، کۆبوونەوەیەکی گشتی کرا لە هەمووی بە تەمەنتر فەرەج بەگی ئەڵمانە وتی:

ئیمڕۆ ئێمە هاتووین بۆ خاك و پابووسی، جا سەروماڵ، دارایی، دێهات، گیانی خۆمان و ڕۆڵەکانمان لە ژێر پێ و فەرمانی مەلیکدایە. نامەوێت درێژە بە قسە بدەم، گیانمان بە دەست خۆیەوەیەتی، لە ڕێی بیر و باوەڕتانا بۆ کوشتن و مردن، پەیمانی گیان بەختکردن ئەدەین و بە کۆمەڵ وتیان هەموو ئامادەین.

شێخ مەحموود لە وەڵامدا وتی: «من لە نیشتیمانی خۆمدا میوانی ئێوەم، بەڵام ئێران پەنامانە و دەبێت هەموو فیداکارییکمان، لە ڕێگەی بەرزیی ئێراندا بۆ حکوومەتی ئێران بەکار بێنن. بێتو تەنیا کوردێك لە هەرچی گۆشەیەکی گێتیدا لە دەست زۆردارێك بناڵێت دەبێت هەموو کوردێك هاوبەشی ناڵە و ئازاری بێت».

«بێجگە لە ئازادی و ژیانی سەربەستی لە هیچ پێویستێك کەممان نەبوو. ئاوارە بووین، دیسان زۆر سوپاسی خوا دەکەین، کە ئێستا لە ناو براپانی خۆماندا دەژین. ئازادی بە ئاسانی دەست ناکەوێت، بابەتێك نییە لەسەر دووکان بیکڕین، دەبێت بە زۆری بازوو و خوێن ڕژاندن بسێنرێت، ئەمەیش تەنیا یەکیەتییە، هەر یەکیەتی دەرمانی دەردمان دەکات و دوا تکام ئەوەیە، کە بە زمانەکەی خۆمان کە کوردییە بنووسین و بیخوێنین و دڵپاك بین بۆ ئێران. ١٥ تەمووز ١٣٤١».

بەگزادەکانی هەورامان و مەریوان دەستی یارمەتییان دایە دەست شێخ مەحموود بە لەشکر و پێویست ئامادە بوون. تەنیا مەحموودخانی کانێسکان، کە مەلیك ڕووی نەدایە و ئەویش هەر لە چاوەڕێی فەرماندا بوو.

بارەگا لە دێی چۆڕەوە بۆ پێنجوێن بڕیاری گواستنەوە درا. شەو میوانی بەگزادەی باڵك بووین، دووبارە لەگەڵ ماجید بڕیارمان دا، کە مەلیك لە خانی کانی سانان ببووڕێت، چووینە خزمەتی. ماجید وتی، خۆت دەفەرموویت هەموو کارێك بە بیری ٣ کەس تەواو بکرێت، پەشیمانیی لە دوا نابێت، ئەوا ئێستا ئێمە ٣ کەسین، دووانمان بڕیار دەدات، کە لە مەحموودخان ببووڕێت، فەرمووی من لە کەمیدا مامەوە، باشە.

دوو سوارمان نارد بۆ کانی ساسان، کە شەو مەلیك میوانە. بۆ ئێوارە گەیشتینە (نیّ)ی ماوەی نیو سەعات لە کانی سانانەوە. مەحموودخان و فەرەج بەگی برای و بەگزادەکانی خزمی لە چاوەڕێدا بوون.

لەگەڵ گەیشتنی شێخ مەحموود، مەحموودخان بە ڕاکردن هات و دەستی ڕاستی ئەسپەکەی گرت، کە ئەمە بە دابی عەشایری ڕێز و ملکەچییە و دەستووری بچووکی چی بوو، بەجێی هێنا. بەڵام شێخ مەحموودیش بە تەواوی دڵسۆزی و گەورەیی خۆی بەرامبەر بە مەحموودخان بەجێ هێنا. گەیشتینە دیواخانی خان و پاش حەسانەوە وتی:

سەردار و گەورەم

ئەوە گیانی خۆم و برا و کوڕ و خێزانم، هەمووی فیداتە و لە ژێر فەرمان و پێی ئەسپەکەتدایە. یەکەم تۆ، دووەم خانی دزڵی، سێیەم من سێ مەحموود لە خۆشیی ژیان بێبەری بووین. بەڵام لە ئێستەوە من کەوتمە خۆشی، چونکە سێبەری گەورەیی تۆ گەڕایەوە سەرم. خۆم و برام بە دوو هەزار چەکداری جەنگییەوە ئامادەی فەرمانتم، نۆکەری خۆت و ئاواتەکەتین، کە ئازادیی کوردە و...

شێخ مەحموود لە وەڵامدا: ئێوە ڕۆڵەی کورد و برای تەنگانەی منن. بە پشتیوانیی ئێوە نەبێت، تەنیا من بۆ ئەو ئاواتە بەس نییە.

فەرەج بەگ: قوربان لەم کاتەوە ئێمە کوێرین دەستمان بگرە، سەرمان لە ڕێگاتدایە.

پاش دوو ڕۆژ مانەوەی مەلیك بە ٣٠٠ سوارە و ٥٠ پیادەوە لە کانی سانان بە هاوڕێیی مەحموودخان و فەرەج بەگی برای ڕۆیشتین بۆ پێنجوێن. لە (دەروتفی) لای کەیخسرەوخان چایی خورایەوە و پاش چوار ڕۆژ لە باشماخ، بارەگا گەیشتە پێنجوێن.

پاش دە دوانزە ڕۆژ موزەفەرول سەڵتەنە و ئەحمەد بەگی باڵك و عەلی خانی (وڵە ژێر) هاتن بۆ پێنجوێن. بڕیاریان دا، کە خێزانەکە لە چۆڕ و هەورامانەوە بهێنرێن بۆ مەریوان لە لایەن مەلیکەوە پەسند کرا. جا بەم پێیە جێگا دیاری کرا و گوێزرانەوە.

١- ئایشەخان دایکی شێخ لەتیف: بۆ وڵە ژێر.

٢- بەهیەخان دایکی شێخ ڕەئووف و بابا عەلی: بۆ شێخە کوێرە یان دێیەکی تر.

٣- شێخ محەمەد غەریب: بۆ باڵك.

٤- سەید ئەحمەد: بۆ سەردۆش.

هەموو ماڵەکان دابەش کران و زۆر بەڕێز و چاوی برایەتی دمیانڕوانییە هەموو یەکێك. دێی ڕیخەڵان نزیکەی ٢٠٠ ماڵ، بۆ من تەرخان کرا، کە دایکم و مستەفای برام لێی دانیشن. بە ڕاستی چاکە و کردەوەی مەردانەی مەریوانی، هەرگیز فەرامۆش ناکرێت. خێزانی هەمەوەندەکان نێرران بۆ دزڵی و وەیسە لە هەورامان.

## جەنگی خەڕاجیان

لەگەڵ ٤٥ سوارەکەی سوارەی مەعییەت چووم بۆ بازیان بۆ ئەوەی دمیەکی پیتی زستانەی دێهاتەکانی مەلیك لە شارەزوور، سووورداش، سەرچنار، بازییان، قەرەداخدا، چی هەیە کۆ بکەمەوە لە ڕێوە گەیشتمە خەڕاجیان. ئیتر بە ڕۆژ ڕۆیشتم. لە بەر فرۆکە و پێزانینی حکوومەت لە سلێمانی بە باشم نەبینی، تا پاش نیوەڕۆ لە ئاواییدا ماینەوە. لە سەعات ٣:٢٠دا چوار زرەهلی گەیشتنە سەرکانییەکان، ئێمە وریا بووینەوە بینیمان ڕوویان کردە خەڕاجیان، ئیتر ئێمەیش بە گورجی پشتی ئاواییمان گرت، بەڵام لادێییەکان مەردانە وڵاخەکانیان کێشایە ژوورەوە هەر بە دوای زرەهلییەکانیشدا دە دوانزە لۆری بە لۆری ئەهالی پۆلیسیان هێنا و لە بەر ئاواییدا پیادە بوون. کاتژمێر بە تەواوی گەیشتە ٤:٥٥. ئێمە ئامادە و لە سووپەرا بووین. ئەوانیش نەیاندەوێرا بچنە ناو ئاوایی و هیچ هێزێکیشیان نەدەبینی، کە پەلاماری بدەن.

بڵاوەیان کرد، چوونە ناو ئاوایی بۆ مڵ و مووش و هێلکە و مریشك کڕین. ئەمە هەلێکی گەورەبوو بۆ ئێمە. چەکدارەکانم پێ داگیر نەکرا، لە دوولاوە پەلاماری زرەهلییەکانیان دا. دووانیان بوون بە بەشی ئێمە و لە ئاواییدا کەوتنە تەقە و پاڕانەوە بە گورجی زرەهلییەك سووتا و لە یەکەمین دەسترێژدا شەش پۆلیس کەوت. ڕۆژیش کەوتە ئاوابوون. کوێخا حەسەن بە قورئانەوە هات وتی دەڵێن تەنیا ڕێگەی گەڕانەوەمان بدەن بەو مەرجەی تەقەیەك لە ئێمەوە نەبێت. تفەنگی کوژراوەکان هێنرا. ڕێگەمان دان سووتاوەکەیان بەجێ هێشت. بە دڵ ڕەنجاوی گەڕانەوە بۆ سلێمانی.

ئیتر بڕیاری دەستووری چەتەگەریمان دا بۆ شوێنەونی. چونکە من دەمزانی کە لەم کارە خۆش نابن و دوامان دەکەون بۆ تۆڵەی ئەم کارەساتە. ئێمەیش سوار بووین. بەڵام بە ڕاستی خەڕاجیاتییەکان یارییەی باشیان داین لە کاتی سواربووندا کوێخا حسێن پارەی دمیەکی خۆیانی هێنا و بە تەواوی دایە دەستم.

بانگی ئێوارەی دەدا، گەیشتینە دێی ژاڵە. شەو چووینە جێشانە. ئەوەندەی بە دەستەوە هات پارەم وەرگرت و چووینە هەزارمێرد. میوانی شێخ سەعید بووم. سوارەکان چوونە پشت مالآن و لە چیاکەدا دامەزران. دوو مەڕمان کڕی. تا ڕۆژ ڕامان بوارد. بێگومان ئەو ڕۆژەیش ماینەوە بۆ ئەوەی جێگامان نەزانرێت گەڕامەوە بۆ کانی خێوەتە، کە ئەمە بە تەواوی دەبێت بە هۆی ونبوونمان. ئەوەی لەلای ئەهالییەکە بوو و لە توانایاندا بوو وەرم گرت. پاش دوو شەو چووم بۆ هەناران و کانی بەردینەبییەکان وایان زانی، کە دەچین بۆ دۆڵی سووررداش، بەڵام ئێمە لە شێرکوژەوە هاتین چووینە دێی باخ، ماڵی شێخ سەعید. ڕۆژ لە باخ بووم، مەحموود ئاغا، خولەی قاورمە سووتاو، پۆلیسی نهێنیی بۆ هات وتی لە دوێنێوە بە دواتاندا دەسووڕێمەوە. زۆر جاسووستان بە دواوەیە. ئەو کارەساتەی خەراجیان نامووسی حکوومەتی شکاند، وا دەزانن تۆ تەنیا دە سوارت لەگەڵە و ئەوەی، کە بەسەریان هاتووە کاری دە کەسە. وتم ڕاستە پێنج چەکدارمان کەوتە کار.

شەو جیا بووینەوە، بەڵام بە مەحموود ئاغام وت دەچم بۆ گرێزە و مووان. لە وێوە چوومە دێی تەپەشوانکارە و بازییان، پەنا تاسڵووجە. ماوەی نیو سەعات دوورە چونکە مەحموود ئاغا لەو باوەڕەدا نەبوو، کە لەم کاتە ناسکەدا بچمە بازییان و دێهاتی شێخ مەحموود و ئەوەندە نزیک. ڕۆژی دوایی لەسەر ڕاپۆری ئاغا، هێزێکی زۆر و فڕۆکە نێررا بۆ شارەزوور، بەڵام بەبێ گەیشتن بە ئاوات، گەڕابوونەوە.

من هەر ئەو ڕۆژە دێهاتەکانم تێ گەیاند بە دوو شەو پارەیان هێنا. لەگەڵ گزنگدا گەیشتمە دێی کونە کۆتر، دێیەکی بچووك و بێ ناو، دوو مەڕمان کڕی. ڕێگەی ڕۆیشتنمان بڕی، ماوەمان نەدا کەس بڕوات، بە پارە خواردەمەنیی وڵاخمان جێبەجێ کرد. ئێوارە سوار بووین، لە کانی گۆمە و وڵوویەوە و کەناری شارا، گەیشتینە سەر کەلی گۆیژە لای جەلالی ڕەشید ئەفەندی و چوومەوە بۆ پێنجوێن.

**لە پێنجوێنەوە، فەرمانی بەرزبوونەوەم بۆ مولازمی ئەوەل**

لەگەڵ گەیشتنم بە دیوان ڕووگرژییەکی تەواوم لە شێخ مەحموود بینی. فەرمووی جارێکی تر خۆت تووشی چورتمی وا نەکەیت، ڕۆژی دوو سێ نامەم بۆ هاتووە، کە لە سلێمانییەوە عەوداڵی تۆ بوون. بچۆ بە تەواوی بە سەراهاتووی خۆتانم بۆ بنووسە. پاش دوو ڕۆژ فەرمووی من هەڵەم نەکرد، کە بە عادیلم وت فەرمانی بەرزبوونەوەکەت بۆ بنووسێت، لە پێش ڕۆیشتنتەوە نووسراوە. دراوە بە یونس ئەفەندی بچۆ لێی وەریگرە.

چووم فەرمانەکەم وەرگرت، زۆر لە پێش ڕۆیشتنما نووسرابوو بەڵام بە ڕاستی من بە خاوێنی

و دڵپاکی و یەکڕوویی لە ڕێی ڕاستی ئاواتمدا، بە بێ بەزەیی بە خۆمدا، خۆم ماندوو دەکرد و دەبزووتمەوە.

مەریوان، وڵە ژێر

٢٢ تەمووز ١٣٤١

ژمارە ٥ ٠٠ ٢٥

بۆ جەنابی قوماندانی عەسکەری

١- کاتبی خۆم مولازمی سانی ئەحمەد ئەفەندی، کە خەدەماتی فەوقەلعادە و فیداکاری لە موشاهەدە و فیعلا خزمەتی موسەلیمە. لە ١٨ تەمووز١٣٤١ەوە بۆ ملازم ئەوەلی تەرفیع و تەلتیف کرا.

١- بۆ نەوعی کەیفییەتە، تەسحیح و داخل بفەرموون.

٢- مووما ئیلەیهی، هەر لە ئموورى تەحریرییەی خۆمدا موستەخدەمە، دەخلی بەسەر قەتەعاتەوە نییە.

باقی ئیحتیرام.

مەحموود، باش قوماندان

**سوپای عێراقی ئاوێتەی لێفیەکە کرد**

ئینگلیزەکان تێ گەیشتن، کە ناتوانن چارەی دەسەڵاتی شێخ مەحموود بکەن. ئینجا لە لایەکەوە بانگی ئیستیقلال و حکوومەتی کوردی دەدا و ناوی شێخ مەحموودی بە مەلیکی کوردستان بڵاو دەکردەوە و یەك بە دوای یەکدا بە ناوی شێخ لەتیفەوە نامەیان دەنارد. لە لایەکی تریشەوە سوپای لیڤی و پۆلیس و جاشپۆلیسی بە هەزاران لەگەڵ فڕۆکەدا دەنارد. خانوو، دێهات، چاندگە، ئاژەڵی دەکوشت و وێران و پەرێشان دەکرد. خوێنی گیانداری کوردی بەسەر بەرد و چیاکاندا دەڕشت و زۆر تەقەلای دا، کە بە سەرکەوتن، شێخ مەحموود چارە بکات، بێ سوود بوو. ئینجا کەوتە ڕەنگ و ڕیسەی بەرپاکردنی ئاگری دوژمنایەتیی کورد و عەرەب بۆ چەپاوکردنی دۆستایەتییان و فەڕ وەرگرتن لە خوێن ڕشتنی هەردوو لا. ئینگلیزەکان خۆیان سەردار و خاوەن دەسەڵات بوون لە عێراقدا. سوپای عێراق یەکسەر لە ژێر فەرماندەی خۆیاندا بوو. لەو کاتەیشدا کەسێکی وایان نەبوو، کە بتوانێت بەرهەڵستیی بەر و ئاواتیان بکات. ئینجا سوپای عێراقی هێنا و ئاوێتەی لیڤیی پۆلیس و بەکرێگیراوەکانی خۆیانی کرد، بۆ پچڕاندنی پشتێنی برایەتیی ئەم دوو گەلە، لە پێناوی ئاواتی سیاسەتی خۆیاندا، بۆ جەنگی براکوژی بەرامبەر بە شۆڕشگێڕانی کورد.

### نامەیەکی چەمەن

بە ڕێکەوت ئەم نامەیەی چەمەنم بینی و خوێندمەوە کە بۆ شێخ لەتیف نووسرابوو، کە لە تەمەنی ٦ تا ٧ ساڵەدا بوو.

لە پاش خوێندنەوەی من نەمویست لێی بدوێم. بەڵام وا دەزانم دوو سێ ڕۆژی بە سەرا ڕابووردبوو. مەلیك فەرمووی دەزانیت چەمەن دەعوەتی خێزانەکە دەکات بۆ شارباژێڕ. بەڵام لەتیف وەڵامی ناداتەوە، چونکە درۆیە، ڕەنگە زانیبیەتی، کە وەکو دەروێش هەر ڕۆژە لە جێگەیەك و بن بەرد و دارێکدا بن.

نامەکەی چەمەن

جەنابی شێخ لەتیف: هیوادارم لە خۆشیدابن. جوابی کاغەزەکانی پێشووم وەرنەگرتەوە. ئینشائەڵڵا خێرە، دەتوانن لە شارباژێڕ بەبێ ترس دانیشن ئەگەر تەنیا خێزانەکە بێت. ئیتر، خواتان لەگەڵ.

موخلیستان

چەمەن

### ئێمە کەی دوژمنی عەرەب بووین؟

من ویستم وەڵامی ئەم نامەیە بدەینەوە. مەلیك بە باشی نەزانی، فەرمووی دەیکەن بە بەڵگە چونکە ناپاك و بێ بەزەیین. بەدبەختیی ئەو بەدبەختانە لەبیر ناچێتەوە. ئێمە کەی دوژمنی عەرەب بووین. ئێمە داوای مافی خۆمان دەکەین. چ ناڕەوایی و نابەجێییەکمان لە عێراق بینیوە و کەی گلەییمان لەو برایانە کردووە دەمانکەن بە گژ یەکترا؟ ئاغستۆس ١٣٤١.

### خەلیفە یونس و نووری بەگ

ئەمجارەیش بۆ کۆکردنەوەی بەشی پیتی دانەوێڵە بۆ چوونی بازیان، فەرمانم پێ درا. لە پاش گەیشتنم بە چنگیان، شەوڕەو گەیشتمە خەراجیان و بێگومان میوانی کوێخا حەسەن بووم. ڕۆژ گەیشتە چێشتەنگاو. کابرایەك هات وتی لە کۆزە ڕەقە جەنگ گەرمە. خەلیفە یونس، نووری بەگی مودیری ئاخنیوەتە ئاوایی، دەیەوێت بیگرێت.

من بە پێویستم زانی بگەمە لای خەلیفە و نووری بەگ ڕزگار بکەم، گەیشتمە لای تێم گەیاند، کە حزمە و دەبێت دەستبەردار بێت. خۆم لەگەڵ پێنج سوارا چووم بۆ ئاوایی. بەبێ ئەوەی قسەی نووری بەگ ببیەم لەگەڵ خۆم بردم و تا ماوەیەکی دوور لە کۆزە ڕەقە. ئەوان ١٢ سوار بوون. تێ گەیشتم دەیەوێت پیلانی گرتنی ئێمە بخاتە کار. بۆ سەربەرزیی خۆی بە گیراوی

بمانگەیەنێتە سلێمانی. چونکە چرپە چرپ و سوارەکانی یەکەیەکە لە خۆی نزیک کردەوە زۆر باش دیاری دا، ئیتر من خۆم گرتە دواوە وتم نووری بەگ تۆ ڕزگار بوویت دا و بۆ کەس دامەنێ. خواتان لەگەڵ. وەستام تا دوورکەوتنەوە بۆ لای خەلیفە.

## چووم بۆ بازییان

لە کۆزە ڕەقە خەلیفەم بەجێ هێشت. شەوی مابوو گەیشتمە بارۆیی گەورە – بازیان. پاش چەند ڕۆژێك سابیر بەگ و خالۆ ئەمین حەمە ئیمام هاتن، پەلەیان بوو وتیان سبەینێ بۆ نیوەڕۆ سوپاکەی لیڤی دەگاتە بازیان بۆ سلێمانی. بڕیارمان داوە لە پێش هاتنیاندا بکەوینە خۆمان تاوەکو بە خۆشی نەگەنە سلێمانی. من فەرمانم پێ نەدرابوو هاوکاری جەنگ بم. پێنج سوارم لەگەڵ بوو، نەمویست تێکەڵیان بم، بەڵام ناچار بووم لە چەکدارانی بازییان پتر لە ١٠٠ چەکدارم کۆ کردەوە و لەسەری تاسڵووجەوە تا پشتی بیبی جکمان بە پیادە گرت و سوارەیش لە بیبی جك و تەپەشوانکارە دامەزران.

پێشداری لقی یەکەم بە چیادا هات کەوتە ژێر لوولەی پیادەکەمان و پەرێشان کران. سوپاکەیش کە لە شەقامەوە دەهات، کەوتنە ناوانی چەکداری سوارە. بەڵام لقی یەکەم زۆر دلێرانە دەجەنگان. بەبێ ترس بەرامبەر بە لەشکرەکەمان ورووژمیان دەهێنا. بەڕاستی زۆر دەترساین، کە ئەوان سەرکەون، بەڵام پێشدارەکەیان پشتی شکاندن چونکە هێزەکەی ئێمە لە بەرزێوە دەسەڵاتی خۆی پێشان دان. من ویستم تەقە ببڕن و ڕێگەیان بدەین چونکە زۆر پەرێشان کران، بەڵام لە ناکاو چوار فڕۆکە هات بە مەترالیۆز و بۆمبا، ماوەی ئێمەی بڕی. ئیتر ئۆردووەکەی خۆی دەرکرد و چوو بە دیوی سلێمانیدا. ئینجا بەرەنگاری لەشکری عەشایری دیوی سلێمانی بوون، کە بە هاواری ئێمەوە هاتبوون. فڕۆکە لەسەر ئێمە جیاوازیی نەدەکرد. ئۆردووکە کەوتبوونەوە تەنگ و چەڵەمە. تا ڕۆژ ئاوابوو فڕۆکە لەسەرمان لانەچوو، تفەنگ و تاڵان زۆر بوو، کوژراو و بریندارییان لە لایەن دێهاتییەکانەوە کۆ کرانەوە. بەڵام ئێمە زۆر داخدار بووین، کە نەمانتوانی چارەیەکی بریندارەکانیان بکەین و ئەو شەوە بە چۆڵەوە مانەوە چونکە وامان دەزانی، کە ڕزێهلییان دێت و دەیانباتەوە. بەڵام تا ڕۆژ لە چۆڵیدا مانەوە.

## گەڕامەوە بۆ پێنجوێن

من کارم تەواو بووبوو. شەو گەڕامەوە و گەیشتمە ئاوایی دارۆغا. شێخ ئاوڕەحمان سەر بە میری و مووچەخۆری حکوومەت بوو. ناچاریش بووین بچینە ئاوایی، زۆر ڕێزیان لێ گرتین. نیوەشەو سوار بووین بۆ قرگە و ڕۆیشتمەوە بۆ پێنجوێن.

کارەساتم بۆ مەلیك گێڕایەوە. فەرمووی پێویستە ئەمانە بە نووسین بنووسن چونکە ئەو

نووسینانە یەکە مێژووی دوا ڕۆژی کورد دەڕازێننەوە و بەدبەختیی ئینگلیز لە خاوەن بەختان دەگەیەنێت، بچۆ بینووسە.

چەند مژدەیەکی خۆش بوو، کە لە کاتی چاپکردن و بەرێکردنی بەرگی دووەمی (چیم دی)دا لە ڕادیۆی بەغدادەوە بیستم و منیش کردم بە پێشەکیی ئەم بەرگە. وتی: لیژنەی سەرکردایەتیی عێراق بڕیاری دا، کە لە هەموو قوتابخانە و دانشگاکانی کوردستان بە زمانی کوردی و لە زانستگا و دانشگاکانی عێراق سوپایی و پۆلیسیشدا بە زمانی کوردی ئەخوێندرێت و ڕۆژنامە و گۆڤاری زانستی و ئابووری و سیاسی دەریکرێت. ئەم ژوان و فەرمانە لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەکانی عێراقدا زۆر جار وترایەوە و بڵاوکرایەوە. تشرین یەکەم ١٩٦٩.

بێ گومان ئەم هەڵە گەورە و مەزنە بە فیڕۆ نادرێت، چونکە ئیتر ئەرکی ڕووخاندن و داگیرکردنی قەڵای نەزانیی سەرشانی ڕەوشەنبیر و نووسەرەکانی کورد، کە نووکی تیژی خامەیان لە سنگی لەشکری نەزانی توند بکەن و بە هۆشمەندی ڕەگ و ڕیشەی نەزانی لە کوردستانا نەهێڵرێت و پایەماڵ بکرێت.

ئەوەش بزانن، کە لیژنەی سەرکردایەتیی شۆڕش بازتی زۆر گەورەتری ماوە بۆ پێشخستن و ڕێکخستن و لە ناوبردنی هەموو چەوت و چیڵەیەك بۆ ئازادی و بەرزکردنەوەی ناوی کورد و کوردستانی عێراق لە مێژوو و جوگرافیای گشتیدا. ئێمەیش دەبێت بە کۆششی بێ وچان خۆمان لە فەریکی و دواکەوتوویی ڕزگار بکەین.

## چیم دی

شێخ مەحموود لە ڕۆژی ٢١ی مایسی ١٩١٩دا بەرامبەر بە بەریتانیای گەورە شۆڕشی کوردی دەست پێ کرد. هەموو گەلە ژێردەست و بەخسیرەکانی ئینگلیزی تێ گەیاند، کە ئادەمیزاد نابێت بەخسیر بێت. بانگی تەنیا نەك بۆ کورد بۆ گەلانی ڕووی زەمین بڵاوکردەوە.

سەعات چواری ئێوارەی ڕۆژی پێش جەژنی قوربان لە سایەی مەلیکدا بە (٣٠٠) سوارەوە گەیشتینە دێی چوارتا. ئاوایی چۆڵ و بێ زیندەوەر و وێران و بارانیش هەناسە نادات. نە نان نە خواردن، پارووییەك نییە. چاوەڕێی ئەو بیست سەر مەڕە دەکرا، کە ڕاسپێری کرابوو. بەڵام بێ نان ڕەنگە بەبێ خوێش بخورێت. مەلیك بانگی کردم چوار زەرفی دامێ فەرمووی لەگەڵ تەنیە یەك سواردا دەچیت بۆ بازییان و لەوێوە بیاننێرن بۆ فەتاح ئەفەندی ١ و ٢ بۆ (کۆنت پۆل تلکی) و بۆ لە ئەندامان، وای. ئای، فرسن، وەزیری موفەوەز لە بوخارست. و. أ. پۆلیس عەقیدی موتەقاعید لە سوپای بەلچیکی و جەواد پاشا موفەتیشی عامی سوپای کیشوەری دیاربەکر و فەتاح بەگ. لە ژێر باراندا گەیشتینە بازیی. نامەکانم نارد.

نامەکان بە تورکی نووسرابوون و زۆر کورت و ئاودار، دەڵێت ئێمە بە چەك بەرامبەر بە ئینگلیز لە جەنگداین. کورد داوای ئازادی دەکات. نایەوێت بە دیلی بژیەت. کێ داوای ئاواتمان کە ئیستیقلال و ڕزگاریی کورد و کوردستانە. دەهێنێتە جێ لەگەڵ ئەو لایەین[1]. مارت ١٩٢٥. لە لایەن عێراقیشەوە سەبیح نەشئەت و لە ئینگلیز – ئار. ئێف. چاردن.

کاتی گەڕانەوەی خێڵەکانی جاف لە کوێستانەوە بۆ گەرمیان نزیك بۆوە، حکوومەت ترسی لێ پەیدا بوو چونکە بە پێی دەستوور هەموو سەرکۆمارەکان لە گەڕانەوەدا دەبێت بێن بۆ بینینی مەلیك و چ خەرج و باجێکیان لەسەر بێت بیدەن. جا حکوومەت کەوتە فرۆکە ناردن، بە بەیاننامە و هەڕەشە کردن. ئەمە وێنەیەك لە بەیاننامەکان و بە زینۆگراف و بەبێ دەستکاری.

---

١. بۆ تێگەیشتن لەم کارەساتە (مشكلة الموصل) بخوێننەوە.

بەدبەختیی ئینگلیز، کورد فێری دروستکردنەوەی کوردستانێکی نوێ و ژیانێکی تازە دەکات.

شێخ مەحموود

بۆ هەموو سەرکۆمارەکان و کۆخاکانی جاف

ئەوا ئیختار دەکرێن، کە هەر لە حدوودی ئێران تەجاوزتان کرد بۆ خاك و لیوای سلێمانی و گەرمیان شایەد، کوللی و جوزئی، بێ ئیتاعەتیی حکوومەتتان لێ سادر بێ، یا خیلافی ئەمر و ڕەزای حکوومەتی جوزئی موعامەلەیەك بکەن، یا لە ئیتاعەتی موتڵەقەی حکوومەتدا، جوزئی قوسوورێکتان لێ ڕوو بدا، مەعلووم، کە فەوقەلعادە عەزاب و فەلاکەت دەبینن و زۆر بە شیدەت تەجزییە دەکرێن، لازم بوو لەم جیهەتەوە لە پێشەوە ئیختار بکرێن.

موتەسەریفی سلێمانی

تشرینی یەکەم ١٩٢٥

حکوومەت لە جەنگی لیڤییەکەی گرێزە، زۆر ورەی بەردا. جا بۆ ناگریری لە پێشەوە کەوتە هەڕەشە بەڵام بێ سوود بوو، بەرایی خێڵی جاف گەیشتە دۆڵی شلێر. فڕۆکە پەی دەر پەی، دێت و دەسووڕێتەوە. بە ڕۆژ پێنجوێن چۆڵ دەکرا، لە پشتی ئاوایی بووین، دوو فڕۆکە هات و یەکسەر یەکێکیان لە (گەڵگە) نیشتەوە و لەو کاتەدا سوارەی حەمەی شێخ عەلی گەیشتنە سەریان و هەردوو فڕۆکەوانەکەیان گرت و هێنایان بۆ بارەگا. فڕۆکەوانەکان (کاپتان دێنی و هێستر) لەگەڵ گەیشتنیان داوای شێخ مەحموودیان کرد، هەر لە دوورەوە ناسییان. وتیان ئێمە وێنەیمان بینیوە. تەنیا مستەفای برام ئینگلیزیی دەزانی و ماوەیەك وتووێژی لەگەڵ کردن. بە سواری ئێستر من بردمن بۆ وڵە ژێر.

جاف هات و بە خۆشی و بێ وەی گەیشتنەوە گەرمیان، بەڵام لە پاش بەجێهێنانی ئەو پێویستیانەی لە سەریان بوو وەکو: مەڕانە و پووش و خوری.

شێخ مەحموود، بەرامبەر بە نائومێدی لە ئینگلیز، دەیویست پەنایەکی تر بدۆزێتەوە، ئەویش تورك، یان، ئێران و بە هەرچی جۆرێك بۆی هەڵسووڕێت، دۆستایەتییەکی بە تین دامەزرێنێت. لە پلەی یەکەمدا، ئێرانییەکان پشتیوانێکی زۆر گەورە و کارناسانیمان بوون، بەڵام ویستی لەگەڵ تورکەکانیشدا دۆستایەتی تازە بکاتەوە و هیچ نەبێ یارمەتیێکیان لێ وەرگرێت، چونکە لە تورکەکان، بە هیوای ویلایەتی مووسڵەوە ئومێدی چاکە دەکرا.

بڕیاری دا بە نووسینی دوو نامە: ١- بۆ خێری پاشای فەرماندەی سوپایی لە (وان) و لەگەڵ سەبری ئەفەندی (کاکە ڕەش) ناردی، ٢- بۆ تاران بۆ سەرۆك شالیارانی ئێران. وەڵامی نووسراوەکەی تاران لە لایەن حکوومەتی (بانە)وە زوو هاتەوە دەڵێت: «فەرمانم پێ درا بێمە خزمەتتان بۆ دەست ماچکردن بۆ ئەو جێگەیەی خۆتان دەفەرموون» لە لایەن یاوەر محەمەد عەلی خانی فەرماندەی قشون لە بانە، ئەم نامەیە لە پێنجوێن وەرگیرا.

فەرمانی ئامادەکردنی ۱۰۰ سوارە و ٥٠ پیادە دەرکرا پاش دوو ڕۆژ مەلیك لە ناکاو ڕۆیشت بۆ دۆڵی شلێر بۆ دێی وێنە بۆ ماڵی حەمە ڕەشید خانی قادرخان. لەوێوە وەڵامی بانەی نووسییەوە و بۆ ڕۆژی دوایی یاوەر لەگەڵ پێنج سوار هات. شەو ماینەوە. ئەوەی پێویست بوو، لە لایەن هەردوو لاوە بڕیار درا.

وەڵامی تورکیا لە وان، لە لایەن والی سەبری پاشاوە لەگەڵ کەمال بەگ ناودا، دکتۆر ئۆرخان و ئەجزاچی کامل بەگ لەگەڵ یەك هەزار لیرەی زێڕدا گەیشتنە (وڵە ژێر). بەڵام دکتۆر ئۆرخان و ئەجزاچی کامل بەبێ دەرمان نێررابوون. شێخ مەحموود پێی وتن لای خۆمان پیاو زۆرە دەرمان نییە، لەبەرئەوە بۆ گەڕانەوەیان لەگەڵ پارەکە بە کەمال بەگ نوێنەری والیی گەیاند. جا بە پاڕانەوەیەکی زۆرەوە بەڵێنی دا، کە بە زوویەکی زوو دەرمانیش بگەیەنێت. گەڕایەوە بۆ وان. بۆ هێنانی چەك و بەرگ و پارەیش بەڵام پارمەتییەکەیان زۆر کورتی هێنا. خۆ ئەگەر نووری عەلی، کە سەرۆکی تەندروستی بوو لە بەر هەندێك پێویست نەدەگەڕایەوە پێویستی دکتۆریش نەدەبوو. ئیتر هیوا بێجگە لە تەنیا کوردە بە ئابڕوو و ئازاکان بەو لاوە، هیچ پەنایەك نەبوو. شێخ مەحموود تەنیا بە دارایی خۆی بەربەرەکانیی دەکرد بۆ ئازادیی گشتی.

لە پێنجوێن زابتەکان و ئێمەمانان کۆبووینەوە، بۆ ئەوەی سەرڕوشتەیەك لە بیر و نیازی ئینگلیزەکان بچێژینەوە. ئەگەر دەست بدات دوایی بە شۆڕش بێت، نامەیەك بۆ موفتیی ئیداری لە سلێمانی لاین [1] بنووسین.

پوختەی نامەکە:

ئێمە لە لوتف و عەدالەتی بەریتانیا دڵنیاین، کە بە چاوێکی دڵسۆزانە ئەم گەلە ئاوارەیە دەبینێت، کە دوای ئازادی کەوتوون و ئیتر بە ماڵوێرانی و خوێنڕژاندن دوایی بهێنرێت، لەگەڵ دانی مافی کورد و عەفوی عام بڵاوکردنەوە لە هەستی ئادەمیزادیتان هیواداری. کانوونی ئەوەل ١٩٢٥.

وەڵامی نوێنەری بەریتانیای گەورە و خاوەن دەسەڵاتی ژیان و مەرگی کوردی هەژار، موفەتیشی ئیداری کۆلۆنێل لاین پەروەردەی دانشگا و ماف زانی ئادەمیزادیش ئەمەیە:

سەگی هار چل ڕۆژ عومریەتی.

موفەتیشی ئیداری لاین

شوبات ١٩٢٦

---

ج. ب. ی - ٤٠٠/٦٧

١. کۆلۆنێل لاین

تەنیا چوار مانگ بەسەر نامە لەنگ و ناپەسەندەکەی (کۆلۆنێل لاین)دا ڕابووردبوو، کە لە وەڵامی تیپێك خوێندەوار و لاوی کوردا فەرموویی (سەگی هار چل ڕۆژ عومرێتی)، ئەم کارەساتە ڕووی دا. ئایا، هەر ئەو کردەوەی دەرمانکردنی نەخۆشە دوژمنەکەی نەبوو، کە تا ئێستا بووە بە مایەی ستایشی پیاو مەزنی بۆ سەلاحەدین؟[1]

ئێستا (لاین) هاتەوە هۆش تا لەم جێگا و کاتەدا بچەقێت، کە بۆ دەرمانکردنی فرۆکەوانەکانیان کە گیاکێش و ماڵ و چاندگە وێران و سووتێنەر و ئاژەڵکوژی کوردن، دکتۆر بنێرێتە ناو جەرگەی کوردی بە دوژمن زان و نەیزانی ئەو تیپە خوێندەوارانە گیان بەختکەر و نەوەی کوردن، کوردی دلێر و ئادەمیزاد نەك سەگی هار.

ئەمە و کردەوە پەسندەکانی زابتە سیاسییەکانیان، ئایا ئەوان ڕاست دەکەن چونکە گەلی بێ ناو و ماف دەبێت لە دانگی سەگدا بژیەت؟ و ژیانی کەم بەڵام قەیرانی چل ڕۆژە بۆ ئەوان بوو ڕێك خرا، بەم پێیە فەرمان درا.

فەرمانی مەلەکی

پشت بە خوا

ژمارە ٣٠

ڕۆژ ١٥ شوبات ١٩٢٦

بۆ هەموو فەرماندە و هێزەکانی سوپایی و عەشایری

بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە ڕۆژی ٢٠ شوباتەوە بە پێی ئەم تەرتیباتەی ژێرەوە دابەش دەبن و بەرامبەر بە هێزی حکوومەت دلێریتان دەبێت ببینرێت و لە هەموو جێگا و شوێنێکدا بۆ پایەماڵکردنتان چاوەڕێی هەڵمەتتانین. ئازاری نیشتەدێیەکان هەرگیز دروست نییە.

مەحموود

١– بەشی سوارە

١– ماجید و سوارەی سوپایی: لە سلێمانییەوە تا مووان.

٢– خەلیفە یوونس و سوارەکانی: لە موانەوە تا خورماڵ.

٣– ئەحمەد ڕۆستەم: لە سێتەلانەوە تا جێشانە.

٤– سابیر و تۆفیق ئاغا: لە سلێمانییەوە تا تابین.

٥– ئەمین حەمەی ئیمام: لە تەپەشوانکارەوە تا دەربەند.

---

١. نامەی دووەمی (کۆلۆنێل، لە لاپەڕەکانی) ئەم نووسراوەدا دەخوێنیتەوە.

٦- ئەحمەد خواجە: لە بازییان و قەرەداخ.
٧- شێخ محەمەد بچکۆلە و حەمەی شێخ عەلی لە شارباژێڕ و پێنجوێندا بۆ هاتوچۆ و نامەبەری: تۆفیق ئاغا، تۆفیقە سوور شێوەکەڵی بۆ لای هەموو لقەکان هاتوچۆ دەکات.

٢- بەشی پیادە
١- فەرماندە حیکمەت ئەمین: لە کەلی گۆیژە.
٢- رەمزی ئەفەندی و رەشید ئەفەندی: لە ئەزمڕ و سیتەك.
٣- عادل ئەفەندی: لە پێنجوێن.
٤- پیادەکانی پیران و کۆڕی گەپلە و برنجە لە جێگەی خۆیان دەمێنێتەوە.
٥- پیادەی شارباژێڕ: لە جێگای خۆیاندا نابزوون تا لە فەرماندەکانی پیادە داوای پارمەتیتان لێ دەکرێت.

مەلیك و باش قوماندان

مەحموود

من لەسەر ئەو فەرمان و وەرگرتنی ڕاسپێری، بە تایبەتی ڕۆیشتم. چوومە داریکەلی ٤٠ باری ئێستری برنج و گەنم و جۆم ئامادە کرد. ماوەی پارەی زەوییانە و دە یەك لە دێهاتەکاندا کۆم کردەوە، لەگەڵ کاروانەکە و دوو سوارا ناردم بۆ پێنجوێن.

لە پێش هەموو شتێك و بزووتنەوەماندا لە لایەن (فەقێ محەمەدی هەمەوەند مودیری مۆرتکە)وە هەرەشەم بۆ هات و داوای بەجێهێشتنی بازییانی کرد. ئەگەر بە پێچەوانەی داواکەی بکەم، بە فڕۆکە بۆمبابارانی دێهاتەکان دەکرێت. من ئەم قسەیەم بە ڕاست زانی، شەو چووم بۆ دێی (داوود بلاغ). پاش یەك شەو، ڕۆژ پاش سەعات (٥) ئێوارە ئاواییمان بەجێ هێشت بەڵام، وا ڕێ کەوت، کە هێشتا لە ٢٠٠ مەترە پتر جیا نەبووبووینەوە دوو فڕۆکە گەیشتە سەرمان و بەبێ وەستان بە بۆمبا و مەترالیۆز پەرێشانی کردین. نزیکەی نیو سەعات بەربەرەکانی، ئێمە بە تفەنگ بەرامبەر بە فڕۆکەکان، بریندارێك و ئەسپێك کوژراومان بوو. تاریك داهات، گەیشتینە دارەکەی (سۆفی نەبی). فڕۆکەیەك، کە بە تفەنگی ئێمە پێکێنرابوو کەوتبوو، چەند پیاوێك لە دوور وەستابوون وتیان لە پاش تەقەکان هات و نیشتەوە ئەوی تریش لە لایەوە نیشتەوە و فڕۆکەوانەکانیان هەڵگرت و بردیانن، لە لایەن سوارەکانەوە ئاگری پێوە نرا و سووتا.

لقی ئێمە، ئیتر نەکەوتینە جەنگێکی واوە، کە شایانی باس بێت. سوارەی هەمەوەند، بە درێژایی ڕۆژ لە نزیك سلێمانییەوە تا سووورداش لە جەنگدا بوون. جەنگی بەکرێگیراوەکانی ناوخۆ و فڕۆکە ماوەی نەدەدایین. لە هەموو لایەکدا، ئاژەڵ، گا و کەر، خانوو و چاندگە، ڕێبوار

و سوار وەکو یەك دەدرایە بەر چیکەنەی مەترالیۆز و بۆمبا.

کاروانی ئازووخەی حکوومەت کەوتە بەر لووتی سوارەی هەمەوەند و ئەمین حەمەی ئیمام لە تەینال بەرەنگاریان بوون. ئازووخە بە بارگیر و ئێسترەوە گیرا و لە سوپاییەکانی میری ئەوەی دەرچوو، بریندار بوون. هەروەها لە شارەزووریش بەری جەنگ نەدەپێچرایەوە لە زەڵمەوە تا گردی سەیوان – سلێمانی ئاگربارانی گوللە بوو. لە سلێمانیشەوە بۆ کەرکووك لە هاتوچۆی حکوومەتییەکان ڕێگە بە تەواوی بەسترابوو. جا شۆڕشگێڕەکان بۆ ئەوەی فڕۆکە نەتوانێت کاریان لێ بکات، دووره جەنگیان نەدەکرد هەمیشە لە ماوەیەکی زۆر نزیك تا دەگەیشتە تێکەڵی، پەلاماری هێزەکانی میرییان دەدا. لەبەر ئەوە بۆ فڕۆکە پارێزگاری هێزەکەی خۆیان بۆمبا و مەترالیۆزی بەکارنەدەهێنا. بێگومان دەبوو بە هۆی شپرزەیی و پەرێشانیی دوژمن.

لە فەرمانە نهێنییەکاندا، کە پێمان دەگەیشت، دەڵێت شۆڕشگێڕەکان، لە سەریان پێویستە تا چل ڕۆژ ماوەی حەسانەوەی حکوومەت نەدرێت، سلێمانییان لێ بکرێت بە کوانووی ئاگر. ئەو کوردانەی یاریدەدەری حکوومەت دەکەن بەبێ بەزەیی لەگەڵیان بجووڵێنەوە. دۆستی دوژمن دوژمنە. ئاگاداری زیانی هەژاران، یەکەمین پێویستە. من بەبێ ئەوەی تووشی هیچ جۆرە جەنگێکی وا ببم، کە شایانی باس بێت، گەڕامەوە بۆ پێنجوێن. لە جەنگاوەرەکانەوە زۆر ڕاپۆر هاتبوو، ئەمە چەند دانەیەکیانە:

بۆ پێشگاهی مەلیك و باش قوماندان

ژمارە

ڕۆژ ٢٥ شوبات ١٩٢٦

١– شەوی ٢٠ لە دێی مووان، بەرەنگاری سوارەی عەسکەری میری بووین. لە ناو ئاواییدا ئابلۆقە کران. تا پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی بە ئاوێتەی عەشایرەکانەوە، زۆر بە پەرێشانی دەرباز بوون.

٢– سوارەی بەشی زەڵم هاتە یارییەمان.

٣– تا نزیك بێستان سوور لەسەریان ڕۆیشتین.

٤– دەستکەوتەکانمان: ٤٨ تفەنگی ئینگلیزی، ٢٠٠ فیشەکی ئینگلیزی، ٥ یەخسیر، ٢ تفەنگی تورکی، ڕەنگە هی عەشایرەکان بێت. لەگەڵ ١٨ کوژراو و ٢٥ بریندار و ٤٠ ئەسپی کوژراو و بریندار، کە بەجێ ماون.

٥– لە مووانییەکان بە گوللەی وێڵ ٢ ژن کوژراو و دوو کوڕ و پیرێك بریندار هەیە.

٦–لە سوارەکانی خەلیفە یوونس یەك کوژراو و یەك بریندار هەیە.

٧– لە ئێمە حەمەی سەعید و قالەی برایم کوژرا و چوار بریندارمان هەیە. لە بریندارەکانیش شەریفی سمایل باش نییە.

٨– هەموو بریندارەکان نێررانەوە بۆ پێنجوێن. ولاخی برینداریشمان هەیە.

ماجید

قوماندانی سوارەی عەسکەری

بۆ پێشگاهی مەلیك و باش قوماندان

دەستتان ماچ دەکەین

دوێنێ لە کەندەکەوە لەگەڵ پۆلیس و عەسکەری لیویدا دوو سەعات لە جەنگدا بووین و تا گردی شێخ محێددین – سلێمانی، شکان و لەسەریان چووین. پێنج بریندار و دوو کوژراویان بە ئەسپ و تفەنگەوە بەجێ ما. لە ئێمەیش حەمە شەریف نەریمان و سێ ئەسپ کوژرا. ئێستا لە دێی کەڵەکن و خێوەتەین. فڕۆکەمان نەبینیوە، تۆفیق ئاغا و هەموومان خاکی بەرپێتان ماچ دەکەین.

٢٨ شوبات ١٩٢٦

سابیر: قوماندانی سوارەی هەمەوەند

بۆ حەزرەتی مەلیکی کوردستان

خاکی پاتان ماچ دەکەین. لە نزیك تەپناڵ دامان لە مەفرەزەی نەقلییات. پێنج ئێستر بەبارە ئازووخەوە لەگەڵ یەك ئەسپمان دەست کەوت. شەش عەسکەر، دووانیان کورد بوون گیران. بە مەرقەدی کاك ئەحمد ئەوەندە بە ئازایی و دلێری ئەجەنگان لە دڵم نەهات بیانکوژم. ئازا ناکوژرێت، بەرم دان. هەموومان سەلامەتین و خاکی بەرپێتان ماچ ئەکەین.

ئەمین حەمەی ئیمام

خزمەتکارت

راپۆری جەنگی زۆر بوو، بەم چەند دانەیە دواییمان پێ هێنا و لە ماوە و قەیرانی چل رۆژەدا بە راستی گاڵە کرا بەهێز و سیاسەتی حکوومەتی سلێمانی و شێرەکانی (لاین) بەرامبەر بەهەموو هەوڵ و تێکۆشانی شێخ مەحموود و دۆزینەوەی رێگا و گوشادکردنەوەی دەرگایەکی یارمەتی لە هەموو لایەکەوە ئێنگلیز، بوویووە دەرگاوانێکی بێ ئامان و وریا بۆ بەریەستی

تێکۆشان و بە بادانی ڕەنجی کورد و شێخ مەحموود. بێجگە لە بەکارهێنانی ئەو پیلانانەی بەرامبەر بە حکوومەتە دراوسێیەکان، لە وڵاتی سلێمانیشدا ئینگلیز کەوتە هەڵگێڕانەوەی عەشایر و دۆستەکانی شێخ مەحموود، پچڕاندنەوەیان لە شۆڕش.

١- لە شێخانی بەرزنجەیان گەیاند، کە ئەوانیش لە کوردستاندا بەشدارن و نابێت تەنیا شێخ مەحموود بیخوات. جا کۆسپی گەورە بەرزنجەییەکانی خزمی بوون. من خۆم زۆر موخلیسیانم، بەڵام لە ڕاستیش نابێت لابدەم. لە کاتێکدا، کە شێخ مەحموود گیرا و نێررا بۆ هند، شێخەکان ناوی شێخییان لە خۆیان داماڵی و ئێجگار زۆریان بوویوون بە عەسکەری لیڤی و پۆلیس. زۆر لە گەورەکانیشیان بوویوون بە ڕوییەوەرگری میری. پێویست بەناو هێنانیان نابینم، کەچی لەم دواییەشدا، بوون بە تاوێری ناگەهان بۆ شێخ مەحموود.

٢- حەمە ڕەشید ئاغای نورك: لە بنەماڵەیەکی بەرز و ناودار و بەڕێز، لە تیرەی ئاغایانی شیوەکەڵ خاوەن مێژوو و دیوانخانەیە. بەرامبەر بە کوردستان و شێخ مەحموود، خۆی بەڕاست و موخلیس پێشان دەدا بەڵام دەرکەوت، کە بەناوی (مودیری ناحیەی شیوەکەڵ)ەوە مانگانە وەردەگرێت. لە بەر ئەوەی بە خزمی حەمە ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا دەزانرا، شێخ مەحموود حەمە ئاغای ئاگادار کرد. وەڵامی حەمە ئاغا: من ئەو کەسەم کە ژوانی گیان بەختکردنم پێ داویت، دوژمنی وەتەن و تۆ، دوژمنی منیشە خۆت سەردار و حاکمیت.

شێخ مەحموود ویستی لەگەڵ حەمە ڕەشید ئاغا ڕوو بە ڕوو بدوێت و لە چاکە و خراپەی کار تێ بگەیەنێ. ئەم نامەیەی بۆ نارد:

برای خۆشەویستم حەمە ڕەشید ئاغا

زۆر دەمێکە لە سیحەت و چۆنیەتیتان بێخەبەرم. نیازم وایە بۆ چەند ڕۆژێك ڕاو بێم بۆ خزمەتتان. وا لە پێش هاتنمدا خەبەرتان ئەدەمێ. ڕەنگە خۆم و دووسێ سوار زیاتر نەیەم. چاوی هەمووتان ماچ ئەکەم. چاوەڕێی وەڵامم.

موخلیستان

مەحموود

ئەم نامەیە لەگەڵ تۆفیق ئاغای خزمیاندا نێرا بەڵام لەوەڵام و ڕاسپێرییەکدا دەڵێت وەکو تۆفیق ئاغا گێڕایەوە من مەئمووری حکوومەتم، ناتوانم بە نووسین وەڵام بدەمەوە، خزمەتکارم. ئەگەر دەفەرموویت من نۆرك بەجێ دەهێڵم و دەچم بۆ سلێمانی. تۆفیق ئاغا بەم جۆرە ڕاسپێرییەکەی هێنایەوە و گەیاندییە شێخ مەحموود.

ئیتر بڕیار درا، کە ئەو قەڵایەی لە سەرووی شۆڕشگێڕانەوە بە ناوی حکوومەتەوە دروست

کراوە بیرمێنێت. بارەگا هاتە دێی سەرخوار. نیزیکەی ٥٠٠ سوار و پیادە چەکدار هەبوو فڕۆکە تا شیوەکەڵ و نۆڕك زۆر هاتوچۆی دەکرد و سوارە و پیادەیش لە بارەگا جیا نەدەکرایەوە. وا زانرا، کە حەمە ڕەشید ئاغا ترساوە و بە سلێمانیی گەیاندووە. کە شێخ مەحموود دەچێت بۆ نۆڕك، لە خواردن، گۆشت، زۆر کەم بوو نزیکەی پێنج شەش ڕۆژ سەخڵەتی هەبوو تا ڕانە مەڕەکە گەیشت. لە عەشایری بێسەری و چووچانی و ناوداری، نزیکەی ١٠٠ چەکدار گەیشت. ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ شێخ مەحموود بانگی کردم فەرمووی لەگەڵ سوارەکانت ئامادە بن ئێوارە بە نهێنی ئامۆژگاریت دەکەم و هەروەها بە (عەزە بەرەی بێسەریش بڵێ ئێوارە بێت و وەرن بۆ لام).

فەرمانەکان

١– من یەکسەر بچم بۆ سەر نۆڕك و بۆ شارەزایی، وسوو ئاغام لەگەڵ بێت.

٢– عەزە بەرە و چەکدارەکانیان لە ڕۆژهەڵاتەوە دەڕۆن تا نزیك ئاوایی.

٣– لە لایەن ئێمەوە و ورووژم دەبرێت و بە دەنگی یەك تەقە ئەوانیش دەبزوون و دەچنە ناو نۆڕك.

٤– وەرن وەکو کوشتن و تالان بە هیچ جۆرێك نابێت ڕوو بدات. تەنیا حەمە ڕەشید ئاغا بە دەستگیر بگیررێت.

نیوەشەو گەیشتینە بەرامبەری ئاوایی، عەشایرەکە چاوەڕێی پرۆگرامیان نەکرد و گەیشتنە ئاوایی. بوو بە تەقە. ئیتر زانیم ئەگەر نەگەمە ئاوایی، تالان دەکرێن. کە گەیشتمە بەر ئاوایی دوو سوار، حەمە ڕەشید ئاغا و خێزانەکەی بە سەڵتە سوارە دەرپەڕین، بەبێ کوشتن نەدەگیران. ئیتر، ماوەی تەقە و بەرپرییانم نەدا، ڕۆیشتن. بەڵام تا گەیشتم کار لە دەست چووبوو. ئاگریان نابوو بە کۆشکەکەی ئاغاوە و چارە نەدەکرا. فیشەکێکی زۆری تێدا تەقی. زۆر دڵتەنگ بووم. چونکە پێچەوانەی فەرمانەکەی مەلیك و پرۆگرام ڕووی دا و لە لایەکی تریشەوە خانوو سووتا و ئەم خێزانە بەرێزە ئاوارە کران و هیچم لە دەست نەدەهات بیکەم و ترسی پرسینەوەی شێخ مەحموودیشم زۆر بوو.

بۆ ئەوەی یادی کردگاری ئەم کورتە خەڵەتاوانە لە بیر و یادا بژی، ئەمجارەیش بە یادی نەزانینیانەوە ناویان دەبەین. لە بەرزنجە، قەرەداغ و سەنگاو و لە سەرگەڵوو و شەدەڵە، شێخان و سادات، لە شیوەکەڵ، پشدەر، ئاغا، لە هەڵەبجە بەگزادەی جاف بە پیلان و هەڵفریواندی، مامۆستای هەرە گەورە ئەدمۆنس و سیاسییەکانی شاگردی، وەکو لید چمەن، لاین و گاوِن ئەو پیاوە بەرێز و ناودارانە لە دوا دواییی کارا جیابوونەوە سەرەڕای ئەمانەیش لە تەنگیسەر شێخ قادری برای شێخ مەحموود بووبوو بە کۆسپ و گرێیەکی سەخت و برینێکی بێ دەرمان.

تاوانبار تەنیا ئەدمۆنس بوو، بە سیاسەتە لەقەکەی زابتەکانیان لە لایەکەوە کوردستانیان دروست دەکرد و لە لایەکیشەوە، بە هاندانی جیابوونەوەی دەستدارەکان لە شۆڕش و بە فڕۆکە و سوپا بۆردومانی تەخت و بەختی کوردستان لە کۆششدا بوون.

برای کورد، خوێندەواری بەڕێز، لە سەرەتادا ئینگلیزەکان، نەك دوو، دەیانویست سێ شووتی بە دەستێك هەڵگرن. ١- درێژەی شۆڕشی کوردیان پێویست بوو بەو مەرجەی بە لاوازی بڕوات. ماوە نەدرێت هەموو کوردی عێراق تێکەڵ ببێ. بۆ ئەوەی لە تورکەکانی بگەیەنێت، کە کورد داوای ویلایەتی مووسڵ دەکەن و هی کوردە و بە چەك لە هەموو داوایەك دەیپارێزن. ٢- بە ئێرانیشی دەوت کوردی عێراق داوای مافی کورد دەکەن ماوەیان نادەین نەك ئێوەیش لە کوردستانی ئێراندا تووشی زیان بین.

٣- هەروەها عێراقیشی دەترساند بۆ ئەوەی بەبێ فزە و بە ئاسانی پەیمانەکانی بۆ ئیمزا بکات و پەتەکە زوو لە ملیان بئاڵێنێت.

بەڵام شێخ مەحموود لەو پیلان و نیازەیان باش تێ گەیشتبوو. بەرامبەر بە ئێران و تورکیا پەیتا پەیتا دڵپاکی و نیازی باش خۆی دەخستە ڕوو. برایەتیی کورد و عەرەبیشی هەمیشە دەخستە پێش و دڵنیای دەکردن. بەڵام ئینگلیزەکان زۆر باش دەیانزانی، کە لە هیچ لایەکەوە یاریدەدەری نییە و ئەم شۆڕش و لەشکرە بە گەنجی دێهاتی خۆی بەڕێوە دەبرێت. لە بەر ئەوە بە ئاهستەیی چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد، کە دارایی نەمێنێ و کۆمەڵ و لەشکرەکەی لە شێخ مەحموود دوور بکەوێتەوە و دوایی بە داوا و ژیانی بهێنن.

ئەوەی ئینگلیز و ئێمەیشی خستبووە ئەندێشەوە، هێزی تورك بوو. جا بۆ ئەوەی زیاتر پەیوەستی ببەسترێت، شێخ مەحموودمان خستە سەر ئەو باوەڕە بۆ ئەنقەرە نامەیەك بنووسێت و بنێرێت.

پوختەی نامەکە:

لە بەر ئەوەی نامەکە زۆر درێژ نووسراوە لێرانەدا بە تەواوی ناتوانین هەمووی دووبارە بکەینەوە بەڵام چەند مادەیەکی لە پوختەی نامەکە پێشان دەدەین.

ولە ژێر مەریوان

١٩٢٦

تورکیا جمهوریەت معظمسی ارکان حربیە

رئاسة علیەس حضور سامسینە

- دوشمنك قهار پنجەء طمع و سیاستندن بو محیطی تخلیص ایچون، سلطنت

وامثالی. مواعید واغفالات سیاسیه سنه رغماً بتون فقدان وسائط ولوازمله برابر بواوزون مدت کوردلرن قان وثروتی ایله مادی و معنوی نفوذی شخصیمله وضعیت حاضرەیی محافظه ایدیشم.

– بز کوردلرله بتون معاونت و وسائطدن محروم، دوژمن ایسه متوالیاً جسیم قوتلرو ثروتلرله آمال و مقاصد سیاسیسنه صرف مقدرت انیمکیدە.

– زمان و وضعیتك نزاکتی و ایشك دخی نهایتی بولمق اعتباریله صوك فعالیتی اجراو دوشمن هر طرفدن تعجیز ایتمك: ایجابا تدندر.

به کوردییەکەی

– بۆ ڕزگار کردنی ئەم ناوچەیە لە پەنجەی سیاسەتی بێ ئەمانی دوژمن (ئینگلیز) لە دەست برین و تەفرەدانمان، بە ژوان و بەڵێنی شاهیەتی، لەگەڵ زەبوونی و کەم هێزیی هۆی پێویستیمان، ئەم ماوە دوور و درێژە بە خوێن و دارایی کورد و دەستداریی خۆم، ئەم کارەساتەم ڕاگرتووە و ئەچێت بەڕێوە.

– ئێمە، کوردەکان لە هەموو هۆ و یارمەتییەك بێبەش و مافینگین. دوژمنیشمان هەمیشە بە هێزی گەورە و دارایی بێشومارەوە خەریکی بە ئاوات گەیشتنە.

– بە چاو ناسکیی کات و ڕووداوەکان و بە بۆنەی ڕوو لە تەواوبوونی کارەوە پێویستە کە بە هەموو هێز و توانایەکمانەوە و لە هەموو لایەکەوە تەنگ بە دوژمن هەڵچنین.

ئەمە بوو وێنەیەك لە بەشێکی نامە نووسراوەکە و تێکەڵیی شێخ مەحموود بە تورکیا، کە تەنیا مەبەس یارمەتییە، بەڵام داخەکەم من وەڵامی ئەنقەرەم نەبینییەوە.

**هێزی میری بۆ پێنجوێن**

لە شاری سلێمانیدا، لە لایەن یەکێك لە باوەڕ پێکراوەکانی شۆڕش (نەریمان)ەوە، ئەم نامەیە هات و دەڵێت:

ئیمڕۆ بۆ ٣ هەزار سوارە و پیادەی عەسکەری و پۆلیس و جاش پۆلیس، ئازووخە لە موتەعەهید وەرگیرا، ئەچن بۆ گرتنی پێنجوێن و شارباژێڕ.

١٩٢٧/٣/٢٧

فەرمانی ملووکانە

پشت بەخوا

ژمارە ٦

رۆژ ١٩٢٧/٤/٢٤

بە پێی بەرنامەی خوارەوە لە ئیمرۆوە لە ماوەی هەشت رۆژدا دەبێت بە تەواوی کار دروست بکرێت فەرمانمان دا.

مەحموود

مەلیك و باش قوماندانی کوردستان

وێنە بۆ:

هەموو فەرماندەکان.

١- سوارەی عەسکەری لە فەرماندەی ماجیددا، بۆ رێگا و بەرکانییەکەی کانی مانگا.

٢- هێزی شێخ عەولی سەرکان و شاربازێری. بۆ هەرزەڵە و کۆلیتان.

٣- پیادەی عەسکەری بە فەرماندەی زابتەکانیان بۆ ملەکەوە و چناران.

٤- پیادەی هەورامی بە فەرماندەی خۆیان بۆ برنجە و تا سێبواران.

٥- سوارە و پیادەی تایبەتی لە فەرماندەی ئەحمەد خواجەدا، لە بارەگا دەبن و لە پێویستیدا تێکەڵ بە هێزی لای ماجید دەبن.

## جەنگی ئاڵپارێز

١- رۆژی ٢/٤ مەلیك بڕیاری دا، کە خۆی چاودێریی ئەم جەنگە بکات. چونکە هێزی میری گەیشتە شانەدەری، بە نهێنی فەرمانی دا بارەگا بگوێزرێتەوە بۆ (چناران). دێی چناران بە چیاوە دەڕوانێتە گەلیی سێبواران. ئێمە لە بارەگا ١٥٠ سوارە و ١٣٠ پیادە مابووینەوە. گەیشتینە دێی چناران. باران ڕەهێڵە دەکات و دێیەکەیش شەش خانووی بچووکی پڕ لە ئاو و دڵۆپە و بێ جێگا و ڕێگایە. کەوتینە سەختڵەتییەکی ئێجگار زۆرەوە. جێگەی وڵاخ و چێشت لێنان، بەر باران و ناو قوڕ بوو. بۆ ئەوەی ئەو سەختڵەتییە سووك بێت، فەرمانم پێ درا، کە بچم و بدەمە کۆمەکی ماجید.

٢- بۆ ئێوارە شێخ محەمەد سەعیدی نزارەیش بە دە سوارەوە هات. ئیتر بڕیار درا کە بچین بۆ (یاسا ماڵ) و فەرمان لە ماجید وەرگرین. باران ماوەی نەدا ماجید ببینم. لەسەر ئەو چیایە

له ژێر باران و بادا ماینەوە. دوای ٣ ڕۆژ چووم بۆ لای ماجید بە پیادەیی. سوپای میریش گەیشتبووە (ناڵپارێز). شەو مامەوە وتی پیادەی شارباژێڕ و شێخ عەول لە هەرزەڵە و کوڵێتان و هەورامیش بە بەری برنجە و ئێمەیش لێرانەوە، سوپاکەمان تەنیوە بەڵام سەرکەوتن بۆ کێیە نازانرێت. ئەو شەوە بەبێ ئاگر لە پەنا با و کون و قوژبندا لەسەر قوڕ و ئاوا و لە ژێر باراندا ڕامان بوارد. لە ڕۆژهەبووندا باران بڕا. لە تەپۆڵکەی بەر ڕێگا و بە دیوی ئەدیودا خۆمان تێدا پەنا دابوو دوژمن دۆزیبێتەوە لە ناکاو گوللە تۆپێکی لێ دا، ڕامان کرد، بە ڕاستی پەلێکی ناگەهانی بوو تلۆری کردینەوە. ئیتر کەمی نەپسانەوە نزیکەی دە گوللەی لێ دا، زۆر شپرزە بووین. چونکە هێشتا تۆپ لە کارا بوو، دوو فڕۆکەیش گەیشتە سەرمان و ئەویش بە بۆمبا و مەترالیۆز گاڵەی پێ کردین. ئەحەی بەکر بە خۆی و ئەسپەکەیەوە و بە بەرچاومانەوە بە مەترالیۆز ئەنجن ئەنجن کرا. زۆر ترسمان لێ پەیدا بوو، کە ئەم تەڕەستی و هەڵمەتە بۆ هاتنی سوپاکەیشی بێت بۆ گرتنی پێنجوێن. ئێمە هیچمان پێ نەکرا و توانای بەربەستیمان نەدەبوو چونکە چەکی ئێمە تەنیا تفەنگ و بە فیشەکی کەمەوە و هێزێکی پەراگەندە و کەم، لەم کاتەیشدا نەماندەتوانی بجزووینەوە و پەك بگرین. چونکە فڕۆکە ماوەی نەدەداین. تا سەعات (١٠)ی پێش نیوەڕۆ ئێمە لە ئەندێشە و ئەشکەنجەدا ڕامان بوارد و سوپای حکوومەتیش گەیشتە ناڵپارێز.

٣- فڕۆکە نەما، سوپایش نەهات، کۆبووینەوە. ماجد زۆر مات بوو. وتی من هیچ هیوام نییە بە سەرکەوتن. ئەوەی بە تۆم وت، کە هەر چوار لامان تەنیون، لەسەر فەرمانەکەی مەلیك وتە کێ دەڵێت ئەو لەشکرە وا بە زوویی فریامان دەکەوێت؟

٤- منیش بە دڵێکی سارد و ناخۆشەوە ماجیدم بەجێ هێشت و بن دار و بن دار بە چیادا هەڵگەڕام. تا گەیشتمەوە لای شێخ محەمەد سەعید، وتی ماون؟ چۆن ڕزگارتان بوو؟ بەڵام من ئەوەندە ماندوو بووم، کەوتم، چونکە ڕێگاکە زۆر و دوور و چیاکەیش زۆر کوێر بوو و ترسی فڕۆکەیشم هەبوو بێت و بمبینێت. لەم کاتەدا پۆستەیەکی شێخ عەول هات، کە بۆ مەلیك نووسرابوو. لەشکر بە زیادەوە گەیشتبوونە جێگە پێسپێراویان. دەستبەجێ گەیاندمە ماجید و داوای پرۆگرامی جەنگم لێ کرد.

٥- لە وەڵامدا وتی لەشکری هەورامیش گەیشتووە. بەڵام ژمێرەیان نە من و نە تۆ نە خۆیان دەزانن. ئێجگار زۆرن عەرزی مەلیکم کرد. بڕیار وایە تا ئەوان نەبزوون ئێمە پەلاماریان نادەین. بام سوپاکەیان مۆڵ بدەن، بەڵام شێخ عەول نابێت ڕێگەی هاتنی هیچی تریان بدات، زۆر وریا بێت. وەڵاممان داوەتەوە تا پرۆگرامی دووەم ئاگادار دەکرێن.

٦- لە ناکاو کابرایەك هات بەم مۆژدە ناخۆشە ئەژنۆمانی شکاند. وتی سوپاکەی ملەکەوە

ڕێگەی ئەدام زووتر بگەم ،بەسەر چیا و شەقامەکاندا بڵاوبۆتەوە، ئێجگار زۆرن، ئێمە وامان زانی لە شارباژێڕەوە سوپای میری هاتووە و پێنجوێنیشی گرتووە، ئیتر ڕێگەمان تەنیا ڕێگەی هەورامانە و کەوتینە مقۆ مقۆ کەچی لە پاش ماوەیەکی کەم وتی: لە بیرم چوو عەزیز ئەفەندی سلاوتان لێ دەکات. ئینجا تێ گەیشتین، کە پیادەیەکی خۆمانە و عەزە زرە و حیکمەت و ڕەمزی و ئەوانی ترن پاشداری ئێمەن.

کانی مانگا

ژمارە ١

ڕۆژی ٣/٤/١٩٢٧

بۆ هەموو فەرماندەکانی سوارە و پیادە، بە نهێنییەوە.

لەسەر فەرمانی مەلیك و باش قوماندان، بە پێی ئەم مادانەی خوارەوە حەرەکەتکردن زەروورییە:

١- پیادەی شارباژێڕ و لەشکرەکەی خۆی لە ژێر فەرماندەی شێخ عەولدا لە کانی مانگاوە تا کوڵێتان.

٢- سوارەی مەعییەت بە فەرماندەی ئەحمەد خواجە و شێخ محەمەد سەعید لەگەڵ سوارەکانی خۆی، ملەکەوە و کانی مانگا و پاساماڵ.

٣- پیادەی هەورامی لە بارەگاوە فەرمان وەردەگرن.

٤- تا لە لایەن ئێمەوە تەقە نەکرێت، لە هیچ لایەکەوە جەنگ دانامەزرێ.

٥- ناوی نهێنی (ئازادی)یە.

ماجید

قوماندانی سوارەی سوپایی

ئەم ڕاپۆرانە بەبێ دەستکاری پێشان ئەدەین:

بۆ جەنابی ماجید ئەفەندی

سەلام ڕەسایەنم، ئێمە هاتین لە برنجە تفنگچیمان بەرامبەر بە دوژمن لە سەنگەردایە. بەدرێژیی ناوی سێبواران دامەزراوین بەشەو و ڕۆژ مەیدانی حەرەکەتیان نادرێت چاوەڕێی فەرمانی ئێوە و حەزرەتی مەلیکین.

محەمەد ئەمین مەحموودخانی دزڵی     عەبدوڵڵا مەحموودخانی دزڵی

بۆ قوماندان ماجید ئەفەندی

لە ڕاپۆر و تەرتیباتەکەتان دڵخۆش بووم. بە باش بینرا تا ئەوان حەرەکەت

نەکەن ئێوە نەچنە جەنگەوە، شایەد گەڕانەوە مەیدانیان بدەن با بڕۆن شەڕیان بوو خۆیان. خافڵ مەبن لە ڕاپۆر نووسین.

مەحمود

١٩٢٧/٤/٦

هێزەکەی حکوومەت دەستی کرد بە بزووتنەوە و جێگای بەرز گرتن. هێزی شێخ عەول ناچار بوو بە بەریەستیان. لە ماوەی نۆ ڕۆژا زۆر تەنگاو کران. خواردەمەنییان هاتە کزی. ڕێگای دواوەیان بەستراوە هیچیان پێ ناگا. بە ڕۆژ لە بووسەدا بوون بە شەویش هەرچی یەکێکیان بچوایە سەر ئاوەکە دەکوژرا. هەورامی بوارەی نەدەدان بە تایبەتی لە پاشدارەکانیان، کە پۆلیس و بەکرێگیراوانی کورد بوون. زۆر دەکوژران.

کانی مانگا

ژمارە

ڕۆژ ١٩٢٧/٤/٧

بۆ پێشگاهی باش قوماندان

دەستتان ماچ ئەکەین

ئەمە خولاسەی ڕاپۆری هێزەکان و فەرماندەی کاتییانە:

١- لە لایەن هێزی شێخ عەولەوە زۆر بەشیدەت دوژمن تەزییق کراوە. لاشەی دە پۆلیسی کوژراو نێژراوە و تفەنگەکانیان دە تفەنگی ئینگلیزی لەگەڵ یەک ئەسپ بە زینی کوردییەوە هێنراوە.

٢- تەیارە بوار نادات، تەنیا بە مەترالیۆز دەجەنگن.

٣- لەوەپێش ئەحەی بەکر بە ئەسپەکەیەوە کوژرا. شێخ عەلی باراویش، کە خۆی چووبووە سەریان، ئەویش کوژرا لاشەکەی هێنراوەتەوە.

٤- تەقەی هەورامی زۆرە، دەڵێن زۆر پەرێشانیان کردوون چونکە مەقەڕی سوپاکەیان بە تەواوی بەرامبەر بە هەورامییەکانە، کوشتاری عەسکەر زۆرە.

٥- تۆپیان کارمان لێ ناکات. ئیشاڵڵا موەفەقیت و سەرکەوتن هی خۆمانە چاوەڕێی فەرمانتانین.

ماجید

ق. سوارە و پیادە

**ئەنجامی گیرۆدەبیی سوپای میری و جەنەراڵ براون**

سوپای میری لە چوارچێوەیەکی سەختدا، بوون بە تەڵەی سوپای کوردەوە. فەرماندە (جەنەراڵ براون) تێ گەیشت کە لەو جێگایەدا، گۆڕەوشار دەدرێن. پاش ۱۸ ڕۆژ مانەوەیان لە ئاڵھاریزا ئەم نامەیەی نارد بۆ مەلیك و باش قوماندان شێخ مەحموود.

پوختەی نامەکە

حەزرەتی شێخ مەحموود ئەفەندی

لە پاش حورمەت و سەلام. ئێمە بۆ جەنگ نەھاتووین، ھاتووین بۆ موناوەرەیەکی عەسکەری و ڕێبوارین. بە تەواوی باوەڕم بەھێز و دەسەلات و نیزامتان ھەیە. تکا دەکەم ڕێگامان بدەن بچینەوە بۆ سلێمانی و بۆ ئەوەی (دکتۆر شەوا)، کە خۆتان داواتان کردووە بگاتە خزمەتتان. بۆ پێشەوە ھاتنمان موساعەدە بفەرموون چونکە دێت بۆ تەداویی تەیارەچییەکان، ئەمەیش کاغەزی موفەتیشی ئیداریی سلیمانییە تەقدیمتان کرا.

جەنەراڵ براون

موخلیستان

ئەم نامەیە لەسەر داوای شێخ مەحموود بۆ ناردنی دکتۆر بۆ بینینی تەیارەچییەکان لەوەپێش نووسراوە بەڵام شێوەی ئەم نامەیە لەوە ناچێت، کە دکتۆر شەوا خۆی بیھێنێت و چاوەڕێی وەڵام نەکەن. وا دیارە ئەم سوپایە وایان نیاز بووە کە خۆیان بێن لەگەڵ تەیارەچییەکان شێخ مەحموودیش بە کەلەبچە کراوی ببەنەوە بۆ سلێمانی. بەڵام ھەڵمەت و جەنگاوەریی کورد تێی گەیاندن بە پاڕانەوە ڕزگار دەبن، نەك بە فرۆکە و تۆپ.

نامەی جەنەراڵ براون گەیشتە بارەگای مەلیك، دەستبەجێ گەڕایەوە بۆ وڵە ژێر و ئەم فەرمانەی نارد بۆ ماجید:

بۆ قوماندەی سوارە و پیادە ماجید ئەفندی- کانی مانگا

چاوتان ماچ دەکەم، تەبریکی موەفەقیتان دەکەم

ئیمڕۆ لە جەنەراڵ براون قائیدی سوپای حکوومەت کاغەزێکم وەرگرت. ئەوا بۆتانم نارد بیخوێننەوە و بەم پێیە حەرەکەت بکەن:

١- ڕێگایان بدەن بێن بۆ دەشتی گەلکە.

٢- لە ملەکەوە، پشتی پێنجوێن، کیلو مسوەد، تەرتیبات بکەن بۆ ئەوەی تەجاوز نەکەن.

٣- تەبریکی موەفەقییەتم لە شێخ عەول و عەبدوڵڵا بەگ و محەمەد ئەمین بەگ کرد.

٤- پاش هەموو تەرتیبات لەگەڵ ئەحمەد وەرنەوە بۆ پێنجوێن. سەلام لە شێخ محەمەد سەعید و براکانی دەکەم. خوا بیانهێڵێت.

٥- خۆم ڕۆیشتمەوە بۆ (وڵە ژێر).

٦- خۆت و یەك سوار بچن. دکتۆر شەوا وەرگرن و بیهێنن بۆ (وڵە ژێر).

٧- ئەم نامەیەیش بدەن بە جەنەراڵ براون لە وەڵامی نامەکەیدا.

مەحموود

١٩٢٧-٤-١٧

عەزیزم جەنەراڵ براون

نامەکەی پەیغامی ئیخلاسی ناچاریتان گەیشت، فەرمانم دا بۆ یەك شەو ڕێگاتان بدەن. فەرموون وەرن بۆ دەشتی گەڵکە.

مەحموود

مەلیك و سەرکردەی گشتی سوپای کوردستان

١٩٢٧-٤-١٧

سرپیە

کانی مانگا

١٩٢٧-٤-١٨

بۆ قوماندانی پیادە: ڕەمزی

بۆ قوماندانی پیادە: ڕەشید

لەسەر فەرمانی باش قوماندان تەبلیغتان دەکەم:

١- ڕەمزی، لە ملەکەوەوە تا چوارباخ.

٢- ڕەشید لە چوارباخەوە و پشتی پێنجوێن تا شێخ ئەحمەد.

٣- جەلال و عەزیز ئەفەندیش حالەن ئیلتیحاق بە هێزەکەی ئێوە دەکەن، تەبلیغیان بکەن.

٤- بەبێ وێستان تەرتیبات و دیفاع دەکەن و هەموو ئەوامرێك لە ئێمەوە پێتان تەبلیغ ئەکرێت. چاوەڕێ بن.

٥- ڕێگای جێشەکە دراوە دێن بۆ گەلکە.

بۆ جەنابی شێخ عەول

بە پێی فەرمانی مەلیك و باش قوماندان، ڕێگە درا بە دوژمن بگەنە (گەلکە)، ئێوە زۆر بە وریایی بە دوایاندا دێن بۆ پێنجوێن، یان شوێنێکی تر، بێجگە لە گەڕاننەوەیان بۆ سلێمانی. بە عەکسی ئەم ئەمرە مەنع بکرێن.

ماجید

١٨-١٩/٤/٢٦

بۆ موحتەرەم   جەنەراڵ براون

حورمەت

ئەوا وەڵامی نامەکەتان بۆ نێررایەوە:

لەسەر تەڵەبی خۆتان. وە عەدەم مودافەعەتان. لە لایەن حەزرەتی مەلیك و باش قوماندانەوە ئەمر سادیر کرا، کە سوپاکەتان بێتە دەشتی گەلکە و بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی.

منیش دێم دکتۆر شەوا وەردەگرم.

ماجید

١٩٢٧/٤/١٩

دکتۆر شەوا بۆ وڵە زێر

خوێنەواری بەڕێز

هێزی میری لە فەرمانەدەی جەنەراڵ براونی لەندەنیدا لۆش لۆش بەسەر دار و ملەکەوەدا شۆڕبوونەوە بۆ گەلکە، جێ هەوارگەی کۆچەری کوردی دلێر.

لە پێنجوێنەوە دیاریی سوپای کورد بۆ جەنەراڵ براون خواردەمەنی بوو. هەر ئەو شەوە، لە شاربازێڕەوە گەڕانەوە بۆ سلێمانی.

بە نومایشێکی زۆر پەسندەوە دکتۆر شەوا گەیەنرایە (وڵە زێر). فرۆکەوانەکانی بە بەرگی کوردی و لەش ساغیێکی زۆر باشەوە بینی. زۆری پێ خۆش بوو لە بابەت ڕابواردنی سوپاکەیانەوە لە ناڵهارێن، دکتۆر زۆر شتی ناخۆشی گێرایەوە. شێخ مەحموود پێی وت: بۆچی ئینگلیز حەقی ئەم قەومە بە وەفا و دلێرە نادات و ئیستیفادە لەم خاك و گەلە بکات؟

دکتۆر (شەوا): داخەکەم من سیاسی نیم. بەڵام دەزانم ئینگلیزە سیاسییەکان، کە لە کوردستاندان، هەموویان ئەحمەقن.

براون دەڵێت ئەم هێزەی بەرامبەرمان دەجەنگن هەموویان موبەرەبن، عەسکەرن. زۆر تەقدیری دەکردن و هەموو کارەساتەکەی بە تەواوی نووسییەوە.

پاش یەك شەو (شەوا) گەڕایەوە بۆ سلێمانی. زۆر سوپاسی کرد و بە فرۆکەوانەکانی وت. ئێوە ببن بە عەسکەری شێخ مەحموود.

ئەنجامی جەنگی ١٩ ڕۆژ لە ناڵپارێز و سێبواران ئەمە بوو زیانی میری، کە بینراوە: ٨٥ کوژراو ٣٠ بریندار و ١٥ تفەنگ و ٢٢ ئەسپ و ١٤ هێستر. هەندێك فیشەك دەست کەوتووە.

زیانی کورد: ١٠ کوژراو و ٨ بریندار لە جەنگاوەران. ٢ ئەسپ کوژراو.

ئینجا خوێندەواری ژیر و خۆشەویست، لە باسی جەنگەوە با باسی ناوخۆیشتان بۆ بکەین.

## ڕۆژنامەی ژیان

لە کاتێکا کە دەنگمان بە هیچ لایەکدا نەدەگەیشت و دەنگی هیچ جێگا و ڕۆژنامە و چاپکراوی هیچ گەل، حکوومەت و کۆمەڵێکیش نەدەگەیشتە لامان، ڕۆژنامەی (ژیان)، ژیانی سلێمانی، ئەو دانانەی، کە لە لایەن زانا و دانا و لاوەکانمانەوە بە سەرزەنشتی، کۆشش و بیری گەلایەتیی سوپای کورد و مەلیکی مەزنی تێدا بڵاوکرابۆوە، بە سەرماندا دەباری.

لە زاناکانی کوردی شارەکەمان چەند کەسێکیان بوویوون بە شایەری بێ پوول و لۆتیی بێ دەهۆڵ. نازانم چۆن بەبێ لێکدانەوەی ئەنجامی لێدوان، نووکی خامەیان دەخەنە کار. بێ چاوێنی بن. مێشکی وشکیی خۆیان و بیری پڕ ژاراویان دەهێننە جۆش و بە قسەی پڕ و پووچ و بەنگیاوی ساردی بێ خوێ، ڕۆژنامەی (ژیان)یان پێ ڕووڕەش دەکەن. بەڵام داخەکەم کابرای ئینگلیز بە تازەکردنەوەی عەبای ڕەنگ چواوە و دۆق دڕاوەکەیشیان دڵخۆشی نەدەکردن با هەر وا بزانن، کە هەر بەدکاری بەرامبەر بە گەلەکەی خۆی تەنیا تالیکی زیاد دەبێت، نازانن تۆڵەی گەل، لە نیشتمانەکەیاندا ڕسوایان دەکات.

نازانم چۆن و بە چ دڵ و ڕوویەکەوە ئەو کەسانەی خۆیان بە خوێندەوار و چینی زانا دەزانن، چاو لە ڕاستی دەپۆشن، تەنیا بۆ دەستکەوتنێکی بێ فەڕ یان خۆ ڕسواکردن بە قسەی هەڵەق و مەڵەق؟ ئایا ئەو نووسەرانە نازانن، کە ئەو شۆڕشە و شۆڕشگێڕانە لە ساڵی ١٩١٩ەوە تا پاش فەرموودەکانیان لە شۆڕش و داوای ئازادیی گەلەکەیاندا، دەچەوسانەوە و لەو کاتەیشدا نووسەری نەزانینیش یان لە دوو لانەی لێفەی مەخمەڵ، یان بە دیار پێکی لێوا و لێوەوە بە چاوشۆڕی لێکدانەوە و ئامادەکردنی هەرزەگۆییان بۆ دروستکردنی شەقامی خۆبردنە

بێشەوەی لای خاوەن پارە و دوژمنی گەلەکەیان خەریك بوون. داخەکەم.

بەلام، بۆ ئەو داناو دانشمەندانەیە کە لە پێناوی بێگانەدا سەربەرزیی خۆی و گەلەکەی بۆ سوودێکی کاتی دەخاتە ژێر پێی مژەر، کە مایەی ڕەنجەڕۆییە. ئێستە نەمویست لێرانەدا ناو و نووسینەکەیان بلاو بکەمەوە. هیوادارم، کە وێنەیان لە نیشتمانەکەماندا نەمێنێت. خۆ زۆر باش حیانزانی لە باوی ئازادی و شێخ مەحمووددا بە ناوی گەل و شۆڕشەوە ڕۆژنامەی بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، بانگی حەق، ئومێدی ئیستیقلال لە سلێمانیدا دەردەچوو و بە هەموو لایەکدا بلاو دەکرایەوە.

سالاروالدەولە (سالار الدولة) من لە (ریخەلان)، دێ پێ سپیرریو و کەمانەوە گەڕامەوە بۆ وڵە ژێر. شێخ مەحموود لە پشت مالانەوە (لە هەوارە بەرزە) وێستابوو، لەگەڵ گەیشتنم نامەیەکی بۆ هاویشتم، بیخوێنەرەوە. بە فارسی نووسرابوو لە لایەن (سالار الدولة - وەلی عەهدی شاهەنشاهی قاجاری ئێران)، دەڵێت: ئەوا من [سنە لە] ئێران دەسێنمەوە. تۆیش دەکەم بە والیی سنە دەسبەجێ بە لەشکرتەوە تێکەڵ بە سوپاکەم ببە. شێخ مەحموود وتی: ئەوا گەیشتین بە ئاوات. ئیستیقلالی کوردستان بوو بە والیەتیی سنەیی. شارە بە ناویانگەکانی خۆمان، من دڵتەنگی ئەوە زیاترم، کە سوپاکەی تەنیا کورد و چەکداری کوردە، کە لەو پێناوەدا لە ناو دەچێت و هەموو کۆششەکەی، کە بۆ هەورامان و مەریوان لەگەڵ شادا بەکارم هێناوە چوو بە با، نای کوردی بەدبەخت، نۆکەری بێگانە. ئەگەر سالار بوو بە شا چیتان دەست دەکەوێت. ئایا لە ڕەزا شا باشتر دەبێت؟ هەر کوردی تێدا دەچێت.

من کە تێ گەیشتم، شێخ مەحموود ئەم کارەی پێ خۆش نییە. چووم دەستبەجێ سوار بووم بە تەنیا سوارێکی ترەوە ڕۆیشتم بۆ (ڕەزاو). ئێوارە کاتژمێر نزیکەی (٤ بوو) شەو لە (تفلی) لای حەمە عەلی بەگ و بە تەواوی لە کار تێ گەیشتم و لە ڕۆژەوەبووندا گەیشتمە بەر کەپری قازی مەلا محەمەد عەلی. پیاوێکی تێگەیشتوو، فەرمووی: سالار هار بووە. لەشکری هەورامی و مەریوان و لهۆن هەمووی لەگەڵە. خۆیشی بە تفەنگێك و قەیارە و دەمانچە و خەنجەرەوە ئامادەیە. زۆر ئاگادار بە چونکە دەست ناپارێزێت، ژیرانە بدوێ. گەیشتمە ژێر ساباتەکەی حسێن خان سالار، بە تەنیا لە لای ژوورەوە دانیشتبوو. زۆر ڕێزی گرتم. بەرچایی خواردن، وتم ببوورە، سەرۆکەکان دەبینم. هەموومان کۆبووینەوە. وتم: تەنیا ئێوەی تێدا دەچن و شێخ مەحموودیش بڕیاری داوە لێقەوماوەکانی شارباژێر بێنێتە جێگاکانی ئێوە، مادام ئێوە دەچن بۆ سەر ئێران. یەکەم کەس مەحموود خانی دزڵی و هەروەها مەریوانیش تەهلی گەڕانەوەیان لێ دا، بەلام جەعفەر سان وتی من دەچم تاران دەگرم و شێخ مەحموود ئەگەر توانی... ئەسپەکەم بگرێت. منیش لە ترسی سالار خۆم زوو دەرکرد.

جەعفەر سان چوو. وڵاتی کوردانی ئێرانیان وێران کرد، بەڵام بە چەشنێك بە شکان گەڕانەوە. نە ماڵ نە ئاوایی، کورد ئەمجارە بە دەست سوپای ئێرانەوە نەما، بە سووتان، تاڵان، کوشتن ڕەچەڵەکی کوردی هەورامانی لە بن هێنا. دواییش جەعفەر سان بە ئاوارەیی لە سلێمانیدا دەسووڕایەوە و نە سانی و نە خانیی نەما. زستان هات، سەرما و بەفر و کرێوە سەرەتای دەرکەوت، ئیتر مەریوان بۆ ئەو لەشکرە زۆرەی پیادە و سوارە و خێزاندارەکان بە کوڕ بینرا. سوارە بۆ شارەزوور و دیوی سلێمانی، پیادە بۆ شارباژێڕ و دێهاتی پێنجوێن بڵاوە پێکران و دامەزراندنیان فەرماندرا.

بارەگا چووە پێنجوێن، پرۆگرامی بەڕێوەچوون و خواردەمەنی و پێویست بەجێ هێنرا و ئەو دێهاتەی، کە جێگەی سوپاییە پیادەکەی هەیە، دیاری کرا. لەم کاتەدا بە هۆی شەیخولئیسلام (شێخ الاسلام)، کە لە دێی (سێف)ی مەریوان دادەنیشت، نامەیەکی یاسین پاشا، وەزیری دارایی هات بۆ شێخ مەحموود. لە نامەکەدا دەڵێت: «دەست لە یاخیەتی هەڵگرە و ئیتاعەتی قانوون بکە».

شێخ مەحموود، هیچ پێی ناخۆش نەبوو. وتی وەڵامی ئەم نامەیە نانووسمەوە. ڕەنگە ڕۆژێك بێت یەکتر ببینین و وەڵامی دەدەمەوە.

پاشا لە دڵ و دەروونی خۆیەوە ئەو نامەیەی نووسیبوو و ڕەنگە زۆر بە باشی زانیبێت چونکە بە پیاوێکی باش و تێگەیشتوو ناودەبرا، بەڵام بە ملکەچی قانوون. چونکە خۆی کە گەڕایەوە بۆ عێراق بێجگە لەوەی لە لای ئینگلیزەکان کەوتە ڕوو، گەیشتە پایەی وەزیری و سەرۆك وەزیران و خاوەن زەوییەکی ئێجگار زۆر لە لیوای بەعقووبە وە کۆشك و کاشانەی باش. بێگومان ئەم دەستکەوتەی لە ڕووی دانایی و ژیرییەوە نەبوو. جا بۆ ئەو نامەیەش، هەروەکو ئەو هەڵکەوتانەی، بۆ ئەم هەڵکەوتەیشی شێخ مەحموود بگێڕێتەوە ڕەنگە تێ کۆشابێت، کە بیکات بە هونەری خۆی.

وتمان یاریدەدەر و یارمەتی لە هیچ لایەکەوە نەبوو و بە درێژیی ئەو ساڵانەی پێشوو بە دارایی خۆی شێخ مەحموود شۆڕش و لەشکری بەڕێوە دەبرد. بە بۆنەی شۆڕشەوە فڕۆکە و بۆمبای ئینگلیز ماوەی لادێییەکانی نەدەدا، کە لە چاندگە و زەوی و زارا تێ کۆشن. کشتوکاڵ زۆر لە کەمی بوو. هەروەها دێهاتەکانی خۆیشی لە بازیان و قەرەداغ و شارباژێڕدا بە بەیاری مابوونەوە. سەرەڕای ئەم سەختییە، ئەمبارەکانی بە چۆڵی و دەرگا کراوە بەرەڵا کرا. تەنیا لە داریکەلی بەشی یەك کاروان برنج و گەنم مابوو ئەویش هات، بێگومان ئەم هۆیانە زۆر کاریگەر بوو بۆ درێژەی شۆڕش و هێز و تینی شێخ مەحموود. دێهاتەکان زۆر پەرێشان بوون. جووت و گا نەما. ڕۆژێك هاتینە شێخ ئەلمارێن، من لە ماڵی کوێخا بووم بانگی کرد: ڕێحان،

ئەگەر نانمان هەیە بیهێنە و پیازێکیش سەربڕە. ئەمە بوبوو بە خۆراکی میوانی خۆشەویست. ئەگەر ئەویش دەست بکەوتایە.

### پێنجوێنییەکان

لە پێنجوێن، دەستوبردی بازرگانی، زۆر بە باشی دەڕۆیشت و ئەم چەند ساڵە بێجگە لە میواندارییەکی کەم، هیچ سەختییەکیان نەدەخرایە سەر. لەم کاتەدا لە پاش ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانیان کردم، بڕیاریان دا وەکو پێشوو باجی گومرگی بدەن، چونکە بەبێ ترس و ڕێگیرییان لە ئێرانەوە بۆ عێراق و لە عێراقەوە بۆ ئێران بابەتیان دەبرد و دەهێنا و دەیەکی کشتوکاڵیشیان نەدەدا.

بەبێ پێوتن یارمەتییان هێنا. لەشکر ٥٠ کیسە لەگەڵ ١٨ سندووق چا و ١٥ تەنەکە ڕۆن و ١٥ گونیە برنج و ٥٠ گونیە گەنم و ٣٠ تۆپ قوماشی خاکی و ٢٠٠ گۆرەوی و پێڵاو و ٢٠٠ کڵاو جامانە و ٢٠٠ کورتەك و ٢٠٠ فانیلەی خوری. بێجگە لەم یارمەتییەیش بەڵێنی بەخێوکردنی ٥٠ سەربازیان دا و گەڕامەوە بۆ (وڵە ژێر).

### ژیانمان

شەو لەگەڵ ماجید و هاوڕێکانمان ٩ کەس لە ژوورێکدا دەژیاین. ئیشوکاری خۆمان وەکو چێشت لێنان، قاپ و مەنجەڵ شتن و گەسکدان، هەموو پێویستێکمان خۆمان بەجێمان دەهێنا. بەفر ئێجگار زۆر باریبوو، سەرما و زوقم پێچی داهوویینە ناو ژووری پڕ لە دووکەڵ و تاریك و بە ماندوویەتییەکی زۆر لە پێنجوێن لە ناخۆشیدا ڕامان دەبوارد. بەڵام هیوامان زۆر گەورە و دڵ قایم بووین بە گەیشتن بە ئاوات. ماجید وتی: ئێمە دەبین بە چی؟ کەی و چۆن چارەیەك بدۆزینەوە؟ بێگومان وەڵام نەبوو.

بە ناخۆشی و دڵتەنگی گەیشتینە مارت، مارتی ١٩٢٧. گەڕاینەوە بۆ (وڵە ژێر). ماجید کزبوو، تای هەبوو. پاش چەند ڕۆژێك کەوت و تووشی گرانەتا (تیفۆ) بوو. نزیکەی ٢٠ ڕۆژ من لە لای جیا نەدەبوومەوە و چاوەڕێی مردنی بووین. بەڵام وردە وردە ڕووی کردە باشی. نەمدەوێرا فەرامۆشی بکەم، نە دەرمان و نە پزیشك دەست نەدەکەوت.

مەحموودخانی دزڵی هات. وتی: من لەگەڵ حکوومەتی ئێران ڕێك کەوتمەوە، بڕیارم دا، کە نە کانی سانان و نە خانی کانی سانان نەمێنێت. شێخ مەحموود، وەڵامی نەدایەوە، لە پاش ماوەیەك فەرمووی ئەم کابرا کەللەڕەقە ئەم کارەی کردووە و دوایی بە ژیانی ئێمە دەدات.

مەحموودخانی کانی سانان زۆر لە ئێران دەترسا. قسەکانی خانی دزڵیشی بیستەوە. داوای

له شێخ مەحموود کرد، کە بە خێزانەوە بینێرێت بۆ دێهاتەکانی پێنجوێن. ماجید زۆر باشیش نەبوو، هەردووکمانی نارد. کۆچ و ماڵی خانی کانی سانانمان گەیاندە دێی (مرانە)ی نزیک پێنجوێن و گەڕاینەوە بۆ (وڵە ژێر) و شێخ مەحموودیش لە (وڵە ژێر)دا مانەوەی بە باش نەدەبینی چونکە بە تەواوی بەرامبەر بە (قەڵا)یە و تەنیا (گۆلی زرێبار) لە ناوەندایە. دیسان بڕیاردرا، کە کۆچ بکرێت بۆ (برنجە) و بەشی (پێنجوێن). خێزانی ئاوارە و لێقەوماو، ژن، مناڵ، پیر، کەلوپەلی لە ناو دار و بەرد، شیو و دۆڵدا کەوتوو، مۆڵ درا. چیای پشتی دێی نژمار بوو بە شاری ئاوارە و سەر لێشێواو. نزیك نیوەڕۆ خانی دزڵی هات، وتی: سوپای ئێرانم گەیاندە (قەڵا). شێخ مەحموودیش بە دڵێکی پڕ پەژارەوە، پیرۆزبایی لێ کرد و پێی وت، ئەم ڕۆژە ڕۆژی لەدایکبوون و ناشتنتە. ڕۆیشتەوە بۆ دزڵی. ئێمەیش کۆچ و بارمان گەیاندە برنجە. بەڵام ماجید دووبارە کەوتەوە.

لە کاتێکی زۆر سەخڵەتیدا بووین. دوو سوار ماجیدیان هێنا. زۆر پەرێشان بوو، دیسان گرانەتایەکەی گەڕابووەوە. من هیچ هیوای ژیانیم نەما و زۆر تەقەلامان دا، کە بە زیندوویێتی گەیاندمانە دیوی پێنجوێن. پاش ئەوەی، کە ماجیدم گەیاند و جێگەم بۆ ڕێك خست، شێخ مەحموود فەرمووی، بە تەنیا سوارە بچۆ بۆ قەڵا بزانە سەرلەشکر کێیە. پێیان بڵێ ئەپەڕنەوە خاوەن خێزانین، ناچار دەبین بە بەربەستنیان و تا دەتوانیت ماوەی چوونیان مەدە بۆ کانی سانان. چووم بۆ قەڵای مەریوان، گەیشتم. ئەفسەرێك هات بە پیرمەوە، پرسیارم لێ کرد وتی: سەرلەشکر عەبدوڵڵا خانە چوو بۆ کانی سانان. لەوێوە، دوای کەوتم بەڵام من گەیشتمە بەر دێی دەرەتفی، ئەوان سووتانیان. لە چۆڵی لەگەڵ فەرماندە ناسیاویم کرد. بە بینینی من، کە ڕاسپێرەی شێخ مەحموودم پێ گەیاند زۆری پێ خۆش بوو وتی: من فەرمانم پێ دراوە، کە هەموو فەرمانێکی شێخ مەحموود بەجێ بێنم. کانی سانانمان بەجێ هێشت. لە بەر ئاوایی (وڵە ژێر) جیا بووینەوە. گفتوگۆمان بە تەواوی کرد و ئەوەی پێم وت بیستی و گەڕامەوە بۆ برنجە. شەو بوو زۆر تاریك. لەگەڵ گەیشتنم هەموو بینراو و بیستراوم گێڕایەوە بۆ مەلیك.

## ماڵ و خێزان

شێخ مەحموود لە شەپۆلی ماتەمیدا گینگڵەی دەدا. نەیدەزانی چۆن ڕۆژ دەکاتەوە. وتی: ئێستە ئێمە لە چۆڵ و چیای خوادا دەژین. ئەم بستە خاکە نە ئێرانە و نە عێراق بەڵام بە ناو کوردستانی ئێمەوە هی عێراقە کە ئێستە مافی ئێمەی پێوە نییە. پاش دوو ڕۆژ مەحموود خانی دزڵی هاتەوە. ماڵ و کۆچی بار کرد بردنیەوە بۆ دزڵی. لە دەربەندەوە تا ئاوایی لە ژێر دار و کەپرا مۆڵمان دا. خواردەمەنی و پێویست زۆر بە ئەرك دەست کەوت.

**موایبی شۆڕش**

نه بابەت مادەکانی حکوومەتەوە، که لەوەپێش ناردبووی و پەسند کرابوو، ئێستە ئەو ئاواتە بەسەرچوو. ناچاری تازەکردنەوە بووین. بڕیاردرا، که لەسەر ئەو مادانە ئاشتی بێت و بابا عەلی بنێررێت بۆ بەغداد بۆ خوێندن. شێخ مەحموود خۆیشی لە یەکێك لە دێهاتەکانی بە بێمنگی دانیشێت.

بۆ ئەوەی یەکێك لە ئێمە ببێت بە هاوڕێی بابا عەلی، هەموومانی کۆ کردەوە لەو ترسەی، که هێشتا لێبووردنی گشتی لە لایەن حکوومەتەوە بڵاو نەکرابۆوە. هەموویان وەڵامی نەرێیشتنیان دایەوە، بەڵام من بۆ چوون و شێخ مەحموود سوپاسی کردم. هەر ئەو ڕۆژە، وەڵامی حکوومەت نووسرایەوە و لەگەڵ بابا عەلی کەوتینە ڕێ بۆ پێنجوێن.

گەیشتینە ئاسناوا، ماجیدیش هات و پێمان گەیشت. وتی بمزانیایە تۆ دێیت، ئەو کاتە منیش لەگەڵتان دەبووم. وامان دەزانی لەگەڵ گەیشتنمان بە سلێمانی لە بەندیخانە توند دەکرێین، زۆر سوپاست دەکەم کە تۆ لەو باوەڕەدا نەبوویت.

بۆ ئەوەی لە مادەکان و درێژەی باسەکە بەتەواوی تێ بگەن (تأريخ الوزارات العراقية – السيد عبدالرزاق الحسني لاپەڕە – ١١٤ بەرگ ٢) بخوێننەوە، کە شێخ مەحموود وتی: ئەو وەعدەی کە بەریتانیا بڕیاری دا بۆ بەجێهێنانی داوا پێویستییەکانی کورد بەجێ بێنن، کە مافی کوردە، مادەکانی ئیمزا دەکەم بەڵام مەندووبی سامی گوێی نەدایە ئەم داوایە و پاڕانەوەی نە مەزن و نە گەلی کورد.

ڕەزا بەگ بەڕێوەبەری ناحیەی پێنجوێن بوو و تازە هاتبوو زانیبووی، کە ئێمە میوانین. پێنجوێنییەکانی ناردبوو بە پیرمانەوە و لە چوارباخ مەرێکیان لە بەر پێی بابا عەلی سەربڕی. بڕیارمان دا، کە نیوە ڕۆژە لەسەر کانییەکەی چوارباخ بخوێین. ئەو مەڕەیش کە سەر بڕرا گلی بدەینەوە و خۆمان بیخۆین. حاجی میرزا عەبدوڵڵا وتی ئێوارە میوانی ڕەزا بەگ دەبن. ئیتر تا ئێوارەماینەوە و شەو میوانی ڕەزا بەگ بووین. زۆر میواندارییەکی بەڕێزی کردین. ١٦ حوزەیران ١٩٢٧.

ڕۆژی دوایی، موفەتیشی ئیداری (لاین[1])، ڕەئیسی ئیجرائی موهەندیسی ئەشغال (پۆڤر[2])، بە فڕۆکە هاتن. ئێمەیان داواکرد، پاش بینین وتیان نەك کوردەکان بڵێن بە حەپسی بردیانن، بە فڕۆکە ناتانبەین. خۆتان بە ئارەزووی خۆتان وەرن بۆ سلێمانی، گەیشتینە وڵیاوا. لە

---

١. کۆلۆنێل لاین

٢. مێجەر پۆڤر

دانیشتوانی سلێمانی زۆر هاتبوون بە پیرمانەوە. شەو لە چنگیان ماینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە لە سلێمانییەوە هاتبوون، گەیشتینەوە سلێمانی و لە ماڵی موتەسەڕیف ئەحمەد ئەفەندیی هەولێری میوان بووین. پاش نیوەڕۆژە خواردن، چوومە ماڵەوە بۆ لای باوکم و خێزانەکانمان. پاش دوو ڕۆژ، ڕۆژێك پێش جەژنی قوربان بردیانین بۆ کەرکووك. جەژنمان لە ئوتێل پالاس کەرکووك کرد.

موتەسەڕیف لە سلێمانی ۲۰۰ ڕوپیەی دامێ وتی لەسەر شێخ مەحموودی دەنووسم. لە یەکەمین ڕۆژی جەژندا لە لایەن فەرماندەی هێزی فڕۆکەی بەریتانیاوە لە کەرکووك بۆ چایی خواردنەوەی ئێوارە بانگ کراین بۆ بارەگای فڕۆکەوانان و بەناو بارەگادا سووڕاینەوە. بینیمان، کە بۆمبای زۆر لە گۆڕێکدا گزرە کراوە و هەڵچنراوە. بابا عەلی بە فەرماندەکەی وت: ئەمە لەو بۆمبایانەیە، کە دەتاندا بە سەر ئێمەدا؟ لە وەڵامدا وتی: بەڵێ. بەلام داخەکەم ئێمە بڵێین چی؟

بەرامبەر بەو چا خواردنەوەیە، لەسەر ویستنی بابا عەلی بۆ ڕابواردنی شەوی دوایی لە ئوتێل پالاس هەموو زابت و فەرماندەکانمان بانگ کرد وا ڕێك کەوت، کە من تایەکی زۆر گران بگرم و ئەوەیش لە دوو ئاوایی و هەوا گۆڕینەوە بوو. ئەو شەوە لە پارەکەمان تەنیا بیست ڕوپیەمان پێ مایەوە. ڕۆژی پاش دوایی جەژن بە شەمەندەفەری شەو بە جێگەی، (پلە) (۱) من و بابا عەلییان نارد بۆ بەغداد و ماجید مایەوە. نەمزانی بۆچی نەهات. گەیشتینە بەغداد لە ئێستگەی شەمەندەفەری بابولموعەزەم (باب المعظم)، میرزا فەرەج هات پاش خۆش و بێژی، چووینە بەر عەرەبانەیەك کەلوپەلەکەمانی خستە ناو خۆی و ناتێکی بەسرە لەگەڵ بابا عەلی لە ناوەوە و منیشی خستە لای عەرەبانچییەکە، وەکو ئاوارە، گەیاندینیە ماڵی خۆیان لە دوکان شناوە. ئەوە یەکەمین جار بوو بەغداد و عەرەبانە ببینم. شەو میوان و ناسیاومان هات، تێیان گەیاندین، کە کارێکی باشمان نەکردووە بە عەرەبانە هاتووینەتە ناو بەغداد و سەرەڕای ئەوەیش لە ژمارەیەکی زۆر ناسیاو و دۆست هاتوون بە پیرمانەوە، ئێمە خۆمان تێ نەگەیاندوون. شکستە و شوورەییان دەخستە سەر من، بەلام تێم گەیاندن، وەکو کوێر وا بووین و میرزا فەرەج تووشی هەڵەی کردین. ئەم باسانەم بە میرزا وت وتی: با بڵێین مەبەس گەیشتنە، گەیشتن.

ئینجا هەموو ڕۆژێك میرزا فەرەج دەیگوت، مێجەر ئەدمونس مانگانەی بۆ بڕیونەتەوە. بۆ بابا عەلی ۲۰۰ و بۆ تۆ ۱۵۰ ڕوپیە بەلام، بەو ژوانە نەگەیشتین.

سوپاییە ئینگلیزەکان زۆر دەهاتن دەیانبردین بۆ هێندی – مەعەسکەر ڕەشید. زۆر خۆش و پڕ دار و درەخت و هەوایەکی خۆش بوو. لە جێی کۆبوونەوەکەیاندا، لە وێنەی چیادا بە خۆڵ و بورەق چیایەکیان دروست کردبوو. ڕۆژێك فەرماندەی گشتی وتی، ئەگەر ئێستە ئەمە یەکێك لە

چیاکانی ئێوە بێ، کە فڕۆکە هات لە چ جێگایەك و چۆن خۆتان دەشاردەوە؟

بابا عەلی پێی وت: ئێوە چیاکانتان بە بۆمبا کاول کرد ئێستە جێگەمان بۆ نادۆزرێتەوە. کابرا، مات بوو، وتی: ڕاستە.

ڕۆژێك حەمە عەلی فەڕاشی ئەدمۆنس هات وتی، مێجەر دەڵێت کاتژمێر ٥ی ئێوارە بێت بۆ ماڵەوە. چووم، لەسەر مێزێکی گەورە خەریکی نووسین و خوێندنەوە بوو. دانیشتم، پتر لە نیو سەعات بە بێدەنگی دانیشتم زانیم بێ سوودە هەڵستام. وتی: دەڕۆیت، دەستم گوشی. دووبارە وتی تۆ لە کەیەکەوە لەگەڵ شێخ مەحموودیت؟ وتم لە ١٩١٩وە.

– ئەی چۆن تۆیش نەهاتیتەوە؟

+ ئیزنی نەدام.

– بۆچی بە ئیزن دەهاتنەوە؟

+ بەڵێ بەبێ وەسیقە، کەس توانای گوزەری نەبوو

ئیتر وتی سوپاس و سەری داخستەوە و منیش بەجێم هێشت و تا ئێستە تێ نەگەیشتم بۆچی بانگی کردم و ئەو پرسیارەی بۆچی بوو و بۆچی ورتەی لەگەڵ نەکردم.

ئێمە، بابا عەلی و من ڕابواردنەکەمان لە گوزەرانی کورە دەوڵەمەند نەدەچوو. شێخ مەحموود لە پیران بوو، نەماندەتوانی چۆنییەتیی خۆمانی تێ گەیەنین. میرزا فەرەج و ئەحمەد ئەفەندیی موتەسەڕیف وایان تێ گەیاندبوو، کە ئێمە بە بەخشندەیی ئەدمۆنس خەبەرە بووین.

شێخ مەحموود هات بۆ بەغداد بۆ ماڵی میرزا فەرەج. بەغداد شڵەقا، ڕێگای ماڵی میرزا فەرەج بوویوو بە ڕێگای مزگەوتی گەورە لە ڕۆژی هەینیدا. جەعفەر پاشای عەسکەری سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو. شێخ مەحموود پێی وت دەبوایە تۆ پاشای خۆمان بیت، بەڵام دۆڕانتان، ڕۆژێك دەبێت نیشتمانەکەتان لێتان بپرسێتەوە.

**٤ی تەمووزی ١٩٢٧**

پاش چوار ڕۆژ، ئەمین زەکی بەگ[١] و ئەحمەد ئەفەندی موتەسەڕیف[٢] و میرزا فەرەج[٣] بڕیاریان دا، کە لەگەڵ شێخ مەحموود بچن بۆ لای مەندووبی سامی بەرامبەر بە ناردنی هەموو ئینگلیزەکان لە لایەن ئەوەوە. بە ماجید و منیشی وت بچین. لە پێش دەرگای دارولئیعتیماد (دار

١. وەزیر.

٢. موتەسەڕیفی سلێمانی.

٣. نائیب، هەرسێکیان کوردن.

الإعتماد) بە دوو ریز (حرس شرف) لە هیندی و ئینگلیز سەرباز وەستابوو. زابتێك بە كڵاوی مارشاڵییەوە هات، پاش بەسەركردنەوە چووین بۆ دیوان. فەرمووی ئەگەر گل درابینەوە دەست مەپارێزن با ئیتر دوایی ژیان بێت. ئێمە ئامادەبووین بۆ ئەو فەرمانە ئەگەر گیراین.

مەندووب زۆر زۆر رێزی لێ گرت. ماوەیەك بە وتووێژی خۆش رایان بوارد بەڵام لە كاتی نوقوڵ گێراندا لە جیاتی دەنكێك من چنگێكم هەڵگرت. چونكە لەو رەوشتەی، كە لە دانەیەك زیاتر هەڵناگیرێت، شارەزا نەبووم. پاش ماوەیەك مەندووب وتی: ئەگەر لە بەر كوردەكان نەبوایە زوو لە ناو دەبرایت.

شێخ مەحموود وتی: زۆر بە داخەوە وەڵامت دەدەمەوە، كە تۆیش وەكو حكوومەتەكەت لە قسەی راست دوورن، ئەگەر ئێوە ئەوەندە كوردتان خۆش دەوێت، كە منتان گەیاندە هیند بۆچی مافی ئەو كوردەی دۆستەكەتان نەدا و منتان بۆچی هێنایەوە و ئەو شۆرش و بڵێسەی ئاگرە كە لە رووی سیاسییە نەزانەكانتانەوە لە كوردستاندا هەڵگیرسا لە پێش هاتنەوەی مندا بۆچی داتان نەمركاندەوە؟ كەوا بوو لە بەر من كوردتان دەوێت. باوەر بكە ئێمە دوژمنی نە عەرەب و نە تورك و نە ئێرانین، تەنیا داوای حەقی خۆمان دەكەین. ئەگەر نەیدەن دەیسێنین و دوژمنمان ئێوە دەبن.

مەندووب تێ گەیشت كە شێخ مەحموود پەست و تووڕە بووە. وتی: هیوادارم بەری ماندووبوونەكەتان بخۆن و كورد دڵخۆش بێت. بەڵام زۆر ئارەزوو دەكەم بچیت بۆ بیلات[1] بۆ دیدەنیی مەلیك فەیسەڵ. بۆ رۆژی دوایی سەعات ١٠ بۆ چوونی بریاری دا و مەندووب ئاگاداری بیلاتی كردبوون.

گفتوگۆ بە فارسی بوو، ئەحمەد ئەفەندی موتەسەریفی سلێمانی و میرزا فەرەج زۆر دەترسان رەنگیان بە زەرد و سپی دەگۆڕرا.

لە رۆژی دوایی و كاتی گەیشتندا بە بیلات، بە دەستووری خۆی و زۆر بەرێز پێشوازی كرا. مەلیك فەیسەڵ هات بە پیرییەوە و ئامێزان بوون و یەكتریان ماچ كرد، ئێمەیش لە خزمەتیدا. جا پاش ماوەیەك قسەی خۆش مەلیك فەیسەڵ: بۆچی بابا عەلی نایەتە قەسرولزهوور (قصر الزهور) لەگەڵ غازی پێكەوە رابوێرن و خۆیشت ئەم پشتێنە فرێ دە گەرمایە و پێویست نییە.

شێخ مەحموود: بابا عەلی فێری ژیانی ناو چیا و بەربە با كوردیش ببێت بە خاوەن ئاڵا، ئەو كاتە ئەویش فێری ژیانی كۆشك دەبێت، ئێستای باشترە بەڵام ئەم پشتێنەیش بۆ ژێر فیشەكلغ (خەریتە)یە، بە بینینی ئاڵای كورد ئەمیش دەكرێتەوە.

---

١. بلاط: كۆشكی مەلەكی.

مەلیك فەیسەڵ: تۆ ئامۆزای منی و عەرەبی، چیت داوە لە ئالآی کورد؟ شێخ مەحموود لەم بابەتەوە زۆر فەیسەڵی دوان و پەشیمانی کردەوە و بەلآم وتی: ئێمە پتر لە (٧٠٠ ساڵە) بە نانی کورد. دەژین ئیتر پاش ماوەیەك بە خۆشی جیا بوونەوە.

#### گواستمانەوە

من لەو ماوەیەدا نەمتوانی گوزەرانی خۆمانی تێ بگەیەنم، کە نەمانگانەمان بۆ براوەتەوە و نەمتوانیم دەنگمان بە خۆی بگەیەنین، بەلآم لە ڕۆژی گەڕانەوەیدا، کە چووینە ئێستگەی شەمەندەفەر چووم تێکەڵیان بووم. وتم دەگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، شێخ ماوەی نەدام زۆر دڵنەوازیی کردم. پاش سێ ڕۆژ میرزا فەرەج وتی لەسەر کیسەی میری لە سابونچییە خانووتان بۆ گیراوە و مێجەر ئەدمۆنس بەڵێنی داوە، کە چ پێویستێکتان بوو بۆتان تەواو بکات. گواستمانەوە. ئەمە بوو بەخشندەییەکەی ئەدمۆنس.

١- خانووەکە: دوو نهۆم و ١٨ ژووری تێدا بوو لەگەڵ دوو ساردا. بە حەوشێکی زل و ڕەبەق و بۆن سارد و ناخۆش و لە هەمووی عەنتیکەتر بەرامبەر بەگۆك نەزەر و کەللەچی بوو.

٢- کەلوپەلەکەی مێجەر ئەدمۆنس ناردبووی. ئەمانە بوون: نیو تاقم کورسیی ڕەق و دوو تەپڵەکی ئاسنی ژەنگاوی بە دوو حەسیری پووشی یەك کەسی.

٣- کوپەیەکی زۆر گەورە و کورسییەك بۆ ئاو لەگەڵ یەك جامی فافۆن.

٤- عەلاقەیەکی کۆنی دیوار، کە ئەمە هەمووی لە (سوق الهراج) کڕرا بوون. جا بەخشندەکەی ئەدمۆنس و بە تکای میرزا فەرەج ئەوە بوو کە خوێندتانەوە، بەلآم خۆمان دوو دەست نوێنمان لە سلێمانییەوە بردبوو بەبێ چاپایە، لە سەریان دەنووستین. هاوڕێیەکی بێگانەی باشم گرتبوو لەگەڵم هات و بردمی بۆ بازاڕ چی پێویستمان بوو بۆی کڕین و پارەکەیشی دا.

#### چوونمان بۆ ماڵی ڕەشید عالی بەگ

من هەموو دەمی ئێوارانێك دەچووم بۆ ماڵی ئەمین زەکی بەگ، خۆشی دەویستم. دەیوت من کۆیلەی باوکتم، فەرمووی بەرگەکەتان بگۆڕن. لام باشترە شەوی جومعەیش لە لای ڕەشید عالی بەگ بۆ ماڵەوە بانگ کراوین بۆ نان خواردن. من بۆ فەرمایشەکانی زەکی بەگ چی بکەم. ناتوانین دەستبەجێ دوو دەست چاکەت و پانتۆڵ دروست بکەین وەیان لە دووکانەکان بیکڕین ناچار بووم بە هاوڕێکەمم وت. دەستبەجێ چووین و دوو دەستی دا بە دروستکردن بەو مەرجەی ڕۆژی پێنجشەمەیش بۆمان بێتەوە. چووین بۆ ماڵی ڕەشید عالی، بابا عەلی و من.

ئەمین زەکی بەگ و میرزا فەرەج زۆر بەرێز هات بە پیرمانەوە. بە ڕاستی گەورەیی پێشان دا. پاش ماوەیەك وتی ١٨ ڕۆژ لە تاران بووم باش فارسی فێربووم، کە قسەی کرد لە شێوەی ئێرانییەکاندا بوو و وتارێکی (قائانی)ی خوێندەوە. سەرمان سوڕما داوای مەبەستەکەی لە ئەمین زەکی بەگ کرد ئەویش فەرمووی ئەمە کوڕی مامۆستای گەورەمانە. ڕەنگە بزانێت بەهۆی هاتوچۆی زۆرم بۆ دێی (بێلوو) لە مەریوان بۆ خزمەت (ناری) وتاری بێژەکان وەکو قائانی و خەیام هەمیشە لەبەردەستا بوو بەتایبەتی لە مەریواندا خوێندەواری فارسی زۆر بوو ئەوکاتە نەختێك توانیم لە مەبەسەکە بدوێم.

ئیتر لە سەر فەرموودەی زەکی بەگیش پتر ناسیاوی پەیدا بوو، فەرمووی ڕۆژی شەممە لە دیوانی وەزارەت چاوەڕێت دەکەم. لە گەڕانەوەدا زانیم وەزیری داخلییەیە. چووم، وتی: بێجگە لە شیمال بڵێ بۆ چ جێگایەك دەتەوێت ئێستا دەتکەم بە مودیری ناحیە. وتم پێویستە شێخ مەحموود ئاگادار بکەم و ژوانمان تا ڕۆژی پێنجشەممە بوو.

ئەم قسانەم بۆ بابا عەلی و ماجید گێڕایەوە. دەستبەجێ بابا عەلی وتی، کە تۆ ڕۆیشتیت منیش دەچمەوە بۆ سلێمانی. ماجید وتی پەلە مەکە منیش خەریك دەبم. یەکێکمان دەبین بە مەئموور ئەوی ترمان بگەڕێتەوە بۆ لای شێخ مەحموود بۆ ئەوەی شۆڕشەکە نەکوژێتەوە و ئەو مانگانەیە بەسمانە.

## ماجید بوو بە مدیر بۆ محێرجە

ڕۆژی پێنجشەممە پاش نیوەڕۆ ماجید هاتەوە وتی: چارە نەبوو بە زۆر دانرام و کرام بە مودیر بۆ (جبایش – محێرجە)، بۆ ئەو جێگایەی، کە وەزیر بە منی وتبوو، بەڵام پارە پێویستە. لە ئەمین ڕەواندزی (٢٠٠ ڕوپیە)م ساند و دام بە ماجید و ڕۆژی هەینی ڕۆیشت بۆ محێرجە. ئیتر من نە گەیلانیم بینییەوە و نە تا ساڵێکی بە سەرا ڕابورد زانیم ماجید لە کوێیە و لە ساڵی ١٩٥٤دا پارەکەی ئەمین ڕەواندزیم دایەوە و پاش ٢٦ ساڵ. قەرز کۆن دەبێت و نافەوتی.

بۆ سەردان گەڕامەوە بۆ سلێمانی. لەگەڵ گەیشتنم موتەسەڕیف بانگی کردم بۆ ماڵی خۆیان وتی: موفەتیشی نیداری دەڵێت ئەگەر لەم شەوە زیاتر بمێنیتەوە بە حەپسی دەینێرمەوە بۆ بەغداد. سبەینێ بگەڕێرەوە (٤٠٠ ڕوپیەی) شێخ مەحموود لای منە بۆتان دەنێرم. پاش (١٥) ڕۆژ میرزا فەرەج ٢٠٠ ڕوپیەی دامێ. پارەی دوو دەست بەرگەکەم لێ دا و لەم کاتەیشدا، کە لە ماڵی میرزا فەرەج جیا بووینەوە لە سلێمانییەوە پیاوێکمان نارد بۆ خزمەتکردنی بابا عەلی.

پاش ماوەیەکیش میرزا ئەحمەد، خاڵی بابا عەلی هات و داوای دەفتەر و حسابی مەسرەفی ئەو ماوەیەی کرد. بەڵام ئێمە پارەمان لە کەس وەرنەگرتبوو، کەس نەیدابووینێ بێجگە لەو

۲۰۰ ڕووپیەی دوایی نەبێت. پێم وت ئەوەی ئێوە داواتانە چەندە، کە منیش وەڵامت بدەمەوە. دیار بوو دەیانویست من لێیان جیا ببمەوە چونکە ئیتر ترس نەماوە. ئیتر (سەبری کەی خۆمم بەجێ هێشت و بە ئەحمەدی ڕووتییەوە دەرچووم). ئەوەی من هەمبوو، دەستێك بەرگی کوردی لە بوخچەیەکدا و نیو ڕووپیە لە گیرفانمدا. پاش ئەو هەمووگیان بەختکردنە لە ئوتێلە نیو ڕووپیەکەی حاجی برایم نیشتمەوە. بەڵام بەخت باشی هێنا (ڕەشە)ی لە سلێمانی دەمناسی لە ئوتێلەکە بۆی بوو ناسیمی، جێگەی باش و خاوێن و خواردنی سێ ژەمەی بۆ پێك هێنام و دە ڕووپیەشی دامێ.

۱ی کانوونی یەکەم ۱۹۲۷ بووم بە موەزەف

چوومە خزمەت ئەمین زەکی بەگ، تێم گەیاند کە بە خۆشی لە بابا عەلی جیا بوومەوە. وتی: سبەینێ وەرە دەچین کارت جێبەجێ دەبێت. تا ڕۆژی ۱۲ی مانگ میوانی ڕەشە بووم، بەڵام لە بابا عەلیشەوە هیچ لوتفێك نەبینرا. کرام بە (کاتب دووەمی موتەسەڕیف) بۆ موحاسەبەی کەرکووك، بەڵام موتەسەڕیف عومەر نەزمی، کە زانی یەکێکم لە شۆڕشگێڕەکانی شێخ مەحموود لە ۱۸ ڕۆژ بەولاوە ماوەی مانەوەمی نەدا، دەرکرام. دوا باس و درێژەی ئەم کارەساتە لە بەرگی سێیەمدا.

هیچ جێگەی باوەڕ نییە، کە برا گەورەکان و کاربەدەستەکانی عەرەب، نەزانن و یان هەستیان پەوە نەکردبێت، کە کورد برایەکی دڵسۆز و گیان بەختکەری سوودی عەرەب، عەرەبی دراوسێ و ئیسلام و هاونیشتمانیانن و دیسان باوەڕیش ناکرێت، کە نەزانن کورد لە هەموو پێویستێکدا لە شمشێری برا عەرەبەکانیان بە کارتر و بە کەڵکترە. چونکە برایەتیی ئەم دوو گەلە قەڵایەکی پۆڵایینە بۆ سوود و بەرزیی عیراق.

ڕەخنەکان کە لە شێخ مەحموود دەگیرا

١- لەسەر پەیمان و بەڵێن بۆ ئیستیقلالی کورد، بەبێ جەنگ ئینگلیزی گەیاندە سلێمانی - کوردستان. کەوابوو نەئەبوو بەرامبەر بە سیاسەتیان بە چاك یان خراپە بەرپێچی بکات.

٢- کە لە هیندەوە هێنرایەوە دەبوایە وەکو کوێر دەستی ئینگلیزەکانی بگرتایە.

٣- کە داوا کرا بۆچی نەچوو بۆ بەغداد؟

٤- جاری دووەمیشی پاش ٤٠ ڕۆژ بڕیاری چوونی دا بۆ کەرکووك، ماوەی بۆمبابارانی سلێمانی و ئینگلیز قسەی خۆی هێنایە دی، ئەمە بوو ڕەخنەکانی کار نەزانەکان.

ئەم ڕەخنانە لەسەر زمانی زۆر کەس سەمای دەکرد. خۆم ڕوو بەڕوو پێم وت، فەرمووی:

ڕاسته بەڵام ئاخ. ئایا من ئارەزووی خۆشیی ژیانی بێ ترس و ئاسوودەیی خۆم و منداڵم ناکەم؟ سەرەڕای ئەوەی ڕەنجم بە با چوو، داراییشم دانا و هەمیشە لە دەربەدەری و ئازاری دڵدام و هەرگیز ئاحەسێمەوە؟ لە نەزانیی من نییە، بەڵام خوێندەوارمان نەبوو و ئەو زابتانەی، کە کورد بوون و هاتبوونەوە، ئەوانیش هەر یەکە ڕەشمەکراوی لایەك بوون و زەق زەق کردەوەیانم دەبینی. چارەم چی بوو؟ ئەوا ئێستە ئێمە بەردی بناغەمان دانا، با ئەوەی دوابیمان تەواوی بکەن. تەنیا لە ڕووڕەشیی دواڕۆژی خۆمان ڕزگار بکەین. ئایا من لە مەلیك حسێن پایە بڵندتر و جێگا بەرزترم؟ باش بینیمان، پاش ئەوەی لە دۆستی دێرینی عوسمانییەکان هەڵگێڕرایەوە چۆن ڕوویان لێ وەرگێڕاوە؟ ئینگلیزیش نەبوایە عەرەب ئازاد دەبوو و حەقی خۆیان وەردەگرت. تەنیا مەلیك حسێنی کرد بە هۆی کەلەپچەکردنی عەرەب. باوەڕم پێ بکەن من پەیمان شکێن نەبووم. ئینگلیز لەگەڵ کورد و من درۆی کرد. دەیویست من نەمێنم و کورد لە ناو ببات.

خزمی خراپ سەرت پێ شۆڕ ئەکا
بێگانەی باش سەرت پێ بڵند ئەکا.

شێخ مەحموود

نامەکەی شێخ ڕەئووفی خانەقا ٩/١٢/٩٦٨ کەرکووك.

بۆ برای شیرین و دێرینم ئەحمەد خواجە:

مێژووی (چیم دی)م دی، لە کونجی شعوورمەوە ئەم چەند شیعرە دەربەڕی، وا بۆتی دەنێرم:

بۆ ئەحمەد خواجەی خاوەن داستان
مێژوونووسەکەی شۆڕشی کوردستان

زۆر ئاواتم بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان
سەورەی شێخ مەحموود بخرێتە مەیدان

بکرێت بە مێژوو بنووسرێتەوە
مەبادا کۆن بێ و لەبیر چێتەوە

زۆر مێژووی کوردی سەرەوین بووە
لەبەر نەنووسران هەمووی ون بووە

ئافەرین کەوا هێناتە وجوود
تەئریخی کورد و سەورەی شێخ مەحموود

ئـافـەریـن لـە تـۆ و دەست و خـامـەکـەت
لـە خـۆش ئـەدایـی مـێژوونـامـەکـەت

تـەئـریـخـی جـوانت کـرد بـە دیـاری
وێنـــەت زیـــاد بـــێ بـــۆ کـــوردەواری

تـــەبـریـکت ئـەکـەم بـە تـەقـدیـرەوە
بـە گشت بـاوەڕ و هـەمـوو بـیـرەوە

***

بەرگی دووەم تەواو بوو. تکای لێبووردنی ئەو هەڵانە دەکەم، کە نەتوانرا ڕاستیان بکەینەوە. جا ئەو ئەرکەمان خستە سەرشانی هونەرمەندیی خوێندەوارە تێگەیشتووەکانمان.

ڕۆژ ئاوا ئەبێت، ماف لەناو ناچێت. شێخ مەحموود.

زنجیرەی چیم دی لەگەڵ ژیانم دوایی دێت

# کورد چیی دی؟

زۆر حەزم دەکرد، کە ئەم بەرگەیش بەو کوردییە پەتییە و بەو ئیملا تازەیەی، کە لاوەکانمان دەیانەوێت، بنووسیایە، بەڵام تکایە خوێندەوارەکانمان ببەخشن. چونکە پیت (حرف)ەکان کوردی نییە. ئێستە هەر بخوێنرێتەوە.

برا، ڕابوردووت فەرامۆش مەکە دوا ڕۆژیشت لە بیر بێ. چاکە بە چاکە و خراپە بە خراپە پاداش ئەبینێت.

حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا

بە داخەوە لە کاتی چاپکردنی بەرگی ١ی چیم دی لاپەڕە ٨٨ لە ڕیزەی وەزیرەکاندا ناوی حەمە ئاغای وەزیری نافیعە و باوەڕ پێکراوەکەی شێخ مەحموود لە بیر چووبوو. تکای لێبووردن ئەکەین. حەمە ئاغا بە ڕاستی کوردێکی بەڕێز بوو و بەڕێزەوە کۆچی دوایی کرد.

## کانگاکان

١- نووسینەکانی نووسەر.

٢- Resimli Tarih Mecmuasi Istanbul

٣- ڕۆژنامەی ژیان، سلێمانی.

٤- القضیة الکردیة، بغداد: الدرة.

٥- ڕۆژنامەی الراصد، بەیرووت.

٦- ڕۆژنامەی الومیض، بەغداد.

٧- کورد و کوردستان. دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو.

برایینە

زۆر جار بە زمان و بە نووسین وتمان (چیم دی) ئەو کارەساتانەی نووسەر بە چاوی خۆی بینیویەتی، یان لە پەرتووك و چاپکراوە مێژووییەکان و داستانە ڕاستەکانی گەلی کوردەوە بیستراوە و بە تەواوی ساخ کراوەتەوە، یان کردگاری ئەو مرۆڤانە و گوزارشی ئەو کاتانەی، کە پەیوەستێکی زۆری بە پێویستی گەلەکەمانەوە هەیە، نووسراوە و دەنووسرێت.

کەچی هەندێك کەس کە لەو پلەیەدا نین و بە هیچ کار و فرمانێکەوە نەناسراون، هەر بە ناوی دۆستایەتییەوە دەیانەوێت بیانکەم بە دەست کەلای باس و سەرگوڵی نووسین و بە تایبەتی جەنگاوەری شۆڕش، کە ئەم فەرمانە نەك من، بە هیچ نووسەرێکی درۆزنیش پێك ناهێنرێت. خۆ ئەگەر بێتو ڕێز لەو نانخۆرانە بگرین، دەبێت بە تەن کاغەز و دینار بەکاربێنین، کە ئەمەیش لە وزە و توانای ئێمەماناندا نییە.

جا ئەگەر ئەوانەی هەر دەیانەوێت بە مفتە بە تێمە ناویان بخەنە ناو لاپەڕەی مێژووەوە، با م شۆڕشیش تەواو بوویێت، خۆیان بە تێکۆشانی خۆیان دەتوانن ئەو ئاواتەیان بهێننەجی. خامە و نووسینیش بەجێهێنەری ئاواتە.

بەڵام شانازییە بۆ مێژوو، کە ناوی ئەو چەکدارانەی لە پێناوی ئازادیی گەلەکەیاندا گیانی خۆیان کردووە بە پردی ڕزگاری، لە لاپەڕەکانیا بنووسرێت و یاد بکرێن. وەکو کاك مەجید قالەی حەمامچی و کاك محێدین ساڵحە سوور و نەریمان باشۆکی و هەندێك لە بەشی سواری و کاك فارسی قەڵەو حەمە چاوەش و عیزەت و عەلی ئەمین و زۆر لە دلاوەرانی تریش لە بەشی پیادە، کە لە شۆڕشەکەی کورد و ئینگلیزا بە سەرداریی شێخ مەحموود لە مایسی ۱۹۱۹ەوە تا حوزەیرانی ۱۹۲۷درێژەی کێشا و لە جەنگدا بوون. (بۆ ئەوەی ناوەکانیان بناسرێت بە ناوی ئەو کاتەیانەوە نووسیم). جا هەموو نووسەرێك بە سەربەرزی دەزانێت ناوی ئەو جەنگاوەرانە بۆ یادگار لە نووکی خامەیەوە بخاتە سەر ڕووی کاغەز و بەختیارانە بیکات بە چرای نیشتمانەکەیان.

ڕەنجی هیچ تێکۆشەرێك بە با ناچێت ئەگەر لە ڕێگای ڕاستی و دڵسۆزییەوە لە پێناوی گەل و

نیشتمانەکەیدا تێ کۆشێت. هەروەها لە بەرگی دووەمی چیم دیدا وتمان لە سلێمانییەوە باسوخوازی میری دەنێررا بۆ شێخ مەحموود و ئەوەی کردەی خۆی هەرگیز فەرامۆش نەدەکرد (نەریمان) بوو. ئەو ناوەیش (کاك سەدیق شاوەیس) بوو، کە هەمیشە یاد دەکرێت. خوا وێنەیان کەم نەکات.

**کورد چیی دی؟**

ئەوا ئەو ئاواتەی نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوپێش عەوداڵی بووم ئێستا بە وەلیفەتی ژیان و شۆڕبوونەوەی لق و پۆپی تەمەنم پێی گەیشتم، تاوەکو بتوانم ماوەیەك یان هێندێك لە بەسەرداهاتووی گەلەکەم بدوێم و بیخەمە ڕوو، بۆ ئەوەی ببێ بە یادگاری پاش خۆم و سەرەتای مێژووی گەلەکەم.

لە مێژەوە دەمویست ئەم نووسراوەم لە زنجیرەی چیم دی، (کورد چیی دی) چاپ بکەم. بەڵام داخەکەم، ئێستەیش بە جەستەی نووسەرانی پێشوو دەستی هونەرمەندانمان لە بێ هێزیی گیرفان، کەلەپچە کراوە و بەرویووم بە ناکامی دەمێنێتەوە و زۆری دەبێت بە خۆراکی مشك و مێروو و لە ئەسرمەکاندا پووکاوەتەوە.

سەرەڕای هەموو کۆسپ و کوێرەوەرییەك، چاپکراوە کوردییەکان بە چاوەڕێی دەستی خوێندەوارەکانمانەوە لەژێر تۆز و خۆڵدا بەبێ ناز دەڕزێت و گۆڤارە وێنەدار و زاخاوەدەرەوەکەی بێگانەیش بەرێزەوە هیچ کاتێك ڕاناوەستێ. جا دەبێت هیوادار بین، کە وەکو هەندەران کارئاسانیی چاپ و بڵاوکردنەوە بۆ ئێمەیش برەخسێت.

لەمەوپێش لە بەرگەکانی (چیم دی)دا لە بابەت کۆشش و هەڵمەتەکانی کورد و شێخ مەحموودی مەزن و سیاسەتە چەوت و چەوێڵەکەی ئینگلیزە کورد و کوردستان پێ سپێراوەکانەوە، کە مایەی پەرێشانی و خوێنرژاندنی کورد و وێرانیی کوردستان بوو، پێشان درا. بەڵام ئێستە بام بە وردتر لە بیر و باوەڕی ئەو ئینگلیزانە بدوێین و بزانین بۆچی هیوا و ئاواتی کوردیان دا بە دەم باوە؟

ئینگلیزە کاربەدەستەکانی عێراق، بە تایبەتی سیاسەت نەزانەکانیان لە کوردستاندا زۆر بە سەرنجێکی دوور و ئەندێشەوە دەیانڕوانییە دواڕۆژی گەلی ئەم نیشتیمانە، نیشتیمانی کوردی ئەوسای بێ ئاگا لە هەموو کارساتێکی گێتی.

ئەو کوردەی لە کاتێکدا بە خۆیان و چەك و خێزانیانەوە خزێنرابوونە ناو چوارچێوەی دیواری چیاکان و ماوەیەکی زۆر کەم بوو لە زاڵییەتی و بەدبەختیی تورکە عوسمانییەکان و پەرێشانی و ڕەنجەڕۆیی جەنگی یەکەمی (١٩١٤) ڕزگار بووبوون، ئینگلیزەکان وەکو مۆتەکە یەخەگیریان بوون.

لەم چەرخەدا نەك هەر کورد، زۆر لە گەلانی گێتی (عالم) لە ڕووداو و گوزارشی ئەو دۆخە (زەمان)ە، لە سیاسەتی مژەر (ئستیعمار) بێ ئاگا بوون. تەڵەکەی کورد زوو تەقی. کورد کەوتە چاوەڕێی دەستی دۆستایەتی و برایەتیی بەریتانیای گەورە، بۆ ئەوەی پەیمانەکەی (سیڤەر)یان بۆ قورمیش بکات و بەکاریبێنێت و دەستی یارمەتی بداتە دەستیان و بادەی خۆشی و ئازادی لە سایە و سێبەری بەریتانیای گەورەدا بنۆشن. بەڵام هەرچەند کوردەکان بەرامبەر بەو کارەساتەی، کە ڕووس لە کات و ڕۆژانی جەنگی یەکەمی ١٩١٤دا بەسەر کوردەکانی ئێرانا هێنابوویان و کوردیش بە چاوی قینداوی و ڕقەوە دەیانڕوانییە ڕووسەکان و دەوترا، کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە و مێژووی کورد چاوپۆشیی لێ ناکات، کەچی نەمانزانی ئینگلیزیش لە پەنای دۆستیدا، نۆرەی خۆیمان لەگەڵ دەکات و دەوری پێشوومان بە ئازاری تازە لە بیر دەباتەوە.

ئەو ئینگلیزانەی خۆیان بە سیاسی و دۆست پێشان دەدا و تنۆکە ئاوەکەی ژیان و مردن (ئاوی حەیات)ی کوردیان بە دۆست و لایەنگری ڕووس دەژمارد، هەر ئەو پیاوە سیاسییانەیان، لە سەرۆك (مەندووبی سامی)یان دەگەیاند ئەگەر بێتو کوردستانێك لە عێراقدا دروست بکرێت ئەو کاتە ئێمە بە لەکەدار دەزانرێت، کە بەئاسانی ئێران، تورکیا، ئەفغان دەکەوێتە ژێر دەست و باوەشی ڕووسەوە.

چونکە کورد لەو پارچە گەورەیەی ئاسیادا دەژیێ، کە لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە تا ژووروی عێراق و ئێران و هەر لە خوارووی چیای ئاراراتەوە بەو زنجیرە مەزنەی چیاکاندا ڕوو بە خواروو بە درێژاییی دووهەزار کیلۆمەتر و لەوێوە بۆ لای ڕۆژهەڵاتی خواروو تا خەلیجی فارسی، کە دەکەوێتە نێوانی ئارارات و چیاکانی جۆلەمێرگ. جا ئەم پشتێنەیە لەسەر لووتکەی چیاکانی ئەرمەنستانەوە تا کاوەکانی چیاکانی ئازەربایجان و زەکتو (إقلیم)ی فارس زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە ژێر پەنجە و فەرمانی ڕووس.

خۆ دروستکردنی کوردستانێك، بەتایبەتی کوردستانی عێراق، کە نزیك بە (بەغداد – مەندلی)یە و پێوەندیی بە مەڵبەندی تورکیا، ئێرانەوەیە کارێکی تووش و ڕزوە (خطر)یە بۆ عێراق و تورکیا و ئێران، نەخوازە لە کاتی ڕوودانی جەنگێکی ناگەهانیدا و ئەگەر وەکو کوردەکان داوا دەکەن بێتو شاری کەرکووك بکەوێتە ژێر دەستیان و بیکەن بە پایتەخت، لە پلەی یەکەمدا ئێرانی تێدا دەچێت چونکە کوردەکان زۆر چاویان لەسەرکەوتنی ڕووسە و لە پەنا ڕووسدا ژیانیان زۆر بە بەختیاری دەزانن و ئەگەر هاتوو ئێران داگیر بکرێت، هیچ گومان نییە، کە بۆمباکە بەسەر ئەفغانیشدا دەتەقێت. ئینجا دوا بەدوای ئەمان نۆرە دەگاتە سەر تورکیا و عێراق و سووریا، ئەو کاتە دەریای سپیش دەبێت بە گوزەرگاهی ڕووس و پەلاماردان بۆ یۆنان و بولغاریا و لەگەڵ دەریای ڕەشدا دەبێت بە یەك پارچەی بێ مەڵبەند و ئیتر دوورگەی عەرەبی

سعوود، کوێت زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە ناو لەپی ڕووسەوە. (قاسملو).

ئەمە بوو، ئەو کەڵەکەی ئینگلیزەکانی خۆمان لە کوردستاندا لە ناو دەریای بێهۆشیدا پێ دەسووڕانەوە. ئایا جێگای باوەڕە لە پاش جەنگی یەکەم و لە ١٩١٩دا نەیانزانیبێت، کە ڕووسەکان ناو خۆیان پێ دانەدەمرکا و کوردیش دۆستیان نەبوو؟ و ئەگەر لە ترسی دواڕۆژ و بە ئازادیی کورد لە سەرکەوتنی ڕووس چەکەرەیان دەکرد، ئەی بۆچی بەم پرۆگرامە گرنگە و بیرە تیژەیان بۆ خۆیان کوردیان نەپچڕییەوە و ئەو کارە پەسندەیان بۆ خۆیان پێك نەهێنا؟ و بۆچی ئەو هەموو کیشوەرە گرنگانەیان بە هۆی کوردەوە نەخستە سەر ئیمپراتۆرییەتەکەی خۆیان و سەربارێش کەرکووکیان بخستایە ژێر دەستی خۆیان و بەم پایتەختیش بوایە باشتر نەبوو لەو خەیاڵ پڵاوە؟ بەم بڵێین کوردیش لەو نیاز و باوەڕدا بووبن و ویستبوویان ببن بە دۆستی ڕووس، ئایا بە شوورەیی دەزانرێت ئەگەر گەلێك، مرۆڤێك بۆ کارسازیی خۆی هەوڵی دۆستایەتی بدا؟

شێخ مەحموود بەبێ پەروا لەگەڵیان کەوتە گفتوگۆ. بەڵام، بۆ ئازادیی بوو نەك بۆ کۆیلەیی، یان بۆ دوژمنایەتیی ئینگلیز.

کورد و هەموو گەلەکانی گێتی لە پاش جەنگی یەکەم بە گێژی دەژیان، لە هەموو کردە و کاری دەوڵەتە سەرکەوتووەکان بێ ئاگا بوون. بە تایبەتی کورد، کە دەستخەڕۆی مرۆڤ نەوازیی ئینگلیز بوون. لەو کاتی هەڵە گەورە و گرنگانەدا نەدەزانرا، کە لە بەر قووتدانی بابا گوڕ گورە و لەو پایتەختە دەترسێت، کە لە کەرکووکدا دادەمەزرێت. کەرکووکیش وەکو (برستول) چۆن لە ئینگلتەرا جیا نابێتەوە، ئەویش کوردستانە و لە کورد جیا نابێتەوە.

ئینگلیزەکان لە بەر ئەوە ڕێگای نێرراوەکانی کوردیان بڕی، نەگەنە پاریس و ببن بە هاوکاری شەریف پاشا بۆ ئەوەی درۆکەی خۆیان بەڕاست نەگێڕن، ئەوەك کورد بە مافی خۆی بگات[1].

پاش جەنگی دووەمی ١٩٣٩

عێراق ڕوو بە پێشکەوتن و بەرزبوونەوە دەچوو. بڕیاریان دا بە ڕزگاربوونیان لە سیاسەتی ئینگلیز. جا لەم کاتەدا ئینگلیزەکان لە دۆستەکانی خۆیشیان ترسیان پەیدا کرد، وەکو نووری سەعید و هاوپەیمانەکانی، چونکە داوای پترکردنی بەش کرا لە پیتی نەوت. مژەریش شۆڕشەکانی (١٩٢٠و١٩٣٦و١٩٤١ لە بەغداد و لە کوردستاندا شۆڕشەکانی کورد لە ١٩١٩تا ١٩٢٧و ١٩٣٠ و ١٩٣١و١٩٣٥ بەرزانی و ١٩٣٥ یەزیدییان) بە درێژیی ساڵی دەهێنایە پێش

1- Lse Kurde et Le Droit. Pays 1947 P. 12 L. Rambout.

چاو. ترسیان پەیداکرد، دەیانزانی کردەوەی خراپی خۆیان ڕیشی خۆیان دەگرێتەوە. جا بەرامبەر بە بزووتنەوەکانی گەل بە پەلە لە پیاوە گەنەخۆرەکانی خۆیانیان هان دا، کە کۆمەڵێکی نهێنی بە ناوی (حزبی شیووعی)یەوە دروست بکەن و حکوومەتی عێراق بناڵۆزێنن و ڕەشمەکەیشیان بەدەست خۆی (ئینگلیزەکانەوە) بێت. بەڵام ئەم هەڵەیە بە ڕاست گەڕا. لە قوتابی، لە خوێندەوار و تێگەیشتوو کەوتنە ڕێکخستن و پێکهێنانی ئەم کۆمەڵە و نیشتنە وێزەی ئینگلیز و کلکەکانی ئیستیعمار. شێوەی سیاسەتی ئینگلیزیان گۆڕی، مەردانە بە خەبات و نومایش، پەیمانی (پۆرتسمۆز)یان پێ هەڵوەشاندنەوە، بەڵام بە خوێن ڕژاندن و کوشتاری لاوانی عێراقی ١٩٤٨ ئیتر بەبێ ماندووبوونی ڕووس، ئینگلیز دۆستایەتیی خۆی بەرامبەر بەو سوێندخۆرە کۆنەی خۆی پیشان دا. بیری شیووعییەتی و دامەزراندنی کۆمەڵی سیاسیی ڕووسی بە ئاشکرا لە عێراقدا بۆ دامەزراند. ئیتر ئایا کورد دۆستی ڕووسە یان ئینگلیز خۆی؟ هەروەکو لە ئاسیا و ئەفریقیادا کاشانەکانیان بوو بە کەلاوە بێ گومان دەستبەرداربیشی لە نەوت نزیک بۆتەوە و جێی باوەڕیش نییە جەنگێکی تری وەکو جەنگەکانی پێشوو ڕوویدات، کە ئینگلیز بکاتەوە بە شاهنشاهی گێتی.

### چوارگۆشەی کوردستان

بە پێی نووسینی مێژوونووسەکان و لێدوانی ڕۆژهەڵاتناسەکان چوار گۆشەی کوردستانیان بەم پێیە داناوە و ناسراوە: لەسەر لوتکەی چیای ئارارات –شیرینەوە بە هێڵێکی ڕاست بەرە و ڕۆژهەڵاتی سەروو لەوێوە بۆ خواروو تا مووسڵ – عێراق بۆ ئەسکەندەروونە – تورکیا. لەوێشەوە لەسەر ئەو هێڵە بەرە و سەرووی ڕۆژهەڵات تا ئەرزرۆم تورکیا. ئینجا هەر بەو هێڵە بەرەو ڕۆژهەڵات تا دەگاتەوە سەر تەپڵە سەرەکەی ئارارات.

ڕووبەری گشتیی کوردستان ٤٠٩٦٥٠کم٢، کە لە ڕووبەری بەریتانیا و هۆڵەندا و بەلجیکا و سویسرا و دانیمارك گەورەترە و بەم چەشنەیە:

٤٠٠ ١٩٤کم٢: لە تورکیا. ١٥٠ ١٢٤کم٢: لە ئێران. ١٠٠ ٧٢کم٢: لە عێراق. ٢٠٠ ١٨کم٢: لە سووریا.

هەمووی: ٤٠٨٨٥٠

کوردستان لەسەر هێڵی درێژیی ٢٠ دەرەجە – ٤٠ دەرەجە بۆ ڕۆژهەڵات، ٢٧ دەرەجە – ٤٨ دەرەجە بۆ ڕۆژئاوادایە.

ئەم پێشەکییەی خوێندرایەوە، پێشنیازی دانا و مێژوونووسەکانمانە، کە بەداخەوە هەمیشە کردگارەکانی بێگانە بەرامبەر بە کورد و نیشتمانەکەیان بە ناسۆرەوە یاد دەکەن. کەوابوو بۆ

پتر تێگەیشتن تکایە نووسراوەکەی دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو بخوێننەوە بەڵام، بەرگی چاپی یەکەم[1].

**حزبی شیووعیی عێراقی**

لە ١٩٣٠/١٩٣١دا کە عێراق چووە (عصبة الأمم)ەوە، گەلی عێراقی پچڕ پچڕ کەوتنە بیروباوەڕی دواڕۆژی عێراق. زۆر لە لاو، لە پیاوە ناسراوەکان و فەرمانبەرانی میری بەرامبەر بە مەلیك و ڕەوشتی زۆر لە کاربەدەستەکانی کەوتنە گلەیی. جا لەو دووربینانە بۆ چارەی ڕێکخستن و لابردنی ئەو کۆسپانەی دەیانبینی وردە وردە کۆمەڵ دروست بوو. لە ١٩٣٤دا بە نهێنی لە بەغداد حزبی شیووعییان پێك هێنا. لە پێویستیشدا هاوکاریی حزبی دیموکرات (أهالی) کامل چادرچییان دەکرد. لە سەرەتادا مێجەر ئەدمونس بە ئاگا هات، بەریەرەکانییەکەی بێ سوود بوو. ئیتر لە ١٩٤٨دا ئینگلیزەکان خۆیان لێ نزیك دەکردنەوە. بەڵام حزب بە عێراقدا بڵاو بووەوە تا ئێستا (١٩٧٠) گیان بەخت دەکەن و حەپسی و سزا دەکێشن. ئینگلیزەکان هەر چەند ماوەی کوردیان نەدا ببێ بە ئیمپراتۆری ئاسیا، ئیمڕۆ ئەوانیش خۆیان و جزیرەکەیان خۆ ئەگەر چاوێك بە نەخشەی گێتیدا بگێڕن تەنیا شوێن پێ ژاراوییە بەجێماوەکەیان دەبینن و بەس.

**١- شۆڕشەکەی شێخ سەعید ١٩٢٥**

ئەم شۆڕشە گەورە و گرنگە بەبێ ئەوەی لە لاپەڕەکانی مێژووی کورد و بێگانەدا بچێتە ڕیزی شۆڕشێکی سیاسی و داوای ئازادی و هەر لە ڕاز و داستانی وتووێژدا مایەوە.

بەپێی نووسراوەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی هەندەران و قسەی پیاوە بەختدار و تێگەیشتووەکانی تورك، لە کاتی دوادوایی جەنگی یەکەمی ١٩١٤دا و لە لەجەری و پەرێشانیی حکوومەتی عوسمانیدا بەرامبەر بە هێرشە بێ سامان و گرنگەکانی یۆناندا بۆ ڕزگارکردنی ئەو پارچە خاکەی بە دەست تورکەکانەوە مابوو، (مستەفا کەمال پاشا – ئەتاتورك) هاتە کۆڕی بەربەرەکانی. ژیرانە خۆی گەیاندە کوردستان – ویلایەتی شەرقییە لەگەڵ جەنەراڵ، سەرۆك عەشایر، پیاوە ئاینی و خوێندەوارەکانی کوردا ڕوو بەڕوو کەوتە قسە و ژوان بۆ ڕزگاریی تورکیا.

بەو مەرجەی سەربەستی و ئازادی (مختارێتیی کورد) لە لایەن تورکیاوە بدرێت، داوای یارمەتیی لە کورد کرد و بەرامبەر کۆمەڵانی کورد، ژوانی دا و پەیمان بەسترا، کە بەدڵێکی پاك و بازووی دلێرانی کوردەوە ڕوو بە یۆنانییەکان بووەستن و جەنگ بهێنەوە. لەسەر پەیمانەکەی ئەتاتورك سوپا و جەنگاوەرانی کورد دلێرانە سوپای یۆنانیان فڕێ دایە ناو دەریای سپی و

---

١. کوردستان والاکرد. الدکتور عبدالرحمن قاسملو.

تورکیا ڕزگارکرا. بەڵام ئەتاتورك بەبێ ترس و بە ئازایی پەیمانەکەی بە کوشتن و قڕهێنانی کورد هێنایە جێ.

داخ ئەو داخەیە کە لە کاتی ئەو کارەساتەی پاشا و تورك لە پاداشی چاکەدا بەرامبەر بە کورد کردیان و لافاوی خوێن لاشەی دەماڵی، ئەو خێرەومەندانەی بە ناوی پارێزگاریی گیانەوەرانەوە پەلاماری سۆڤیاتیان دا، کە گوایا گیانی پاکی تووتکە سەگێکی بە سارووخ ناردووە بۆ مانگ و ئازاری لەشی دراوە، هێشتا دروست نەبوویوو. کە هیچ نەبێت لە نێوانی داواکەیاندا پرسیارێکیشیان لە خوێن ڕژاندنەکەی کوردیش بکردایە.

### شێخ سەعید چیی کرد؟ چیی بەسەرهات؟

ژمارە ۱۷و مانگی مایس ۱۹۵۱دا لە لایەن کاك ئیسماعیل تولمانەوە، بەڕاست و ڕەوانی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی مەزن، لە کوردستانی ژووروو، کە لە ۱۹۲۵دا ڕووی داوە نووسیویەتی[1] و دەڵێت:

ئەمجارەیش وەکو جارانی پێشوو لە تورکیادا لە ژێر پەردەی ئاینیدا بزووتنەوە و شۆڕشێکی سیاسیی پڕ ترس و سامدار ڕووی دا. بەڵام ئەم شۆڕشە وەکو ئەوانی تر نییە. چونکە بۆ هەڵکردنی چرای زانستی و زانیاری نەبوو، بەڵکو بۆ هەڵکردنی ئاڵای کورد بوو، بەدابڕین و پچڕاندنی بەشێکی گەورە لە جمهوورییەتە نازدار و تازەکەی تورکیا بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی و کوردستانێك لە دیاربەکردا، لە لایەن شێخ سەعیدەوە بەرپا کرا. بەڵام لەبەر ئەوەی بە نەزانی پەنجەی بێگانە تێکەڵ بە هیوا و ئاواتەکەیان کرا، بە خوێن ڕژانێکی زۆر ئەم شۆڕشە کەوتە سەریان و بە ناکامی دوایی بە ئاواتەکەیان درا.

شێخ سەعید، سەرۆك و شێخی تیرەیەك بوو لە دێیەك لە شاری گەنج لە کیشوەری بتلیس. پیاوێکی زۆر گەورە و مەزن و شێخێکی بەڕێزی نەقشبەندی. خاوەن دەروێش و داراییێکی ئێجگار زۆر و گوزەرانێکی شاهانە بوو. کوردەکان ورد و درشت بەگ و ئاغا ملکەچی ئەم شێخە و دڵسۆزی ئەم جێگا پیرۆزە بوون.

ئەو شێخ سەعیدەی، کە دەیویست لەسەر بەرماڵی شێخیەتییەوە بە بۆنەی تازەیی و کەمدەستیی جمهوورییەتە نازدارەکەی تورکیاوە هەل وەربگرێت، بە قسە و هاندانی بێگانە بۆ ڕووخاندنی تورکیا لەسەر بەرماڵی شێخەوە بۆ سەر تەختی شاهی و

1. Resimli Tarih Mecmuasi. Istanbul

دروستکردنی حکوومەتێکی کوردستان باز بدات و لەگەڵ بێگانەکانی تورکیادا لایەك لە تورکیا بڕ بدات و جیای بکاتەوە، شێخ سەعید بە باشتر و خاوەن ماف زانرا. بۆ پێکهێنانی ئەو پڕۆژەیە و هەڵسووڕاندنی ئەو چەرخ و چیکەنەیە شاری حەڵەب (حلب)یان کرد بە مەکۆ و جێگەی ڕێکخستنی کاری شۆڕش.

شێخ سەعید لە ژێر فەرماندە و دەسەڵاتداریی خزم و کەسوکاری خۆیدا وەکو شێخ تاهیر، شێخ خەلیل، شێخ عومەر، شێخ شەریف و شێخ محەمەد و پیاوە باوەڕپێکراو و کارگوزار و زانا و دەروێشەکاندا هێزێکی زۆر گەورەی دروست کرد. فەرمانی بزووتن و هێرشی دا. بەڵام لە دوای لەشکرە چەکدارەکەیەوە لەشکرێکی جەواڵ بە کۆڵیش هەبوو بۆ تالانکردنی شاری گەنج[1].

شێخ سەعید بە لەشکرێکی زۆری بێ سەر و سامانەوە کەوتە بناغەدانانی حکوومەتێکی سەربەخۆی کوردی. لە هەوڵ هەڵمەتدا پالو، چاپوك چۆڕیانی داگیر کرد و لە لایەکی تریشەوە هێزێکی گەورەی نارد بۆ سەر ئەلعەزیز، مەلاتییە، چەمیش گازێك.

بەڵام شێخ سەعید بۆ گرتنی شاری دیاربەکر پیلانێکی زۆر گرنك و نایابی ژیرانەی دامەزراند. بە بەرگی یەك لە یەك نەچوو و لە کوردە زازاکانی پەیتا پەیتا دەنارد بۆ ناو شاری دیاربەکر و خۆیان لە بووسە دەدا. بۆ ئەوەی لە کاتی وروژمبردنی سوپای کوردە دلێر و ئازاکان بۆ سەر شاری دیاربەکر، دەستبەجێ دەرگای ماردینیان بۆ بکەنەوە. کەچی بەبێ ئەوەی پێویستییان بەو دەرگایە بێت هەر لە قوموش و ناو زێرابەکانەوە لەشکری کورد ڕژانە ناو شاری دیاربەکرەوە.

ڕۆژی ٨ مارت ١٩٢٥ لە ناو جەرگەی شاری دیاربەکردا جەنگێکی خوێنڕێژ و نەبیستراو و نەبینراوی بێ هاوتا ڕووی دا. بەڵام کوردەکان بە ناچاری شاریان بەجێ هێشت. لەگەڵ ئەم لەشکرە گەورەیەدا فەرماندەی مەزن شێخ سەعید بە ناسۆرەوە بەبێ ئەوەی بە ئاواتە گەورەکەیان بگەن، دیاربەکریان چۆڵ کرد.

پاش ئەم نوشستییە و گەڕانەوەی سەرۆکی مەزن شێخ سەعید، سەرۆك عەشیرەتەکان و کوردە بە شەرەف و خاوەن ناموسەکانی لێ هەڵگەڕانەوە. لە دواوە پەلاماری لەشکرەکەی شێخ سەعیدیان دا و ئەو کوردە خاوەن پەیمانانەی شێخ سەعید ئەمانە بوون کە شێخیان دەستخەڕۆ کرد:

---

١. لەشکرەکەی شێخ لە کورد و دەروێشی کورد و شاری گەنج بوو و ملکەچی بوون، ئایا جێی باوەڕە، کە بە لەشکرێکی جەواڵ بە کۆڵ شاری گەنج، کە ماڵی خۆیەتی تالانی بکات؟ نووسەر

١- سەرۆك عەشیرەتی هەویرکی حاجو ئاغا - لە نوسەیبین (نصیبین).

٢- بەدرەدین شێخ ئەحمەد: لە ئەشرافی دیاربەکر، کەرجۆشکی.

٣- چەلەبی: ڕەئیسی عەشیرەتی هەویرکی.

٤- جەمیل: ڕەئیسی عەشیرەتی ریسان.

٥- ئیسماعیل: ڕەئیسی عەشیرەتی حەسار.

٦- سالّح بەگ: ڕەئیسی عەشیرەتی ئارناسی.

٧- مستەفا ئاغا و ئاغایانی دێرسم و ڕەئیسی جهان بەگیانی سیواس.

٨- ئاغایان و ڕەئیسی عەشیرەتەکانی ئالازیك و مەلاتییە.

پاش ئاوارەیی شێخ سەعید و لەشکرەکەی، ئەم سەرۆك عەشیرەتە بە شەرەف و ناموسانەی کورد بە تەلگرافیش کۆیلەیی خۆیان بۆ ڕەئیس جومهوور ئاتاتورك نووسی.

حکوومەت بانگی سەفەربیرلیگی (عێلجاڕی)ی دا. لە چیا، دێهات، شار لە هەموو جێگایەکدا بەبێ دەستپارێزی دەست کرا بە کورد کوشتن، سووچدار بێ یان بێ سووچ.

لە (لیجا، های) و بە فڕۆکە و لە (ئەرگەنی، ئەکیل)یشەوە بە سوپایی پیادە و تۆپ و مەترالیۆز، کوشتن، سووتان بە قڕهێنانی کورد فەرمان درا و ئەو مەلا محەمەدەی، کە بڕیاری هەڵگیرساندنی ئەم شۆڕشەی دا، بە گوللەی مەترالیۆز کەللەی سەری هەڵگیرا و مێشکی ڕژا.

شێخ یەکسەر خۆی گەیاندە (خانە). بەرامبەر بەو هێزە گەورە بێ شومارەی حکوومەت بڕیاری بەربەرەکانیی دا. لە ڕۆژی ١١ نیسان ١٩٢٥دا خانەیشیان بێ بەجێ هێشت و ئەو هێزەیشی، کە لە (تیپورکە و ئیگین) لە ناوچەی مەلاتییەدا دامەزرا بوو پەرتەوازە کرا و لە ئەنجامدا شێخ عەلی و شێخ غالب و لە عەشایری جیران قاسم و ئیسماعیل و ڕەشید بەگ کە (٢٥) کەس بوون و لەگەڵ شێخ سەعید مابوون، ئەمانەیش بە پارە و زێڕێکی زۆر و نامەی گرنگەوە لەسەر پردی (چار بووە) بە یەخسیر گیران و بران بۆ دیاربەکر. لەگەڵ ئەو کوردانەی ترا، کە گیرابوون هەموویان دران بە مەحکەمەی ئیستیقلال (محكمەی استقلال)، پاش ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر، فەرمانی خنکاندنیان درا. لە دیاربەکر سێدارەیان بۆ دانرا لەگەڵ ئەو شێخ سەعیدەی، کە دەیویست حکوومەتێکی کوردستان لە دیاربەکر دروست بکات. لە ناوچەی دەرگای ماردیندا کران بە سێدارەدا و خنکێنران.

لە کاتی کوشتاری کوردی تورکیادا، کوردی عێراقیش لە ناو چیا و ئەشکەوتەکاندا لە ژێر بۆمبای ئینگلیزا دەژیان، خوێن دەڕژا، ماڵ دەسووتا. ئاژەڵ بە مەترالیۆز لە ناو چوو. کورد عەودالّی مافە و گوللە و بۆمبا بە دوایاندا دەسووڕێتەوە. ١٩٢٥.

وەنەبێت لە پاش شۆڕشەکەی شێخ سەعید دوایی بە شۆڕش درابێ و کورد خۆی بە بەزیو و بێ دەسەڵات زانیبێت. لە ١٩٢٧دا لە (دێرسیم) شۆڕش دەستی پێ کردەوە، بەڵام بۆ بەدبەختی دوژمنەکەیان بەهێزتر بوو و (١٢) سەرداریان کرا بە سێدارەدا.

لە ١٩٢٧دا لە (ئاگری داخ) لە سەرۆکی فەرماندەی ئیحسان نووری پاشادا بە ناوی ئیستیقلالەوە، لە لایەن حزبی خۆیبوونەوە ماوەی ساڵێك درێژە بە شۆڕشەکە درا و لە ئەنجامدا ئەمانیش وەکو پێشووەکانیان بوون بە خۆراکی دوژمنی بەدخوا و تۆپ و فڕۆکە و سەرۆك ئیحسان نووری پاشا داڵەی دا بە ئێران. کەچی لەگەڵ ئەم هەموو کەلەلایی و پەرێشانییەدا، کە بەسەر کورددا هاتووە، ئینگلیز بە دۆستی کورد دەناسرێت چونکە وەکو مووی بۆ هەڵپرووزابێت، تێکەڵی هەموو ئاوات و کار و بەختی کورد دەبوو، نەك بۆ چاکە، بۆ ئاڵۆزانی کاری کورد.

ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکانی تورك بە ئاشکرا شۆڕشەکەی سەعیدی مەزنیان بە سیاسەتی ئینگلیز پێشان دەدا و دەیانوت، شۆڕشەکانی دێرسم و لە هەرچی جێگایەك کورد داوای ئازادی بکات، بە پەنجە و ئارەزووی ئینگلیزە. چاویان لەوە دەقووچان، کە ئینگلیز خۆی نیشتیمانی کوردی کردووە بە گۆڕستان و لە هەموو لایەکەوە بە خاو و خێزانەوە دەربەدەر و ئاوارەن و زیندەگانییان لە چیا و ئەشکەوتەکاندایە و زۆرتریان بە گژوگیا و بەری دارە کێوییەکان دەژین، کە هۆی ئەم دەرد و کارەساتەیش تەنیا نەوتەکەیە، کە لە گێتیدا بووە بە گەنجێکی بێ پایان و سەرگەردانی بۆ کورد.

**برایم خانی دەلۆ**

ئەگەر بێتو بەدبەختیی ئینگلیزە بەدخواهەکان بەرامبەر بە کورد بێنینە پێش چاو، یەکە یەکە بنووسرێت، باوەڕ ناکرێت تەواو ببێت و ئەو ناسۆرە دەرمان بکرێت. لە کاتێکدا گەیشتنە کوردستان پەلی زاڵیەتییان ئەوەندە درێژ کرد، کە هەرگیز چاوی تۆڵەساندنیان لێ نەترووکێت.

بێجگە لە هەڵمەتە گەورەکەی ١٩١٩ لە شارەبان و کفری پەلی گەورەیان لێ درا. کوردەکانی شارەبان لە کاتی جەنگدا حاکمی سیاسییان بە خێزانەوە ڕفێنرا [ڕفاندن]. هێزەکەیان پەرش و بڵاو کرایەوە و تەخت و بەختیان تێك درا.

بەڵام لە کفری، بە سەرۆکایەتی و فەرمانداریی برایم خان و سوێندخۆرە سەرۆکەکانی عەشیرەتی دەلۆ، وەکو وەیسی بەگ و عەبدولحەمید عەبدولڕەحمان کارێزە لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ – ١٩٢١دا لە ژێر پرۆگرام و یەکدڵیدا پەلاماری شاری کفری درا.

ئەو تەوژمە دلێرانەی ئەم عەشیرەتە بەناوبانگە، بەڕاستی بە شایانی یاد و دووبارەکردنەوە دەزانرێت. جا بەرامبەر بە دەستدرێژی و زاڵیەتیی زابتە ئینگلیزەکان، کە مافی گەلایەتیی کورد

لە توورەکەی سیاسەتیاندا خنکا، بە سەرۆکایەتیی برایم خانی دەلۆ و هاوپەیمانەکانی وەك سەرۆکەکانی دەلۆ، شۆڕشی پیرۆزی کورد دەستی پێ کرد.

لە پاش جەنگ و کوشتارێکی زۆر لە هێزی دوژمن و درێژەی ڕۆژانی جەنگ (٢٣) ڕۆژ و کوشتنی حاکمی عەسکەری، تێ گەیشتن، کە هەرگیز حکوومەت توانای دامرکاندنەوەی ئاگری ئەم شۆڕشەی نییە. جا بە پەیمان و فڕ و فێڵەکەی خۆیان، لە لایەن حاکمی سیاسیی کەرکووك (میلەر) ناوەوە، تاڵەبانییەکانی تەفرە دا و بە هۆی شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانییەوە لەشکرێکی زۆری کوردی تاڵەبانی لەگەڵ هێزێکی گەورەی سوپایی بە تۆپ و چەکی گەورەی جەنگیی وێرانکەرەوە گەیشتنە کفری. ئەم شۆڕشگێڕانە هەرچەندە بڕیاری دروستکردنی حکوومەتێکی کورد و داکوتانی ئالآی کوردیان دابوو، دوایی بە ئاواتیان درا و زۆر لە پیاوە بەناوبانگ و ڕۆڵەی عەشیرەتەکەیان کوژرا. بەڵام دیسان دەستبەردار نەبوون و نەبەزین. بە فەرماندەی برای برایم خان و سەرۆکە هاوپەیمانەکەیان کەوتنە جەنگی چەتەیی و تیتر ئارامیان نەدەدا، تا بە ناچاری ئینگلیزەکان بەو مەرجەی لە هەموو تاڵان و کوشتن واز بهێنرێت و داوا لە کوردەکان نەکەن، فەرمانی لێبووردنیان بڵاو کردەوە.

ئاواتی ئەم عەشیرەت و پیاوە مەردانەیش وەکو ئاواتی شۆڕشەکانی پێشوویان، بە ڕەنجەڕۆیی مایەوە و ناوی ئەوانەی، کە لە پێناوی خاك و نیشتمانەکەیاندا گیانیان بەخت کرد وەکو عەبدولحەمید عەبدولڕەحمان و هاوشانەکانی، هەرگیز نامرێت و مێژووی کورد شانازییان پێوە دەکات. زۆر سوپاسیش بۆ کاك ساڵح دەلۆیی کە باسی ئەم شۆڕشەی بۆ تازە کردینەوە.

**کورد چیی دی؟**

لاپەڕەکانی (چیم دی) بخوێنەرەوە، چەرخی بیستەم، کە چەرخی ئەتۆم و گەیشتنە مانگ و ئازادییە، بەڵام بە چەرخی لەناوبردن و ئاوارەیی کورد پێشان دەدا و ناو دەبرێت.

دەزانن غاندی چۆن بوو بە مەهاتما؟ کە ئینگلیزەکە لە ناو شەمەندەفەرەکەدا دەری کرد و وتی نابێت هیندییەك بەرامبەر بە ئینگلیزێك دانیشێت، ئیتر بۆ ئەو تۆڵەیە دەستبەرداری خۆشیی ژیان بوو تا مافی هیندی ساند و خۆیشی بە پشتیوانیی گەلەوە بوو بە مەهاتمای هەموو هیندستان.

**٢- لە باسە کۆنەکەی چیم دی**

لە بەرگی (٢) دووەمی چیم دیدا وتمان، عومەر نەزمی متەسەڕیفی کەرکوك بانگی کردم. وەڵامم بە تورکی دایەوە، دەمزانی عەرەب نییە و لە وەنداوییەکانی کفری و کوردە ١٩٢٧/١٢/١٢.

وتی: بۆچی عەرەبی نازانیت؟

کوردم، حکوومەت بڕیاری داوە کە شۆڕشگێڕەکانی شێخ مەحموود دامەزرێنێت. منیش یەکێکم لەوان. ئیتر زانی کە لە نەوەی خواجەی سلێمانیم و لە (الخوجە)ی بەغداد نیم. بە توورەییەوە وتی:

بڕیارمان داوە، کە بێجگە لە کەرکووکی، لاوی کورد ڕانەگرین. ئیتر بۆ ئەوەی لە ژوورەکەیدا دەرم نەکات، چوومە دەرەوە. کورسی و مێزم نەما. مزی (١٨) ڕۆژیان دامێ و گەڕامەوە بۆ بەغداد و دیسانەوە یەخەگیری ئەمین زەکی بەگ بوومەوە. بە فەرمانی وەزارەت نێررام بۆ مەخموور. بەختم باشی هێنا ئەورەحمان سەعید، کە دۆست و هاوڕێیەکی کۆنم بوو لە مەخموور قائمقام بوو ١٩٢٨/٢/١و عومەر نەزمیش دەستنیژی ئینگلیز بوو.

مەخموور

ئەورەحمان بەرامبەر بە موتەسەڕیفی هەولێر، مەجید یەعقووبی و ئاغاکانی دزەیی لە بەرەبەرەکانیدا بوو.

١- دەبوویست بەبێ پەردە یاسای نووسینی کوردی بەکاربێنێ. لە هەولێر حکوومەت بە عەرەبی و تورکی دەینووسی و بە کوردی نووسین نێچگار زۆر کەم بوو. قائیمقام ئەورەحمان دەینووسی بۆ (دادپەروەری ئاشتی = حاکم صلح) و (دادپرسی تەنیایی = حاکم مفرد)، هەموو جارێك ئەو پۆستانە دەگەڕایەوە بۆ مەخموور. لەسەریان دەنووسی: (هنا لایوجد صاحب الکتاب). یان بە تورکی (کتاب صاحبی یوقدر). ئەمە پیشەی بوو، هەندێ جار نامەکانی لە لایەن کوردیزانەوە لە موتەسەڕیفدا هەر بۆ کوردی تەرجەمە دەکرایەوە موتەسەڕیف ئەم کردەوانەی پەسند نەدەکرد.

٢- لەگەڵ ئاغاکاندا زۆرتر ناکۆك بوو. داوای لێ دەکردن کە داوای قوتابخانە بکەن. ڕێگای ئۆتۆمبێل ڕاکێشن. لە ناو خۆیاندا یەك بن. ئاغاکان لە ترسی موتەسەڕیف داواکانی ئەورەحمانیان بەجێ نەدەهێنا.

لە ئەنجامدا وردە وردە ناچار بوو کە لەگەڵ موتەسەڕیفدا ئەمووەنی بکاتەوە. بەڵام ئاغاکانی ناچار کرد بە داوای چوار قوتابخانە و بە یارمەتیی خۆی لە ناو دزەییدا کرانەوە. زۆر ڕێگای ئۆتۆمبێلیشی پێ دروست کردن. هەروەها گەیشتنە ئەوەی داوای یەکیەتیی عەشایرەکەی لێ کردن. لەگەڵ خورشید ئاغای بایز سەرۆکی دزەیی کۆبوونەوە و پەیمانێکیان بەست. لەو کاتەدا حسێن مەلا نائیب بوو. پیاوێکی ئازا و نەترس و دەمڕاست بوو. پاش ڕێککەوتن بڕیاریان دا، کە من بچم بۆ لای شێخ مەحموود بۆ پیران ٢٩ شوبات ١٩٢٨.

## چوونم بۆ پیران

لە هەولێر بەرهەنگاری مستەر چمبن بووم. وتی: دەچیت بۆ پیران؟ سەرم سووڕما، شڵەژام. وتم چۆن دەزانی؟ ئەو قسەکەی خۆی نەبڕی. بە شێخ مەحموود بڵێ چمبن سەلامی هەیە. تکایە ئێوەیش دزەییەکان مەورووژێنن. ئەمانە وەکو ئێوە هار نین و ڕۆیشت.

وا دیارە کە پیاوە هاوپەیمانەکانمان هاو پەیمانی چمبنیش بووین. گەیشتمە پیران. شێخ مەحموود زۆری پێ خۆش بوو. وتی لە پێناوی دە ساڵ شەکاننەوە و ماڵوێرانیی کورد و خۆماندا ئێستە ئەرکەکەم بووە بە نوێژ. بووە بە، بەڵام مەرد ئەوەیە نەبەزێت.

ئەحمەد ئێمە کورد خۆم، دڵدارین. سەر هەڵبڕە بڕوانە بزانە چۆن کوردستانێکمان هەیە. وەڵڵا شەرت بێ ئەگەر نەمردم بە دەستی خۆم بەیداخە جوانەکەی کورد لەسەر ئەو لووتکە شاخانەی کوردستان دادەکوتم و ئەگەر مردیشم بێشەکەی کوردستان پڕە لە شێر. بام ئەو بناغەیەی ئێمە دامان ناوە ئەوان تەواوی بکەن. من نیازەکەمم تێ گەیاند، سەری بادا. دەستی بە دەستدا دا و وتی:

> داجەکەم خوێندەوارەکانمان بە زانایی بۆ پارە و عەشایر و نەخوێندەوارەکانمان بە نەزانی بۆ پارە، ئاواتی کوردیان بزرکاند. باوەڕم پێ بکە هەر ئەو ڕۆژەی ئێوە لە مەخموور نەمان هەموویان دەچنە سەر دین و ئارەزووی تازە هاتووەکە.
>
> بە چمبنیش بڵێ، بیرە بێ بنەکانتان پڕە لە زیندەبەچاڵی کورد، ئیتر بیری تازەمان بۆ هەڵنەکەنن. من دزەییەکانم خۆش دەوێت، بە باران و جووت و گا دەژین، کاکەخان زۆر دۆستم بوو.

ئیتر تێ گەیشتم باوەڕی نەماوە. کۆششەکەی ئێمەش بایەخی نییە. ٥ مارت. ڕۆژی ١٣ مارت گەیشتمەوە مەخموور. ئەوڕەحمانم تێ گەیاند، پاشگەز نەدەبۆوە. وتی بام خەریکیان بین بەڵکو باش بن بۆ دواڕۆژ.

لە سەرەتای مانگی نیساندا چمبن هات بۆ مەخموور. وتی مۆر و قلیشە (کلیشە)ی پوولەکانت لای من بوو، زۆرم پێ چاپ کرد و فرۆشتم تا، وتیان دووهلی نییە. شێخ مەحموود چۆنە؟ چیی وتبوو، چیی ڕاسپاردبووم پێم وت. پێ کەنی، وتی کەی ئێمە دەتوانین بیر هەڵکەنین.

## هەولێر لەو کاتەدا

شارێکی بچووک، زۆر لە پیاوە دەوڵەمەند و خاوەن دیواخان و جێگا بەرز و بڵند و خانەدانەکان لە قەڵا دادەنیشن. بەدەگمەن دێنە خوارەوە بۆ گەڕەکی (کورتەک). ئاغاکان زۆر ورد دەڕۆن. لە ڕەمەزاندا گۆچان دەگرن بە دەستەوە و پێی دەڵێن (ڕەمەزان چوێگانی). پاش ڕەمەزان هەڵی ناگرن. لە ژیانێکی زۆر خۆش و بەختیاریدان. بە ڕاستی پێیان دەوترێت

خانەدان. حەزیش لە تەزبیح بەدەستەوە گرتن دەکەن.

زۆریان بە تورکیێکی ۱/۳ کوردی قسە دەکەن. بیری کوردایەتییان زۆر کەم بوو. نزیکەی ۲۰ موەزەفی سلێمانییان نارد بۆ هەولێر. زۆریان لە ئەندامی (پشتیوان) بوون. لە هەولێردا و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕۆڵەی دلێر و بەکار پێ گەیشت، بەڵام کۆیە لە جۆشا بوو. ئاغا و ئەفەندی و جووتیار وەکو یەك نیشتمانپەروەرییان دەکرد. ۱۹۲۹/ ۱۹۳۰.

ئەوەی یەکەم جار ناسیم ئاسەف ڕەئووف بوو، کۆیی، زۆر وریا و جێگای باوەڕ بوو. بە هۆی قائیمقام ئەوڕەحمان سەعیدەوە گوێزرامان بۆ مەخموور و لە هەولێریش ڕەشید موفتی بەڕاستی جێگای باوەڕ و کارگوزارێکی گرنگ و بەفەڕ بوو. لەگەڵ ئاسەف زۆر تێ دەکۆشاین، ڕەشید موفتی یاریدەدەرێکی بەهێز بوو. زۆر نامەی نهێنیمان دەنووسی بۆ موتەسەڕیف و وەزیرەکان و داوای نووسین و خوێندن بە کوردی دەکرا.

**موتەسەڕیف و نووسینی کوردی**

ڕۆژێ یەکێك لە فەرمانبەرەکانی هەولێر لە نامەیەکدا لە جیاتی موتەسەڕیف (اربیل)... هەولێری نووسیبوو، موتەسەڕیف حەمید سرسڕ بانگی کرد. وتی: دایکت ناوی چییە:

ناوی:....

باشە. ئەگەر پێی بڵێن (قحبة) پێت خۆشە؟ نیتر ئەم ناوە کوردییە لە بیر خۆتان ببەنەوە.

**چووین بۆ باداوا**

ڕەوشی ئیدارە و موتەسەڕیف و هەندێك لەو موەزەفانەی کورد نەبوون زۆر بە خراپی دەڕۆیشت. دەیانویست بە هیچ جۆرێك ناوی کورد نەمێنێ. لەگەڵ ئاسەف چووین بۆ باداوا بۆ لای مەلا ئەفەندی. کارەساتمان تێ گەیاند، وتی زۆر باش ئاگادارم. بچن چی دەکەن بیکەن مەترسن، حاجی شەریف ڕادەسپێرم. لەم کاتەدا من گوێزرابووم بۆ هەولێر. کە لە باداوا گەڕاینەوە بینیمان بە دیوار و دەرگا و دەرابەی دوکانەکانەوە بە عەرەبی نووسراو دۆزان (إعلان) چەسپ کراوە و تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا یەت و لە نووسراوەکەدا دەڵێت:

کوردییەکەی:

(بە سەرۆکایەتیی حەقی شبلی دەستەیەکی لاسایی (تمثیل) هاتووە. لە ژێر سێبەری موتەسەڕیفی لیوادا لە سەریانی دووکانەکانی بەرقەڵادا ئیش دەکەن، ڕێگا بۆ گشت کراوەیە).

ڕەنیس بەلەدییەی ئەربیل

ڕۆژی دوایی چووین بۆ لای حاجی شەریف (باوکی دکتۆر هاشم). وتی چیتان دەوێت، چەندتان پارە دەوێت لەسەر فەرمانی مەلا ئەفەندی من ئامادەم بۆ بەجێهێنانی.

ئاسەف زۆری لە هەولێرییەکان دەناسی. پیاوی زۆرمان کۆ کردەوە، ئەو شەوە ماوە نەدرا کەس بچێت بۆ تەمسیل. ئەوانەی چوو بوون یەکی پێنج ڕووپییەیان لێ سێنرا.

پۆلیسی سەرشەقامەکان کران بە شاری و بەکچیی شەویش لە خۆیان. لە شەویشدا چەند دەستڕێژێك کرا بەسەر جێگای پۆلیسی سوارەدا. شار و میری شڵەقا. موتەسەڕیف حەمید سرسپ و مودیری پۆلیس، دەرویش لوتفی چوونە سەربانی سەرا و بە مەترالیۆز هەر چوارلایان تەنی. بێ حکوومەتی ماوەی (٢٢) ڕۆژی کێشا ١٩٣٠.

لە بابەت کۆمەڵی پشتیوانەوە چەند جارێك باس هات. لە بەر پێویست ئێستە ئەو باسە دووبارە دەکەینەوە. لە بەغداد بڕیار درا، کە کۆمەڵێکی سیاسی و نهێنی دابمەزرێت لە خانووەکەی ئێمە. باباعەلیدا کۆبوونەوەیەك کرا و بە ناوی پشتیوانەوە ئەم کۆمەڵە ڕێك خرا. ١٩٢٧/٧/١٠. لەو کۆبوونەوەیەدا لە مەئموور و زابت و بازرگان، تەقاعودی مولکی و عەسکەری پێك هێنرا، ئەمەیش ناوەکانیانە ١٩٢٧/٧/١٠.

١- مستەفا شەوقی: سەرۆك. زابتێکی عوسمانی، خاوەنی گۆڤاری (پەیژە).
٢- ڕەشید نەجیب: سکرتێری یەکەم و سندووق ئەمین، مووەزەف.
٣- ئەحمەد خواجە: سکرتێری دووەم.

ئەندام:

١- خەلەف شەوقی داودی: مووەزەف.
٢- مەحموود جەودەت: مووەزەف.
٣- عزەتی تەل: مووەزەف.
٤- عەلی عیرفان: مووەزەف.
٥- حەمید جەودەت: زابت.
٦- ئەمین ڕواندزی: زابت.
٧- فائیق کاکە ئەمین: زابت.
٨- ڕەئووف بەگ جەلالی: زابت.
٩- بەشیر موشیر: خەیات.

لقی پشتیوان بە هەموو کوردستاندا بڵاو بووەوە. بەڵام من پاش یەك مانگ پەیوەستیم نەما چونکە بووم بە مووەزەف و دووریش کەوتمەوە. بەڵام لە مووسڵ زۆر بەهێز بوو.

لە هەولێر

بۆ تازەکردنەوەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵی (پشتیوانی)، بە سەرۆکایەتیی ڕەفیق حیلمی لە ماڵی ئەحمەد فەخری کۆبوونەوەیەك کرا. نووسینی نامەیەك بۆ سەرۆك عەشایرەکان بەم (نووسەرە) سپێررا، کە بە ناوی شێخ مەحموودەوە وریا بکرێنەوە. ئەو موسوەدەی نووسینەم لە لایەن ئەم کۆمەڵەوە درا بە موتەسەڕیف حەمید سرسرِ. بانگی کردم. پێشانی دام، نەمتوانی هیچ بڵێم وتم نووسینی منە. پاش یەك مانگ بۆ ماوەی (٣) ساڵ لە وەزیفە دەرکرام و بە زینۆگرافی وێنەی نامەکەی خەڵەف شەوقی، کە وەڵامی دامەوە دەخوێننەوە.

مێژووی ژیان و سەرگوزەشتی حەمید سرسرِ زۆر دوورە. خۆی بە ناوی شەبانە (شبانە) پۆلیسی ڕسمی نا، لە عەمادییە (ئامێدی) خزمەتکاری ئینگلیزە، کە بوو بە قائیمقام، موتەسەڕیف، تەواو گوێی ئاو درابوو. لە سیاسەتی ئینگلیز لای نەدەدا. دوژمنی خوێنینی کورد بوو.

کۆمەڵەکە

سەرۆك ڕەفیق حیلمی و سکرتێر مەحموود شەوقی، سندووق ئەمین مستەفا چیچۆ بوون. ئەندام ئەحمەد فەخری و ئاسەف و ئەحمەد خواجە. ئاسەف و ئەحمەد خواجە یەکی بۆ سێ ساڵ فەسڵ کران. بۆ پێشاندانی ڕاستیی قسە، وێنەی نامەکەی خەلەف شەوقی کە نگاهدار کرابوو ئەمەیە وا پێشان دەدرێ.

١٣ / ١١ / ١٩٣١ بەغداد

برای خۆشەویستم کاك ئەحمەد

سی چوار ڕۆژ ئەبێ شیرین نووسراوەکەتم وەرگرت و بەندە سەعاتێ تەماشای میحفەزەی شەخسیتانم کرد و لیم مەعلووم بوو، کە بە ژمارە ١١٥ و ڕۆژی ٢ی ئاب ١٩٣١ مەکتووبیکی دوور و درێژی نووسیبوو بۆ وەزارەتی داخلییە و خولاسەکەی ئەو مەکتووبی موحەڕەمە ئەمەیە:

جەنابی سەعادەتمەئاب ئەڵێ: " هەر وەکو لە مەکتووبەکانی ترم نووسیبوو ئەحمەد ئەفەندی دائیمەن موداخەلەی ئومووری سیاسییە ئەکا و ئەهالی تەشویق ئەکا لە عەلەیهیی حکوومەت و دائیما مەنشوور ئەنووسێ و بڵاوی دەکات و لە وەقتی خۆیدا هەرچەندە مومکین بوو سوورەتیکی ئەو مەنشوورانە تەقدیم بکەم فەقەت ئەم جارە وا موسەوەدەیێکی تەحریزی وا بە خەتی دەستی مووما ئیلەیهی نووسراوە بۆ ڕوئەسای عەشایەر ناردوویەتی و لەسەر قاقەزی

ڕەسمیی حکوومەت نووسیویەتی "... إلخ " و ئەم مەنشوورەم دی و بە خەتی جەنابتان نووسرابوو. مەئالەکەی دەرحەقی ئیستیفتا بوو، کە لە زەمەنی هاتنی موزاحیم بوو و لە نیهایەتەکەی سوورەتێکی بۆ فەخامەتمەئاب مەندووبی سامی نووسراوە.

وەزارەتی داخلییە سوورەتێکی مەکتووبەکە لیوای هەولێر و ئەسڵی موسەوەدەی مەنشوورەکەی ناردبوو بۆ وەزارەتی مالییە و وەزارەتی مالییەش قەراری تەنزیلتانی دابوو و تەنفیزی قەرارەکەی کرد.

پشتیوانی: خەلەف شەوقی ئەمین

Telephone Central No. 603

Baghdad

ئەمجارەیش گەوارەی شۆرش (یەزیدییەکانی گرتەوە ١٩٣٥)[1]. ئینگلیزەکان بیستوویانە کورد ئازایە ناترسێت. رەنگە هێشتا ماوەی تاقیکردنەوەکەی، کە لە ١٩١٩وە دەستی پێ کردووە تەواو نەبووبێت. وا بە دوای شۆرشەکەی کورد لە سلێمانییەوە بۆ بەرزان و لەوێشەوە بۆ ناو یەزیدییەکان پەرەی سەند.

لە باوی عوسمانییەکاندا لە یەزیدییەکان عەسکەر نەدەگیرا. ئیمرۆ لەم کاتەدا لە هەموو کاروباری حکوومەتی عێراقدا یاساکانی عوسمانی لە کارایە. تەنیا یاسای عەسکەرگرتن نەبێت گۆراوە ١٩٣٥.

ئینگلیز هانی حکوومەت و موتەسەریفی مووسڵی دا، کە کۆسپێك بۆ بەرپاکردنی ئاشووبێك پەیدا بکرێت، کە هیچ نەبێت هەندێك خوێنی کوردی تێدا برژێنێت، کە ئەمەیش ئاسانترین رێگا، یەزیدییەکانە و داوای عەسکەرییان لێ بکرێت.

لە دەستووری عوسمانییەکاندا لە سێ تیرە عەسکەر نەدەگیرا، کە ئەو باوەیش بە باوی، وەکو دەڵێن کێنرێ: ئستیبداد، ناو دەبرێت. ئەو تیرانەیش ئەمانە بوون:

١- سادات: ئەوەی پێغەمبەر، نابێت ژێر فەرمان بن.

٢- کۆچەر: پێویستە خاوەنداریی ئاژەڵ و پارێزگاریی خۆیان بکەن.

٣- یەزیدی: ئاینیان رێگا نادات لە ناو ئایندارە بێگانەکانیاندا بژین. زۆر روونە، کە ویسترا بە بیانووی عەسکەرگرتنەوە پەلاماری کورد بدرێت و بەم بۆنەیەوە لە یەزیدی کوشتار بکرێت.

یەزیدییەکان لەسەر رەوشی کۆنی خۆیان لایان نەدا، وتیان عەسکەر نادەین. کار بەم جۆرە رووی دا.

رۆژی ٢١ی ئەیلوولی ١٩٣٥ لە لایەن موتەسەریفی مووسڵەوە ئەم تەلگرافە نووسرا بۆ وەزیری داخلییە[2].

بە کوردییەکەی:

رۆژی ١٩ی مانگ گەیشتینە سنجار. لەو ناوچەیەدا بۆ بە خورتی گرتنی سەربان، پشکنینی (یوقلەمە)ی سەرەتایی تەواو کرا. کار زۆر بە ئاسانی و هێمنی دەرۆیشت. بەڵام لە دێی (زیروان و رەشو قولو) لە لای (داود ئەلداوود سەرۆکی عەشیرەتی مهرکان) و عەشیرەتی (مالا خالیتی) لەوێ (عالدلینا) لە

---

١. بۆ ئەوەی بە دوای یەکترا شۆرشەکانی بەرزان بکەین بە یەك بەرگ، لە ریزەی ساڵدا دواخرا. لە ١٩٣٠یەوە تا...؟ بەسەر یەکەوە پێشکێش دەکرێن.

٢. القضية الكردية، محمود الدرة.

فەرمان و فەرمانەکەمان یاخی بوون. ئەمجارەیش وەکو ساڵی ۱۹۲۵ لێژنەکەیان دەرکرد و یاخی بوون. ئەم داود ئەلداوودە لە ساڵی ۱۹۳۳دا لە ئاوارەیی گەڕاوەتەوە. هەر چەند بۆ هاتنە ناوچەی قەزایش داوا کرا نەهات.

تەلگرافی دووەم:

لە ٢٤ی ئەیلوولدا، لە موتەسەریفی مووسڵەوە بۆ وەزیری داخلییە:

بە کوردییەکەی:

لە لایەن مودیری پۆلیسەوە زۆر ئامۆژگارییان کرا بێ سوود بوو و (میری شێخان)یش نەیتوانی پاشگەزیان بکاتەوە. دەڵێت من حکوومەتی عێراق ناناسم. پەیوەستیمان بە مێجەر (وڵسن)ەوە هەیە، دەتوانم لەگەڵ ئەودا یەکتر ببینین. ئیتر چارەی ڕێککەوتن نەماوە. فڕۆکە بنێرن تاوەکو بۆمبابارانیان بکات و ئێمەش لە ژێر فڕۆکەدا ۳۰۰ پۆلیسی پیادە و ۱۵۰ سوارە بنێرین.

لەسەر ئەم تەلگرافە، حکوومەت بڕیاری دا بە ناردنی هێزی سوپایی عێراقی بۆ خاپوورکردن و پەرێشانکردنی سنجار و ماڵ و چیای یەزیدییەکان و ئەم ئەرکەیش کەوتە سەر حسێن فەوزی. ۱ی تشرینی یەکەم.

جا ماوەی (۱۷) ڕۆژ بۆ دامرکاندنەوەی ئاواتە گەرمەکەی ئینگلیز، کورد کوژرا و لە ناو برا.

بەپێی نووسینی میری خۆیان، لە یەزیدییەکان ۲۰۳ کوژراو ۱۰۲ بریندار ۳۹۵ کەسیش دالەدەر بووە و لە هێزی میریش ١٤ کوژراو ۳۰ بریندار و ۳ سەرباز ون بووە. لەگەڵ ئەوەیشدا لە لایەن مەجلیسی عورفیی عەسکەری (مجلسی عرفی عسکەری)یەوە لە شۆڕشگێڕەکان (۹) کەس لە مووسڵ خنکێنرا. دووانیان مەحامی و مووسڵی بوون چونکە لە سوودی یەزیدییەکاندا جاسووسی فرانسە بوون.

خۆزگە لە پاش خوێندنەوەی دوا دێری سەرەوە، خوێنەوار تۆزێك لێکی بدایەوە. فرانسەکان چییان بوێت لە یەزیدی و جاسووس لە سوودی یەزیدیدا چیی دەست دەکەوێت، کە بۆ فرانسەکانی کردبێت و فرانسەکان چ پێویست و پەیوەستێکیان بە چیاکانی یەزیدییەکانەوە هەیە؟ مەگەر هەر بڵێین ئەمەیش پەندی (مێجەر)ە بۆ ئەوەی خوێن ڕشتنەکە بە ڕاست پێشان بدەن و کوردەکان بە سووچدار ئەم بەیانەیان دەرکرد:

بیان رسمی
١٧ی تشرینی یەکەم ١٩٣٥

کوردییەکەی:

لە بەر تەفرەدانی هەندێك لە پیاوخراپان لە ناوچەی (سنجار)دا بە سەرۆکایەتیی (داود ئەلداوود و ڕەشۆ قولو) لە یاسای حکوومەت هەڵگەڕانەوە. ئامۆژگاریی پیاوانی میری و ئاینییەکانیان کاری نەکرد. بە لاساری مانەوە. بەڵام لە یەزیدییەکان ئەم کردەوەیان پەسەند نەکرد. ئیتر بە فڕۆکە و سوپای عێراقی و پۆلیس وورووژم برایە سەریان. لە ڕووی ئەم پەلاماردانەوە زۆر لە دێهاتیان داگیر کرا. زۆریشیان دایانە چیا و ناو ئەشکەوتەکان، کە ئیتر ناگیرێن. دەستبەجێ حوکمی عورفی بڵاوکرایەوە. زۆریان داڵدەیان دا بە میری. لەوانە تا ٣٠٠ چەکداریان بە چەکەوە هاتوونەتەوە و داود ئەلداوودیش خۆی و ژنەکەی و کوڕێکی چوون بۆ سووریا و دوایی درا بە شۆڕش.

جا ئاسایش لە چیای سنجاردا گەڕایەوە. یەزیدییەکان لەم ٢٠ ساڵەی دواییدا تێکەڵ بە عەرەبی شەممەر (شمر) بوون، بە عەرەبی قسە دەکەن. منداڵیان دەنێرنە قوتابخانە، باوەڕیان گۆڕاوە و خوار و خێچیی ئاینییان نەماوە و یەزیدییەکانی شێخانیش بە بۆنەی تێکەڵییان بە کورد و عەرەب، ڕەوشتیان گۆڕاوە.

بەم پێیە دوایی بە شۆڕش درا. کوشتار، وێرانی، لە کورد تەواو کرا. بەڵام ئەوە ئاینە لە کوردی هەزار ٢٠٣ کەس بکوژرێت و ١٠٢ کەسیش بریندار بوویێت و کێ دەزانێت چەند سەد کەسیش لە بریندار و کوژراو لە چیا و دۆڵەکاندا نەدۆزراوەتەوە و بووە بە خۆراکی جانەوەر؟ نازانرێت بۆچی خوێنی کورد ڕژاندن دروستە و گیانیان بێ نرخ؟ ئایا هەر لە بەر ئەوەیە کە داوای گیانداری و مافی ژیانی ئازادی دەکەن؟ یان پاداش و وەڵیفەتی بێگانە پەرستیمانە؟

ئەمە ماوەی ١٥ ساڵە[1] ئاگری شۆڕش لە کوردستاندا لە بڵیسەدایە و ڕەوشتی کار وا پیشان دەدات، کە ئەمە سەرەتای کار بێت نەك دوایی.

---

١. ئەم نووسینە لە ١٩٣٥دا نووسراوە لە بەر ئەوە ماوەی ١٥ ساڵ پیشان دراوە.

**زانستی**

جەمعییەتی زانستی، لە لاوە نیشتمان پەروەرەکانی سلێمانی کاک ئەحمەد ڕەفیق (ئەحمەدی حاجی فەرەج) هاتە هەولێر. بۆ ئەوەی نامەی یارمەتی بۆ کۆمەڵی زانستی بڵاوبکاتەوە، ئەم فرمانەی گرتبووە ئەستۆی. ئەحمەد لاوێکی بە نرخ و پاك و نیشتمان پەروەرە.

ئەوەی لە هەولێرا بڵاو دەکرایەوە بە نهێنی جێبەجێ کرا. هێشتاکە ئەورەحمان سەعید لەگەڵ موتەسەرپفدا لە بەریەرەکانیدا بوو. ئەحمەد چوو بۆ مەخموور بە هیوایەکی زۆر گرنگەوە. بەڵام چەپۆکی موتەسەرپف حەمید سرسرِ زوو گەیشتە سەر سەری، بە هۆی پۆلیسەوە هێنرایەوە بۆ هەولێر و دەستبەجێ بەبێ ڕاوەستان ناردی بۆ کەرکووك و لەوێشەوە بۆ سلێمانی. بەڵام ئەمە شایانی باس نییە. ئەوەی کە پێش (٤٥) ساڵ لە پێناوی خوێندندا لە سلێمانیدا ڕووی داوە دەخەینە پێش چاو وە بیخوێننەوە. ئەمەیش ئەو نامەیەیە کە ئەحمەد ڕەفیق بڵاوی دەکردەوە.

وێنەی نامەی ڕەئیسی جەمعییەتی زانستیی کوردان، سلێمانی

بۆ هەموو کوردێکی حەمییەتمەند و وەتەنخواە

کۆمەڵی زانستیی سلیمانی، کە لە ساڵی ١٩٢٦ ەوە بە پشتیوانی و یارمەتیی وەتەنپەروەرانی کورد بۆ تەنویری کوردەواری و تەعلیمی نەخوێندەوارەکان خەریك بووە، لەم ئاخرییەدا بە فەعالییەت و نەشاتێکی تەواوەوە دەستی کردووە بە کۆشش بۆ خزمەتکردنی مەعاریفی کوردان و لەم خزمەتەیدا تا دەرەجەیەك (ئەلحەمدولیللا) موەفەق بووە. لە زەرفی ئەم چوار ساڵەدا بە هەزاران نەخوێندەوار فێری خوێندن بوون و کەم و زۆر مۆتەکەی نەزانینمان لەسەر لاچووە.

یەکێك لە فەعالییەتی تازەی کۆمەڵ تەسبیت کردن، کڕینی مەتبەعەیەکی عەسری و موکەممەلە و بۆ پێکهێنانی ئەمە هەوڵ و هەنگاوی هاوێشت. لەم چەندانەدا لە سلێمانی ئیجتیماعێکی عموومیی عەقد و دەفتەرێکی پیتاك کرایەوە. هەتا ئێستا لە تەرەف حەمییەتمەندانی سلێمانییەوە نیزیکی چوار هەزار ڕوپییە بەخشراوە. ئەم مەبلەغە مەعەلئەسەف بۆ ئەم مەقسەدە بەش ناکات. زاتەن خزمەت و تێکۆشینی کۆمەڵی زانستی هەر مەخسووسی پارچە و ناوچەیەکی کوردستان نییە. جەهد و فەعالییەت بۆ سەعادەت و ڕەفاهی هەموو کوردانە. قەراری قەتعیی کۆمەڵ وەهایە هەر وەختی بووجەی موساعەدەی کرد لە داخیلی ئیقتیدارێدا بە هەموو ئەترافی کوردستاندا پەل بهاوێژێت.

خزمەتییەکەی تەعمیم بکات.

کۆمەڵەی زانستی ئەوا دەستی موعاوەنەت بۆ هەموو کوردێکی حەمییەتمەند درێژ ئەکات و چاوەڕوانی سەخا و سەماحەتتان ئەکات. ئەو پارمەتییەی لەم ڕێگایەدا دەکرێت، هەم دینەن، هەم میللەتەن ئەبێت بە سەبەبی پاداشتێکی گەورە.

ڕەئیسی جەمعییەت

لە ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ١١ - ١٧ ڕەمەزان ١٣٤٤ و ١ نیسان ١٩٢٦ەوە ئەم نووسراوە دەخوێننەوە پێش ٤٤ ساڵ.

مژدەیەکی گەورە بۆ هەموو کوردان

مەعلوومی خوێندەوارانی کیرامە، کە تا ئەمڕۆ هەموو ئارەزوو و ئەمەلمان حەسر کردووەتە سەر بڵاوکردنەوەی عیلم و مەعاریف. ئەوا ئیمڕۆ "شوکرەن لیللا" بە کەمالی ئیفتیخار بڕی ئەم سەعیە ئەخەینە بەرچاوی میللەت. بینا لەسەر تەشەببوساتی چەند کەسانێکی میللییەت پەروەر و تەسدیقی وەزارەتی داخلییە و موعاوەنەتی گەورەی جەنابی موتەسەڕیف و موفەتیشی ئیداری*، قەدردانی پرۆغرام، نیزامنامە (جەمعییەتی زانستیی کوردان) نەشر و ئیعلان دەکەین.

ئومێد وایە، کە ئەم جەمعییەتە بناغەیەکی علمیمان بۆ دابمەزرێنێ و پێشوازیی هەموو میللەت بکات و ئەم تەشەببوسە خەیرییەیە بۆ وڵات و میللەت بە فەئلێکی خێر و تەمەننا ئەکەین، کە ئەم جەمعییەتە بە سایەی هەموو ئەشراف و عولەما و توجاڕ و مونەووەرینەوە بژی و بەردار بێ.

بە نەشر و تەقدیمکردنی ئەم مژدە خۆشە و ئەم خەبەرە بە قیمەتە (ژیان) جیدەن مەسروور و موفتەخیرە.

پرۆغرامی جەمعییەتی زانستیی کوردان

ناوی جەمعییەت و مەرکەزی

١- ناوی جەمعییەت (جەمعییەتی زانستیی کوردان) و مەرکەزی سلێمانییە.

مەقسەدی جەمعییەت:

٢-مەقسەدی جەمعییەت تەعمیمی عیلم و مەعریفەتە لە کوردستان بەپێی ئەم وەسائیتە:

---

* قەدردانی ئینگلیزە و ئینگلیزەکەش لاین.

أ- بە نەشری غەزەتە و رەسائیلی موەقەتە.

ب- تەرجەمە و تەئلیفی کتێبی تەدریسییە و سائیرە.

ج- مەکتەب کردنەوە و ئیجرای تەدریسات بە ڕۆژ و بە شەو.

ح- بە سوورەتی موحازەرە، ئەهالی تەنویرکردن.

د- کتێبخانە کردنەوە.

هـ- بۆ ئیکمالی تەحسیل بۆ مەمالیکی موتەرەقییە قوتابی ناردن.

٣- جەمعییەت ئەحوالی تەئریخییە، جوغرافییە ئەتنۆغرافییەی کوردان بە سوورەتی مەخسووسە تەدقیقی مەحسوولی مەساعی نەشر دەکات.

٤- جەمعییەت بۆ تەئمینی مەحەببەت و مووانەسەت لە مابەینی ئەهالی و حکوومەتدا بۆ تەقوییەی ڕووحی ئیتاعەت بە سوورەتی مەخسووسە و بە واسیتە و ئەعزایانی مەخسووسبەند و نەسیحەت ئیجرا دەکات.

٥- جەمعییەت بە هیچ سوورەتێک لە گەڵ سیاسەتدا خەریک نابێ.

| | | |
|---|---|---|
| مەعرووف بەگزادە | موحامی | حاجی فەتاح زادە |
| فائیق | ڕەفیق تۆفیق | ڕەمزی |

نیزامنامەی داخیلی

سوورەت قەید و قەبوولی ئەعزا و ئیخراجات:

١- بلا تەفریقی جینس و مەزهەب، هەموو کەسێک بەو شەرائیتە، کە لە ژێرەوە نووسراوە ئەتوانێ بە قەراری هەیئەتی ئیدارەی داخلیی جەمعییەت ببێ.

أ- عومری لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ.

ب- لە حوقووقی مەدەنییە ساقیت نەبێ و ساحیب حوسنی ئەخلاق بێ.

٢- هیچ کەسێک موخالیفی مەقاسیدی جەمعییەت حەرەکەت بکات، یاخود مانگانە و دخوولییەی جەمعییەت نەدات یاخود حەرەکەتێک بکات کە لە ناو ئەهلی وەتەندا موخیللی شەرەف بێ، بە قەراری هەیئەتی ئیدارە لە جەمعییەت دەردەکرێت.

سوورەتی تەشکیلی هەیئەتی ئیدارە و وەزائیفیان:

٣- جەمعییەت بە واسیتەی هەیئەتی ئیدارەوە کە لە ٣ کەمتر نابێت و لە حەوت کەس زیاتر نابێ ئیدارە ئەکرێ.

٤-هەیئەتی ئیدارە بە ئینتیخابی ئەکسەرییەتی موجتەمیعین لە هەیئەتی عوموومی ئینتیخاب ئەکرێ.

٥- رەئیس کاتب و موحاسیبی جەمعییەت و مەئموورین لە هەیئەتی ئیدارەیی یاخود لە ئەعزای جەمعییەت تەعین و ئینتیخاب ئەکرێ، وەلاکین رەئیس نەبێ لە هەیئەتی ئیدارە بێ.

٦-هەیئەتی ئیدارە بۆ ئیجرای مەقاسید، جەمعییەت هەرچی لازم بێ ئەیکات " واریدات " و مەساریفاتی جەمعییەت تەسبیت ئەکات. بودجەی ساڵی موستەقبەل ئیحزار و تەقدیمی هەیئەتی عوموومییە ئەکات و هەموو ساڵێك هەرچی لازمە بکرێ بۆ ئیجرای مەقاسیدە جەمعییەت بە ڕاپۆرتێکی موفەسەڵ عەرزی هەیئەتی عوموومییە ئەکات.

٧- هەیئەتی ئیدارە، وەزائیفی مەئموورین و کەتەبە تەعین ئەکات و موراقەبەیان ئەکات.

واریداتی جەمعییەت و مەساریفاتی:

٨- واریداتی جەمعییەت عیبارەتە لە دخوولییە و مانگانەی ئەعزاکان و عیبارەتە لە تەبەڕوعات و هیبەی ئەسحابی خێرات.

٩- هەموو ئەعزایەك لە حینی دخوولیدا بە پێی ئیقتیداری خۆی مەجبوورە مەبلەغێك بە ناوی دخوولییەوە بدات. حەدی ئەسغەری ئەم مەبلەغە ڕوپییەیەکە. دیسان مەجبوورە بە پێی ئیقتیداری خۆی مانگی شتێك بدات بە جەمعییەت.

١٠- بۆ ئیجرای مەقاسید، جەمعییەت زیاتر بۆ شتیکی تر واریداتی جەمعییەت سەرف ناکرێ و هەموو مەسرەفێك بە ئەمر و تەسدیقی هەیئەتی ئیدارە ئەکرێت.

١١- هەیئەتی ئیدارە مەجبوورە ئەو دەفتەرانە کە قانوونی جەمعییەت ئەمری پێ ئەکات بیکرێ و ئەگەر ئیجابی کرد جگە لەو دەفتەرانە دەفتەری کەش بکرێ.

هەیئەتی عوموومییە:

١٢- هەیئەتی عوموومییە هەموو ساڵێك لە ئەوەلی تشرینی ئەووەلدا ئیجتیماع ئەکات و وەزائیفی هەیئەت ئەمەیە:

أ- واریدات و مەساریفاتی جەمعییەت تەسبیت ئەکات.

ب- ئیجاب بکات پرۆغرام تەعدیل ئەکات.

ج- هەیئەتی ئیدارە ئەز سەرنوێ ئینتیخاب ئەکات.

د- بۆ ساڵی ئاینده مەساعیی جەمعییەت تەنزیم ئەکات.

١٣- رەئیسی هەیئەتی ئیدارە، ڕیئاسەتی هەیئەتی عوموومییەش دەکات.

١٤- ڕەئیسی هەیئەتی ئیدارە، یاخود وەکیلێك کە جەمعییەت تەعینی ئەکات لە مەحاکم و دەوائیری حکوومەتدا جەمعییەت تەمسیل ئەکات.

١٥- چە لە هەیئەتی ئیدارە و چە لە هەیئەتی عومومییە، موزاکەرە و ئیتتیخازی قەرار بە ئەکسەرییەتی موجتەمیعین ئەبێ.

١٦- هەیئەتی عومومییە عیندەلئیجاب لەسەر دەعوەتی هەیئەتی ئیدارە جگە لە ئیجتیماعی عادی سنووری هەموو وەقتێك ئەتوانێ گرد ببێتەوە، وەزائیفی خۆی بە پێی ئەم پرۆگرامە بەجێ بێنێ. ٢٧ کانوونی سانی ١٩٢٦.

مەعرووف بەگزادە　　موحامی　　حاجی فەتاح زادە

فائیق　　ڕەفیق تۆفیق　　ڕەمزی

ئەمری مەئزوونییەتی وەزارەتی داخلییە

الحكومة العراقية

وزارة الداخلية

العدد ٢٥٧١

التاريخ ٢٤ / ٢ / ١٩٢٦

سعادة متصرف لواء السليمانية المحترم

الموضوع: جمعية زانستی کوردان

بعد التحية

بالإشاره الى كتابكم المرقم ر٥ - ٢٤ والمؤرخ فی ١ / ٣ / ١٩٢٦ عملاً بقانون الجمعيات لسنه ١٩٢٢ يؤذن بتأسيس جمعيه (زانستی کوردستان) على أن يطبق مؤسسوها تصرفهم فيها على قانون الجمعيات وعلى المنهج المربوط و لسيادتكم الإحترام.

وزير الداخلية

صوره منه الى:

سعادة مدير الشرطة العام المحترم

المفتش الأداري في لواء السليمانيه المحترم

سورەتی تەرجومەی ئەمری وەزارەتی جەلیلەی داخلییە

مەوزووع: جەمعییەتی زانستیی کوردان

لە پاش ئیحتیرام

جەوابی تەحریراتتان کە بە تەئریخی ١/ ٢ ١٩٢٦ بە ٥ – ٢٤ نومرە نووسراوە، بە مووجیبی قانوونی جەمعییاتی ساڵی ١٩٢٢ مەئزوونن بە دامەزراندنی جەمعیەتی (زانستیی کوردان) بە شەرتی مونەسەسەکانی تەسریفیان تەتبیقی قانوونی جەمعییات و پرۆغرامی مەربووت بکەن. نیتر ئیحتیرام.

وەزیری داخلییە

تەبلیغی حەزرەتی موتەسەرپفی

بۆ جەنابی: رەمزی ئەفەندیی حاجی فەتاح، رەفیق ئەفەندیی تۆفیق موحامی، فائیق بەگ مەعرووف بەگ

ئەوا سوورەتی تەحریراتی وەزارەتی جەلیلەی داخلییە ژمارە ٢٥٧١ رۆژی ٢٤ شوبات ١٩٢٦ لەگەڵ سوورەتیکی ئەو پرۆغرامەدا، کە تەسدیق و ئیعادە کراوەتەوە بە پێچراوەیی نێررا. بە پێی مەفادی موساعەدە فەرمووراوە بۆ تەئسیسی جەمعییەتی زانستی. بینائەن عەلەیهی موافیقی ئەو ئەمر و پرۆغرامە، ئەتوانن موباشەرەت بفەرموون. ئیتر ئیحتیرام.

ئەحمەد

موتەسەرپفی لیوای سلیمانی

سوورەتێکی بۆ زانین بۆ:

– مەعالیی وەزارەتی داخلییەی جەلیلە
– سەعادەت مەئاب موفەتیشی ئیداری
– جەنابی والای موعاون مودیری پۆلیس

ئیجرای ئیحتیفال بە رەسمی گوشاد(جەمعییەتی زانستی)

شەوی شەمووی ئاتی، کە موافیقی ٣ / ٢ نیسان ١٩٢٦ هەیئەتی مونەسیسەی جەمعییەتی زانستی کوردان لە دائیرەی بەلەدییەدا بە حەفلەیەکی رەسمی گوشادی جەمعییەت ئیجرا دەکات. تەمەننا ئەکەین، کە ئەم ئیجتیماعە گەورە عیلمییە ببێتە فاتیحەی تەرەقی و سەعادەتمان و ئەم تەشەبوسە بە ئەهەمییەتەی هەیئەتی مونەسیسەی جەمعییەتی مەزکوور تەقدیر[1] و تەبریك ئەکەین.

---

١. رۆژنامەی ژیان.

**بۆ خوێندەوارانی ئیمڕۆ**

ئەو کۆششەی کە ٤٥ ساڵ لەمەو پێش لەم شارەی سلێمانییەدا کرا و پاسا و تێکۆشینەکەتان خوێندەوە، بناغەی پێگەیاندنی ئێوە و نەوەی دواڕۆژمانە. بۆ بنچ داکوتانی ئەم کۆمەڵە و دامەزراندنی زانستی کوردان زۆر هەوڵ درا. ئەم زانستییە ئەوەیە، کە زۆر ڕۆڵەی نەخوێندەواری شاگرد خەیات. بەقاڵ.... ی زۆریان دانشگاهیان تەواوکرد. دکتۆر، موهەندیس، موەزەفی پێ گەیاند. بەڵام ئەو دیمەنەی کە هەموو پاش نیوەڕۆیەك، خێزان بە کۆمەڵ منال بە باوەشی دایك و باوکەوە و بەڕاکردن منالانی سەر دووکانیان بەرەو زانستی دەڕۆیشتن، چە فیلمێکی جوانی سینەمایی پێشان ئەدا؟

پێشکەوتن، ڕوو بە ئازادیی دەخستە ئاوێنەیەکی پاکی بێگەردەوە. باوەڕ بکەن نەدەبینرا، کە یەکێك لە پارەتی دریغ بکات تەنانەت تا قوتابی (ئانە)ی ڕۆژانەکەیان لە دەمی خۆیان نەگرتەوە و نەیانخستە ناو سندووقی پاشەکەوتی زانستییەوە. دڵسۆزیی لیژنەی بەڕێوەبەریش ئەتوانم لە وێنەی باوکێکی دڵسۆز بەرامبەر بە کوڕە تاقانەکەی پێشان بدەم. بارەگای زانستی، بارەگای پەرستش بوو. چیی لێ هات؟ تۆ بیڵێ.

**ئاسایش**

لە هەموو کوردستاندا بە چاو هەندەرانەوە هەرگیز زۆرداری و ملۆزمی نەبووە. بەتایبەتی لە کاتی شۆڕشەکاندا پترتر ئەهوەنیی ژیان دروست بووە. بەڵام لە ١٩٢٧ەوە تا ١٩٣٠ هیچ بزووتنەوەیەك ڕووی نەدا، کە شایانی باس بێت بێجگە لە ئاسایش و خۆشیی ژیان. ئەو خۆشییەی، کە هەستی نیشتمان و گەلپەروەری بوو هەمیشە وەکو گوڵ بە دەم هەموو یەکێکەوە لە گەشانەوەدا بوو. یەکدڵی، یەکسانی ئەوەندە لە برەودا بوو، مرۆڤ هەبوو خۆیان لە خێزانێکدا دەبینی و هەموو کوردستان بە ژوورێك.

جووتیار بە زەوی و زارییەوە، فەرمانبەران بە ئیش و کاریانەوە، بازرگان بە کڕین و فرۆشتنیانەوە، هەر کەسە بە هونەری خۆیەوە خەریك بوو، تەنیا ئەوەی بەرامبەر بە گشتی بوو و هەموو وەکو یەك پەیوەستی بوون، نیشتمان بوو.

گەل بە خشەخش و تیلیلی پێی نایە ساڵی ١٩٣٠، ساڵی پڕ ئاشووب ساڵی ئەهات. سوپاسی زۆر بۆ ئەوانەی لە پێناوی زانستیدا ماندوو بوو و کۆشش و بەڕێوەبردنەکەی کەریم زانستی، کەریم بەگی سەعید بەگ زۆر شایانی سوپاس و یادە.

## چۆن ٦ی ئەیلول ڕووی دا و نامەکانی شێخ مەحموود
## بۆ مەندووبی سامی و عوسبەتولئومەم

**لە سلێمانی و ناو کوردەوارییدا**

وەرتە وەرتی بڕیاری عوسبەتولئومەم (عصبة الامم) کە لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥دا بڕیاری دابوو کەوتە ناو ناوان، دەیانوت لە بەندی (٣)یەمی ئەو بڕیارەدا بەم چەشنە باسی کوردی کردووە و دەڵێت:

مادە ٣

بەو بۆنەیەوە، کە حکوومەتی بەریتانی دەست بەسەرداگرتووی (عێراق)، داوای لە کۆمەڵی عوسبە کردووە، کە کوردەکانی عێراق لە بابەت دامەزراندنی بەڕێوەچوونی ناوخۆییانەوە بڕیاری داوە هەر وەکو لیژنەی پرسیاریش ڕاسپێری کردوون، داوا دەکرێ.

**قسەکانی ڕەئیسولوزەرا مەندووبی سامی و مەلیک فەیسەڵی یەکەم**

ئەم بۆڵە بۆڵە زۆری تەنییەوە. دەوترا ئەو ناوخۆییە چی بێ هەر کەسە بە چەشنێك لێکی دەدایەوە، ئەم منجە منجە زۆر گەورە بوو، گەل کەوتە جوست و جۆ و دەفتەری کۆن دۆزینەوە

بە بۆنەی باسی مادە ٣ی باسکراو و سپاردنی بڕیارەکەی عوسبەتولئومەم بە حکوومەتی عێراق، وێنەی ڕاپۆرەکەی حکوومەتی عیراق بڵاوبووەوە. ئەمەیش قسەکانی ڕەئیس وەزرای عێراقە کە لە کۆمەڵی نێرراواندا ڕۆژی ٢١کانوونی دووەمی ١٩٢٦دا دەفەرموێت:

براینە، ئەم وڵاتە نازێ ئەگەر مافی ئەوانەی لەگەڵمان دەژین نەدرێت. پێویستە مافی کورد بدەین، مووەزەفیان لە خۆیان بێ و دەبێ زمانەکەیان بە زمانێکی ڕەسمی بزانرێت و منداڵیان لە قوتابخانەیاندا بە زمانی خۆیان بخوێنن. لەگەڵ ئەمەیشدا ڕێزی هەموو ئاین و گەلەکانی ناو عێراق دەبێت وەکو یەك بزانرێت.

ئەم قسانەی سەرەوە بە هەموو وەزارەتەکاندا و لە ڕۆژنامەی میری و عێراقییەکاندا بڵاوکرایەوە، کە دەبێ لە کوردستاندا هەموو مووەزەفیان کورد و زمانەکەیان ڕەسمی و خوێندنی

قوتابخانەکانیان بە کوردی بێ. دیسان هەر بەم بۆنەیەوە موعتەمەدی سامی لە هۆلێیعتیمادا کۆبوونەوەیێکی کرد و لەم کۆبوونەوەیەدا مەلیکی عیراق فەیسەڵ و بێگومان سەرۆك وەزیرەکانی عێراقیش دانیشتبوون، وتی:

ئەمانەوێت بۆ بەڕێوەبردنی عێراق بە رێگەی ڕاستدا نەوە و گەلێکی ڕاست و دڵپاك پێکەوە بنێین. ئەبێت هان بدەین، کە هەموو یەکێك بە ئاینی ئایندەری و هەموو گەلێك بە گەلەکەی سەربڵند بێت. چونکە کورد نابێ بە عەرەب و عەرەبیش نابێ بە ئسویچێك، ئینگلیز، کە بتوانن بە خورتی زمانی عەرەبی و ڕەوشی عەرەبییان پێ فێر بکەن. پێویستە لە جیاتی ئەوەی بیانکەن بە عەرەب یارمەتییان بدەن، کە ببن بە کوردێکی باش و ئەوەیە یەکیەتیی دەوڵەت. بۆ ئێوە ئەم هەستە زۆر بە سوودە عوسبەتولئومەم باوەڕ بکات، کە عێراق دەتوانێت ببێ بە ئەندامی کۆمەڵەکەیان.

مەلیك فەیسەڵ لە وەڵامدا:

هەموو عێراقییەکی ڕاست و دڵپاك بەرامبەر بە عیراق دەبێت لەو بیر و باوەڕەدا بێت بۆ بەرزکردنەوەی برا کوردەکانیان.

٢٤ شوبات ١٩٢٦

لەندەن

### نامەی نێرراو – مەندووبەکان[1]

هەر لە مانگی شوباتی ١٩٢٧دا لە لایەن جەمال بابان و سەیفوڵلا خەندان و حازم شەمدین ئاغا و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و محەمەد بەگی جاف و محەمەد سالح بەگی حەمە عەلی بەگ، نێرراوانی کوردەوە ئەم نامەیە پێشکەش بە سەرۆك وەزیرانی عێراق کرا:

١– پەرە پێساندنی زانیاری – مەعاریفی کوردستان.

٢– دروستکردنی یەکپارچەیی بەڕێوەبەری (وحدة إدارية كردية) بە لیواکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووك ئاوێتەی ناوچە کوردەکانی لیوای مووسڵ بەو مەرجەی لە لایەن موفەتیشێکی گشتیی کوردەوە بەڕێوە بچێت و ببێت بەهۆی پەیوەستیی کوردستان و حکوومەتی بەغداوە.

٣– زۆرترکردنی پارە و تفاق بۆ وڵاتی کوردان

---

١. القضية الكردية. الدرة.

لەسەر ئەم نامەیە:

حکوومەتی عیراق و مەندووبی بەریتانی کەوتنە گفتوگۆ، مادەی دووەمیان لابرد، ئەوانی تریان پەسەند کرد، بەو مەرجەی زمانی کوردی ببێ بە زمانێکی ڕەسمی و یاسایی لە هەموو کوردستاندا، کە دانیشتووانی کوردن. بەڵام مەلیك فەرمانی دا، کە ئیتر هەرگیز ئیسماعیل بەگ و حازم بەگ نەکرێن بە نائب. ساڵی ١٩٣٠.

ئەو ورتە ورتانەی خوێندنەوەی پێشوازیی ١٩٣٠ بوو. بەپێی بڕیار لەم ساڵەدا دەبێت ئەندامی عێراق لە عوسبەتولئومەمدا دانیشێ و بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و ئازاد بزانرێت. ئەم دەنگە زرنگایەوە. پیاوە کار نامەدەکانی کورد* کەوتنە خۆیان و بە هەموو لایەکدا کەوتنە داوا و نامەنووسین و بڵاوکردنەوەی لە عێراقدا و وێنە بۆ عوسبەتولئومەم.

بەڵام کورد وای زانی، کە ئەو مادە ٣یەی بڵاوکرایەوە ئەو قسانەی بۆ کوردی کرد ئیتر مەندووب و ئینگلیز بە جارێك دەستی برایەتییان خستۆتە ملی کورد و ماف و سەربەستییان بەو فڕۆکەیە، کە لە ئاسمانی کوردستاندا دەسووڕێتەوە، بەڵام نەیاندەزانی بۆمبایە.

لەگەڵ عێراقدا ئەم بەندەی دارشت

دەبێت سلێمانی موتەسەڕیفییەت بێ و موتەسەڕیفەکەش لە خۆیان و لە لایەن (ئینگلیز)ەوە دابنرێت و دانشمەندێکی ئینگلیزیشی لەگەڵدا بێت. هاتووە بە پێویست بینرا لە جیاتی موتەسەڕیف دەشێ حاکمێکی سیاسی دابنرێت (بێگومان ئینگلیز)، لە پێویستیشدا قائیمقامەکانیش بەریتانیایی دەبن و لە لایەن مەندووبی سامییەوە دەسەڵات (سلطة)یان دەدرێتێ تاوەکو لە کوردەکاندا پیاوی تێگەیشتوو پێ دەگات.

ئێستا لێرانەدا پێویستە پرسیارێك بکرێت. ئایا کە ئینگلیز هاتە ئەم کوردستانە، کورد پیاوخۆر و کێوی بوو، کە تازە (دەیەوێت پیاوی تێگەیشتوو پێ بگات؟). بۆچی نازانن، کە چەند ڕەئیسولوزەرا (صدر أعظم) و مارشاڵ فەرمانەدەی دلێر و موتەسەڕیف و زابتی کورد کاربەدەستی حکوومەتەکانی پێشوو بووبوون و ئێستاش؟

لە پڕ مامۆستای مەزن تۆفیق وەهبی بەگ کرا بە موتەسەڕیف و نێررا بۆ سلێمانی. بێگومان بە ئارەزووی حکوومەتی عێراق نەبوو، بەڵام حکوومەتی عێراقی پێ ڕاچڵەکاند و کوردیش پێی خۆش بوو.

---

* بە تایبەتی میرزا تۆفیق قەزاز.

• سلێمانیدا

نە هەموو کوردستاندا کورد بێجگە لە داوای خۆی نەهیچی دەزانی و نە هیچیان دەبینی. وتنە نامە بلاوکردنەوە

ئەی میللەتی کورد

بە دیقتەوە گوێ بگرن، وجدانی ملی، روحی پێشینان و پاشینانتان خیتابتان ئەکاتێ. داوای تێکوشین و تێ هەڵچوونتان لێ دەکات.

ئەی کورد

لەم عەسری میللییەت و ئازادییەدا، لەم عەسری نوور و سەربەستییەدا، تەنها هەر کوردی بێچارە زەلیل و بێ بەش ماوەتەوە. وەتەنی کورد وەك ماڵی مناڵێکی نابالغ بەسەر بێگانەدا دابەش کراوە.

مەعلوومی هاوخوێنە خۆشەویستەکانمانە، لەم چەندانەدا معاهەدەیەك لە بەینی حکوومەتی بەریتانیا و عێراقدا بەستراوە هەرچەندە موافقی مقەرەراتی (عصبة الأمم) و سائری وعوودی بەینەلدەولی ئەبوایە مەسەلەی کوردستان بخرایە ئەوەل بەندی ئەم معاهەدەیە. فەقەت بە کەماڵی تەئەسوف و تەعەجوبەوە ئەبینین، کە ئەمە کولییەن ئیهمال کراوە بەپێی ئەم معاهەدەیە ئینتیدابی ئینگلتەرە لە عێراقدا نیهایەتی هاتووە، کە لەو حاڵەدا لازمە قەراری (عصبة الأمم) لە خسووسی کوردەکانەوە حەرفییەن تەتبیق بکرێ.

(بناءً علیه)، ئێمە بە پشتیوانیی ئێوە هەتا ئێستا بە وەسائیلی موختەلیفە بۆ موحافەزەی حقووقی کورد لە جوهد و موارەجەعات غافل نەبووین و هەتا ئاخیر نەفەس دەوام ئەکەین. هەدەف و غایەی کوردان تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە لەژێر نەزارەتی (عصبة الأمم)دا. بۆ مەشروعییەتی ئەم تەڵەبە دوو دەلیلی غەیری قابیلە ڕەدمان بەدەستەوەیە:

١. قەراری (عصبة الأمم) سەراحەتەن ئەڵێ وەقتێ کە ئینتیداب نیهایەتی هات، ئەبێ بۆ کوردەکان موافەقەتی رەغائیبی خۆیان حکوومەتێکیان بۆ تەشکیل بکرێ.

٢. بەیانێکی ڕەسمی موشتەرەك، کە لە ڕۆژی ٢٤ کانوونی ئەوەلی ١٩٢٢دا لە تەرەف حکوومەتی بەریتانیا و عێراقەوە نەشرکراوە، ئەم بەیانە بەوەجهی ئاتییە:

حکوومەتی (صاحب الجلالة) بەریتانیا و حکوومەتی عێراق ئیعتراف ئەکەن بە حقووقی ئەو کوردانەی لە داخلی حدوودی عێراقدا ساکنن، بۆ تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە لە داخلی ئەو حدوودەدا و حکوومەتی بەریتانیا و عێراق ئومێدیان هەیە کە عەناسری موختەلیفەی کورد لە

بەینی خۆیاندا ڕێ ئەکەون بۆ خسووسی حدوود و شکلی ئەو حکوومەتە کوردییە و بۆ ناردنی موفاوزینی مەسئوول بۆ بەغداد، کە مزاکەرە بکەن لە بابەت مناسەباتی ئیقتسادییە و سیاسییەیان لەگەڵ حکوومەتی ئینگلتەرە و عێراقدا.

ئەی میللەتی نەجیب

پاش ئەم تەفسیلاتە، ئیخبارتان ئەکەین، کە ڕۆژی یەکشەمە ١٠ تۆغستۆس ٩٣٠ مەندووبی سامی و ڕەئیس وزەرای عێراق بۆ مزاکەرەکردنی ئەم مەسئەلەیە دێن بۆ سلێمانی. قەناعەتی تامەتان هەیە، کە هەموو کوردەواری یەك دڵ و یەك زیان لە تەڵەبکردنی ئەم حەقە مەشرووعەدا پشتیوانمانن.

ئەی کورد

تاریخ لاپەڕەکانی کردۆتەوە حەرەکاتمان تەسجیل ئەکات، محافەزەی شەرەفی ڕابوردوو و نامووسی ئایندەمان بەدەست نەسلی حازرەوەیە. ئێوەش خۆتان و غیرەتتان.

عەزمی بابان، عەبدولقادر حەفید زادە، حەمە ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا، عیزەت عوسمان پاشا، حەمە ساڵح حەمە عەلی بەگ، شێخ محەمەد گولانی، عەبدوڕەحمان ئەحمەد پاشا، فائق بابان، تۆفیق محەمەد قەزاز، رەمزی حاجی فەتاح.

لە ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ٢٥٧ ڕۆژی پێنجشەمەی ٢٠ ڕەبیعونەووەل ١٣٤٩ی ١٤ تۆغستۆس ١٩٣٠دا ئەڵێت: تەشریفهێنانی فەخامەتی وەکیلی مەندووبی سامی و وەکیلی ڕەئیسولوزەرای عێراق بۆ کەرکووك و هەولێر و سلێمانی.

مجادەلەی کوردان

لەسەر مراجەعاتی موتەمادیی کوردانی لیوای سلێمانی و کەرکووك و هەولێر فەخامەتی وەکلیلی مەندووبی سامی و وەکیلی ڕەئیسولوزەرای عێراق ڕۆژی جومعەی ١٩٣٠/٨/٨ لە بەغداوە تەشریفیان هێنایە کەرکووك و لەعەینی ڕۆژدا لە قشڵەدا عموومی لە شراف و ئەعیانی کەرکووك و رونەسا گەورەکانی ئەو لیوایە کە هەموو کوردن کۆیان کردەوە، لە دوای بەستنی کۆمەڵەکە ڕەئیسولوزەرا هەڵسا ئەو بەیانەی، کە هەموو کوردێك خوێندوویەتەوە و لەپێشا نەشر کرابووەوە، کە گوایا حکوومەتی عێراق قەراری داوە بۆ کوردەکان موقەڕەراتی (عصبة الأمم) تەتبیق بکات خوێندیەوە و لە عەقبی ئەوەوە فەخامەتی مەندووبی سامیش هەڵسا و نوتقی خوێندەوە و تەئیدی بەیانەکەی حکوومەتی عێراقی کرد و فەرمووی ئێمەش لەگەڵ عێراقدا موتەحیدین بۆ تەتبیقی موقەڕەراتی (عصبة الأمم)، لە دوای ئەمانە عەبدوڵڵا سافی ئەفەندی

حقوویی هەڵسا و گوتی:

ئەم بەیانە زۆر موتەشەکیرین، زاتەن ئەم لیوایە عیبارەتە لە تورك و عەرەب یەعنی خووسەکەی سەد هەزار لەم دوو عونسرەیە و ئێمە عێراقین و لە وەحدەتی عێراقا جیا نابینەوە و مستەفای برایشی عەینەن تەئیدی قسەکەی کاکی کردەوە.

بەڵام ئیتر لە حازیروون و لەو هەموو قەڵەبالغە غەیری فارس ئاغای بەیات نەبێ، کە پیاوێکی عەرەبە و شێخ محەمەد حەبیب ئەفەندی تاڵەبانی نەبێ، کە چونکە قازی و مەئموورە و مەجبوورە، کەسێکی تر تەئیدی نەکردنەوە و هەتا چونکە قسەکانی عەبدوڵڵا سافی ئەفەندی هەمووی عیبارەت بوو لە بەیاناتێکی غەیرە حەقیقی و بەئاشکرا مەوجوودێکی ئەکسەرییەی کوردی پەنهان کرد. وەتەنپەروەر و جوانمەردی غەیووری کورد محەمەد بەگ جاف مەندووبی پێشووی کەرکووك هەڵسایە سەرپێ و بە هیمەتێکی مەردانەوە و بەدەنگێکی بەرز فەرمووی لیوای کەرکووك ئەکسەرییەتی عەزیمەی کوردن یەعنی لە ١٥٠ هەزار ١٢٠ هەزاری کوردێکی خاڵسە، ئەنجا ئەگەر بەزیادەوە حسابی بکەین ئەوی تری ئەنجا تورك و عەرەبن و ئەم قسەیەی منیش مەعلوومی جیهانە و بە ئیحسائیات مەعلووم و ئاشکرایە و فەرمووی بەندە، لێرەدا تەمسیلی عەشیرەتێکی زۆر گەورە وەکو جاف ئەکەم، غەیری ئەمیش ڕوئەسای داودە و زەنگنە جەباری، شوان و سائیرەی ڕوئەسای کوردان لەم مەجلیسەدا حازرن بەندەیان تەوکیل کردووە، کە بەناوی عوومە عەرزتان بکەم، کە ئەم کوردانە بەیەك وجوود و یەك زوبان داوای تەتبیقی مقەرەراتی (عصبة الأمم) ئەکەن: (ئەمە حەقمانە و ئەم حەقەمان ئەوێ و هەتا ئاخیری تەعقیبی ئەکەین). لە دوای ئەمە عەبدوڵڵا سافی بەگ قەهوورانە، کە خیلافی ئاداب و ئیجتماعیات و هەڵسا، گوتی: ئەم زاتە بەناوی کێوە قسە ئەکات. جاف عائیدی سلێمانییە. هەمووی دوو ساڵە ڕەبتی کەرکووك کراوە، با بچێتە سلێمانی داوای حەقی خۆی بکات. لەسەر ئەوە محەمد جافیش هەڵسا و جوابی دایەوە: من بەناوی ١٥٠ هەزار جافەوە قسە ئەکەم من کوردم و بە کوردی ئەژیم و بە کوردی ئەمرم. ئەم مەملەکەتە هی کوردە لەبەرئەوە هەموو کوردێك هەقی ئەوەی هەیە لە مەملەکەتی کوردیاندا بەئاشکرا تەڵەبی حقووقی میللەت و وەتەنەکەی بکا. وە حەقیقەتەن خوێنی کوردایەتی بەئاشکرا لە دەمارەکانیا بە شیدەتەوە جەولانی کرد. لەو ئەسنایەدا جەعفەر پاشا هەڵسا و ڕووی کردە محەمەد جاف گوتی: بە شەرەفی حکوومەت و خۆم تەئمینت ئەکەم کە بەتەواوی مقەرەراتی (عصبة الأمم)تان بۆ تەتبیق ئەکرێ و ئەم لیوایەش ئیستیفادەی لێ ئەکات و محەمد جافیش لە جوابیدا وتی: سا باشە تەشەکورتان ئەکەم. لەو ئەسنایەدا جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی خانەقا و سەید محەمەد ئەفەندی جەباری و سائیری ڕوئەسا موحتەرەمەکانی کورد عەلەنەن هەڵسان تەئیدی محەمەد

بەگی جاف و حقووقی کوردیان داوا کردەوە و بەم نەوعە مناقەشەکە دوایی هات و کۆمەڵەکە بڵاو بوونەوە.

### هەولێر

ڕۆژی ۱۹۳۰/۸/۹ لە کەرکووکەوە تەشریفیان بردە هەولێر لەوێش لە سەعات نەی ئینگلیزیدا لە سەرا لە مەقامی موتەسەرفیدا (من خۆم – نووسەر) لە هەولێر بووم. لە نادی (یانە)ی فەرمانبەران کۆبوونەوە کرا و لە دوای ئەم باسەدا بینراوەکانی ئێمەش ئەخوێننەوە.

ئەشراف و ڕوئەسای عەشایرەکان کۆبوونەوە. (رئيس الوزراء) ئەو بەیاناتەی، کە لە کەرکووکیش خوێندبوویەوە، دیسان خوێندیەوە و فەخامەتی مەندووبی سامیش هەڵسا و نوتقێکی خوێندەوە. لە دوای ئەمانە جەنابی محەمەد ئەفەندی ئەعیان و وەتەنپەروەری غەیوری کورد هەڵسا فەرمووی: لە پێش ئەمەدا قسە بکەین ئیجاب ئەکات ڕوئەسای عەشایر فیکری خۆیان بەیان بکەن چونکە ئەوانیش مەزبەتەیان تەقدیم کردووە. مەندووبی سامی فەرمووی باشە. لەسەر ئەوە ڕوئەساکان گوتیان بە عموومی جەنابی خدر بەگی ئەحمەد پاشای لە ڕوئەسای دزەییمان کردووە بە وەکیل، مووما ئیلەیهی هەڵسا و گوتی: ئێمە هەموو عەشایر موتەفیقەن تەئیدی مەتالیبی ئەهالیی سلێمانی ئەکەین. ئێمە لەگەڵ سلێمانیدا ئەژین و ئەمرین، یەکێکین. ئیسترحام ئەکەین ئەم ۳ لیوایە کەرکووک، سلێمانی، هەولێر، نابێ لە یەك جیا بکرێنەوە. هەرچی بە سلێمانی بدرێ ئێمەش ئیستیفادەی لێ بکەین، لە دوای ئەمە جەنابی ئەعیان ئەحمەد بەگ[1] هەڵسا فەرمووی ئێمە کوردین و حقووقی خۆمان ئەوێ. بەندە چەند ساڵە لە خزمەتی حکوومەتتام و تێ گەیشتووم، کە کورد بە عموومی لەسەر حقووقی خۆی ئیسدار ئەکات و ئەم حەقە بە قەراری (عصبة الأمم) دامەزراوە پێویستە بماندرێتی (و لەسەر ئیعتیراز و تەئسیری جەعفەر پاشا) خیتابەن بە جەعفەر پاشای گوت: پاشا تۆ بۆ عەرەبەکان بنچینەت دانا، ئێمەش هەقمانە لە ڕێی ئەم هەقە میللییەمانا ڕووحی خۆمان فیدا کەین، کەس حەقی عیتابی نییە و قەراری (عصبة الأمم) ئەوەیە: لوغەتی کوردی ڕەسمی بێ. ئێمە بۆ ئەم هەقە موسیرین و لە پاش ئەم گفتوگۆیانە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی هەڵسا گوتی پاشا ئێمە لەم قسە پڕ و پووچانە تێر بووین. بەحسی موستەقبەل ئەکەن، موستەقبەل هەم سویحەینێ و هەم دە ساڵی و هەتا ئاخیری هەر موستەقبەلە. ئێمە حالەن تەتبیقی قەراری (عصبة الأمم)مان ئەوێ وە فەورەن ئەبێ لیوای دهۆك تەشکیل بکرێ. میللەت بە ئارەزووێکی قەتعی داوای ئەم تەڵبە ئەکات. لە پاشان مەعرووف بەگ جیاوك هەڵسا و گوتی وابزانم جەنابی فەخامەت

---

۱. لەوە پێش موتەسەریفی هەولێر و سلێمانی بوو.

مەناب وەکیلی موعتەمەدی سامی ئەفەرمویت دوو قسە بکەم. بەندە عەرزێك و سوئالێکم هەیە. ئەو بەیانەی جەعفەر پاشا خوێندیەوە دوو شتی تێ گەیشتم، ١. تەڵەبی وەحدەتی عێراقی، کورد و عەرەب ٢. عەدەم تەئیدی حقووقی کوردان بە مادەیەکی خاس لە معاهەدە.

لە پێش جوابداندا جەنابی مەندووبی سامی فەرمووی، کە بەعزێ مەحافیل وا زەن ئەکەن، کە ئێمە تەشویقی بەعزێ کەس ئەکەین و ئەگەر کەسێك وا بێ و بێتە (دار الإعتماد) و لە دواییدا لە خۆیەوە قسەیەکی وای کردبێ، ڕەدی ئەکەینەوە. ئێمە لەگەڵ حکوومەتی عێراقی یەکین.

بەندە لەسەر ئەم فەرموودەیە ئەڵێم، ئەبێ فەخامەت پەنا و جەعفەر پاشا چاك بزانن، کە بەندە کوردم و هەموو وەکو من تابیعی هیچ تەئسیرێك نییە. میللەتی کورد بە سائقی وجدانی قسە و ئیدیعای حقووق ئەکات.

بەڵێ زۆر دەفعە بەعزێ کەس و بەعزێ لە کوردەکان و کە تا ئێستا لە مەوقیعی گەورەدان، بەمنیان ئەگوت: ئێوە بە پەنجەی ئەجنەبی ئەم تەڵەبە ئەکەن.

مەندووبی سامی پرسیی: ئەجنەبی کێیە؟

ئەجنەبی یەعنی ئێوە، ئینگلیز. کە دەلیلم ئەوەیە پارساڵ ئەم جەمال بابانە، کە دانیشتووە و وەزیرە بە مەزبەتە ئیدعای حقووقی میللیی کردبوو، دیسان بەم تەحرە ئیتیهامیان کرد.

بێینەوە سەر حقووقمان: جەنابی فەخامەت مەناب، وەکیلی مەندووبی سامی چاك ئەیزانێ، کە حکوومەتی بەریتانیا بە شەرەفی تەعەهودی کردبوو، کە مقەرەڕاتی (عصبة الأمم) تەتبیق بکات، ئێستا هەموو کوردێك مونتەزیر و ئەمینە کە جەعفەر پاشا لەباتی ئەو کاغەزەی لە جانتاکەی دەری ئەهێنێ، مقەرەڕاتی (عصبة الأمم)ی لەگەڵ خۆیا بهێنایە و عەلەنەن بیخوێندایەوە، کە هەموو کەسێك تێ بگەیشتایە (مع ما فیە) بەندە بە نەزەرێکی حقووقی خوێندوومەتەوە و جەمال بابان و جەعفەر پاشایش ئەیزانن، کە من حقووقیم (لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا و مەندووبی سامی و موفەتیشی ئیداری دەستیان کرد بە سرکە سرك و موفەتیشی ئیداری چووە دەرەوە). مقەرەڕاتی (عصبة الأمم) چییە؟ ١. ئەبێ مەئموورەکانی کوردستان لە عونسوری کوردی بن. ٢. لوغەتی کوردی رەسمی بێ. لەم ئەسنایە موفەتیشی ئیداری گەڕایەوە و لەناو فایلێکا مقەرەڕاتی (عصبة الأمم)ی تەسلیمی مەندووبی سامی کرد. ئەویش فەرمووی ئەمە مقەرەڕاتی (عصبة الأمم).

(ملاحظە): (لەپێش ئەمەدا جەعفەر پاشا موسیرەن ئەیگوت ناڵێ مەئموورەکانی کورد لە عونسوری کوردبن. ئەڵێ هەر کوردی بزانن). مەندووبی سامی خوێندیەوە و تەرجەمە کرا و مەعلووم بوو، کە مادەکە ئەڵێ ئەبێ مەئموورەکان لە عونسوری کورد بن.

لەسەر ئەوە ئەحمەد ئەفەندی هەڵسا فەرمووی ئەمە تەئویل و تەفسیر قەبوول ناکات چونکە سەریحە و مەعلوومە. لەو وەقتەدا جەعفەر پاشا ئەختێك شڵەژا و مەوزووعیان گۆڕی. فەقەت جیاوك ئەوامی کرد گوتی بە مەندووبی سامی، وا ئەزانم فەقەرەی ئەخیری قەراری (عصبة الأمم) ئەڵێ: "ئەگەر تەبدیلێك لە حکوومەتی عێراق بوو ئەبێ حوکمێکی زاتی بە گوێرەی رەغائیبیان بدرێ بە کوردەکان". مەندووبی سامی فەرمووی دوێنێ ئەم قسەیەم لە کەرکووکیش بیست، مادەیەکی وا نییە. جیاوك جوابی داپەوە لە نیهایەتی لائیحەی هەیئەتی (عصبة الأمم) لە سەتری ئەخیریا ئەم مادەیە مەوجوودە، بەندە تەقدیمم کردووە و مەنزووری عالیشت بووە.

مەندووبی سامی: ئەو لائیحەیە قەراری (عصبة الأمم) نییە.

جیاوك: بەڵێ ئەم لائیحەیە لە تەرەفی (عصبة الأمم)ەوە تەسدیق کراوە و بڵاو کراوەتەوە و شکڵی قەراری وەرگرتووە.

لەدوای ئەمە جیاوك هاتە سەر ئەسڵی مەوزووع گوتی: وەکو عەرزم کرد بەیاناتەکەی جەعفەر پاشا دوو شتی تیایە: ١. ئیتحادی کورد و عەرەب. جەعفەر پاشا چاك ئەزانێ ئێمە لە گەڵی عەرەب مومکین نییە بە سوورەتی تەوحید (جیاوك پەنجەکانی خستە ناو یەکتر) گوتی بەم سوورەتە بژین، فەقەت بە سوورەتێکی (ئینجا ئەم جارە پەنجەکانی جووت کرد)، گوتی: قابیلە بەم نەوعە وەکو ئۆستریا و مەجەرستان بژین. وە هەموو کەسێك ئەمەی ئیدراك کردووە میللەت لە حاڵی ئینتیباهدایە. لەپاش ئەمە جەریدەکانی بەغدا هاوار ئەکەن ئەڵێن ئێمە عەرەبین و حکوومەتمان عەرەبە، ئەبێ کوردەکان وەکو ئەرمەنییەکان لێ بکەین، ئیتر مومکین نییە پێکەوە بژین. لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا بە تەهەوورەوە گوتی من قسەت نادەمێ و حەقت نییە ناوی عەرەب بێنی.

جیاوك: پاشا من قسەم لە مەندووبی سامی ساندووە. بەندەیش بەقەدەر تۆ عەرەبەکان تەقدیس ئەکەم فەقەت کوردم و کورد هەقی خۆی ئەوێ.

وا دیارە ئەم جەریدانە بەرەزای حکوومەت ئەنووسن. ئیللا ئەبوایە تەعتیل بکرانایە.

بێینەوە سەر مادەی دووەم: تەناقوزێکی زاهیری لە قسەی جەعفەر پاشادا هەیە، چونکە لە جهەتێکەوە ئەڵێ حکوومەت مەشقوولی قانوونێکە بۆ تەئمینی حقووقی کوردان، لە جهەتێکەوە ئەڵێت بۆ ئەم حقووقە، موغایری ئسووڵە مادەیەك داخلی معاهەدەکە بکرێت، کە ئەو مادەیە بە قانوونێکی خاس حقووقی کوردەکان تەئمین بکات لەمەدا مانع چییە؟

خولاسە هەموو کوردێك مونتەزیری تەتبیقی قەراری (عصبة الأمم)ە. بەم نەوعە خیتامی بەیاناتی جیاوك هات و حازیروون بە عموومی بێ ئیستیسنا فەرموودەی جیاوکیان تەئید کرد و مەجلیسەکە دوایی هات و بڵاوبوونەوە.

لە کاتی هاتنی مەندووبی سامی و جەعفەر پاشادا، من خۆم لە هەولێر بووم، کە گەیشتنە کەرکووکیان بیسترا، لە هەولێر ئەو پێویستییەی بەباشی زانرا، کرا.

ئیسماعیل بەگی رەواندزی و مەعرووف جیاووك لەگەڵ هەموو سەرۆك عەشایرەکاندا، کە لەسەر فەرمانی موتەسەڕیف حەمید سەرسەڕ لە هەموو ناوچەکانی لیواوە بانگ کرابوون و ئێمەمامانیش لە ماڵی حاجی سەعید ئاغا کۆ بوونەوەیەك کرا. بەتەواوی باوەڕ و پەیمان یەکدیگیر بوو.

گەیشتنە هەولێر، سەعات ٣ پاش نیوەڕۆ یانەی فەرمانبەران ئامادە کرا، لە کۆبوونەوەدا، پیاوە بەناوبانگەکانی شار و مەئموورانی وە ئەو کەسانەی خۆیان هاتبوون، لەلایەکی ترەوە سەرۆك عەشایر جێگای خۆیان گرت. بەڵام دەرگا بەهەموو یەکێك کرابووەوە.

ئێمە رەشید مفتیمان نارد بۆ ناو شار نێزیکەی ٢٠ پیاوی بڵاوکردەوە و بڵاویان کردەوە، کە لە یانە ئاهەنگ و بەزمە. ئیتر نێرینە لەناو ئاوایی نەما.

ئەو دیوی یانە بەورد و درشت تەنرا.

وەکو خوێنرایەوە گوفتوگۆ دامەزرا، بێجگە لەوانەی کە لە (ژیان)دا پیشانیدا زۆر شتی تر رووی دا. یەکێکیان ئەوە بوو شێخ محەمەد ئاغای وەڵاش لە لایەن حکوومەتەوە ٢٠٠ رووپیەی بەناوی شەبانەییەوە وەرنەگرت. لە جەعفەر پاشا و مەحموود پاشا چووە پێشەوە وتی: بۆچی سەری خۆتان ئەیەشێنن، کورد چەکدارە. بە خۆشی یان ناخۆشی مافی خۆی هەر ئەسێنێ. (چەپڵە نێزیکەی دە دەقیقە) بیستم کە مانگانەکەیان بڕی.

بەناوی خۆشهاتنەوە قوتابی سروودی (ئەی کوردینە ئەی مەردینە)یان ئەوت و مەدحەت مویارەك مامۆستایان کەمانچەی لەگەڵ لێ ئەدان. موتەسەڕیف حەمید سەرسەڕ تووڕە بوو، ناردی وتی: پێویست نییە، وای زانی کەمانچەکە پێویست نییە. دای نا و خۆی هاودەنگیی کردن ئەمجارە زۆر بە بەرزتر دەنگیان هەڵبڕی.

جەلال سائب ئینگلیزی و عەرەبییەکەی ئەگۆڕی بە کوردی، خدری ئەحمەد پاشا پێی وت (جەلال ئەفەندی کەلیمەیەك کەم بڵێیت گوللەی کورد تۆڵەت لێ ئەستێنێ).

لە ئەو کۆبوونەوە مەزنەدا بەیەك دەنگ هاوار ئەکرا (مردن و ژیانمان لەگەڵ سلێمانییە. داوای ماف دەکەین).

کەس نەیئەزانێ کە ئەم چەتاوڕووە هەر رووی خۆمان ئەگرێتەوە و لە نەزانینی کورد و عەرەب جێگا بۆ ئینگلیز خۆش ئەکات و خۆی سەردارە بە پێشینان ئەڵێن: "مانگایان کرد بە چاوەش ئاخوڕی بۆ خۆی دروست کرد." جا سوودی سەرداری ئینگلیز بۆ ئێمە قازانجەکەی بۆ

خۆی و چەرمەسەریش بۆ کورد و عەرەب.

کە گەیشتینە سلێمانی هەموو قوتابی و دانیشتوان لەسەر شەقامەکە لە بەردەمی ئۆتۆمۆبێلکەکەیاندا ڕاکشان و ماوەیان نەدا بچنە ناو شار تا (وەعدی شەرەفیان دا).

سلێمانی

لە دوای تەواوبوونی موناقەشە و موجاهەدەی هەولێر، وەکیلی فەخامەتی مەندووب و وەکیلی ڕەئیسولوزەرا و هەیئەتەکە ڕووەو سلێمانی تەشریفیان هێنا.

١٩٣٠/٨/١٠ لە سەعات ٣ی کوردیدا کە میعادی هاتنیان بوو عموومی ڕوئەسای دەوائیر و مەئموووران و عولەما و سادات و ئەشراف و ڕوئەسای عەشایر و بیلعموم لە سلێمانیدا حازربوون. چوون بەپیریەوە لە جادەی دەباخانە لەو ڕەشمالانەدا، کە بەلەدیە هەڵی دابوو، دانیشتن. غەیری ئەمانیش تاخمێك عەسکەری جێش، دوور لە ئەهالییەکە وەستابوون کەشافەی مەکتەب، قوتابیی مەکتەبەکان، بیلعموم ئەهالیی شار، هەموو تەبەقەیەکی حازر بوویوو، دووکان و بازاڕ چۆڵ کرا و قیسمی ژنانیش لە دەباخانەوە هەتا قاپیی سەرای حکوومەت کۆمەڵ کۆمەڵ وەستابوون.

فەخامەتی مەندوویی سامی و هەیئەتەکە لە سەعات دووی عەرەبیدا مواسەڵەتی چەمچەماڵ و لەوێش هەموو ئەهالی و ڕووئەسای عەشیرەتی هەمەوەند لەسەر جادە وەستابوون و کە تەشریفیان گەیشتە ئەوێ، هەموو بە دەنگی بەرز هاواریان کرد و داوای حقووقی کوردایەتییان کردبوو. لە دوای دوو سێ دەقیقە ئیستراحەت لە چەمچەماڵەوە حەرەکەتیان کرد و زاتەن سەعادەتی موتەسەریف و موفەتیشی پۆلیس و مودیری پۆلیس بە ئۆتۆمۆبێل لە بەیانییەوە بەرەو پیریان ڕۆیشتبوون، لە سەعات چوار و نیوی کوردیدا گەیشتنە سەرجادەی دەباخانە لە دوای ئەوەی لەلایەن عەسکەرەکەوە بە سەلام بەخێرهاتنیان کرا، هاتە بەردەمی ئەو عەشاماتە زۆرە کە بێ و حیساب ڕاوەستابوون، کە لە ئۆتۆمۆبێلەکە دابەزین بەگرەتی دەست کرا بە چەپڵەلێدان و هەر بژی کورد و کوردستان و بەگرتێك هاوار ئەکرا کە بەقەتعی تەشکیلی حکوومەتی کوردیمان ئەوێ و لەو وەقتەدا قوتابییەکی مەکتەب بە جلی کەشافەوە هاتە بەردەمیان و خیتاب بە مەندوویی سامی نوتقێکی ئینگلیزیی خوێندەوە کە لە خوارەوە دەرج کرا و نوتقەکە بە چەپڵەلێدان و بە هەر بژی حکوومەتی بەریتانیا و کوردستان و هەر بژی فەخامەتی مەندوویی سامی مقابەلە کرا، لە دوای ئەمانە بە ئۆتۆمۆبێل هاتنە ناو شارەوە[1].

---

١. لە هەولێر باوبوو کە ژن و پیاو لەسەر ڕێگای ئۆتۆمۆبێلەکەیان ڕاکشاون تا بە شەرەفی بەریتانیا سوێندی نەخواردووە، کە حوکمی زاتی ئەدرێ بەکورد، ڕێگا نەدراون بۆ ناو شار. (نووسەر)

له ڕێگا له هەموو نوقتەیەكدا، ژنەكان لە كۆڵان و سەربانەوه هاواریان ئەكرد: هەربژی كورد و كوردستان و حكوومەتی كوردییەمان ئەوێ. وەكیلی فەخامەتی مەندووبی سامی تەشریفی برده ماڵی موفەتیشی ئیداری وه وەكیلی ڕەئیسولوزەرا و وەزیری داخلیه له ماڵی متەسەرڕف و وەزیری عەدلییه له ماڵی بابان عەزمی بەگ میوان بوون. ئەو قەڵەباڵغه هەتا ئێوارێ لەبەر دەرکی سەرا و جادەكان مایەوه و موتەمادی هاواریان ئەكرد: حقووقی موقەدەسەی خۆمان ئەوێ. ئەو ڕۆژه وا دەوامی كرد. هەر شەو تەرتیبات كرا بۆ موزاكەره، تەزكیره نووسرا به شوێن ئەشراف و ڕوئەسای عەشایرەكان. سوبحەینی سەعات دووی كوردی هەموو لایەك له مەقامی موتەسەرڕیفیدا كۆبوونەوه. دیسان بازاڕ داخرا و ئەهالی ڕووی كرده بەردەمی سەرای حكوومەتی. تەڵەبەی مەكتەب و هەموو ئەهالی لە حاڵێكی مونتەزەمدا وەستابوون، كه فەخامەتی مەندووبی سامی و هەیئەتەكه تەشریفیان هێنایه سەرا لەبەردەمی تێلخانەدا بەگرتێك چوونه بەردەمی ئۆتۆمۆبێلەكەی مەندووبی سامی و هەر كەسه دەستەگوڵێكی بەدەستەوه بوو خستیه ئۆتۆمۆبێلەكەیەوه و بەگرتێك هاواریان كرد حقووقی میللییەمان ئەوێ و ئەبێ حكوومەتی فەخیمەی بەریتانیا بۆمان تەئمین بكات.

حاسڵی بەم نەوعه داخلی سەرابوون و چوونه مەقامی موتەسەرڕیفی و لەوێدا هەموو لایەك كۆبوونەوه. ئەوەل جار له تەرەف ڕەئیسولوزەراوه ئەو بەیانەی كه له پێشا له جەریدەكان نەشركرابوو خوێنرایەوه. له دوای ئەوه فەخامەتی مەندووبی سامیش هەڵسا ئەو بەیانەی، كه له كەركووك و هەولێر دابوویان، عەینەن خوێندیەوه. له خیتامی ئەمانەدا.

جەنابی حەمه ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا هەڵسا و فەرمووی: جەماعەتی حازره كه تەمسیلی هەموو ئەشراف، سادات، عولەما و عەشایری لیوای سلێمانی و قسمێك له لیوای كەركووك ئەكات به عموومی ڕەمزی ئەفەندییان تەوكیل كردووه، كه جوابی بەیاناتی فەخامەتی مەندووبی سامی و ڕەئیسولوزەرا بداتەوه و تەڵەبی حقووقی میللییەمان بكات.

له دوای ئەمانه ڕەمزی ئەفەندی هەڵسا و وتی:

بەناوی عموومی ڕوئەسای عەشایر و ئەشرافی كوردەوه، عەرزی بەخێرهاتنتان ئەكەم. میللەتی كورد تەشریف هێنانتان بۆ حەیاتی حوڕییەت و موستەقیەلی خۆیان به فاڵێكی عید عەد ئەكات. بەیاناتی ڕەئیسولوزەرا و مەندووبی سامی كولییەن موخالیفی مقەڕەراتی (عصبة الأمم) و ئیعتیرافاتی فەخیمەی بەریتانیا و عێراقه. له پێش هەموو شتێكدا ئەبێ ئیعتای حقووقی مقەدەسه و ئیستیقلالی كوردان بێ به سەبەبی ئیتیحادی عونسری كورد و عەرەب. لای فەخامەتتان مەعلوومه كه كوردەكانی كوردستانی جنووبی، له ئەسنای حەربی عموومییەوه تا ئەمڕۆ بۆ تەئمینی حوڕییەت و ئیستیقلالی خۆیان له سەعی دوانەكەوتوون و بۆ

ئەم غایە موقەدەسە دائیمەن ئیلتجایان بە معاوەنەتی مەشفەقەی حکوومەتی فەخیمەی ئینگلیز کردووە. (مع الأسف) تا ئەمڕۆ نائیلی ئەمالیان نەبوون گەرچی لەم خسووسەوە گەلێ مەواعیدیشیان درا و بە (عصبة الأمم)یش ئەم مەواعیدانە تەئید کرا لاکین تا ئەمڕۆ هیچیانمان بۆ تەتبیق نەکرا.

مەعلوومی فەخامەتتانە، ئەوەل معاهەدەی حکوومەتی عێراق و ئینگلیز لە تاریخی ١٠ تشرین ئەوەل ١٩٢٢دا تەسدیق کراوە و لە پاش ٧٤ ڕۆژ لە تاریخی ٩٢٢ بۆ تەشەکولی حکوومەتێکی کوردییە لە بەینی حکوومەتی فەخیمەی بەریتانیا و عێراقدا ئەم بەیانە نەشر و ئیعلان کرابوو.

مادام ئەسڵەن (عصبة الأمم) ئینتدابی عێراقی داوە بەئینگلیز و لە قەراری ئەم ئینتدابەدا گوتوویەتی هیچ وەختێك سالح بێ ئیستیقلالی ئەدرێتێ و لە عەینی وەقتدا لازمە حکوومەتێکیش بۆ کوردەکان تەشکیل بکرێ. حقووقەن وا لازم بوو، کە لە پێش تەنزیمی معاهەدەی تازەی ئینگلیز و عێراقدا – کە تەئیدی قەراری (عصبة الأمم) و ئیستیقلالی حکوومەتی عێراق ئەکات – حکوومەتێکیش بۆ کورد بە سەراحەت بخرایە مەتنی ئەم معاهدە تازەیەوە.

لەمەشدا زەربە لە حکوومەتی کوردەکان درا.

لای فەخامەتتان مەعلوومە کە حکوومەتی عێراق کوردەکانی بە قوەتی تۆپ و تفەنگ ئیستیلا نەکردووە، لە عوقبی موتارەکەدا کوردەکان بەو شەرتە خۆیان خستە حەلقەی رابیتەی ئینگلیز، کە حکوومەتێکی کوردییەی موستەقیلمان بۆ تەشکیل بکرێ و لەسەر ئەمە ئیتیفاق واقع بووبوو.

کەوابوو لازمە چۆن عەرەبەکان لە قەراری ئینتیدابی (عصبة الأمم) موستەفید کراون، کوردەکانیش موستەفید بکرێن، کە تەڵەبی هەموو کوردەکان (تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییەیە لەژێر ئینتیدابی حکوومەتی فەخیمەدا).

(رئیس الوزراء): من لەو بەیاناتە زیاتر، کە لە پێشا بۆم خوێندنەوە سەلاحیەتم نییە بە سوورەتی رەسمی گفتوگۆیەك بکەم. وا فەخامەتی مەندووب قسەتان لەگەڵا ئەکات. لەسەر ئەمە فەخامەتی مەندووبی سامی هەڵسا و ئەم بەیانەی دا:

لە خوتبەی رەمزی ئەفەندیدا نوقتەی موهیم هەیە. ١– بەیانی ١٩٢٢. ٢– مقەرەراتی (عصبة الأمم).

بەیانی ٩٢٢ هەروەك (رئیس الوزراء) وتی خۆی لە تەرەفی حکوومەتی بەریتانیاوە جواب

دراوەتەوە. لەم ئانەدا حەز ناکەم لەسەر ئەم مەوزووعە موناقەشە بکەم.

دووهەم: مقەڕەراتی (عصبة الأمم) بەلای منەوە (توصیات عصبة الأمم) تەتبیق کراوە و من موتەئەسیفم ئەگەر ئەم تەوسییانە شکێنرابێت. فەقەت تەقدیری تەنفیز و عەدەم تەنفیزی ئەم موقەڕەراتە بەدەست (عصبة الأمم) خۆیەتی. حکوومەتی بەریتانیا و عێراق هەردوو لا سەعی ئەکەین بۆ تەنفیزی موقەڕەراتی (عصبة الأمم). (عصبة الأمم) ئەگەر بینیی موقەڕەراتەکەی تەتبیق نەکراوە، موداخەلە ئەکات.

وە گوتی بەعزێ کەس موراجەعەتیان کردووە بە (عصبة الأمم)، وە جوابیان وەرگرتووتەوە، کە بەتەوەسوتی حکوومەتی مونتەدەبەوە ئەبێ موراجەعات بکرێ و ئێستاکە عەینی موراجەعات بەمن کراوە. من لەم خسووسەوە موفەسەڵەن لەگەڵ حکوومەتی عێراقا موزاکەرە ئەکەم، لەم قسانە کەس واتێ نەگات کە مەقسەدی من مانیع هێنانە پێشەوەیە بۆ موراجەعاتی خەڵقی. هەموو کەسێ سەربەستە لە موراجەعەت کردن.

فەقەت لازمە مەتاڵیب تەسریح و بە تەفسیل بەیان بکرێت، تەشکیلی حکوومەتێك لێرەدا موشکیلە. وا ئەزانم ئایا قابلە کوردستان ئەم حکوومەتە بتوانێت ڕابگرێت؟

ئەمەوێ بزانم ڕەمزی ئەفەندی تەمسیلی سائیری کوردستان ئەکات یان هەر سلێمانی؟

ڕەمزی ئەفەندی: مەزبەتەی هەولێر مەعلوومتانە زاتەن لەوێ بەخۆشتانیان وتووە، کە ڕەئیمان لەگەڵ خەڵقی سلێمانییە، قسمێك لە عەشایری کەرکووك وا لەم مەجلیسەدا حازرن. ئەوانیش هەر لەگەڵ ئێمەدان و مەزبەتەی عموومی عەشایری کەرکووك تەقدیم ئەکەم و مومەسیلی هەولێریش لێرەدا حازرە.

مەندووب: چوونە هەولێر و کەرکووك، لەوێش مومەسیلی کوردان کۆبوونەوە عەینەن موناقەشە کرا. فەقەت کەس ئیزهاری جیابوونەوەی نەکرد، تەنیا سلێمانی تەڵەبی ئیفتیراق ئەکات.

ڕەمزی ئەفەندی: جوابەکەی سەرەوەی تیکرار کردەوە و وتی ئەم دووە لەژێر تەزییق و تەئسرا بوون لەبەر ئەوە حەیاتی حەقیقییەی خۆیان ئیزهار نەکردووە، ئەمر بفەرموون بێنە ئێرە ئەوسا مەعلوومتان ئەبێ، کە ئێمە تەئکید ئەکەینەوە و کوردستان هەمووی لە عەینی فکردایە و یەك هەدەف تەعقیب ئەکات، کە ئیستیقلالییەتی کوردستانە.

مەندووبی سامی: کەوابوو لازمە هەموو لایەك مەتاڵیبی خۆیان بە سەراحەت و بە تەفسیل بۆ (عصبة الأمم) بەیان بکەن. کوردەکان چ نەوعە حکوومەتێکیان ئەوێ، مەلەکی یا جمهووری؟ پارلەمانت، (رئیس الوزراء) و (مجلس الوزراء)یان ئەبێ یان نا؟ ئایا فیکریان بەرامبەر بە مەلیك فەیسەڵ گۆڕیوە یان نا؟ وە ئایا ئەیانەوێ هەر نەوعە مەساڵحێکی حکوومەتی و گومرگ

و مەکۆس، ئەشغالی عامە پۆلیس، سیحە و عەسکەریان ببێت؟ وە ئایا مناسەبات و عەلائیقی حکوومەتەکە وا تەشکیل ئەکرێت چی ئەبێ لەگەڵ بەریتانیا؟

رەمزی ئەفەندی، هەڵسا خیتاب بە مەندوویی سامی گوتی:

فەخامەتتان فەرمووتان، کە بەیانی ۹۲۲ رابردوو و کۆنە. حەق کۆن ئەبێ نامرێ. ئەم بەیانە کافلی حقووقی موقەدەسەی ئیستیقلالی قەومێکە تەڵەبی تەتبیقی ئەکەین.

(بەسە ۳ جار) بەسە بەسە بەسە.

١- حەمە ئاغا: ئێمە کوردین و کوردستان عیبارەت نییە هەر لە سلێمانی، لە زاخۆوە هەتا خانەقین و هەموو کوردەوارێتییە و ناپانەوێ لەگەڵ *عێراقدا* بژین و حکوومەتێکی موستەقیلەی کوردمان ئەوێ لەژێر *ئینتیدابدا* ئەگەر ئینگلیزیش ناماندات، مراجەعەت بە (عصبة الأمم) ئەکەین.

٢- خیتاب بە رەئیسولوزەرا: حەفامەتتان زۆر چاك ئەیزانن، کە حسییاتی میللییە بە نەوعێك چۆتە مێشکی عونسوری عەرەب و کوردەوە، کە هیچ قوەتێك نییە مەحوی بکاتەوە. بینائەن عەلیهی ئیمکانی ژیانێکی موتەحید نییە لە بەینی عەرەب و کوردا وە هیچیان ئیستیفادە لە یەکتر ناکەن. بۆ هەردوو لا وا چاکە کوردستانێك لەژێر ئینتیدابی (عصبة الأمم)دا چونکە ئەم ئینتیدابە بە نەوعی عەرەبەکان ئیستیفادەیان لێ کرد، کە لە زەرفی نۆ ساڵدا ئەوەتا ئیستغنا لە حکوومەتی ئینگلتەرە ئەکەن.

٣- خیتاب بە مەندوویی سامی: ئەم دەنگی کوردایەتییە تەنها وەکو جەناتبان ئەفەرموون مەخسووسی دۆڵی سلێمانییە نییە. هەولێر و کەرکووك لەژێر تەزییقی مەئمووری عەرەبدان. ئەگەر بانگ بکرێنە ئێرە مەعلووم ئەبێت کە هەموو غایە یەکێکە.

رەئیسولوزەرا: تەشەکوری بەیاناتەکان ئەکەم، زۆر مەسروورم، کە لە قتعەیەکی عێراقدا ئەهالی لەسەر غایەیەك وا ئیتیحادی کردووە لە خسووسی بەیانی ۹۲۲ەوە ئەمەوێ بەسوورەتی خسووسییە قسە بکەم. ئەوەی سەلاحییەتدار بم بیڵێم عیبارەتە لەو بەیانەی، کە لە پێشەوە عەرزم کردن. وەکو رەمزی ئەفەندی ئەڵێ معاهەدەی عێراق و ئینگلیز هەرچەند لە ۹۲۲دا عەقد کراوە فەقەت لە ۹۲٤دا لە تەرەف مەجلیسی تەئسیسییەوە تەسدیق و حەقی قانوونیی کەسب کردووە و لەو مەجلیسەدا مومەسیلینی کوردیش هەبوو. زۆر چاك لە بیرتانە لەژێر ریاسەت و ئیمارەتی شێخ مەحموودا ئیدارەیەکتان بۆ دامەزرابوو، لە پاشا ئەهالی کەوتنە تەزەڵوم و شکایەت لە شێخ مەحموود، کە ئێستاش دڵم پێتان ئەسووتێ، کە حکوومەت مەجبوور بوو بە ناردنی ئۆردوو. وە لە پاش ۳ ساڵ حەرەکاتی عەسکەرییە ئەوسا وەزعییەتی بۆ چاك کرا.

ئەم بەیاناتەم بە سوورەتی خسووسییە بۆ تەنویری ئێوەیە.

شێخ قادر: شێخ مەحموود فەردێکی ئەم میللەتەیە میللەتی کورد، ئایان عەن جد حوورمەتی شێخ مەحموود و ساداتیان گرتووە. زوڵمی شێخ مەحموود بە قەدەر زوڵمی عێراق تەئسیری نەکردۆتە سەر ئێمە. ڕەئیسولوزەرا کە ڕێز ئەکات ئێمە میللەتێکی سەربەخۆین لەژێر ئینتدابدا حکوومەتێکی کوردیمان ئەوێ وەئیلا ناژین.

ڕەمزی: ئەم حەقە کە بە میللەت دراوە، ئەگەر شێخ مەحموود خەتای کردبێ دیسانەوە میللەت قەباحەتی نییە و مەعلوومی فەخامەتتانە شەخسێك حقووقی میللەتێکی وا مەحوو ناکاتەوە و شێخ مەحموود لە تەرەف دوژمنانی کوردەوە ئیغفال کرابوو، مەسئەلەی شێخ مەحموود تەئسیری نەبوو بۆ ئیمحای میللەتمان بەڵام ئێوە ئەتانەوێ بە کەرەتێك بمانکەن بە عەرەب.

عیزەت بەگ:میللەتی کورد تەنها عیبارەت نییە لە سلێمانی، لە زاخۆوە تا خانەقین هەموو داوای ئەم حەقە ئەکات و هیچ کوردێك کەرەتێکی تر لەگەڵ عێراقا ناژی. بۆ ئیحقاقی حەقمان موراجەعەت بە حکوومەت ئەکەین ئەگەر ئەویش نەیپرسی شکایەت ئەبەینە بەر (عصبة الأمم). کورد حکوومەتێکی موستەقیللەی ئەوێ لە ژێر ئینتیدابدا، بە هەموو قووەتمانەوە بۆ ئەم غایەیە سەعی ئەکەین. ئەمجارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم و مراجەعاتە.

ڕەئیسولوزەرا: لام وایە عونسری کورد لە عێراقدا لە عونسوری عەرەب موحتەرەمتر و مورەفەهترە، هەرچی مەشەقەت و ئەزیەتە بەسەر عەرەبەکانەوەیە. حقووقی کورد مەحفووزە، یەکێ بڵێ مەئمووریکی عەرەب زوڵمی لە کورد کردبێ.

مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسووڵ ئاغا: بەڵێ کورد دائیمەن مەعرووزی زوڵمی عەرەبەکان بووە. پار کە لە بەینی عەرەبەکانی فەڵەستین و سەهیۆنییەکاندا شەڕ بوو، عەرەبی عێراق بە یەکجار کەوتنە تەعزیەوە. ئەنواعی موراجەعات و موزاهەراتیان کرد، کەچی ئێستا هاوخوێن و براکانمان لە کوردستانی شیمالی لە تەرەف تورکەوە سەرئەبڕێن، غەزەتەکانی بەغدا بە عەلەنی تەقدیری تورکەکان ئەکات و بەیانی شادمانی ئەکات. وە بە تۆپ و تفەنگ و مەترالیۆز تەهدیدی ئێمە ئەکات، کە ئەڵێ لەگەڵ تورکا ئەتانهەڵیشێنینەوە و عەرەب هیچی لە تورك کەمتر نییە. عەلاوەی ئەمیش، لە ڕۆژی تەشکیلی حکوومەتی عێراقەوە هەتاکو ئێستا خۆتان موتەعەدید موعەلیمتان لە ئەورووپا، ئینگلتەرە، سووریە و جێگایانی ترەوە تەرتیب کردووە و هەموو ساڵێك کۆمەڵێکی زۆر تەڵەبەی عەرەب، کە بە ئیستیعداد و زەکا لە کوردەکان دوونترن، داخلی بەعسەی علمییان ئەکەن کەچی تەڵەبە کوردەکان لەسەر مەسرەفی خۆیان ئەچن بۆ بەغداد و غوربەت ئەکێشن بۆ ئەوەی داخیلی بەعسە بکرێن. بە خۆڕایی نمرەیان ئەشکێنن دوایان. ئەخەن ئەمساڵ پەنجا تەڵەبەی کورد، کە دائیمەن لەپێش عەرەبەکانەوە بوون هەر

لەبەر ئەم سەبەبە دوایان خستن.

رەئیسولوزەرا: بۆچ ئێوە هەموو نازانن، کە غەزەتەکانی بەغداد بەیانی و ئێواریٚ چەند جنێو بە حکوومەتی عێراق ئەدەن و چۆنمان تەنقید ئەکەن کێ ئەڵێ غەزەتەکان بە تەشویقی حکوومەت لە عەلەیهیی کوردن. بۆچی مەعلووم نییە غەزەتە چۆن و بەچ واستەیەکەوە شت ئەنووسێ. تەڵەبە ئەوراقی ئیمتیحانیان مەوجوودە و کەس ناتوانیٚ خیلافی ئەوە حەرەکەت بکات و لام وایە تەڵەبەیەك بێ ئیستیحقاق تەرفیع بکات نە بۆ خۆی و نە بۆ موجتەمەعی موجبی ئیستیفادە نابیٚ.

مەجید ئەفەندی: بەڵێ غەزەتەکانی بەغداد لە عەلەیهیی حکوومەت مەقالەیەکیان نووسی گورج دای ئەخەن بەڵام کە تەهدیدی کوردەکان بکات و لە زدی ئێمە بنووسن تەشویقیان ئەکەن و پارەیان ئەدەنیٚ.

حەمە ئاغا: هەموو ئەیزانین کە فەخامەتی رەئیسولوزەرا شەخسێکی وەتەنپەروەر و بۆ غایەی وەتەنییە زۆر سەعیی کردووە، (بناءً علیە) ئەبیٚ تەقدیری ئێمەش بکات و حەقمان بداتیٚ، کە بۆ حەقێکی مەشرووعی وەتەنی و میللیی خۆمان تیٚ ئەکۆشین.

رەئیسولوزەرا: بەڵێ هەموو نەوعە حیساباتێکی وەتەنییە بە ئیحترامەوە قەبوول ئەکەم فەقەت لەم مەسائیلانەدا ئێمە لازمە مەنتیقی و عەمەلی تیٚ فکرین عەجەبا کوردستان وەکو ئەڵێن لە خانەقینەوە هەتا زاخۆ جیابێتەوە بەبیٚ عێراق ئەژی؟ واریداتی کیفایەت ئەکات؟ بەرامبەر بە دراوسێکانی حدوودی پیٚ محافەزە ئەکریٚ و خاسەتەن لە نوقتەی تیجارەتەوە لە عێراق زیاتر بەندەرێکی هەیە؟ بۆ نموووری نافیعەی کوردستان هەتاکو ئێستا عێراق بە لەکها رووپەی سەرف کردووە لە کودستانا.

رەمزی ئەفەندی: یەك دەفعە عەرزمان کردن کورد و عەرەب قابل نییە پێکەوە بژین. ئێمە ئارین و ئەوان سامین. ئێمە شاخین و ئەوان دەشتەکین، حەتا خاکی کوردستان بەرین بۆ عەرەبستان و هی عەرەبستان بهێنین بۆ کوردستان قوەی ئەبنایەتییان ون ئەکەن.

رەئیسولوزەرا: ئەی تووتنەکەتان بۆ کویٚ ئەبەن؟

رەمزی ئەفەندی: ئەیبەین بۆ ئەورووپا، غەیری ئەمیش مەجبوورن تووتنی ئێمە بکڕن چونکە لەمە هەرزانترتان دەست ناکەویٚ و لە ئێمەش زیاتر لە تیجارەتا لەم تووتنە ئیستیفادە ئەکەن.

رەئیسولوزەرا: نا نایبەن بۆ ئەورووپا، هەمووی لە عێراقا سەرف ئەکرێت. کوردەکان (الحمد لله) توجارِی زۆر وریایان تیایە و چاك تەقدیری ئەکەن، کە کوردستان بیٚ عێراق ناژی.

رەمزی ئەفەندی: لە بیدایەتی حەربی عموومیدا، کە رێگا و بەندەرەکانی عێراق گیرابوو، کە

ـعفایش ئیستیلا کرا ئێمە لەگەڵ شیمال و شەرق و غەربدا مونتەزەمەن تیجارەتمان ئەکرد. ـەروەتی عموومییە و وەزعیەتی ئیقتسادیمان لە ئیمڕۆ گەلێ باشتر بوو. جەعفەر پاشا ـەفەرمووێ کە بە لەك پارەمان بۆ ئمووری نافیعەی کوردستان سەرف کردووە. ئەو ئمووری ـفیعەی ئەوان ئەڵێن قەلا و ئیستیحکاماتە بۆ موحافەزەی جەیشەکەی خۆتان، لە باتی ئەمە مەکتەبتان بۆ بینا بکردینایە. ئەگەر حکوومەتی کوردییە تەشکیل بکات هیچ لزوومان پێ ـابێ و ئیستیغنای لێ ئەکەین.

رەئیسولوزەرا: (بە تەئەسور و هەیەجانەوە)، براکانم بزانن کە لەم دەمارەدا خوێنی کوردیشم تیایە وەلاکین من عەرەبم. بۆ مەنفەعەتی ئێوە قسە ئەکەم، بە حسییات حەرەکەت مەکەن. مەبن بە ئالەت بە دەست خەلقەوە، بەزەییتان بە میللەتەکەدا بێت، تووشی فەلاکەتیان مەکەن. ئاوا لەسەرەوە کوردەکان پارچە پارچە ئەکەن، سەریان ئەبڕن. لە دنیاوە مەعلوومە کە کورد قەومێکی دیندارە، لە بیرتان ئەچێ کە دینتان عەرەبییە. قورئان عەرەبییە. محەمەد عەرەبە وە فەیسەڵ کوڕی محەمەدە. براکانم رجاتان لێ ئەکەم فاجیعەی کەربەلا تیکرار مەکەنەوە.

شێخ قادر: جەعفەر پاشا بە بەیانکردنی فاجیعەی کەربەلا تەهدیدمان ئەکات. ئەبێ بزانین ئەگەر ئینگلیز لە بەینا نەبێ، عەرەب ناتوانێ بێتە خاکمانەوە.

جەعفەر پاشا: رجا ئەکەم سوء تەفاهوم حاسل نەبێ، مەقسەدم تەهدید نییە. (رەمزی ئەفەندی زۆر دەفعە داوای قسەکردنی کرد و مەیدانی نەدرا، نیهایەت بە حیدەتەوە هاتە پێشەوە گوتی): پاشا، دین، ئیمان، مەفکوورەی میللی حکوومەتێکی میللیی ئەوێ، (جەماعەت وا نییە؟) هەموو بە کەرەتێك (بەڵێ وایە). رەمزی ئەفەندی دەوامی کرد: پاشا، ئەم قسانەت ناچێتە جەواڵی کوردەوە، ئەمە هەموو ئەغفالاتە و بیخەرە جەواڵەکەی خۆتەوە و دەرگاکەی ببەستەرەوە.

جەعفەر پاشا: قسەکەت وەرگرەرەوە، تۆ پیاوێکی تەحسیل دیدەیت، لە ئیجتیماعێکی وادا نابێ قسەی وا ناشیرین بکرێ.

ڕەمزی ئەفەندی: تۆ قسەم نادەیتێ، لە سوئالەکانم کرێز ئەکەی. بڵێ: تەسلیم بووم.

میرزا تۆفیق: ئێستا کە دیانەت مەوزووعی بەحس نییە، مەسئەلە میللییەتە و تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە ئەگەر بەدین بێ ئەبێ ئێرانیش واز لە میللەتی خۆی بێنێ و داخلی حکوومەتی عێراق بێ. ئاسف ئەم مەوزووعە مەگۆڕە.

جەعفەر پاشا: قیاس مەعەلفارق کردن زۆر بێ مەنتیقییە ئێرانییەکان دوو ساڵ زیاترە کە تەئسیسی کردووە.

میرزا تۆفیق: ئەگەر لەبەر دین لازمە ئێمە تابیعی ئێوە بین، لە هەموو عالەم مەعلوومە کە کورد زۆر دیندارە بینائەن عەلەیهی لازمە عەرەب لەژێر ئیدارەی ئێمەدا بێ.

رەمزی ئەفەندی: یەك قسەم هەیە. خەلافەتی عەباسییە لە ئەواخری سەڵتەنەتیدا دەستی کرد بە ئیستیخدامکردنی مەئموورینی تورك، فورس و کورد وە ئەمە بوو بیکاتە سەبەبی ئیزمیحلالیان، حەز ئەکەم حکوومەتی عێراق ئەم تەجروبەیە تیکرار نەکاتەوە و مەئموورینی کورد لەناو خۆیانا ئیستیخدام نەکات چونکە ئەبێ بە سەبەبی ئینحیتاتی وە کەزا ئیستیخدامی مەئمووری عەرەبیش لە کوردستانا ئەبێ بە سەبەبی مەحووبوونەوەی کوردەکان.

رەئیسولوەزرا: تەشەکوری تەوسیە و نەسیحەتەکەت ئەکەم، کە لە پێش وقووعیدا ئەخبارتان کردین. لەپاش ئەوە رەئیسولوزەرا، کە بینی موزاکەرەکردن لەم مەوزووعە سوودێك نابەخشێ وە میللەت یەك ئاواز بۆ موتالەباتی خۆی ئیسرار و یەکتری تەئید ئەکاتەوە، لزووم نەبینرا بە تەمدیدی موزاکەرە و ئیجتماعەکە بەتاڵ بووەوە.

لە ناوەڕاستی ئیجتیماعدا سالار مستەفا بەگ جەعفەر سوڵتان هەڵسا و بەناوی سادات، عولەما، مەشایەخ و بەناوی ئەو عەشایرەی حدوود، کە داخلی عێراقن تەئیدی مەتاڵیبی کوردانی کورد بۆ تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە و لە عەینی مەوزووعەوە مەزبەتەیەکی ئیمزاکراوی تەقدیمی مەندووب کرد.

لە ئاخری ئیجتماعەکەیشەوە لە تەرەف فەتاح حەمە رەزای رەئیسی هەمەوەندەوە، کە لە لیوای کەرکووك ساکنن، لە عەینی مەئال مەزبەتەیەکی تر تەقدیمی مەندوویی سامی کرا و عەشیرەتی جاف، کە تا ئێستا تابعی کەرکووکن لەم ئیجتیماعەدا لە تەرەف جەنابی کەریم بەگی فەتاح بەگەوە تەمسیل کرابوون (لەم بەریەرەکانی و تێکۆشینەدا تەنیا رەمزی ئەفەندی بەبەشی خۆی گەیشت و کرا بە قائیمقام و ئەم بەشە کرا بە بەشی هەموو کورد).

دهۆك ٩/٨/٩٣٠

سوورەتی: ١. بۆ عوسبەتولئومەم بە پۆستەدا، ٢. بۆ (دار الاعتماد) لە بەغداد. بۆ رەئیسولوزەرای عەرەب. ٣. بۆ پەرلەمانی ئینگلیز. ٤. بۆ لیوای سلێمانی.

لە کوردانی ئەقزیەی شیمالییەوە بۆ هەموو کوردان: خەبەردار بن، چاوی خۆتان بکەنەوە سەیری ئەترافی خۆتان بکەن وا ئینگلیز لەگەڵ عێراقدا معاهەدەیەکی کرد و لەم معاهەدەیەدا بەحس لە حقووقی کوردان نەکراوە. لە پاش دوو ساڵی تر ئینتیدابی ئینگلیز لە عێراق نامێنێ. حکوومەتی عێراق سەربەست و داخلی (عصبة الأمم) ئەبێ. ئەوسا کورد لەژێر دەستی عەرەبا زەلیل ئەبێ. لەبەر ئەوە عەیبە ئەگەر ئێمەش وەکو ئەهلی سلێمانی داوای حقووقی خۆمان

نەکەین و ئەو برایانەمان بە پیاو، ژن، ماڵەوە جوهد ئەکەن و بەجارێك هاواریان بردۆتە بەر (عصبة الأمم) و (دار الإعتماد) و داوای حقووقی کورد ئەکەن، ئەگەر ئێمەش ئیتیحادیان لەگەڵا نەکەین وەکو ئەوان داوای حقووق نەکەین، حاڵمان خراپ ئەبێ و حقووقمان ئەفەوتێ.

ئێمە کە ناومان لە ژێرەوە نووسراوە و عەشایری سندی، گل، بەرواری، دۆسکی وە هەموو نەقزیەی شیمالی تەوکیلیان کردووین، کە بەناوی کوردی ئەم ناوەوە ئەم بەیاننامەیە عەرزی ئینتیزاری عالەم بکەین و داوای حقووقی کورد بکەین، فکری ئێمە فکری سلێمانییە و موخالەفەتێك لە بەینا نییە و موافیقی قەراری (عصبة الأمم) وەکو لیوای سلێمانی تەڵەبی تەشکیلی حکوومەتێکی موستەقیلەی کوردییە ئەکەین.

شێخ رەقیب سوورچی، شێخ غیاسەدین شێخ نووری بریفکانی، ئەدیب ئەفەندی رەئیسی بەلەدییەی عەمادیە. حەمە ئاغای بەراش. شێخ شەهاب زێباری تەمەرخان حاجی رەشید بەگ بەرواری.

برای خوێندەوار

ئەم بەربەرەکانییە گەرموگورەتان خوێندەوە تێ گەیشتن کە لە سوودی کورد و عەرەبدا هیچ قازانجێکی نەبوو. تەنیا بۆ خۆشکردنی ئاگری ناکۆکی نەبێت؟ گوژمەی هێزدارە و بێ هێز دەهێشێنیتەوە رەنگ و ریسە هی خۆی [ئینگلیز]ە، داخەکەم رەئیس ئەلوزەرایش وەکو کۆمەڵی کوردەکان لە ئەنجام بێ ئاگایە. سەر و بنی کار چییە؟ نازانن.

خۆ ئەگەر عەرەب لە جێگای کورد بوایە ئەوسا دەبوایە ئەوان ئەو قسانە بکەن و بە گەرمتر پەلامار بدەن، چونکە ئینگلیز دەستکردی خۆی بۆ خۆیەتی نەك بۆ هیچ لایەك[1].

---

١. لەمەو پێش وترا، کە مامۆستای مەزن تۆفیق وەهبی بەگ بە موتەسەریفێتی هات بۆ سلێمانی. حکوومەتی بەغدادیش کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردن (ئینتیخابات) ١٩٣٠، بۆ چوونە ناو کۆمەڵی (عصبة الامم) بەئەندام بەناوی حکوومەتێکی سەربەست و موستەقیل. بەڵام هەر وەکو عێراق خۆی کۆ دەکردەوە و بەو هیوای بەرز و خۆشییەوە ئەچوو بە پیر ئاواتەوە، ئینگلیزیش بۆ پاشقولگرتن خۆی ئامادە دەکرد، کە پەیمانە تازەکەی بە ئارەزووی خۆی تازە بکاتەوە و عێراق لە ناو کەوانەی فاقەکەیدا بناڵێنێت. هەموو کورد و عەرەب زۆر باش ئەیانزانی، کە ئینگلیز هەمیشە لە ئەنجامی تێکدانی کورد و عەرەبدا کارسازیی خۆی کردەوە و بووە بەهۆی خوێن رشتنیان و جار جار زیاتر هەر دوو گەلەکە ملکەچتر بوون بۆ بەجێهێنانی فەرمانیان چونکە ماوەی لە یەکتر نێزیکبوونەوە و لە یەکتر تێگەیشتنیانی نەدەدا.

**ڕۆژی ٦ ئەیلول**

ڕۆژ کرا بە شەوەزەنگی ئەگبەتیی کورد. بە مێژوویەکی پەڕە ڕەشی ئەو ڕۆژەی، کە بەسەر شاری سلێمانیدا هێنا و شاییان لێ بوو بە شین و یاد ئەکرێت.

گوایا ڕۆژی ١٦ ئەیلوول ١٩٣٠ هەڵبژاردنی لیژنەی بەراوردی [تەفتیش] بوو بەچاودێریی هەڵبژاردنی کۆمەڵی گشتیی پەرلەمانی تازە، لە بینای موتەسەڕیفیدا لە سلێمانی و لە ژێر سەرۆکی موتەسەڕیفەکەی ئینگلیزا بەڵام وا ڕێك خرابوو، کە دانیشتوانی شار هێرش ببەنە سەر سەرا، تا گەیشتە تەقەکردن لە نێوانی پۆلیس و نومایشکاراندا. تا بە ناچاری لە لایەن میرییەوە هێزی سوپاییان تێکەڵ کرد، ١٤ کوژراو ٢٣ بریندار لە شارییەکان و ١١ کوژراو و ٣ بریندار لە پۆلیس ڕووی دا[2].

ئەمە بوو نووسراوەکەی مامۆستا (الدرة) بەڵام ئەو نومایشە بەدەسیسە نەبوو. کورد داوای ئازادیی دەکرد، ئەم هەڵبژاردنە دوایین هەناسە بوو بۆ بڕیاری چارەنووسی کورد. (عصبة الامم) لە لایەکەوە پشتی بە کورد دەکرد و لە لایەکیشەوە حکوومەتی عێراق پەیتا پەیتا بە ناوی برایەتییەوە بانگی ئازادی و مافی کوردی دەدا و بەڵام ئینگلیزیش لە ژێر قنچکی باپیرەکەیەوە بە زەردەخەنەوە سەری با ئەدا و خەریکی ئاڵۆزانی ڕیسی هەردوو لا بوو لەو نومایشەدا. نیزیکەی ٢٠٠ ماڵ کەوتە شین و گریان. پتر لە ٤٠٠ کەسی ناسراو، لە موەزەف، ئەشراف، مامۆستا لە حەبسخانە توند کرا. لە هەموو گەڕەکێکی سلێمانیدا ماتەمی ڕوو درا و هیوای تۆڵەساندن و بە ماف گەیشتن لە بروسکە لێدانا بوو.

لە کاتی تەقە و گوللەبارانی مەترالیۆزدا بە تێڵاوە هێرش ئەبرایە سەر بەدخوایان. تا لە دواییدا بەردەبارانی پەنجەرەکانی ژووری موتەسەڕیفیش کرا. وا دەزانم دەیانویست بێتە دەرەوە بۆ چارەسازی. تا لەبەر سەرادا لاشەی ١٥٠ لاو بریندار و کوژراو ڕیز کرا. موتەسەڕیف و موفەتیشی ئیداریش لە کونی پەنجەرەوە دەیانڕوانییە ئەم کارەساتە.

پاش دوو ڕۆژ لە سلێمانییەوە، یەکێکی ئاینی، بازرگانێك، کوڕ کوژراو، باوك گیراوێك چوون بۆ لای شێخ مەحموود. ئاینییەکە وتی: یا شێخ قورئان چە لە دەستا بێ و چە لە ناو سنگا، بەو قورئانەوە هاتووین تۆڵەی شارەکەت ون مەکە. کورد چاوەڕێتە. پاش ئەم هەڵە کورد بێ ناو و نیشان ئەمێنێتەوە. ئەوەیش هاوڕێکانم بیانبیینە.

شێخ مەحموود بەم کارەساتە خۆی زامدارتر بوو. ئەمجارەیش بڕیاری دا، کە تۆڵەی گوللە

---

١. القضية الكردية لاپەڕە ٨٤ محمود الدرة و ڕۆژنامەی ژیان.

٢. لاشەی ٣٢ کوژراو و لە ١٠٠ پترتر ڕۆڵەی بریندار فڕێ درا. نووسەر.

بەگوللە بسێنێتەوە. بە لەشکرێکی باشەوە لەگەڵ ناردنی ئەم نامەیە بۆ مەندووبی سامی – بەغداد، (پیران)ی بەجێ هێشت و گەیشتە شارەزوور. لەشکر لە هەموو لایەکەوە ئەهات و زۆر لە قوتابی و خوێندەوارانی سلێمانی بوون بە هاوچەك.

شێخ مەحموود لە نامە تایبەتیەکەیدا، بۆ مەندووبی سامیی عێراق لە بەغداد، بەکورتی ئەمە بوو:

> کورد داوای حەقی خۆی ئەکات، پێویستە حکوومەتی عێراق هەموو کوردستان لە زاخۆوە تا خانەقین بەجێ بهێڵێت و لەم کوردستانەدا حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێت لە ژێر چاودێریی ئینگلیزدا تا وەکو عوسبەتولئومەم (عصبة الامم) بڕیاری خۆی بە ئیجگاری بڵاودەکاتەوە[1].

کە حکوومەتی عێراق بەم بزووتنەوەیە ئاگادارکرا، تۆفیق وەهبی بەگ برایەوە بۆ بەغداد و حکوومەت دەستی کرد بە ناردنی سوپا و تۆردوویەکی ئیجگار زۆر و جەنگ لە هەموو لایەکەوە دەستی پێ کرد. عێراق باش تێ گەیشت کە ئینگلیز هەلاجیی ئاوایی هەردوولا دەکات.

بەڵام گوێیەنگەکەیان هەر بەسەر کورددا دەسوو، چونکە کاربەدەستەکان خۆشەویستی خۆیان، ئینگلیز بوون. هاواری کورد تەنیا لە دەست مەئموورین و موەزەفین عەرەبەوە ئەوە بوو، کە بۆ بەجێهێنانی فەرمانی مەندووبی سامی کورد و عەرەبیان لە یەکتر دەڕەنجان و هەوێنی کارسازییان بوون.

بەراستی سوپای عێراق چارەی جەنگی چەتەیی کوردیان پێ نەدەکرا بەتایبەتی جەنگی (ئاو باریك). جەنگ لە ٦ ئەیلوول ٩٣٠ وە تا ٣١ مایس ١٩٣١ درێژەی کێشا. ئەمجارەیش وەکو جاران بێ پشتیوانی، شێخ مەحموودی ناچارکرد، کە بکشێتەوە و بچێتە خوارووی عێراق لە شارێکا بە بێدەنگی دابنیشێت. تا لە ئاشووبی ١٩٤١ی ڕەشید عالی گەیلانیدا گەڕایەوە بۆ سلێمانی.

کە ئەم باسەیش لە جێی خۆیدا دەخوێننەوە، بەڵام ڕۆژێك پاش (حەوت) مانگ جەنگ و چەوسانەوە، شێخ مەحموود بڕیاری دا، کە (عصبة الامم)یش لە کارەسات ئاگادار بکات. لە ڕۆژی ٢١مارت ١٩٣١دا لە گەرمەی جەنگدا، لە پێش هێنانە ناو ناوزەنگی و سواربوون و دەست دانە چەکی تۆڵەساندن، شێخ مەحموود ئەم نامەیەی نووسی و ناردی بۆ کۆمەڵی (عصبة الامم)، کە لە لایەن گۆڤاری بازیل نیکیتینی فرانسییەوە لە ساڵی ١٩٥٠دا بڵاوکراوەتەوە و لە فرانسزیەکەیەوە گۆڕاوە بۆ کوردی: لاپەڕە – ٣٠٠ و ٣٠٢.

---

١. القضية الكردية لاپەڕە، ٨٤، القرار الخاص بإعلان إستقلال العراق.

بۆ سەرۆکی مەجلیسی ئەعوام

سەعادەت مەئاب

بە شەرەفی دەزانم، کە هاوار و شکاتی میللەتێك دەهێنینە خزمەت ئێوە، کە حیمایە و وسایەی لە ژێر دەستی ئێوەدایە. چونکە وسایە و حیمایە یەعنی ئاگاداریکردنە، کە ئەم میللەتەیش میللەتی کوردە و بە شەرەفێکی بەرزەوە منیش لەو میللەتەم، کە لە بەشێکی کوردستان، کوردستانی خواروودا دەژین، بە عێراقەوە بەستراوە.

بیخەمە بەرچاوتان، کە ئەم خاکە لە لایەنی هێز و لەشکری سوێندخۆرەکانەوە یان یەککگرتووەکانەوە هەرگیز داگیر نەکراوە و نەگیراوە. ئەمەیش ڕووداو و لێقەومانێکە، کە لە ناو (میزۆپۆتامیا، بین النهرین)دا ڕووی داوە.

لە ساڵی ١٩١٨دا کورد بەعەزم و ئیرادەی خۆیان دەستیان دایە چەك. هێز و لەشکر و سوپای تورکیان ناچار کرد، کە کوردستان بەجێ بهێڵن.

کوردیش خۆ بۆ خۆ بانگی ئازادییان بۆ خۆیان دا و بەناوی حکوومەتی کوردستان، کوردستانی جنووبییەوە حکوومەتیان دامەزراند. ئیدارە و موقەداراتی خۆیان گرتە ناو دەستی خۆیان. لەم کاتەدا عێراقی عەرەبی لە ناو فەوزادا ئەتلایەوە و هێشتا لەشکری یەککگرتووان هەر لە جەنگدا بوون.

داخەکەم ئێمەی کورد، میللەت و خاکمان، لە دواییدا بەسترا بە عێراقەوە، کە ئەورووپاییەکان ئەیانوت ئێمە بۆ پارێزگاریی حەق و عەدالەت پەلاماری چەکمان داوە و لە ڕووی ڕاستی لانادەین و بەرامبەر بە ناڕاستی هەرگیز ناگەڕێنەوە دواوە و بەرامبەر بە داد و مافی ئەو میللەتانە پاشگەز نابینەوە، کە بەخت و شانسی میللەتێکی تریان بە ناحەق بەستووە بە دەست خۆیانەوە.

وە ئەو میللەتانەی، کە لە پێشدا حکوومەتیان هەبووە و یان لەگەڵ گەلێکی ترا جیاوازییان هەبێت، ئیتر ئێمە قەت فەرامۆشی ناکەین و لە بیرمان ناچێت. لەسەر شەرەف و بەڵێنی ئێوە، کە بە کوردستانی جنووبی، کە موختارییەتێکی گەورەتان بەخشیبوو بە ئێمە وەعدتان دابوو. لەسەر ئەم پەیمانە بێدادی و هەراسانکردنمان سووك کرابوو. بەڵام هەر چەند ساڵەکان یەك لەسەر یەك دێن و تێ دەپەڕن. لەو ڕۆژەوە تا ئیمڕۆ وەنەبێ وەعد و بەڵێنتان جێبەجێ کرابێت بە پێچەوانەی ئاواتی ئێمە و فەرمانی ئێوە، گیانمان ژیانمان منداڵانمان هەموو ڕۆژ ئاگرباران دەکرێن، لەبەرئەوەی ئەیانەوێت لە مافی خۆمان لادەین و کورد

نەبین. فەرمانی کوشتنمان دراوە وە لە دژمان جەنگی خوێنینمان دەربارە دەکرێت.

حکوومەتی مەلەکیی عێراق بێ ترس و لەرز ناو شاری سلێمانی گوللەباران دەکات، کە پایتەختی کوردستانی جنوبییە و ئەو کوردانە بۆمباردمان دەکات، کە لە ئینتیخاباتدا بەشدار نەبوون و نەیانویستووە چونکە ئەم حکوومەتە بەدئامانجە ویستوویەتی، کە پەیمان و معاهەدەیەك ببەستێت، تاکو هەموو مافەکانی کوردی پێ لە ناو ببات و نەیهێڵێت. ئێمە باوەڕمان وایە، کە ئەم بۆمبایانە، ئەم ئاگری مەترالیۆزانە کە هەمووی بەسەر شەرەف و هەیبەت و کەرامەتی ئێوەیان، کۆمەڵی ئەقوام پێ لێ ئەدرێت، چونکە کورد لە ژێر حیمایە و ویسایەی ئێوەدایە و وە وا دەزانن، یەعنی ئێوە پارێزگار و پەنادار و نیگاهداریانن.

ئەگەر هێز و لەشکری حکوومەتی مەلەکیی عێراقی، لەشکر و سوپا و فڕۆکەکانی بەریتانیا پشتیوانییان نەکات، کە بە ناوی کۆمەڵی با شەرەفی ئێوەوە چاودێری و بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتانە دراوەتە ژێر دەستی ئینگلیز نەبوایە، دووپاتەکردنی مێژوو و چوونەسەر بەغداد و گرتنی لەلایەن کوردەوە، هەر باس و دەنگێکی چەند ڕۆژێك دەبێت. ئێمە هەموو کاتێك نیشتمان و یانەمان پاراستووە و هەروەها بەرامبەر بە دوژمن دیفاع و پارێزگاری دەکەین، لە کاتێکدا، کە ئێمە نەمانویستووە بەرامبەر بە حکوومەتی بەریتانیا بچینە جەنگەوە، چونکە بە ناوی کۆمەڵی پیرۆزی ئێوەوە ئەجزوێتەوە.

ئێستا و تا ئێستا بە ناوی ئێوەوە داوای حەق و ماف دەکەین. بەم ڕەنگە داخوازی و داد و عەدالەت تەرجیح دەکەین. بەڵام نامانەوێت نیشتمانمان ببەسترێت بە حکوومەتی مەلەکیی عێراقەوە. چونکە دەیانەوێت بە زۆر و خورتی ئەم بەستنەوەیەمان پێ پەسەند بکەن و پێمان بسەلمێنن. لە کاتێکدا ئاسایش و ئەمان، سوڵح و ئیستیقرار بەلای کۆمەڵ و هەیئەتی با شەرەفی ئێوەوە گرانبەها و بەنرخە. جا هەر لە توانای ئێوەدایە لە ناو ئەم پارچەی جیهانەدا، ئاسایش و ئاشتی جێگیر بکرێت.

بەڵام هەتاوەکو بەخت و موقەدەراتی وەتەنی کورد ئەدرێتە دەست نەوەکانی خۆی، تاکو حکوومەتێکی کورد، بەڕێوەبردن و کار و فەرمانی خۆی نەخاتە ژێر دەستی خۆی و تا کورد خۆی خاوەنی حوکمی ئەو پارچە کوردە نەبێت، هیوای سوڵح و سەلام، ئاسایش و ئاشتیکردن خەیاڵێکی خاوە. کورد خاوەنی

مێژوویەکی هەزاران ساڵەیە. تەئریخ ئیسپاتی دەکات، کە کورد هەموو کاتێك هەستی مەوجوودییەتی خۆیان، مێژوویان، نیشتمانیان پاراستووە. لە دەستگا و مونەسەساتی قەومی و گەلایەتییان، خۆیان بێ ئاگا نەبوون، ئاگادارییان کردووە. لەبەر ئەوە وا قەرار و بڕیار دراوە تا دوا هەناسە بۆ پاراستنی وەتەن و موحافەزەی خۆیان دیفاع بکەن، بە چەك بەدەستی بمرن و ملکەچیی حکوومەتی مەلەکیی عێراق نەکەن. نە دەخاڵەت و نە نەفس تەسلیم ناکەن.

ئێمە، کوردەکان لەگەڵ هەموو قەوم و گەلێکدا دەمانەوێت دۆست و برا بین و بێ قین و کینە بژین و نامانەوێت مەیدانی ئەوە بدرێت، کە (حەق و ماف - تەقریر مەسیر)مان بخرێتە ژێر دەستێکی ترەوە. ئاشکرا و ڕوونە کە چارەنووس (تەقریر مەسیر) دراوەتە دەست چەند گەلێکی دواکەوتووی بیدائیی گەلانی ئەفریقیا، کەوابوو نابێت بۆ میللەتی کورد ڕەد و ڕەفز بکرێت، کە قەومی کورد خاوەن مێژوو و ناسراوە و لە ناو گەلان و ئەقوامدا مەوقیعێکی بڵندی هەیە. وەکو بە ڕاست و موخلیس ئازا و قارەمان و چالاك و زیرەك و هۆشیار ناسراوە. بەڵام لەم دوا دواییەدا حکوومەتی عێراق بە یارمەتی و پشتیوانیی حکوومەتی بەریتانیاوە ڕێگایەکی تری گرتووە. هەر بۆ ئەوەی بەرهەڵستیی موقاوەمەی ئێمە بکات و سەر بکەوێت، بیری خوێنڕێژیی وەرگرتووە و لەگەڵ ئێمە کورددا کەوتۆتە جەنگەوە.

لە کاتێکدا کوردە بێ چەکەکان، هیچ نیازێکی هەڵمەت و وروژم بردنیان نەبوو بۆ سەر هیچ کەسێك، تەنیا لە ڕووی ئاشکراکردنی بیر و باوەڕی (سیاسی) و ئامانجی خۆیان، بەهەزاران کوردیان بەئاگری مەترالیۆز و بومبای فڕۆکە درووێنە کرد و کوژران. بەڵام پاش ئەم کارەساتە، کە ئیمڕۆ کورد دەستی داوەتە چەك و سیلاح، گوناح و تاوانی ئەم تەقسیرە ئەکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی، کە لە پێشدا هەڵمەتی چەکدارییان بردۆتە سەر کوردەکان و ناعەدالەتی و خوێنڕێژییان دەربارە ئەکەن و گوناح ناکەوێتە سەر کورد و لەسەر ئەوانە.

خوێن، ئاگر، هیچ شتێك ناتوانێت مێژوو بگۆڕێت، بیسڕێتەوە، بە ملیۆنەها کورد و ڕەگەزی سەلاحەدین، کەریم خانی زەند بگۆڕێت و بیانکات بە عەرەب و یان تیرەیەکی تر. میللەتەکەم دەڵێت ئێمە شۆڕش ناگێڕین و بۆ خوێنیش تینوو نین و نامانەوێت فیتنە بنێینەوە و لایەنگری جیاوازیش ناکەین.

بەڵێ ئێمە بە ناچاری چەکمان هەڵگرتووە چونکە ئیجبار و ئیرغام کراوین و بە نابووتی مەحکووم کراوین. لەبەر ئەوەی بێ بەش و بێ هیوا کراوین و دەستمان

داوەتە چەك. ئێمە داوای ئەوە ناکەین حاکم و زاڵی هیچ میللەتێك بین و چاومان لە خاك و وڵاتی هیچ گەلێك بێت. بەڵام ڕازیش نابین کەس حوکممان بەسەرا بکات و فەرمانمان بەسەرا ڕابوێرێ. ئێمە تەنیا حوکم و سەرۆکایەتی و فەرمانداریی خۆمان ئەوێت.
ئێمە لەو بیر و باوەڕەداین، کە لە دوایی ئەم جەنگەدا، ملیۆنەها ئینسان لە پێناوی خۆیاندا گیانیان فیدا و قوربان کردبێت بۆ داوای ئەو ماف و حەقە، کە کۆمەڵی با شەرەفی ئێوە بۆ ئێمە کوردی داناوە و ڕەوای بینیوە و بە پەسندی لە یەکەم ڕۆژەوە دراوە و تەسدیق کراوە.
بمبەخشن، بە تەئکید و تەسدیق باوەڕتان ڕادەکێشم، کە ئەم حاڵە، وەسفی شۆڕش و ڕاپەڕینە، هەمووی لە ڕووی بەدکاری و بیر و باوەڕ خراپی و ئامانجی نالەباریی بەرێوەبەران، پیاو و کاربەدەستانی عێراقەوە ڕووی داوە و ئەوان شۆڕش و چەك بەکارهێنانیان تەولید و دروست کردووە تا هەموو ماف و حقووقمان، بە تەواوی جێبەجێ نەکرێت بە ئیحتیرامەوە تەسدیقی حەقمان نەکرێت، قەت دەست هەڵناگرین. جا داوا و داخوازیمان ئەوەیە کە باوەڕ بە سەربەخۆیی و ئیستیقلالمان بکرێت و وەتەنمان ئازاد بێت و ئەم حەقەمان لە ژێر پەنا و ئینتیدابی هەیئەی با شەرەفی ئەقوامدا، ڕاست و ڕاست ئیعتیراف و تەسدیق بکرێت بە ناوی ئیستیقلالی حکوومەتی کوردستانی جنووبی و هیچ پەیوەندی و پەیوەستێکمان لەگەڵ حکوومەتی مەلەکیی عێراقدا نەمینێت، چونکە ئەمانە (ئینگلتەرە – عێراق) لە ناو خۆیاندا بە پەیمان و موعاهەدەیەکی تازە کۆتاییان بە ئینتیدابی بەریتانیا هێناوە. لەبەرئەوە حەل و فەسڵی دەعوا و قەزیەی ئێمە، کە عەرز و تەکلیف کرا، موافیقی مەنتیق و زەروورەتە و کردنیشی پێویستە.
کۆمەڵی با شەرەفی ئێوە بە مووجیبی ئەمر و تەبیعەت و لزوومی ئیقتیزا و حاجات و وەقائیع، پێویستە ئێوەش بگەڕێنەوە سەر قەرارەکەتان، کە لە ساڵی ١٩٢٥دا دراوە و موعتەریفەن تەسدیق کراوە.
سەعادەت مەئاب، هیواداریین، کە ئیحتیرامات و تەعزیماتی بێ پایانمان قبووڵ و تەسدیق بفەرموون.

بە ناوی دانیشتوانی کوردستانی جنووبییەوە

شێخ مەحموود

٢١ مارت١٩٣١

پاش ئەوەی تۆفیق وەهبی لە سلێمانی کێشرایەوە، لە ساڵی ۱۹۳۲دا چوو بۆ لوبنان. ئەم وتووێژەی لە رۆژنامەی (الراصد)دا بڵاوکردەوە و لە پاش کارەساتەکەی ئاوباریك نووسراوە دەیخوێننەوە.

## جەنگی ئاوباریك

لە کاتێکدا، کە شێخ مەحموود لەشکرەکەی لە شارەزووردا لە گەرمەی جەنگدا بوون، لە عەشایرەکانی گەرمیانەوە داودە، زەنگەنە، دەلۆ، گل.... و لە بابەت وەرستی و پەرێشانیی خۆیانەوە لە دەست یاسا و ناڵەباریی مەئموورانی حکوومەتەوە بە نامە داوایان لە شێخ مەحموود کرد، کە شۆڕشەکە بگوێزێتەوە بۆ گەرمیان و جەنگی کورد ئەمجارە لە گەرمیانەوە دەست پێ بکات، جا وەکو وتمان لەسەر کارەساتەکەی ٦ ئەیلیول ۱۹۳۰، کە بەبۆنەی هەڵبژاردنەوە کوشتار و ماڵوێرانی و دەستدرێژیی میرییەکان لە سلێمانیدا رووی دا وە نوشستیی گەلی بێ چەك کەوتە ئارا و لە ناو سەرای حکوومەتی عێراقدا لە ژێر چاودێریی موتەسەرپیفی عێراقی و موفەتیشی ئیداریی ئینگلیزدا کەوتنە جێبەجێکردن و بەجێهێنانی ئاواتی پرۆغرامی حکوومەتی ئینگلیزی، ناوئاخنی حکوومەتەکەی عیراق، وەکو لە پێشەوە خوێنرایەوە، بوو بەهەڵگیرسانی شۆڕش و قڕانی کورد.

شێخ مەحموود بانگی دەستدانە چەك و جەنگ، بانگی شۆڕش و تۆڵەساندن، بانگی داوای ئازادیی دا. بەلەشکری خۆیەوە گەیشتە شارەزوور. بەگزادەی جاف لە ژێر سەرۆکایەتیی کەریم بەگی فەتاح بەگ و داود بەگی برایدا تێکەڵ بوون. حکوومەتی ناوچەکانیان پێچایەوە. گەیشتنە ناوچەی قەرەداغ و سەنگاو. عەشایر و شێخان و لەشکری بازییان ئاوێتە بوون. گەیشتنە ناو عەشیرەتی زەنگنەی. کەرکووك کەوتە ژێر ترسی لەشکری کوردەوە و عەشایری گەرمیان کۆمەکیان کرد و پرۆگرامی جەنگی چەتەیی دامەزرا. هەر لە جەنگی شارەزوورەوە حکوومەتی زۆر تەنگاو بووبوو. ترسیان زۆر بوو و ئەم شۆڕشە زۆر بەسەخت ئەبینرا.

لە گەرمیاندا دەسەڵاتی لەشکر ئێجگار زۆر بوو حکوومەت زۆر لە ناوچەکانی چوڵ کرد. لە هەموو لایەکەوە کورد دەستی دایە چەك. لەبەر ئەوەی هێزە سوپایی و پۆلیسەکان توانای بەریەرەکانییان نەمابوو، حکوومەت ناچاربوو بە هێنانی سوپا، بە هۆی شەمەندەفەر و ئۆتۆمۆبیلەوە لەشکرێکی زۆری گەیاندە نیزیك کفری و تووز. بەکرێگیراوی کوردیش پێشداریان بوو.

بۆ حەسانەوە و چەند رۆژێك دانیشتن لە لایەن سەید مەجیدەوە داوا لە شێخ مەحموود کرا

---

۱. بەپێی ئەو داستانە بیستراوەی لە چەکدارەکانەوە بیستراوە.

بچێت بۆ (ئاویاریك). بەڵام لەبەر ئەوەی ئاوایییەکە کەم و بچووك بوو، زۆریی لەشکر بەدێهاتەکانی تردا بڵاوکرابۆوە. تەنیا شێخ مەحموود و چەکدارە تایبەتییەکانی و داود بەگ بە سوارەکانی خۆیەوە لە ئاویاریك مانەوە بەلەشکرێکی ئێجگار کەمەوە.

بە ڕێگا پێشاندانی کوردە بەکرێگیراوەکان و دەستنیشانی جێگا و بزووتنەوەی شێخ مەحموود و لەشکرەکەی، ڕۆژی ٥ نیسان ١٩٣٤ لە لایەن دوو فڕۆکەوە، دێی ئاویاریك کەوتە ژێر بۆمباران و ئاگری مەترالیۆز و گەیشتنی سوپایی و پۆلیس و کوردی ناڕاست. لەو کاتەدا پارەی میری (ڕوپیە بوو، نەبوبوو بە دینار). جەنگ بوو بە جەنگی دەستە و یەخە و شێخ مەحموود لە ناو باخەکەدا و داود بەگی جاف لە جێگا هەرە پڕ ترس و گرنگەدا و شێخ عەلی قەڵبەزە لە ناو ئاوایدا لە ژێر فڕۆکەوە بەرامبەر بە مەترالیۆز و هێزی میری بەو مەرجەی لوولەی تفەنگ لە سنگی یەکتر گیر بکرێت جەنگی دلێرانە و بێ هیوا لە ڕزگاری ئەکرا. شێخ عەلی و ١٨ چەکداری و چەند چەکدارێك لە جاف و چەکداران لای شێخ، کوژرا و بریندار بوون. بەڵام بەو هێزە کەمەیشەوە دیسان بەرامبەر ٣ هەزار چەکداری میری سەرکەوتن بووە بەشی کورد و میرییەکانیش بە شکستەیی گەڕانەوە. ئەگەر لەشکری تاڵەبانیش نەشکایە و لە ناو لەشکری کوردا بجەنگایە. هیچ گومان نییە بە ئاسانی کەرکووك ئەگیرا. ئیتر فڕۆکە ماوەی نەئەدان، ناچار بوون بگەڕێنەوە بۆ ناو چیاکانی قەرەداغ و هەورامانی ئەمدیو (لهۆن) و ڕاوی لەشکری میری.

مامۆستا کاك مەحموود ئەلاوڕە (محمود الدرة) لە (القضية الكردية)کەیدا دەڵێت:

بەکر سدقی فەرماندەی سوپایی بوو. بە شەو بە لایتی دەست و ئاگر، ڕێگایان پیشانی لەشکرەکەی شێخ مەحموود ئەدا. چونکە خۆیشی کوردە، جا خەلیل زەکی پاشا، کە کەرکووکییە ناردیانە جێگای بەکر سدقی پاشا.

مامۆستا ئەلدوڕە وا دەزانێت، کە خەلیل زەکی پاشا لە گەلێکی بێگانەی کوردە، نازانێت سلێمانی و کەرکووك لەسەر یەك تیرە و یەك ڕەگەزە. سەرکەوتنی کورد، ئێجگار زۆر بوو. حکوومەت ناچاربوو لەگەڵ شێخ مەحمووددا بنیاتی ئاشتی بنێت. وەکو زانرا کەریم بەگی سەرۆکی جافیان دۆزییەوە و ئەم کارەیان پێ جێبەجێ کرد. بەرامبەر بە دلێریی ئەمجارەی لەشکری جاف، شێخ مەحموود لە قسەی کەریم بەگ لای نەدا. بەڵام شێخ مەحموود وتی: ئێمە دەنگی خۆمان گەیاندە عوسبەتولئومەم (عصبة الامم). ئەگەر دوو خاوەن بەخت لەو کۆمەڵەدا بێت بۆ ئێمە بەسە. با کوشتاریشمان دابێت بەڵام تێمان گەیاندن، کە کورد بەرامبەر بە دوژمن ملکەچ نابێت. ئەمجارەیش بانگی ئازادیمان دا بام ماوەکەیشی کەم بووبێت، بەڵام دەبێت بە بناغەی دامەزراندنی ئازادی. نای ئازادی نای ئیستیقلال چەند خۆشیت. داود بەگ وتی شێخ

مەحموود نەڕاندی وتی، شەرت بێ ئیستیقلال بخەمە پێش مەرگم و دەبێت کورد بە سەربەستی و کوردستانێکی ئازاد ببینم، چونکە کورد دەتوانێت بیسێنێ. وتی لە کاتی گەرمەی جەنگدا شێخ مەحموود خۆی بەسەر چەکدارەکاندا دەسووڕایەوە و کوژراوەکانی دەبینی و شێرانە دەجەنگا.

ئەو قوتابییانە وەکو شەفیق ئەحمەد ئاغا و باقی نووری بەگ و ڕەئووف شێخ سالح و غەفووری سەعید ئەفەندی و ڕەسووڵ عەبدوڵڵا و لە زابتەکان کامیل حەسەن و مەحموود جەودەت و حامید جەودەت و لە لاوانی سلێمانی پۆلێکی زۆربوون بە هاوچەکی جەنگی، بەڵام پاش تەواوبوونی شۆڕش، کامیل لە ناحیەی پێنجوێندا مابۆوە، مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە پێنجوێن بوو، بەو مەرجەی بچێتە ژێر ئاڵای میری و داڵە بدات، لێی دەبووری، بەڵام کامیل نەچوو ئیتر مەلیك وتی (عەفو ایتدم) لێی بووردم و گەڕایەوە.

تۆفیق وەهبی لە ڕۆژنامەی – الراصد (بیروت)، ژمارە ٣٧٦٦ و ڕۆژی ٢٤ ئاب ١٩٣٢دا دەڵێت:

بيان من زعيم الاكراد الكولونل توفيق وهبي بك نزيل بيروت الى الراصد: القضية الكردية في عصبة الأمم

يعلم القراء ان الكولونل توفيق بك زعيم الأكراد العراقي هو اليوم نزيل بيروت وقد بعث الينا بالبيان التالى ننشره عملا بقانون حرية النشر قال: طالعت مقالات فى جريدة الأحرار يوم ١٦ آب ٩٣٢ لكاتبه يوسف ملك مؤلف كتاب (فواجع الانتداب) زاعما فيه ان الأنكليز هم الذين فتحوا باب موضوع الأقليات منذ سنة ١٩٣٠ وأخطروهم بتحريض الى مراجعة عصبة الامم.

لما كان الاكراد، الداخلون ضمن حدود دولة العراق قد راجعوا عصبة الامم أيضا، بعد أن تأكد لديهم ان حقوقهم أهملتها المعاهدة العراقية – الانكليزية المنعقدة يوم ٣٠ حزيران ١٩٣٠ فدفعا لكل شك أن يسببه المقال المذكور الافكار العامة، بان الاكراد أيضا سبقوا الى باب المذكور الذى يزعم مؤلف الكتاب بان الانجليز هم فتحوه، قد رأينا الضرورة تقضى بتبيان الحقائق الاتية:

١– ان الاكراد فى العراق لم يعترفوا قط بأن تشملهم كلمة الأقليات ولن يعترفوا بها. وذلك كما يأتى:

أ– كان الأكراد فى كردستانهم تلك يتمتعون بنوع من الحكم الذاتي قبل التفكير فى تأسيس الدولة العراقية الحاضرة أى منذ سنة ١٩١٨.

ب– الحكومتان الأنكليزية والعراقية قد تعهدتا سنة ١٩٢٢ فى بيان أصدرتاه

بتأسيس حكومة كردية ضمن حدود الدولة العراقية بأقرب وقت ممكن. على ان يعين الأكراد أنفسهم شكل حكومتهم.

ج- الشرط الأساسي لإلحاق هذا القسم من كردستان بالعراق نص على وجوب تأسيس إدارة كردية حسب رغائب الاكراد.

٢- ليس لمراجعة الاكراد عصبة الامم أية صلة بباب موضوع الأقليات الذى ذكره المؤلف وذلك لما يأتي:

أ- فى سنة ١٩١٩ إختلف الاكراد ذو الحكم الذاتى قبل الحكومة العراقية إختلافا شديدا مع الانجليز بشأن حقوقهم، كما جرى ذلك مع الحكومة العراقية، فانقلب الإختلاف حينذاك الى حرب شعواء وبعد ان ساقت الحكومة الانجليزيه جيشا عرمرماً على كردستان تم لها إحتلالها.

ب- فى سنة ١٩٢٢ عندما كانت الحكومة العراقية موجودة ثار الأكراد فى وجه الإنكليز مطالبين بحقوقهم فارغموا القوى الانكليزية المرابطة فى (دربندى بازيان) على الإنسحاب وأخلى حكامهم السياسيون وموظفوهم مدينة السليمانية فى اوائل أيلول منسحبين بالطيارات. فكانت النتيجة تأسيس مختارية كردية فى السليمانية.

ج- فى سنة ١٩٢٣ توترت مرة أخرى العلاقات الكردية -الانكليزية وإندلعت ألسنة الثورة في أوائل سنة ١٩٢٣ الى اوائل سنة ١٩٢٧ من جراء الحقوق نفسها. ولإخضاع الاكراد أستخدم الانكليز في الحروب الشديدة المنعقدة التى وقعت في غضون تلك المدة قواتهم الجوية الهائلة وجنودهم الهندية والجيش العراقي والقوات الأخرى الموجودة لديهم.

د- فى سنة ١٩٣٠ إحتج الاكراد لدى عصبة الامم حيث وجدوا ان معاهدة الإستقلال ودخول عصبة الامم قد أهملت إهمالا تاما حقوقهم التى سبق ذكرها فى المادة الاولى من هذا البيان.

الا ان هذا الاحتجاج السلمي لدى عصبة الامم أثارت ثائرة أركان الوزارة العراقية لدرجة إنها إتخذت تدابير شديدة غير رشيدة سببت ثورة الشيخ محمود ولكن هذه الثورة أخمدت بفضل قوة الانكليز وسياستهم.

هـ- وكل من تتبع ثورة الشيخ أحمد البارزانى سنة ٩٣٢/٩٣١ ومصيره لايحتاج الى التفكير كثيرا حتى يرى ان الإنكليز أخذوا على عاتقهم إخلاء الجو قبل دخول العراق عصبة الامم.

فتبين مما تقدم ان الأمة الكردية لا تتأخر عند اللزوم عن التضحية في سبيل الوصول الى حقوقها. فكيف يمكن ان تكون حاجة الى تحريض الغير لها على القيام بعمل سلمي محض لتقديم إحتجاجات الى عصبة الامم.

هذا هو مجمل المشكلة الكردية في العراق واخال ان بياني هذا كاف لاظهار الحقائق وتبيان وجهة نظر الاكراد للرأي العام.

وبهذه المناسبة أرى من واجبي ان اختم مقالي هذا بالكلمات التالية:

لا يحق لاى شخص غير كردى ان يتداخل بشئون الاكراد بأسم الشعب الكردى ومع ذلك فأن الشعب الكردى يرحب ويعترف بالجميل لكل من يعطف على القضية الكردية من أى عنصر كان.

توفيق وهبي

بەڵێ، وەهبی بەگ بەیانەکەی زۆر دڵسۆزانە و ڕاست پێشان داوە بەڵام زۆرترینی کوردەکانمان بە گلەیین و دەڵێن، ئەم کوشتار و پەرێشانییەی لە شارەکەی خۆیدا، سلێمانی، ڕووی دا ئەو تاوانبارە، چونکە:

١- ئەگەر دەیزانی ئینگلیزەکان دەیانەوێت بەکوشتار لە کورد و مەبەستی تایبەتی خۆی عێراق بگلێنێت، دەبوایە لە پێشەوە ئێمەی ئاگادار بکردایە.

٢- ئەگەر ئەوەی پێ نەدەکرا نەهاتایە بۆ سلێمانی، یان خۆی بەبێ ترس ئاوێتەی گەلەکەی بکردایە و ماوەی ئەو کارەساتەی نەدایە.

٣- لە هەموو گرنگتر و ئاسانتر ماوەی نەدایە، کە سوپای عێراق بێتە کایەوە و بە مەترالیۆز کوشتار بکات و نیوەی خێزانی شاری سلێمانی بخەنە شیوەن و سەرەڕای ئەو هەموو ناهەمواریە نیزیکەی نیوەی پیاوانی شارەکە لە بەندیخانە توند بکرێت و بە کاری خراپ زەجر بکرێن.

وەهبی بەگ بێجگە لە کورد حکوومەتی عیراقیش بە پیاوچاکی نەیەزانی بەڵام لە کاتی شۆڕشەکەی بەکر سدقی پاشادا هاتەوە کایە و کرا بە (مودیری عامی ئەشغال).



ئەو نیشان: شیعارەی لە ١٩١٩دا لەلایەن شێخ مەحموودەوە بۆ حکوومەتەکەی پەسند کرابوو:

١- گوڵەگەنم

٢- گوڵەجۆ

٣- گەڵاتووتن



ئەو ئالایەی کوردستان، کە لەسەر فەرمانی حوکمدار شێخ مەحموود لە سلێمانی، لە جێگەی ئالاکەی ئینگلیز لەلایەن عیزەت نەجیبەوە داکوترا. ١٩١٩. بەرگی یەکەم لاپەرە ٤٥ .



وتمان شۆڕشەکانی بەرزان لە بەرگێکدا پێشکەش ئەکەین، بەڵام ئێستا پێویست بووە ئەم پارچەیە پیشان بدەین.

## سەرەتای شۆڕش لە بەرزان

سەرەتای شۆڕش

بەرزانی

ڕێگای شێتنە، کانوونی یەکەم ۱۹۳۰

لە لایەن (إدارە) موتەسەرفییەی هەولێرەوە نێررام بۆ کردنەوەی ڕێگا:

لە گەلی عەلی بەگەوە تا شێتنە، کە درێژیی ۱٦ کیلۆمەتر بوو. کە گەیشتمە باڵەکان، وتیان بەرزانییەکان یاخین. لە ئاینی ئیسلامی لایان داوە و بوون بە ئاسووری. قورئان دەسووتێنن، سمێڵ دەتاشن، گاگەل دەکەنە ناو مزگەوت. ئەم چاو و ڕاوە زۆر گەرم دەبیسترا. لە لایەکەوە زۆر دەترسام و لە لایەکیشەوە هیچ باوەڕم بەم هات و وتە نەبوو. چونکە ئەو کردەوانە پێویست نییە بۆ داوا و ئاواتێك.

لەو کاتەدا چووم بۆ دیانە. ناوچە و بارەگای ئاسوورییەکان. بیستم (کۆلۆنیل لاین، زابت ئیرتیباتە) و لە دیانە خۆی مەڵاس کردووە و ئەم چاو و ڕاوەیش هەموو ڕۆژێك بە بەستەیەکی تازە بڵاو دەبێتەوە لە کارخانەکەی ئەوەوە دەرئەچوو.

هەر ئەو ڕۆژە لە دیانە بیستم، کە بەرزانی پەلاماری دێهاتەکانی شێخ رەشیدی لۆلانی داوە. دێهاتەکانیان سووتاندووە. منداڵ، پیر، ژن، پیاو دەکوژن. تاڵان دەکەن. لەم بابەتەیشەوە زۆر قسەم بیست.

ئاسەف ڕەئووف، خۆشەویست و برام بوو. لای کۆلۆنیل لاین کاتب بوو و لە دیانە دادەنیشت. لێم پرسی: ئەم قسانە ڕاستە؟

ئەمە وەڵامەکەیەتی بەبێ گۆڕین:

وتی:

بە شەرمەفم، بە نیکاحم، بەرزانییەکان ئاگایان لەم قسانە نییە و هەمووی لەم ژوورەی لاینەوە دەردەچێت، چونکە ئینگلیزەکان دەیانەوێت حکوومەتی عێراق هەڵهەڕێنن، بەم هاش و هووشە کورد دەکەن بە دوژمنیان. نە ئینگلیز هیچی لە کیس دەچێت و نە عێراقیش پیاوی موخلیس و ڕاستی هەیە. بام کورد و عەرەب یەکتر بکوژن. مەقسەدی ئینگلیز عێراق بکەن بە ژێر قەرزەوە و موعاهەدە و پەیمانیان پێ ئیمزا بکەن.

من نەختێك تێ گەیشتم ترسم کەم بووەوە. پاش ماوەیەکی تر لە دیانە، میوانی مەلیك ئیسماعیل، گەورەی تیرەی تیاری و باوکی یاقۆ فەرماندەی سوپای ئاسووری. لە کاتی وتووێژدا پرسیی: ئێوە دێو بە چی دەزانن؟

وتم بە شتێکی خراپ. وتی: کەوابوو ئینگلیزە.

بەڕاستی من لەوێدا نەمدەوێرا خراپەی ئینگلیز بڵێم چونکە ئاسوورییەکان نۆکەریان بوون. هەر دیسان ماوەم بۆ خۆی بەرەڵا کرد.

وتی: ئەمە کارە بە ئێمە و ئێوەی دەکەن؟ ئێوە، کورد، ئەم بەنگ و باوەی دوای بەرزانییەکانی دەخەن ڕاستە؟ نەیبڕییەوە. بەرزانی بۆچی دەبن بە ئاسووری، خۆیان لە ئێمە ئازاتر و پیاوترن خۆ. بەلای ئێمەوە سمێڵ زۆر شەرمەفە. بۆچی لادەدەن بۆ مەسیحێتی، کە خۆیان دیندارن وە ئەم دینەیان چ ڕێگایەکی لێ گرتوون ئەگەر داوای حەق و مافی خۆیان بکەن؟ کاشکی بیانویستایە ئێمە تێکەڵیان ببین. بەڵام ئینگلیز شەرەفی ئێمەی نەهێشت. ئێمەی دەربەدەر، بێ جێگا و وەتەن و ئاوارە، چۆن بارزانی دەبێت بە ئاسووری. ئاخ، بمانتوانیایە لە جیاتی زمانیان پێی ئینگلیزمان ببڕیایە هەموومان ڕزگار دەبووین.

کوڕم، ئینگلیز هەر لەگەڵ بەرزان یان شێخ مەحموودا حەرب ناکات، لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا لە حەربدایە. بیانوویان پێ دەگرێت، بێجگە لە بەریتانیا کەس نابێت خاوەن شت بێت.

قسەکانی مەلیك ئیسماعیل و ڕەوشتی، کاری تێ گەیاندم کە ئینگلیز عێراقی بێ ئاشووب ناوێت. ئەم بزووتنەوەیەی بەرزان لەبەر ئەوەیە کە لە شێخ مەحموود دەستی شت چونکە تێ گەیشت، کە شۆڕش ڕاستە و لە شیرازەی خۆیا نابێت، کە چارەی بکا ئیتر لە سلێمانی گواستییەوە بۆ بەرزان. هیچ نەبێت چەند ساڵێکیش حکوومەتی عێراقیان پێوە خەریك دەکات. لەوێ بنیاتی شۆڕشی بەرزانی دامەزراند. وە بۆ ئەوەی تووشی پارە لە ناوبردنیان بکات کردنەوەی ئەم ڕێگایە لە گەلییەوە تا شێتنەی خستە سەر شانی عێراق. لە پاش ئەوەی کە من دەستم بە ئیشکردن کرد، تێ گەیشتم، کە بەرزانییەکان هیچ بەربەستێکمان ناکەن.

وا دەزانم پاش نیزیکەی مانگێك، کە ڕۆژی ١٢ کانوونی یەکەمی ١٩٣٠ دەستم بە ئیش کرد، لە لایەن قائیمقامی ڕەواندز ڕەزا بەگەوە، پێم وترا، کە ڕۆژی ٣ مارت ١٩٣١ سوپای عێراق

دەگاتە باپشتیان و دەبێت ئەو ڕێگەیە تەواو بوویێت. ئیتر چی دەکەیت بیکە، پارە زۆرە.

لەو ماوەیەدا موهەندیس و موحاسیب و کەس نەیدەوێرا بێت. هەر لە زاری گەلیدا پارەی کرێکاریان ئەدایە دەستم و دەگەڕانەوە، وایان دەزانی، کە بەرزانییەکان پیاوخۆرن. ڕێگا گەیشتە مەزنە، سەر ئاوی شێتنە، قادر ئەفەندی ئایشەخان هات، وتی سبەینێ دەچین بۆ گەلی چونکە سوپای میری دەگات. ٢ی مارت ١٩٣١ چووین. پێشدار دوو ئینگلیز بوو. یەکێکیان قۆڵێکی نەبوو. بەبێ ترس پەڕینەوە و بە چیادا هەڵگەڕان و قائید فیرقەیش خەلیل زەکی پاشای کەرکووکی بوو، پیاوێکی ڕێزین و بەڕێز. ترسیان زۆربوو، کە بەرزانی لە ناو گەلیدا بیانگرێت. بەڵام وا دەرنەچوو و ڕاستییەکەی نازانین بۆچی؟ جەنگی بەرزانی و حکوومەتی عێراق دامەزرا تا ٢٢ حوزەیران ٩٣٢. لە جێگای خۆیدا دوایی ئەم باسە دەخوێننەوە.

### شۆڕشی بەرزان ١٩٠٩ی باوی عوسمانی

بە بۆنەی باسی پێشووەوە و زاڵییەتیی دوو حکوومەت بەسەر بەرزاندا و ئەو بەرزانییانەی، کە لە ناو بەرد و داری چیادا، بە هەزار کولەمەرگی و ڕەنجی شانیان، بەرێوە دەچن و ژیندەگانییان بەجێ دەهێنن و هەموو چەرخی بیستەمیان بە تاڵی و ناسۆرەوە بردە سەر، بە کورتی لە مێژووی ئەو گەلە دلێر و نەبەزە دەدوێین.

بەرزان لە هەرە ژووروویی پۆژهەڵاتی ژووروویی عێراق و لە ڕیزە چیاکانی چیای شیرین، چیاکانی شێروان و لە مەڵبەندی تورکیا و ئێراندایە. دانیشتوانی ئەم گوندە یەك تیرەن. تەنیا جەنگاوەریان نیزیکەی ٣٠٠٠ چەکدار دەبێت. ئەژدادی ئەم خانەدانە پیری نەقشبەندی و پیاوێکی دانا و بەڕێز و خاوەن شکۆە و بەرز و بڵند بوو. لە پاش ئەو باوکە مەزنە، سەرۆکییان کەوتە دەست شێخ عەبدولسەلام.

### شۆڕشەکەی شێخ عەبدولسەلام

پیاوێکی دانا و بەبیر و تێگەیشتوو، گەلنەواز و بەرێوەبەر بوو. بەرامبەر بە یاساشکاندن و زاڵییەتیی کاربەدەستانی حکوومەتی عوسمانی هەندێك داوا و پێویستی ناوچە و گەلەکەی پێشکەش بە والیی مووسڵ کرد. بۆ ئەوەی ئەو خەرج و باجەی، کە بەسەر گەلەوەیە لە ڕێگەی دەستوور و یاسادا بسێنرێت و مافی گەلایەتییان بپارێزێت.

حکوومەت ئەم داوایەی بە یاخیەتی پیشان دا و فەرمانی ناردنی لەشکر و سوپا درا بۆ گرتنی شێخ و سووتان و کوشتنیان و لە لایەن میرییەوە عەشایرە کوردەکانیش هان درا و کۆمەکی میرییان کرد. هەر چەندە بە پێی ئەو نووسراوانەی بڵاو کراونەوە گوایا نازم پاشای والی لەگەڵیدا ڕێك کەوت و مانەوە.

بەڵام ئەم ڕێککەوتن و تەباییيە لە کاتی بانگی جەنگی یەکەم ١٩١٤دا هەڵوەشایەوە. شێخ عەبدولسەلام وتی: من عەسکەر، یان لەشکر نادەم بینێرن بۆ جەنگ و لە پێناوی بێگانەدا بە کوشتی بدەم، چونکە خۆم بە دۆستی ئەم دەوڵەتە نازانم. ئیتر ماوەی نەدا بە گەیشتنی پیاوانی میری بە ناوچەکەی و هیچ خەرجێکیشی نەدا. پەلاماری ئاکرێ (عەقرە)ی دا، مەئموورەکانی دەرکرد. جا حکوومەتی مووسڵ لەگەڵ زێبارییەکاندا ڕێك کەوت و پەلامارێکی سەختی شێخ عەبدولسەلامیان دا و بارزانیان گرت و پەرێشان کران وەکو زانراوە. دوای ئەم کردەوەیان شێخ سەلام گەڕایەوە بەرزان. ساڵێکی بەسەرا رابورد و پەلاماری دوژمنانی خۆی دایەوە. والیی مووسڵ سلێمان نەزیف، کورد بوو، چووە لای شێخ سەلام ئامۆژگاریی کرد. وتی: حکوومەت دەسەڵاتدارە چیی لە ناو بچێت دەتوانێت دە چەندانە تۆڵەی بکاتەوە ئەوەی لە تۆ کەم دەبێتەوە ناگەڕێتەوە، چارەی حکوومەت بە تۆ ناکرێت.

لە وەڵامدا وتی: من لە پێناوی ئازادیی گەلەکەمدا، کە کوردین هەموو ئازارێك دەچێژم. بۆچی حەقی کورد نادەن، بێگومان والی وەڵامی داوەتەوە. لە دواییدا بە والی دەڵێت، یەکێك لەو چەکدارانە بانگ بکە، والیش گازی چەکدارێك دەکات و دێت.

شێخ سەلام دەڵێت: بچۆ لەسەربانەوە خۆت بخەرە خوارەوە. چەکدارەکە بەبێ پرس و وەڵام چوو لەسەر ئەو سەربانە بەرزەوە خۆی فڕێ دایە خوارەوە و پارچە پارچە بوو. بە والیی وت ئەمەتان هەیە؟

ئیتر والی گەڕایەوە، بە وەزارەتی داخلییەی گەیاند، لە وەڵامدا پێیان وت ئێمە بڕیارمان دا بنێرە شێخ سەلام بانگ بکە بزانە چیی دەوێت ئاگادارمان بکە. والیش ئەم مژدەیەی بە هەڵێکی گەورە زانی، دەستبەجێ شێخ سەلامی ئاگادار کرد. بەڵام والی لە فێڵی وەزیر ئاگادار نەبوو، کە شێخ گەیشتە لای والی دەستبەجێ بە بروسکە ئاگاداری کرد. لە وەڵامدا (ارادەی سنیەی سلطانی) بە خنکاندنی شێخ (عبدالسلام) بە والی گەیاند. والی نەیکرد، دایان بە عەسکەری و خنکاندیان. وەکو زانراوە بەبێ ئەوەی مەحکەمەیەك بڕیار بدات و یان حاکمێك بینیبێتی ئەم گوناهە بەرامبەر بەم کوردە مەزن و بڵندە کرا. لە لایەکی تریشەوە دەڵێن بە یارمەتیی زێبارییەکان شێخ سەلام گیرا.

پاش شێخ عەبدولسەلام، شێخ ئەحمەدی برای

شێخ ئەحمەد پیاوێکی لەسەرخۆ و هێمن و ئازا و دلێر و نەترس، پاش جەنگی یەکەم و هاتنی ئینگلیز بۆ عێراق، شێخ ئەحمەد بەهەڵی زانی (بەرزان)ی لە ئاکرێ (عقرة) جیا کردەوە و خستیە سەر (ڕەواندز). پەلاماری شێروانییەکانی دا و تا (مێرگەسۆر)ی داگیرکرد بە بێ ئەوەی خەرج و

باج بدا و حکوومەتی ئینگلیز یان عێراق بناسێت. تا ۱۹۳۰ بەبێ دەنگ دانیشت. بەڵام وردە وردە جەنگی عەشایری ڕووی دەدا.

حکوومەتی عێراق بڕیاری دا، کە لەو ناوچانەدا قەڵای پۆلیس و خانووی میری دروست بکات. تابوورێك عەسکەری نارد بۆ (بلە) بەڵام شێخ ئەحمەد ماوەی ئەدەدا ئەو تابوورە عەسکەرە دەسەڵاتیان ببێ و حکوومەت پرۆغرامەکەی بێنێتە جێ. جا حکوومەت بڕیاری دا، کە لە عەلی بەگەوە تا شێتنە ئەو ڕێگایە بکاتەوە و بیگەیەنێتە مێرگەسۆر. وەکو لەمەوپێش وترا نووسەری ئەم نامیلکەیە نێررا. بە ڕاستی چاو و ڕاو و فرۆفێڵی حکوومەت بەرامبەر بە بەرزانی و دراوسێکانیان، کە دوژمنیان بوون، زۆر خراپ و کوشندە بوو. دەیانویست لە ڕووی ئاینەوە هانی عەشایرەکان بدەن، کە بە ئیجباری بچنە سەر شێخ ئەحمەد و لە بن و بنجیان دەرهێنن و ماکی ئەم کار و پرۆغرامەیش کۆلۆنێل لاین بوو، کە لە (دیانە) دادەنیشت.

ڕێگامان گەیاندە (حەودیان)، بەفر زۆربوو. ئەو ڕۆژە خۆم و کرێکارەکان لە ئاوایی حەودیان بووین لەبەر ساردی و زۆریی بەفر ئیش وەستابوو. (کۆلۆنێل لاین) بە سواری هاتبوو و پیاوێکی نارد، کە لەگەڵ دکتۆری کرێکارەکان بچم بۆ لای. زۆر بە پەلە چووم. لە دوور دانیشتبوو خواردنی دەخوارد. نیزیکەی سەد سوارەی پۆلیسی سلێمانیی لەگەڵ بوو. قادر ئەفەندی (ئایشە خان) موهەندیسیشی لەگەڵ بوو. پاش خواردنەکەی، هات. زۆر بە تووڕەیی وتی: چەند مانگە لێرەیت؟ کەی تەواو دەبێت؟ تۆ ناتەوێت ئەم ڕێگایە تەواو ببێت. تا ئێستا چەند جار بەشەو بەرزانییەکان هاتوونەتە لای تۆ؟ لەم وێنە پرسیارانەی زۆر کرد. بەڵام من نەمدەزانی وەڵامی چی بدەمەوە. ماوەی قسەکردنی منی نەدەدا. پاش زۆر قسە و هەڕەشە وتی وا من دەڕۆم زوو تەواوی بکە. ۲۸ کانوون دووەم ۱۹۲۰.

پاش نێزیکەی ۲۰ ڕۆژ، ۱۷ی شوبات قائیمقامی ڕەواندز ڕەزا بەگ داوای کردم چووم. وتی: موتەسەریف بە تەلەغراف تۆی ئەوێت، ئەیەوێت بتنێرێت بۆ جنووب، من زۆر دیفاعم بۆ کردیت بەڵام بێ فائدە بوو. گەڕامەوە تەنیا لەم ڕێگەیەوە (بەرزان) بۆ ڕێگای (ڕایەت) نێررام و تەلەگرافەکە هەڵوەشایەوە.

پاش شەش مانگ چووم بۆ هەولێر تێ گەیشتم، کە کۆلۆنێل لاین بە موتەسەریفی وتووە نەك بە نووسین، گوایا من ئیلتیحاق دەکەم بە شێخ ئەحمەدی بەرزان.

لەبەر ئەوەی حکوومەتەکانی عێراق و ئینگلیز ئەیانویست لە ڕێگەی ئاینییەوە هانی عەشایرەکانی دراوسێی بەرزان بدەن و ئێلجاڕی بچنە سەریان و بە یەك جار لە ڕەگ و ڕیشەیان دەربهێنن. بەڕێوەبەری ئەم پیلانەش (لاین) بوو لە دیانە دادەنیشت.

لە لایەن حکوومەتەوە ئەم دووزانە بڵاو کرایەوە:

دوزان – بلاغ١

لەم دواییيەدا پیاوانی شێخ ئەحمەدی بەرزانی وروژمیان بردۆتە سەر دێهات و دانیشتوانی دراوسێکانیان. بەسووتان و تالآن و کوشتن دەستدرێژی دەکەن. فەرمان درا، کە سوپاییيەکانی (بلە) نومایشێك بکەن.

بەڵام لەم خۆپیشاندانەدا جەنگێکی بەرامبەری ڕووی دا لە ڕۆژی ٩ی ئەم مانگەدا. لە عەسکەر ١٣ کوژرا بە زابتەوە و ٩ بریندار. لە بەرزانییەکان ٢٠ کوژرا و ٣٠٠ بریندار ڕووی داوە.

حکوومەت بۆ بڕینی دەستی پیاوخراپ و ناردنی هێزی سوپایی و فڕۆکەی بەریتانیاش ئەگەر پێویستبوو بۆ یارمەتی بڕیاری داوە. بۆ گەیشتن بە ئامانج بڕیاری تەواو درا، کە لە ژووررووی ڕەواندزەوە تا ڕووکوچك و لە بلە و عەقرەیشەوە بۆ سەر بارەگای شێخ هێز بنێررێت.

بۆ ئەوەی پاش ئابلۆوقە لای ژوورروەوە شێخ ئەحمەد تەنگاو بکرێت و ناچار بێت یان خۆی بدات بەدەست حکوومەتەوە و یان بەرەو ڕۆژئاوا ڕا بکات تا وەکو تووشی هێزی پۆلیس ببێت و هێزی فڕۆکەی بەریتانیاش یاریدەدەری پۆلیس ببێت و ئەمەیش دوزانی دووەم:

دوزان – بیان٢

بۆ ئەوەی سوپای میری لە مانگی نیسان ١٩٣٢دا پاش حەسانەوە و خۆئامادەکردن لە ڕووکوچکەوە بۆ مزووریی بالا بپەڕێتەوە، لە لایەن حکوومەتی عێراق و داوا لە موعتەمەدی سامیی بەریتانیا کرا، کە هێزی فڕۆکەی بەریتانیا یاریدەدەری سوپای عێراق بێت بۆ ئەوەی لە بەشی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ناحیيەی مزووریی بالاوە، فڕۆکە بۆمبابارانی هێزی شۆڕشگێڕان بکات. بڕیاردرا، کە هێزی فڕۆکەی بەریتانیا ڕۆژی ٢٩ نیسان دەست بە بۆمباباران بکات، بەڵام لە پێشەوە بۆ ٢٥ دێ دوزان بڵاوکرایەوە، کە لە پێش بۆمبارانیاندا داڵە بدەن بە حکوومەت.

بەڵام بەخت نەیهێنا یەکێك لە فڕۆکە – بۆمبهاوێژەکانی وا.بی.نی. پۆلی ٥٥ لە دەست وەشاندن و بۆمبارانـدا ڕۆژی ٢٦ نیسان لە نێزیك شێروانی مەزن کەوتە سەر زەوی، دەستبەجێ لە لایەن شێخ ئەحمەدەوە فڕۆکەوان و یاریدەدەرەکەی گیران و بە یەخسیری بران و بە بۆنەی هەندێك ئازارەوە لە شانی یاریدەدەرەکەدا داوای ماوەدانی ناردنی پزیشکێك درا بەشێخ ئەحمەد. لە لایەنی شێخ ئەحمەدەوە بەڵێن درا بۆ ناردن و گەڕانەوەی پزیشك بەبێ وەی. ئیتر بۆ ماوەیەك بۆمباردمان وێستا. ٢ مایس.

لەگەڵ کاپتان هۆڵت، کە کوردیزانێکی بەریتانی و موەزەفێکی موعتەمەدی سامی بۆ پزیشك

١. القضية الكردية لاپەڕە ١٢٥ الدرة.

گەیشتە مزووری باڵا. ۳ مایس.

بەبۆنەی چوونی پزیشك و جەنگ وەستانەوە ویسترا کۆتایی بە جەنگ بهێنرێت. شێخ ئەحمەد خۆی بدات بە دەست حکوومەتەوە. وتوویژ تا ۲۳ مایس درێژەی کێشا و بێ سوود بوو.

ڕۆژی ۲٤ مایس لەگەڵ ڕۆژئاوابووندا شێخ ئەحمەد لە حکوومەتی گەیاند، کە (ماوەی ڕێککەوتن نەما) و تەواوبوو. جا حکوومەت بە هۆی فڕۆکەیەکی (ڤیکتۆریا)وە بە زمانی کوردی بە دەنگێکی گەورە بەسەر دانیشتوانی ناوچەکەدا بانگی دەکردن بۆ داڵەدانیان بە میری.

ڕۆژی ۲٥ مایس سەرلەنوێ فڕۆکە دەستی کردەوە بە بۆمبابارانی ئەو جێگایانەی، کە شۆڕشگێڕان خۆیان تێدا شاردبۆوە. فڕۆکە ڕێگای لەوانە بەست، کە دێهاتیان چۆڵ کردووە و دەیانەوێ بگەڕێنەوە. بە بۆمبا، ماڵ و ڕەشماڵیان سووتا و وێران کرا، بڵێسەیان چوو بە ئاسماندا. بە تایبەتی جێگای دانیشتنی شێخ ئەحمەد زۆر بەشێدەت و سەختی بۆمباباران دەکرا. لادێییەکان هەموو دێهات و خانوویان بەجێ هێشت، خۆیان گەیاندە سەر لووتکەی شاخەکان. ۲۷ مایس.

لە ڕۆژی ۲۹ مایسدا زانیمان، کە بۆمبابارانەکەمان زۆر کاریان لێ دەکات و ورەیان بەرداوە و زانرا، کە هێزەکەی شێخ ئەحمەد لە ڕۆژی ۳۰ مایسدا پەرش و بڵاو بوونەوە. ئیتر لە ڕۆژی ۳۱ مایس و لە دانیشتووەکانی (بارۆش)ەوە دەست کرا بە گەڕانەوە و داڵەدان. کار لە دەست شێخ ئەحمەددا ترازا. ڕۆژی ۹ حوزەیران محەمەد سدیقیش داوای لێبووردنی کرد و وتی شێخ ئەحمەدیش داوای وەستانی جەنگ دەکات.

لەم ماوەیەدا شێخ ئەحمەد و پیاوەکانی چووبوونە سەر ئەو چیایەی، کە ۸ هەزار پێ بەرزە و لە ناو ئەو ئەشکەوتانەدا دەژیان، کە فڕۆکەوانەکان بۆیان نەدەدۆزرانەوە. بەڵام خۆشاردنەوەی بۆ دەست نەدەدا، ناچاربوون بە بەجێهێشتنی ئەو جێگا و مەکۆیانەیش.

شێخ ئەحمەد و چەکدارەکانی خۆیان گەیاندە مەڵبەندی تورکیا بۆ ئەوەی داڵە بدەن بە تورك یان ئێران. ۱۳ حوزەیران. سوپای عیراق ڕۆژی ۱٤ حوزەیران گەیشتە (شێروان مەزن)، کە شێخ و چەکدارەکانی چەند ڕۆژێك لە (زیتا) مابوونەوە. فڕۆکە ماوەی نەدان و لە ترسی گەیشتنی سوپا زیتایشی بەجێ هێشت و داڵەی دا بە تورکیا. ئیتر بۆ حکوومەت بەر بەرەڵا بوو و دەست کرا بە قەڵا دروستکردنی پۆلیس و عەسکەر دامەزراندن.

### ۱٥- شۆڕشی تازە

پاش ڕۆیشتنی شێخ ئەحمەد بۆ تورکیا سەرۆکایەتی کەوتە دەست مەلا مستەفای برای. لە بەرزاندا جەنگ دوایی نەهاتبوو. (خەلیل خۆشەوی)، کە یەکێك بوو لە بەرزانییە ناسراوەکان،

دەستی کردەوە بە شۆڕشگێڕی و تێکدانی کار و پرۆگرامی حکوومەت، کە لەو کاتەدا میری بڕیاری دابوو بە قەڵا دروستکردن بۆ پۆلیس و هێزەکانی لە ناوچەی (مێرگەسۆر و بلە)دا. جا مەلا مستەفا بەرامبەر بە حکوومەت وەستا و ماوەی دامەزراندنیانی نەدا و قائیمقامی ڕەواندز و موهەندیسەکەیان کوژران.

حکوومەت ناچاربوو بە ناردنی هێز و سوپا و دامەزراندنەوەی جەنگ، بەڵام خەلیل خۆشەوی کوژرا. لە مانگی شوبات ١٩٣٦دا حکوومەت توانی دەست بە سەر ناوچەکەدا بکێشێ و مەلا مستەفایش چوو بۆ ناو چیاکان. هێشتا بەڵگەی جەنگ مابوو شۆڕشەکەی بەکر سدقی دەستی پێ کرد. جەنگ وێستا. لەسەر ویستنی بەکر سدقی بەرزانی ڕێك کەوت و بە دەستبەسەری نێرران بۆ سلێمانی.

ئەم خێزان و ماڵ و منداڵە لێقەوماوە لە ژیانێکی ناتەواویدا لە سلێمانیدا دەژیان. تا لە ناکاو و لە کاتێکدا بانگی جەنگی دووەم درا، مستەفا بەرزانی لە سلێمانییەوە بەبێ ئاگای حکوومەت خۆی گەیاندە بەرزان و دەستیان دایەوە چەك و بەرامبەر بەناڕەوایی پیاوانی میری بانگی شۆڕشیان دایەوە. بەڵام حکوومەت بە هۆی شۆڕشەکەی ڕەشید عالی گەیلانییەوە توانای ناردنی هێز و سوپای نەبوو بچێتەوە جەنگی بەرزان. ئەمجارە حکوومەت لە جیاتی جەنگی خوێن ڕشتن، سیاسەتی بەکارهێنا.

لە دروستبوونی وەزارەتی ١٩٤٣دا ماجید مستەفا، کە کورد بوو کرا بە وەزیری دەولە. داوای ڕێکخستنی مەلا مستەفایان لێ کرد. لەسەر ئەم داوایە چوو بۆ بەرزان، بەرزانیی بینی، لەگەڵ خۆی ماجید، مەلا مستەفا هاتن بۆ بەغداد. ٧ کانون دووەم ٩٤٤.

لە وەزارەتی داخلییە بەرزانی و پیاوەکانی میری کۆبوونەوە لە جیاتی ئەوەی پێویستیان چی بێ بزانرێت و یارمەتیی ئەو گەلە پەرێشانە بدرێت، بڕیاریان دا، کە بەرزانی لە دووری بەرزان دانیشێت و چەکەکانیان بە تەواوی بدەن بە حکوومەت. داوایان لە بەرزانی کرد بۆ ئەوەی فەرمان و بڕیارەکەی حکوومەت بهێنێتە جێ گەڕایەوە بۆ بەرزان. مارت ١٩٤٥.

بەڵام لەگەڵ گەیشتنی بە بەرزان بانگی شۆڕشی دایەوە و پەلاماری قولغ و قەڵای پۆلیسەکانی دا و وتی: بەرزانییەکان بەبێ چەك ناژین. ناشزانین بە گۆچانەوە بجەنگین. ئایا میری خۆی نازانێت، کە بەلای کوردەوە چەك لە ڕۆڵە خۆشەویستترە؟ سەر دەدەین چەك نادەین. دوور نییە بۆ ئەمجارە دەستی ماجیدیش تێکەڵ نەبووبێت.

لە مانگی ئاغستۆسدا لە لایەن حکوومەتەوە لە هەموو ناوچەکانی بەرزاندا (ئەحکامی عورفی) بڵاوکرایەوە. سوپایش دێی (بەرزان و بلە)ی داگیرکردەوە. ئەمجارە و ئەم شۆڕشە بەلای هەموو کوردەوە زۆر گرنگ و پیرۆز بوو. لە هەموو لایەکەوە کورد و بە تایبەتی لە عەسکەر و

زابتانی کورد زۆر ناوێتەی بەرزانی بوو. لەوانە عیزەت عەزیز، محەمەد قودسی، خەیروڵلا، جەلال ئەمین بەگ، مستەفا خۆشناو، بوو بە هاوچەکی شۆڕشگێڕانی کورد.

وەکو زانرا بەرامبەر بە بەدختیی پیاوانی میری و کارەساتی سووتان و وێرانکردنی دێهات و چاندگە و پەرێشانیی گەلەکەی، مەلا مستەفا چوو بۆ مەهاباد بۆ هاوکاریی گیان بەختکەرانی کوردی کۆمەڵە (بە پێی بیستن، قازی محەمەد داوای کردبوو) لە مەهاباد. پارتی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند. هەمزە عەبدوڵلای نارد بۆ سلێمانی بۆ دامەزراندنی لقی پارتی. وەکو زانرا یەکەم جار (مامۆستا کەریم زەندی مامۆستای قوتابخانەیەکی سلێمانی) دۆزییەوە و کاروباری پارتیی بە ناوی سکرتێرییەوە درایە دەست. بەڵام لە پاش ماوەیەکی کەم ئەویش چوو بۆ مەهاباد و بوو بە هاوکاری کۆمەڵە و پارتی.

بۆ جاری دووەم هەمزە هاتەوە، ئیبراهیم ئەحمەد هەڵبژێردرا. کارەساتی بەرێوە چوون و پارمەتییەکەی سلێمانی بۆ کۆمەڵە چیی بەسەرهات لە بەرگی دواییدا دەیخوێننەوە. بەڵام لە دوا دواییدا زابتەکانی باسمان کرد هاورێیی بەرزانییان نەکرد.

بەهەرچی بۆنەیەکی سیاسییەوە بوو کۆمەڵە تێك درا. (باسی کۆمەڵە و مەهاباد بە جیا دەخوێننەوە). مستەفا بەرزانی و چەکدارەکانی گەڕانەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان. بەڵام لەو کاتەدا حکوومەت بە تەواوی دەستی بەسەر ناوچەکەیاندا کێشابوو. بۆ ئەوەی جێگایەکی ژیان بدۆزێتەوە، بڕیاری بەجێهێشتنی نیشتمانەکەی خۆی دا.

لەسەر داوا و ویستنی عێراق و تورك و ئێران لەو کاتەدا، کە دۆست و هاوبیر بوون بۆ لە ناوبردنی کورد، لە هەرسێ حکوومەتەکەوە سوپا گەیەنرایە مەڵبەندەکانیان و وایان زانی، کە بەرزانی ئیتر دەرچوونی نابێت، بەڵام رێگای مەردان ناگیرێت. پاش ئەوەی جەزرەبەیەکی باشی دا لە ئێرانییەکان و هەڵمەتیکی دلێرانە بە رووی سوپای عێراقدا، بەسەر سوپا مەزنەکەی تورکیادا، کە بۆ گیانی بەرزانی خۆیان مەلاس دابوو، پاش جەزرەبەیەکی باشی ئەوانیش خۆیان و چەکدارەکانیان خۆیان گەیاندە حکوومەتی یەکیەتیی سۆڤیەت وەرگیرا، کرا بەجەنەراڵ و مەشقی تەواویشی بینی. بەڵام حکوومەتی عێراق شێخ ئەحمەد و پیاوەکانی لە بەسرە لە بەندیخانە توند کرد و بڕیاری خنکاندنی دان و لە زووری (ئیعدام و بە بەرگی ئیعدامی)یەوە حەپس کران.

ئیتر بارزانی لە سۆڤیەت و تا ئێرە دوایی بەم باسە درا. درێژەی شۆڕشەکان و تا شۆڕشی ١٤ تەموز ٩٥٨ لەگەڵ دامەزراندن و ڕماندنی کۆمەڵە لە مەهاباد زۆر باسی مێژوویی لە بەرگی (٤)ی زنجیرەی (چیم دی)دا دەخوێننەوە.

شۆڕشەکەی بەکر سدقی پاشا

بەکر سدقی زابتێکی کوردی زانا و تێگەیشتووی عەسکەری تورك بوو. پاش تەواوبوونی جەنگی یەکەم ١٩١٤، گەڕایەوە و چووە سوپای عێراقییەوە. بەکر زادەی دێی (عەسکەر لە ناوچەی ئەغجەلەر-چەمچەماڵ). لە سوپای عێراقدا مەشق (فێرکردنی) زابتە ئینگلیزەکانی پەسند نەدەکرد. ئەیویست بیگۆڕێتە سەر ڕەوشتی تورکەکان، کە لە ئەڵمانییەکانیان وەرگرتووە.

لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان خۆشیان نەدەویست. بێگومان وەزارەتیش هەروەها، بەڵام بەکر خۆی کوردێکی زۆردار و نەترس بوو. بەتایبەتی لەم کاتەدا کە مەلیك غازی خۆیشی لە دەستدرێژیی ئینگلیزەکان و کلکەکانیان لە کاروباری نابەجێی عێراقدا وەڕس بوو، لایەنگریی بەکر سدقیی دەکرد. بەکر کولیەی ئەرکانی تەواوکرد. کرا بە فەرماندەی فیرقەی ٢ لە کەرکووك.

سەرۆك وەزیرانی عێراق یاسین پاشا هاشمی بوو. مەلیك ئەیویست بیڕووخێنێت. بەڵام ئینگلیزەکان پشتیوانی بوون. ماوە نەدەدرا و بە هەڕەشە وەڵامی مەلیکی دەدایەوە. جا باوەڕپێکراوەکەیشی تەنیا بەکر سدقی بوو، کە پیلانی ڕزگاریی بۆ دامەزرێنێت.

بەناوی مەشق و موناوەرەی چیایی و لە کەرکووکەوە چوو بۆ (قەرەغان - جەلەولاء) و پاش یەك دوو ڕۆژ لە ناکاو بەکر پاشا بە سوپا سوارە و پیادەکەیەوە گەیشتە (خان بەنی سەعد). حکوومەتی یاسین پاشای ڕاپەڕاند و تێی گەیاند، کە دەستبەردار ببێ. جا بە بیستنی گەیشتنی بەکر سدقی پاشا بە(خان بەنی سەعد) بۆ ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە، جەعفەر پاشا عەسکەری، کە وەزیری دیفاع بوو لە بەغداوە بە پیر بەکر سدقی پاشاوە برد.

بەڵام لە لایەن بەکر پاشاوە فەرمان درابوو، کە ماوەی هیچ کەسێك نەدرێت بگاتە ناو سوپاکەی و بچێتە بارەگاکەی. بۆ ئەم فەرمانەیش فەرماندرا بوو بە جەمال جەمیل، یەکێك لە زابتە باوەڕپێکراوەکانی.

جا لە کاتی گەیشتنی جەعفەر پاشادا ڕێگا نەدرا و پێی گەیاندبوو نابێ بچێت. پاشایش بە بۆنەی بڵندیی خۆیەوە، کە گوێی نەداوەتێ و ئەویش بە بۆنەی بەجێهێنانی فەرمانی گەورەیەوە، جەمال، جەعفەر پاشای بە بەرگی عەسکەرییەوە کوشت و لە نیزیك خان بەنی سەعدەوە کرا بە ژێر خاکەوە.

ئەم دوزان - بەیانە بڵاوکرایەوە:

ڕۆژنامەی: الصباح ٢١ تشرين الثانی ١٩٣٦، ٦ رمضان

نسورنا العراقية

حامت فوق سمائنا هذا اليوم سبع طيارات عراقية وهی تزف أبناء الشعب

البشرى التالية:

أيها الشعب العراقى الكريم

لقد نفذ صبر الجيوش المؤلفة من أبنائكم على الحالة التى تعانونها من جراء إهتمام الحكومة الحاضره لمصالحها وغاياتها الشخصية دون ان تكترث بمصالحكم وبرفاهكم. فطلب لى صاحب الجلالة الملك المعظم إقالة الوزارة القائمة وتأليف وزارة من أبناء البلاد المخلصين برئاسة السيد حكمت سليمان الذي طالما لهجت البلاد بذكره الحسن ومواقفه المشرفة وبما انه ليس لنا قصد من هذا الطلب الا تحقيق رفاهكم وتعزيز كيان بلادكم فلا شك في أنكم تعاضدون إخوانكم أفراد الجيش ورؤسائه وتؤيدونه بكل ما أوتيتم من قوة، وقوة الشعب هى القوة المعول عليها في الملمات.

وأنتم ايها الموظفون، لسنا الا إخواناً وزملاءً لكم في خدمة الدولة التي نصبو كلنا الى جعلها دولة ساهرة على مصلحة البلاد وأهلها عامة على خدمة شعبكم قبل كل شيء فلابد وأنتم ستقومون بما يفرضه عليكم الواجب الذى ألجأنا الى تقديم طلبنا الى صاحب الجلالة ملكنا المفدى لإنقاذ البلاد بما هى فيه فتقاطعون الحكومة الجائره وتتركون دواوينها ريثما تؤلف الحكومة التى ستفتخرون بخدمتها إذ ربما يضطر الجيش بكل الأسف لإتخاذ تدابيرها فعالة خلالها إجتناب الأضرار بمن لا يلبى هذه الدعوة ماديا وادبياً.

الفريق بكر صدقي

قائد القوة الوطنية الإصلاحية

٢١ تشرين ثاني ١٩٣٦، ٦ رمضان

بەکر سدقي پاشا لەگەڵ محەمەد عەلی جەواد فەرماندەی هێزی فڕۆکەی عێراقیدا هاوپەیمان و هاوبیر و باوەڕ بوون. لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بەیانەکەدا دوو بومبایش درا بەسەر بەغداد و دوایی بە سەرۆك وەزارەتی یاسین پاشا درا و ڕۆیشت بۆ شام.

ملحق جريدة الصباح، ٢١ تشرين الثاني ١٩٣٦

حدوث إنقلاب عسكرى في بغداد

إستقالة الوزارة السابقة وتأليف وزارة جديدة

حدث إنقلاب عسكرى اليوم في بغداد قام به الجيش العراقي وعلى رأسه القائد الكبير

السيد بكر صدقي وقد أستقالت الوزارة الهاشمية على الاثر وتأليف وزارة جديدة برئاسة فخامة السيد حكمت سليمان وقد وقع هذا الإنقلاب بصورة سلمية بدون أن تسفك الدماء.

أسماء الوزراء في الوزارة الجديدة

تمّ تأليف الوزارة الجديدة على الشكل التالي:

١- السيد حكمت سليمان لرئاسة الوزراء و وزير الداخلية.

٢- السيد جعفر أبو التمن وزير المالية.

٣- آمير اللواء عبداللطيف نوري وزير الدفاع.

٤- الدكتور ناجي الأصيل وزير الخارجية.

٥- السيد كامل الجادرجي لوزارة الإقتصاد والمواصلات.

٦- السيد صالح جبر لوزارة العدلية.

٧- السيد يوسف عزالدين إبراهيم لوزارة المعارف.

وقد وصلت قطعات الجيش ببغداد قبل نصف ساعة وقوبلت بالهتافات والتهليل من قبل مختلف طبقات الشعب.

بەکر سدقی پاشا ویستی بە پێچەوانەی ئاوات و ویستنی ئینگلیزەکان حکوومەتێکی تازە و دوور لە پیاوە لف لێدەرەکانی ئینگلیزەکان دابمەزرێنێت. مەلیك غازی خۆیشی یاریدەدەری بوو، تەنیا دەیانویست پێی ئینگلیز لە عێراقدا نەهێڵن. بەڵام دۆستایەتیی تازە و پتەو لە ڕووی سیاسی، ئیقتیسادەوە لەگەڵ ئەڵماندا ببەستن.

بە دانانی وەزارەتی تازە، نووری سەعید پاشا بۆ لەندەن و هەروەها یاسین پاشایش بۆ شام ئاوارە کران و لە شام کۆچی دوایی کرد و عێراقی نەبینییەوە.

بەڵام ئینگلیزەکان ڕانەوەستان. کەوتنە فرۆفێڵ بەکارهێنان و پیلانبازی. لە ئەنجامدا بەکر سدقی پاشا و محەمەد عەلی جەوادیان دا بەکوشت و سەرلەنوێ بە سەرۆکایەتیی نووری سەعید عێراقیان خستەوە ژێر باڵی خۆیان و چووەوە دۆخی خۆی.

لە بابەت کوشتنی بەکر سدقی پاشا و محەمەد عەلی جەوادەوە، ڕۆژنامەی (الوميض عدد ٦٦ فی ٢٣ جمادی الاول ١٣٧١/ ١٩٥٢)دا، کە بڵاوکراوەتەوە ئەمە کوردییەکەیەتی:

بەکر، بۆ تێکەڵ بوون و بینینی نومایشی سوپایی لە تورکیا، کە ڕۆژی ١٨ ئاب ١٩٣٨ دەستی پێ کرد، بەغدادی بەجێ هێشت و ڕۆژی ١٠ ئاب محەمەد عەلی جەوادیش لە مووسڵ گەیشتە لای. بڕیاریان دا، کە ئەو ڕۆژە لە مووسڵ بمێننەوە. جا لە کاتی وتووێژدا، کە هەردووکیان

پێکەوە بوون بە پیلانی عەقید عەزیز یاملکی و محەمەد خورشید و مەحموود ئەلهیندی و فەهمی سەعید[1] یەکێك لە سەربازەکان (محەمەد عەلی تەلەعفەری)یان نارد و لە پڕ گەیشتە بەرەمی بەکر و بە دەمانچە گوللەیەکی لێ دا و هەروەها محەمەد عەلی جەوادیشی کوشت. تەرمەکانیان هێنایەوە بۆ بەغداد و نێژران.

هەرچەندە لە لایەن وەزارەتە هاوپەیمانەکەی بەکرەوە، حەمدی زەینەڵ و ئەنتوان لۆقا نێرران بۆ مووسڵ بۆ تێگەیشتن و دۆزینەوەی هۆی کوشتنی بەکر. بەتەواوی ورد کرایەوە زانرا، کە (امین العمری و تکریتی) ماوەی ئەوەیان نەدا، کە ئەو سووچدارانەی دۆزراونەتەوە بنێرن بۆ بەغداد. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمین ئەلعومەری زۆر ترسی لە جەنگێکی ناگەهانی ناو شارەکان هەبوو، کە لەم ڕووەوە ڕوو بدات. لە فەرماندەکانی سوپایی هەولێر، کەرکووك، سلێمانیی گەیاند، کە ئاگاهەداریی ناو خۆیان بکەن و ماوەی ئاشووب نەدەن. ئیتر لە ڕۆژی ١٧ ئابدا وەزارەتی حیکمەت سلێمانیش دەستبەرداریی خۆی پێشکەش بە مەلیك غازی کرد.

بەکر سدقی پاشا، کە وەزارەتی تازەی دامەزراند بڕیاری دا، کە قوتابخانە سەرەتاییەکانی عێراق بە کوردی بخوێنن.

مەلیك غازیش وەکو بەکر سدقی پاشا و محەمەد عەلی جەواد ئاواتەکەی ئەویش کەوتە پاش دانانی گیانی ڕۆژی ٤ نیسان ١٩٣٩، لە پیلانی نووری سەعید و ئینگلیز ڕزگاری نەبوو.

حکوومەتەکانی عێراق، بە تایبەتی نووری سەعید بەرامبەر بە کورد بیانوویان زۆر بوو، هەرجارە بە بۆنەی بیانووێکی بێ سەر و پێوە، لە لایەکەوە شۆڕشێکیان بەرپا دەکرد. بە سوپایی و پۆلیس جەنگێکی براکوژیی کوردیان دروست دەکرد. بەم سیاسەتە نالەبارە کوردیان تیژ دەکرد و دەکەوتنە داوای ماف و حەقی ژیان. بەڵام سەیر ئەوە بوو، کە خۆیان ماکی شۆڕش بوون بۆ پێویستیی ئاواتی ئینگلیز بەرامبەر بە حکوومەتی عێراق. کەچی دەیانوت ئینگلیز هانی کورد دەدات، کە حکوومەت خەریك بکات بۆ بەجێهێنانی ئاوات و پەیمانی ئینگلیز و بەڵام دوایی هەموو شۆڕشێکیش بە سەربەرزیی کورد دوایی دەهات.

### شێخ مەحموود لە ناسرییە

کە شێخ مەحموود لە ناسرییە بوو من نێررابووم بۆ شارەبان، کە ناوەڕاستی ئیشی ڕێگای بەغداد – خانەقین بوو. خەریکی ڕێگا و پرد دروستکردن بووم. لەگەڵ کوردەکان و چەند سەرۆك عەشایرێکی عەرەب بڕیاریان دا. کە تا (٣٠) ئۆتۆمۆبێل لە عەشایری عەرەب و زەرگوشی بچن بۆ بینینی شێخ مەحموود. بەڵام لە ناکاو شێخ مەحموود هێنرایە بەغداد.

١. بێجگە لە (محمود الهندی) ئەوانی تر کوردن.

عەشایرەکان درێغیان نەکرد لە بەجێهێنانی پرۆگرامەکە. بەڵام لە پڕ ئەم نامە نهێنییەم بۆ هات. بێگومان یەکێك لە دۆستە کوردەکانمان بە وەزیری داخلییەی گەیاندبوو.

سری. العدد س ٨٧ التأريخ ٢٩ أيلول ١٩٣٧

الى السيد أحمد عزيز خواجه

الملاحظ الفني في طريق بغداد – خانقين

لقد أبلغتنا المراجع المختصة بانكم تداخلون في أمور خارج واجباتكم تجاه الدائرة. وقد اوعز الينا بانه ستتخذ إجراءات صارمة ضدكم في حالة إستمراركم على هذا السلوك. ومنذ الآن فصاعدا نرجو الكف عن أى عمل أو كلام يسبب إنتقادكم أو إرسال تقارير بحقكم.

مهندس المنطقة الوسطى

للاشغال في بغداد

بوفر

کاتێك ئەم نامە نهێنییەم وەرگرت، کار لە کار ترازابوو، چونکە بە مەزندە عەشایرەکان لە کورد و عەرەب چوویوون و شێخ مەحموودیان بینیبوو.

وەڵامی نامەکەیشم بەم جۆرە نووسییەوە (من بە ئیش و کاری پێسپێردراوی خۆمەوە خەریکم، هیچ کارێکی ناهەموارم نەکردووە و نایکەم). ئەم نامەیەم پیشانی ئەنوەر سائیب دا، وتی گومانم نییە برادەرێکی خۆمان ئەم ناپیاوییەی کردووە، کە دەتوانێت وەزیر ببینێ. بەڵام ئیتر لێم نەپرسرایەوە. لە کاتێکدا چووم بۆ بەغداد نامەکەم پیشانی شێخ دا، فەرمووی بەشی ئێمە (تفەنگ و کێو و ئەشکەوتە)، خوا پیاوخراپەکانمان باش بکات دوژمنی کورد لە ناو خۆیایە نەك بێگانە. خۆت بپارێزە، ماوەیەك خامۆشی بدەن بە بزووتنەوە.

**لە سەدەکانی ڕابوردوودا**

ئەگەر چاوێك بە(شرفنامە)دا بگێڕێت تێ دەگەن، کە لە سەد ساڵەکانی ڕابوردوودا چەند ئەمارە و ڕێکخراوی ئازاد لە کوردستاندا پێك هاتووە و چەند بە سەربەستی ژیاون. بەڵام لە ئەنجامدا بە هۆی پیاوە نالەبار و بەدخواهەکانی خۆمانەوە بوون بە خۆراکی عوسمانی و ئێرانییەکان و کران بە وێنە بۆ ڕاز و داستان. جا بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکەمان بکەوێتە ڕوو یاداشتەکەی سوپایی بەناویانگ (مۆلتەکە)ی مەزن و خاوەن ئابڕوومان کرد بە وێنەی نیاز و کێویەتیی ئەو ئیمپراتۆرە گەورەیەی عوسمانیی خاوەن شکۆوە بەرامبەر بە گەلی کورد، تکایە بیخوێننەوە.

**پێش ١٣٢ ساڵ**

**یاداشتەکەی سوپا سالار و سەرفەرماندەی ئەڵمان فیلد مارشال**

**هولمس فونی مولتەکە**

**لە گۆڤاری: رسملی تأریخ مجموعەسی، ئەنقەرە**

**لە تورکییەوە کراوە بە کوردی**

خوێندەوارانی بەڕێز:

ئەگەر بێت و تاوێك، بۆ پشکنینی کەل و قوژبنی پەرتووکخانەکان، یان ئەختێك لە ژیانی رۆژانەمان بۆ خوێندنەوەی نووسراوە کۆنەکان تەرخان بکەین، هیچ گومانی تێدا نییە لە باس و خوازی گەلە ونبووەکەت، کە لە پەنا کەژ و چیا و درك و دارەکانی گێتیدا دووچاری شاراوەیی دەستی بەدبەختی مژەرەکان بووە، بەرەنگاری ئەبین و ئەدۆزرێتەوە.

ئەو بەڵگانەی، کە پێویستی مرۆڤ (ئادەمیزاد) ئەبینرێت و لە وزەی کورددا بینراوە و نووسراوەتەوە، داستانی ئێجگار زۆر و گرنگ هەیە. کەوا لەم دواییی چەرخی بیستەمەدا، کە بازت بەسەر کۆسپ و قوڵتی ئەهێڵی ئەو چاو بەستەی ڕابوردوودا دراوە وردە وردە لە باسە نایاب و داستانە مێژووییەکەی گەلەکەمان ئاگادار ئەکرێن. جا ماوەی لێدوانی بۆ نووسەر و خوێندەوارانی دڵسۆزی بەختیاری بەختداری خۆمان واز و یەکالا کراوەتەوە.

کەوا بوو پێویستی سەر خوێندەوارەکانیشمان ئەوەیە هەر وەکو پێشینانەکانمان، ئەوەی ئێستایشمان ڕابوردووەکەمان ئەکەن بە تفاقی گەنجینەی مێشکیان و لە هەمبارەکانیاندا ئەیرژێنن. ئەو پێویستە، بەڵام بە دەستێکی ڕەنگینانەوە بخەنە سەر ڕووی لاپەڕەی پەرتووك و بیکەن بە ناملکە و بیکەن بە تۆوی ئازادی دانایی، تاوەکو پیتەکەی ببێت بە مایەی شانازیی گەلە شاراوە و دواکەوتووەکەی، بۆ ئەوەی بەرگی مێژووی کوردیش لە پەرتووکخانەکانی خۆ و بێگانەدا ببێ بە هاوشانی مێژووی گەلانی گێتی و بچێتە ڕیزەوە.

من هەر بەو ئاواتەی، کە بە بێ ترس و بێباکی پەل بکێشم و لە ڕیزەی مێژووانی گشتیدا بەرگی مێژووی کوردی کوردم دەربهێنم، لە توانای خۆمدا ئەو باسە نایابەی فیلد مارشالی

ئەڵەمانی (هولموس فون مولتەکە)م کرد بە کوردی بۆ دیاریی دەستی خۆم و زیندووکردنەوەی ناوی ئەو قارەمانە پێشکەش بە خوێنەوارەکانم کرد. بۆ ئەوەی ئەوەی ئێستا و دواییشمان تێ بگەن، کە ئەرکی گرانی بێگانە چۆن کوردی ناچاری پچڕاندنی زنجیرەی پاسا کردووە و چۆن هەوڵی ڕووخاندنی بناغەی بارەگای دوژمنی بێگانەی دڵڕەق و بێ بەزەییی داوە.

تکایە ئێستا نووسراوەکەی (مولتەکە) بەکوردی بخوێننەوە.

لە تورکییەوە: یادداشتەکەی مولتەکە

لە لاپەڕەی بەرگەکانی (رسملی تأریخ مجموعەسی – ئەنقەرە)وە:

ئەو زابتەی ئۆردووی ئەڵەمانەکانی بەرامبەر بە دانیمارك و ئاوستریا گەیاندە چیکەنەیەکی بێ هاوتای جەنگی و وەکو جادووگەر بردی بەڕێوە و بەرامبەر بە فرانسزەکانیش بە سەرکەوتنێکی نەبیستراوەوە دواییی بە جەنگ هێنا و ناوی سوپای ئەڵمانیای بە سەرکەوتوویەکی زاڵییەوە بڵاو کردەوە (سوپاه سالار و سەرفەرماندە فیلد مارشال هولموس فون مولتەکە) بوو.

ئەم فەرماندەیە لە پروسیادا بە سوپاییەکی هونەرمەند و دلێرێکی بێ وێنە ناوی بڵاوکرایەوە. لە ساڵی ١٨٣٤دا هاتە کیشوەری وارنا و سلیستریا. بە بۆنەی ئەو ناویانگە گەورەیەی، کە بیسترابوو لە لایەن (سوڵتان مەحموودی دووەمەوە) بۆ چوونە ناو سوپای عوسمانیی تورکیا، فەرمانی بۆ دەرچوو.

ئەم فەرماندەیە لە ساڵی ١٨٣٩دا لە کاتی شۆڕشەکەی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای خدێویی میسردا بە دانشمەندیی سوپایی لەگەڵ سەرفەرماندە حافز محەمەد پاشادا نێررابوو. لە پاش وەشاندنی پەلێکی گەورە و گرنگ و جەزرەبەی سوپاکەی میسر، گەڕایەوە.

بەڵام، بەلام ئەمجارەیان لە ساڵی ١٨٣٨دا بوو، کە لە لایەن سوڵتانەوە بۆ جەزرەبە و دامرکاندنەوەی شۆڕشگێڕەکانی کورد نێررابوو، بۆ کوردستان. ئێمە لێرانەدا باسی بەشی تورك و عەرەب و عەرەبستانمان لە یاداشتەکەیدا بوارد، تەنیا ئەوەی لە کوردستاندا کردوویەتی و بینیویەتی، کردمان بە کوردی و پێشکەش کرا.

موڵتەکە لە نووسینەکەیدا دەڵێت:

بۆ دامەزراندنی بناغەیەکی توند و تۆڵی تازە و بەکارهێنانی دەستوورێکی پاسای توند و تیژی عوسمانییەوە گەیشتینە (تووروس).

ئۆردووگا لە تۆڕوس، خەرپووت ١٩ مارت ١٨٣٨ پاش کانگای (قەبان) سێ سەعات بە هەورازەوە بەرز و کووڕەکەیدا سەرکەوتین. گەیشتینە چاندگە و پەرژینکی جوان، کە دێهاتی

کوردەکان بوو. زۆرم پێ خۆش بوو، کە لەو زەوییە زۆر و زۆر فراوانەدا جێگایەکی نەکێڵراو، یان بەیار و دانەچێنراوم نەبینی. بە درێژاییی رێگاماندا ئاوەدانی و شینایی و هاژەی ئاو و جۆگا و رووبارە. بە تایبەتی شنە شنی بای دارگوێز و داربەڕوو چاو و دڵ ڕوون ئەکاتەوە. نەئەزانرا بەچ لایەکدا و چ دیمەنە جوانێکدا بڕوانین و چی لە چی بە جوانتر بزانین. زۆر ئارەزوومەند بووم، کە زوو بگەمە ئەو خانووە جوانانەی، کە لە قوڕ و گڵ دروست کراون و لە دوورەوە دەیانبینم. وردە وردە نێزیك بەو کۆشکە زێڕینانە بووینەوە، کە بە تیشکی رۆژ ئەدرەوشانەوە. من بەلای خۆمەوە بە یەکەمین جارم ئەزانی، کە شارێکی وا جوان و پوخت ئەبینم. کە ئەو شارەیش شارە پیرۆزەکەی (خەرپووت)ە.

لە هەمووی جوانتر و دڵگیرتر چیا بەرزە سپییەکانە، کە بەفریان بەسەرەوەیە. بەڕاستی ئەتوانم بڵێم خوا ڕوویەکی تایبەتی و خۆشەویستییەکی ئێجگار زۆری تێ کردوون.

ئیمڕۆ گەیشتمە (میسرا)، کە نیزیکەی (٣) سەعات لە خەرپووتەوە دوورە و کرا بە ئۆردووگا. پاش مۆڵە، خانوویەکی بچووکی لە قوڕ دروستکراو بۆ قوماندان تەرخان کرا. بێجگە لە قەواس و پۆستەچییەکان پەلێك سەربازیش بۆ پێشخزمەت تەرخان کرا و تەتەریش ئامادەی فەرمان بوو.

دیوارە قوڕەکانی ژووری پاشا بە کووتاڵی شین پۆشراوە و لە جیاتی شووشەیش بە کاغەز پەنجەرەکانی گیراوە. بێجگە لەمانەیش ئەوەی دیمەنێکی جوانی ئەهێنایە پێش چاو چەکەکانیان بوو، کە بە دیوارەکاندا هەڵواسراوە. توومەس پیشەی کوردەکان وایە.

پاشا دانیشتبوو. لەسەر مێزە بچووکەکەی ئەستەیەك پۆستە، کە بە مێوی سوور مۆرکرابوو دانراوە. ئەمانیش کوردەکان، بە پێی دەستووری تورکەکان لە ژوورەکاندا لەسەر زەوی دائەنیشن مێز و کورسییان نییە.

کوردەکان بەرامبەر بە ئێمە کە گوایا میوانین و خۆیان بە خانەخوێ ئەزانن بە پێوە وەستاون و دەستیان گرتووە بە سنگیانەوە. پاشا لە زەویدا لەسەر پێستە پڵینگێك کووشکەی کردووە. کوڕکێکی شینی ئاویشی گرتۆتە کۆڵی، بە فێستێکی سوورەوە لە سەریا، قوت بووتەوە. کە ئەچووین لە پاش (سەلام) پاشا بە سەر وەڵامی ئەدایەوە و دوایی فەرمانی دانیشتنمانی ئەدا. پاش ماوەیەکیش خۆشهاتنی لێ ئەکردین.

حافز پاشا، چەرکەسە. لە کاتی خۆیدا بە منالی کڕراوی سوڵتان بووە. بە فەرمان و ئیش و کاری پێشخزمەتی پەروەردە کراوە و کۆیلەیە. جا لەبەر ئەوەی فێری نەختێك خوێندن و نووسینیش کرابوو، بە خوێندەوار ئەزانرا و لەگەڵ فەرماندەکانیدا جیاوازییەکی هەبوو. بێجگە لەمەیش هەندێك عەرەبی و فارسیشی ئەزانی و لە مێژووی تورکیایش ئاگاداربوو. پاشا لەگەڵ

و لیژنەیەشدا، کە پێنج شەش ساڵ لەمەو پێش نێررابوو بۆ ڕووسیا، ئەویش چووبوو. ئەم حافز
ەشایە لە پاش روشدی پاشا کرابوو بە قوماندانی ئەو ئۆردووە، کە بۆ چوونە سەر کوردەکان
ۆ کراوەتەوە و ئێستا ئێمە بەرامبەر ئەو کوردانە وەستاوین.

لە خەرپووت جێگای تەخت و ڕێك کەمە. ناچار بووین، کە لەسەر سەربانی خانووەکان مەشق
بە عەسکەرەکان بکەین. چونکە بەچاو کردنەوەکەمانەوە فرمانەکەمان گرنگ و بە ڕێگەی هات و
نەهات دەزانرێت.

پاشا هەمیشە دیاریی وەکو فستق، قەیسیی وشك، بە قوتوو سێوی مەلاتییە و هەنگوینی بۆ
دەناردین و هانی دەداین و دەممانی شیرین دەکرد، چونکە خۆی پتر شارەزای هەڵمەتی
کوردەکان بوو.

ڕۆژێك چووم بۆ لای حافز پاشا و مژدەی بەرزبوونەوەی بۆ (لوا)یم دایە. سوپاسی کردم. لە
مژدانەدا بەڵێنی جووتێك جزمەی دەستدرووی دامێ. پاشا لە پێشدا خۆی سۆڵدورووو بووە.
هەندێك جاریش هەر بە ئارەزووی کۆنەوە دائەنیشت سۆلی ئەدروو چونکە نەیدەویست
دەستبەرداری پیشەکەی خۆی ببێت.

مولتەکە دەڵێت:

بە مەشقی سوپاییەوە بە چیاکانی تۆرووسدا بۆ مەلاتییە و ئاسبوزد. ٢٨ مارت ١٨٣٨.

ڕۆژی ٢٣ بۆ تاقیکردنەوەی مەڵبەندی سووریا لە لایەن پاشاوە فەرمانم پێ درا. بە
دەستەیەکی کەمەوە لە پاوانەکانی خەرپووتەوە بە دۆڵ و گەلییە تەنگەبەرەکەدا سەرەوژێر تل
بووینەوە. گەیشتینە سەر ڕووباری (فورات)، کە شەومان بەسەرا کشا، لە دێیەکی بچکۆلەدا
بووین بە میوانی کوردەکان. لەم ئاواییە بچووکەدا تووشی ڕێز و خزمەتێکی وا بووین، کە
هەرگیز ئەو میوانداریەمان فەرامۆش نەکەم. لە توانایان پترتر بە شۆربای پاقلە، فستق،
شیرینی و شەرابی نایاب تێر و پڕ و مڕ بووین. لە خۆشیی جێگا و خواردنەکەمان هیچ مەپرسن.
چونکە خەپەرە بوویبووین. خۆ بە تایبەتی، ڕوونی و جوانیی ئاوە شیرینەکەیان وێنەی بەهەشت
بوو.

شەو تیپێك سوارە هات ئاگاداریان کردم. بەڕاستی ترسام لە هاتنی کوردە ئازاکان، کە ئێمە
بە دوژمنانمان دەزانین، چونکە زۆر لە ناکاو بوو. بەڵام دۆست بوون نەك دوژمن. ئەوانیش
دەچوون بۆ خەرپووت. ترسان شووڕەیی نییە. من کە باڵا دەست و تفەنگی کوردەکانم دەبینی،
هیچ باوەڕم نەدەکرد، کە بەم سوپا هەڵپچڕاوەمانەوە دەرەقەتیان بدەین.

پێش هەتاو کەوتن گەیشتینە کەناری (فورات). لەم جێگایەوە بە بەر ریزە چیای تۆرووسدا

فورات دەبێت بە دوو پەل. پانییەکەی دەگاتە (٨٠) پێ. بەڵام بە گەلەکییەکەدا و بەسەر بەردەکاندا وەکو گوللە ئاوەکە بە کەفە کەف تێپەڕ دەبێت. لە دوور و لەو سەری کەناری ڕووبارەکە کۆشکێك و کاروان سەرایەکی کۆن و مزگەوتێك دەبینرا. دەڵێن لە لایەن سوڵتان مرادەوە دروست کراوە و بەس، ئیتر کەس هیچی تری لێ نازانێت.

پاش نیوەڕۆ مەلاتییە

دەمبیست، کە شاری مەلاتییە پێنج هەزار خانوو دەبێت، کەچی خانووەکانیان نە بە کەرەمیت دروست کراوە و نە پێنج هەزاریش دەبێت. بەڵام ئەوەی بەلای منەوە جوان و عەنتیکە بوو گومەزی خانوو و حەمامەکانیان بوو، کە لە قوڕ دروست کراوە وە ڕەنگەکانیان قورقوشمی ئەبینرا و هەموویشیان وەکو یەك بوون. بەڵام لەم کیشوەرەیشدا وەنەبێت ناوی شووشە بیسترابێت.

لە مەلاتییە، لە دۆستە سوپاییەکانم لە خەرپووت، یەکەم جار میرئالای تۆپچییەکانم بینی و گا باران و گا بەفر بەسەرماندا دەبارێت بەزۆر ماندوویەتی گەیشتینە (مەرعەش). ئەوا دوو ڕۆژمان ڕابوورد تاوێك بە خۆشی چاو ناکەینەوە. ئای چەند خۆش بوو، کە لە پڕ لە گەلییەکەی مەرعەشدا بە تەواوی ژیانمان گۆڕرا. دار لە پشکووتندایە و خەریکی گۆپکە و گەڵاکردنە.

دەشت و کێو لە سەوزبوونی گژ و گیادایە. خۆ ڕژەوی ئاوی ڕووبارەکان ئەوەندە جوانە پێویستی وتن نییە. بەتایبەتی چریسکەی ئاوەکەی کە لە چیاکانی (گاور)ەوە بەهاژە هاژ دەڕژایە خوارەوە، گیانێکی تازەی بە شارەکە و تەماشاکەران دەبەخشی. لە خەرپووتەوە تا ئەم شارە جوانە ٦٥ فرسەخمان بڕیوە، زۆر ماندوو بووین، بڕیارمان دا، کە لەم شارە جوان و دڵگیرەدا ڕۆژێك بمێنینەوە.

ئێستا لە ناو باخچە جوانەکەی وێنەی بەهەشت لە ماڵی ئەرمەنییە خاوەن دارایییەکەی مەلاتییەدا دانیشتووم نامە دەنووسم. دارە بادامەکەی ژوور سەرم تازە لە گوڵکردندایە. ئاوی کانییە ڕوون و زنگەکەی ژێر پێشم بەهاژە هاژ تێپەڕ دەبێت. پەح، کە چەند سارد و جوان و خۆشە.

هاوینان لە مەلاتییە لە ناو شارا دانانیشن، دەچنە ناو باخە هەنجیر و پڕ لە میوەجاتەکانیان. چیاکانیان زۆر چڕ و پڕ دارستانە. دیمەنی چنارە بەرزەکان کە لە ناو نزارەکەدا وەکو منارە دەبینران و بەفرە سپییەکەی لەم کاتەدا بەسەر چیاکانەوە دەچریسکێتەوە و لە توانەوەدایە، ئاوە بەفراوەکەی بە هارە هاڕ و کەفەوە بەناو کۆڵانەکانا بڵاو دەبێتەوە، بەلای پاشاوە زۆر جوان و خۆش بوو. بەڵام بێگومان بەلای منەوە پتر، هەر داخم ئەوە بوو، کە دەمزانی دەڕۆم و ئیتر نایبینمەوە.

ئاو بە خۆڕایی ناڕوات. زەوی و دەشت هەمووی بەجۆگەی گەورە گەورە و بچووك شەق کراوە. بەچاندگەکاندا دابڕدابڕ بووە بۆ سوود لێ وەرگرتن. چونکە هەمووی لە وێنەی هەندەسیدا دابەش دەبێت و بستێك زەوی نابینیت سەوز و شینایی نەبێت.

بەڕۆیشتن ماوەی (١٨) سەعات ڕێگامان بڕی، لە ڕۆژی ١٦ مانگدا گەیشتینە چیاکانی تۆروس. پاش پێدا هەڵگەڕانێکی زۆر، کە ماوەیەکی کەممان مابوو بەو دیودا شۆڕبینەوە لە ناو گەلییەکەدا گەیشتینە دێی (ئەرگەنە).

ئەرگەنەی جوان، ئەرگەنەی شیرین، ئەرگەنەی دڵڕفێن، بەچەشنێك دڵمی برد، کە لە تافی جوانیشمدا تووشی دڵداریی وا نەبوو بووم. بە تاڤگەی گەورە ئاو دەرژێتە ناو ئاوایی. دەترساین نەماندەوێرا لە ڕووبارەکە بپەڕینەوە و بچینە ناو ئاوایی. دەزانن ئەم دیمەنە چۆن دەهاتە پێش چاوم؟ بەهێڵی کورفەزی بەسرە، یان، دەریای سپی.

## ئورفە

ئورفە، خۆی ناوی (ئاداسی)یە. پایتەختی (خەسرەو) بووە لە ساڵی ٢١٦دا. لە خەسرەوەوە بووە بەخاکی ڕۆمییەکان. هەر چەندە لای ژووروی ئورفە چۆڵە بەڵام دارستان و شیناییەکەی زۆر جوانە. دۆڵێکی بەرەلانی لای خوارووشی تا دەگاتە دیاربەکر دەشت و چۆڵێکی دوور و درێژە. لەم ڕێگایەدا تەنیا تووشی (سێوەرەك) و چەند دێیەکی بچووك بووین و هیچی تر. بەڕاستی لەو هەموو چیا و دۆڵ و دەشت و دێهاتەی، کە بینیومە لە هەمووی دڵخۆش بووم و هیچ خراپی و ناشیرینی و ناخۆشییەکم نەبینیوە.

## دیاربەکر ١٢ نیسان ١٨٣٨

شەوێکم تێدا ڕابوارد. بەڵام بەڕاستی هاژە و گرمە گرمی تاڤگەی ناوی ڕووباری فورات، کە بەسەر بەردەڵانییەکاندا کفە ئەکات، خامۆشی و بێدەنگیی نەهێشتووە.

چاوم لێك نا. هەستم دەکرد، کە هەر لەو جێگایەی ئە ئێستا منی تێدام. ئەسکەندەر، کسونۆفۆن، سیزار و جولاین بەرامبەر بە خاکە پیتدارەکەی ئێران وەستاون و ڕوانیویانەتە ئەو دار و بەرد و چیایەی، کە ساڵەهای ساڵی بەسەرا ڕابوردووە ڕەنگە هەروا بوو بێت و نەیشگۆڕابێت، ئاخۆ کێی تریش هەر لەم جێگایەی ئێمەیشدا ئەم سینەمایەی بە مێشکدا ڕانەبووربێت یا هاتوچۆی کردبێت و یان دەیکات ڕای بواردبێت.

بەسەر دیجلەدا بۆ مووسڵ بۆ عەرەبستانی عێراق بە بیابانەکانی عەرەبیدا گوزەرمان بۆ جەزیرە:

١ مایس ١٨٣٨

لە ڕۆژی ١٥ نیساندا لە وێنەی سەفینەکەی نووحدا بە مەشکەی فووردراو و بە چیلکە و چەوێل تەنراو، بە حەسیر و بەڕە و خالّی پۆشراوەوە دروستکراو وەکو لە ژوورێکی ڕازاوەی زاوایەتیی بێ ترسدا دانیشتم، سواری کەڵەکێك بووم. ئێمە و مەشکە و کەڵەك دراین بە دەم ڕژەوی ئاوەوە. خۆ سەوڵ وەشێن بەبێ ئەرك و بەبێ باك خەریکی جگەرە و قەندەکێشان بوون و شەپۆلی دیجلەیش ڕامان دەدات. بە (٣) ڕۆژ و نیوە ڕۆژ (٨٨) فرسەخ ڕێگای بەسەر ئاومان بڕی.

لە شوورە و قەڵای دیاربەکر تێ پەڕیین. تورکەکان لە نووسراوەکانیاندا بە دیاربەکر دەڵێن (ئامێدە ڕەش)، ئەم شارە لە باوی (قوستەنتینیشدا) جێگا و قەڵایەکی سەخت و گرنگ بووە ڕەنگە لە پێنج فیرقە عەسکەر کەمتر نەیتوانیبێت ئەم شارە داگیر بکات.

لە ساڵی ٣٥٩دا لە لایەن شا پوورەوە ئابلووقەی دیاربەکر درا. شەو لە لایەن بەدخواهێکەوە پەیژەیەك نرا بەسەر ئەو بەردە گەورەیەی کەناری دیجلە. کە تا ئێستاش وەکو قەڵایەك ماوە و وەستاوە و دەبینرێت.

لەو پەیژەیەوە ٧٠ تیر ئەندازی ئێرانیان هەڵکێشا و بردیاننە ناو قەڵاکە و گەیانرانە نهۆمی سێهەم و ئاڵای ئێرانیان داکوتا و ئەو ئابلوقەیە ٧٣ ڕۆژ درێژەی کێشا، بەڵام شار بەوێرانی کەوتە دەست ئێرانییەکان.

جارێکی تریش لە ساڵی ٥٠٥دا ئامێد ئابڵووقە درایەوە، ئەمجارەیش پاش ئەوەی ٥٠ هەزار ئێرانی لە ناوبرا داگیر کرایەوە و ڕۆمانییەکان گرتیانەوە. لە پاشیشدا دیسان لە ناو شارەکەدا کە (٨٠ هەزار) بە شیر و ساتیان پارچە پارچە کرا، بەجێیان هێشتەوە و ئێرانییەکان هاتنەوە. بەڵام گەڕەکێکیان بۆ مەسیحییەکان جیا کردەوە و تەرخان کرا.

### شارەکەی جزیرە

پاش ٣ ڕۆژ ڕێگا بڕین گەیشتینە شارەکەی (جزیرە)، ئەم شارەیشم بینی. هەر چوار لای دیوار کراوە. لەوە پێش لە لایەن قوماندانێکی تورکی پێش ئێمەوە ئابڵووقە درابوو. پاش ماوەی ٣ مانگ جەنگێکی گەرم و گوڕ و تیژ و ترسناك و خوێن ڕشتن، توانیبووی داگیری بکات. بەو مەرجەی هەموو نێرینەکانی ئەم شارە بە شیر و شمشێر لەت لەت بکەن، ژن و منداڵیان بەیەخسیر ببەن. بۆچی؟ چونکە، گوایا، گوایا یەزیدین و شەیتان پەرست هەر بەم ناوەوە خانووەکانیشیان بەهێوە نەهێشتوون کەچی هەموویشیان کوردن، یان کورد بوون.

شوورەکەی جزیرە لەگەڵ شوورەی دیاربەکردا جیاوازیی زۆرە چونکە دیوارەکانی دیاربەکر پێش دوانزە چەرخ لە بەردی بۆر و ڕەق و لە بەرزیی چل مەترە و دووریی قوڵەکانی لە یەکتر

دوور دروست کراوە و ئەیشتوانرێت بە ئاسانی تۆپ بەسەر دیواری شوورەکەدا بسووڕێنرێتەوە لەسەر بەردەکانی بە ڕۆمی و ئێرانی نووسینی زۆر هەڵکەنراوە. بەڵام دیمەنی شوورەکە چەند جوانە، ئەوەندەیش ناو شارەکە پیس و چەپەڵە. ئەوەی بەڕاستی بیر و هۆشی منی ڕاکێشا ئەو پردەیە، کە لە نێرینەی ئاوەکەدا پایەکانی نێزیکەی ١٠٠ پێ لە یەکتر دوور دروست کراوە.

پاش جزیرە کەوتینە ئەو پێدەشتەی، کە نووح پێغەمبەر دوای لافاوەکە بە کەشتییەکەیەوە لەسەری نیشتۆتەوە و ئەو جێگایەش چیای (جوودی)یە. دێهاتی ئەم ناوچەیە هەمووی وەکو یەك وت و وێرانن. هەروەها بەدەم گەشتەکەمانەوە گەیشتینە مووسڵی کۆن و سەر لە ئێوارە منارەکانی مووسڵی تازەیشمان دەبینی.

جا مووسڵ گەشتی بەرەو ڕۆژهەلاتمی تەواوکرد. ئەم شارە بۆ کاروانییەکانی بەغداد – حەڵەب، کاروانسەرا و ئێسگە و ڕێبازێکی گرنگی ڕێبوارەکانە. بەبۆنەی دەستدرێژیی عەرەبەکانەوە بەسەر ئەم شارەدا دانیشتووەکانی هەمیشە پاشکەوتوو و پەککەوتوون. دیواری شوورەکەی ئەم شارە زۆر تەسکە هیچ جێی باوەڕ نییە کەڵکی پارێزگاریی بێ؛ بەلام ئەو دوژمنەی هێرش دەهێنێتە سەریان تەنیا سوارەی عەرەبە بەدووەکانی چۆلنشینن.

دەرگا بەناوبانگەکەی (باب العمادیة – ئامید) هێشتا ماوە. خانووەکانی مووسڵیش بچووك و لە قوڕ دروست کراون، دەرگاکانیان زۆر جوانە. ئەملا و ئەولای بە بەردی مەڕمەڕ دروست کراوە. زۆر جوان ڕازاندوویانەتەوە.

بەلام ناوی خانووەکانیان خاوێن نییە. نیشتەنیی ئەم شارە (کورد، کلدانی، عەرەب)ن. بە کوردی و عەرەبی و ئێرانی و تورکیش وتووێژ ئەکەن. کە گەیشتینە مووسڵ والی میواندارییەکی زۆر بەڕێزی کردین. منی کرد بە میوانی (پەتریکێکی ئەرمەنی) لە مووسڵدا. کڵیسای ئەرمەنییەکان و دەستوورییەکانم بینی وەکو یەك ڕێك و پێکن و خاوێنن. بەڕاستی پەسندم کردن. پەتریکێکی یەعقوبیش چاری ناچار بوو، کە میوانداریی ئاین نەناسێکی وەکو من بکات و هەموو شتێکیشم دەرخوارد بدات. بەڕاستی والی پاشا زۆر ڕێزی لێ دەگرتم. پیاوە گەورە و ناسراوەکانی ئیسلامی تیپ تیپ دەهێنا بۆ بینین و خۆشی هاتنم.

ئیتر چۆن پەتریك ئەفەندی شتی خۆشم دەرخوارد نادا و وا ڕێ کەوت بە نابەدڵی ئینجیلێکی بە (سریانی) و یەکێکی بەعەرەبی نووسراوم بدا بەسەرا و منیش وەری بگرم. چی بکەم؟ میوانم. نەخشەیەکی جوانی مووسڵم دروست کرد و پێشکەش بە پاشام کرد.

هەروەها نەخشەی قشڵەیەکی ناپابیشم بۆ دروست کرد. زۆر سوپاسی کردم. لە کاتی جیابوونەوەمدا، ئەسپێکی ڕەسەن و چەند ئێسترێکی باشی دامێ، وام زانی ئەم بەخشندەییەی والی بەرامبەر بە نەخشەکانە. بەلام نا، هەر خۆی بەخشندەیە. کە لە مووسڵ پەڕینەوە، کەلاوەی

زۆرم بینی. پرسیم، وتیان ئەمە شارە کۆنەکەی نەینەوایە.

کە لە مووسڵ بووم جێگایەکیان پیشان دام وتیان ئەم کووچەیە بە تایبەتی بۆ عەرەبەکان جیا کراوەتەوە بۆ ئەوەی نەیەنە ناو شار. هەر لەم جێگایەدا کڕین و فرۆشی خۆیان دەکەن دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی نەوەك ناو شارە خاوێنەکە تێك بدەن، چونکە پۆخڵن. بەلای خۆیانەوە شارەکەیان زۆر نایاب و دانسقەیە، قەیناکا با وا بزانن. شارەکانی ئێمەیان نەبینیوە. نازانن شاری جوان و خاوێن چۆنە. ئەگەر شارەکانی ئێمە دەبینن ئەوسا تێ دەگەن چەند بێ نرخ و بایەخە.

باوەڕناکەم هیچ گەلێك بتوانێت وەکو عەرەب ڕەوشت و زمان و خووی خۆیان نیگاهدار بکەن. لەگەڵ ئەوەدا کە بە درێژیی ژیانیان کەوتوونەتە ژێر دەستی، ئاشووری، میسری، یۆنانی، ئێرانی، ڕۆمی، بیزانسی و لە گەڵیاندا ژیاون و ڕایان بواردووە و ئەوانە هەموویان لە ناو چوون، کەچی عەرەبەکان هەر، هەروەکو خۆیان لە چۆڵەکاندا بە ڕاوە ئاسك و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن و ماون. هەمیشە بە ژیانی چۆڵپەرستی و تالانی یەکتری و ماینی ڕەسەن بەخێوکردنەوە ڕاتەبوێرن.

تابلووقەی قەڵای کوردێك: قەڵای سەعید بەگ ٢ مایس ١٨٣٨

سەرفەرماندە محەمەد پاشا بەهێزەکەی خۆیەوە، کە (٦ تابوور هەر تابوورێکی ٤٠٠ چەکداری پیادە و ١٥٠ سواری بە ٨ تۆپ)ەوە لە دیاربەکریشەوە تالایەك تۆپچی بە تۆپەکانیانەوە لە دیجلەوە بە کەڵەك پەڕێنرایەوە بەهەموو پێویستێکیانەوە. ئەم هێزە بێشومار و گەورەیە هاتە سەر ئەو بەگە کوردە، کە لە پێش پێنج ساڵەوە بەهیچ چەشنێك فەرمانی (باب عالی)، کە فەرمانی سوڵتانە نەیبیستووە و سەرشۆڕیی بە نوشستی زانیوە، بۆی نەکردوون. هەر لەبەرئەوەی، کە خۆی بە ژێردەست و فەرمانی میری نەزانیوە خەرج و باجێکیشی نەداوە، دەیانەوێت لە ناوی ببەن.

کوردەکان کە لە هاتنی ئەم هێز و لافاوی لەشکرە ئاگاداربوون، سەعید بەگ بەخۆی و ٢٠٠ چەکداری کوردی ڕاست و پاك و مەردەوە چوونە بەرزترین لووتکە و جێگا سەختەکانی چیاکەیان. بەرامبەر بەو هێزە گەورەیە خۆیان دامەزراند. باش تێ گەیشتم، کە ئەم هێزی سوپاییە گەورەیەی ئێمە بە هیچ نازانن و باکیان نییە.

لە ئۆردوگاهەکەماندا زۆر بەتوندی ڕاسپێری پاسەوان و ئێشك گرەکانمان دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا هەموو شەوێك زۆر لە کوردەکان خۆیان دەرباز دەکرد و بەریەستیمان پێ نەدەکران.

من لە ناو ئۆردوگاهەکەدا زۆر دڵ تەنگ بووم لەگەڵ ئاغایەکی کوردەکانی لایەنگری

خۆماندا تا نیزیك قەڵاكەی سەعید بەگ چووم. بەڵام بەبێ چەك، چونكە كوردەكان چاو نابڕنە ئەو جۆرە پیاوانەی، كە داریەدەستن. كاتێك، كە ئەو قەڵا شاهانەیەم بینی زۆریاش بۆم ساخ بووە، كە چل چەكداری كورد دەتوانێت لە بەرامبەر هێزێكی لەمە گەورەتریشدا بوەستێت و خۆیان بپارێزن بەو مەرجەی چووغڵ و پیاوخراپ ماوەیان بدات.

بەهۆی قەڵەوز و رەهبەرە كوردەكانی خۆمانەوە، پێش هێرشەكەی ئێمە زۆریان لە قەڵاكانی سەعید بەگ داگیر كرد. لەگەڵ ئەوەدا، كە كوردەكان لە قەڵاكەدا تفەنگەكانیان بە بارووت و فتیلە دەتەقا، چەكدارە هونەرمەندەكانیان نیشانگری و گوللەكانیان بووبوو بەهۆی پارێزگاری و رزگارییەكی تەواویان.

كوردەكان بە شەو كاروباری خۆیان جێبەجێ دەكرد. بە ڕۆژیش لە پەنا بەردە گەورە و زەلامەكاندا لە سوپەر و حەشارەكانیاندا خۆیان لە بووسە دەدا و چاوەڕوانی بینینی دوژمنیان دەكرد. چونكە ئەگەر لە پەنا بەردێكدا ئەوەندەی نەختێك سەری دوژمنێكیان ببینیایە هیچ گومان نییە، كە مێشكیان دەپژاند. كوردەكان بارووت و قورقوشمیان زۆرە، تەقە نابڕن. باوەڕ بكەن گوللەیان بە هیچە ناڕوا، بە خۆڕایی تەقە ناكەن.

دەتوانرا بەدرێژایی ڕۆژ یەكە یەكە تەقەكانیان بژمێررێت چونكە بەبێ بینین تەقە ناكەن. دوێنێ ٣ عەسكەرمان بەو چەشنە كوژرا. ڕەنگە بەناستەمیش بینیبێتیان. بەڕاستی لە چۆنیەتیی كردەوە و زاڵیەتییان بەسەر چەكەكانیاندا سەرم سڕ دەما. بەڕاستی چەك بۆ دەستی كورد دروست كراوە.

خۆ كوردەكان لە قەڵاكەیاندا تۆپ نییە. كەچی ئەوەندەی نینۆكێك زەوی نەماوە، كە جێ گوللەی ئەوانی پێوە نەبێت. كاتێك لەگەڵ كوردەكانی خۆماندا بەسواری ئەسپە سپییەكەم لە ژێر دار گوێزە گەورەكەدا وێستابووم لە پڕ گیزەی گوللەیەك هات چڵە دارەكەی سەر سەرمی پەڕاند و ڕاپەڕیم. تێ گەیشتم دەیانەوێت خۆیان بەمن بناسن. نایشیانەوێت پیاوێكی بێگانەی وەكو منی دوور لە نیشتمانم بە گوللەیەكی قورقوشم بكوژن.

قەڵاكەی سەعید بەگ لەسەر لووتكەی ئەو چیایە بوو، كە وەكو نووكی دەرزی لە ئێمەوە دەبینرا، بەسەر ئۆردووگاهەكەیشماندا زاڵ بوون.

ڕۆژێك لە ناو گەلییەكەوە بە ڕێگایەكی پێچاوپێچی چیاكەدا هەڵگەڕاین، بۆ ئەوەی بام بە ماندوویەتییێكی تەواویش و ئەركێكی زۆر بگەینە نیزیكی سوپەرەكانی كوردەكان، پێم خۆش بوو بۆ ئەوەی تەنیا بزانم ئایا دەتوانین ئێمە لە سوپەرەكانی خۆماندا بیزووینەوە، لێكم دەدایەوە چونكە زۆر ژێر قامچیان بووین تاقی بكەمەوە.

جێگا و سوپەری كوردەكان لە چیاكەوە بەسەر هەموو ڕێگا و سوپەر و بزووتنەوەیەكی ئێمەدا

زاڵە و دەڕوانێت وە نەبێت لە بەرامبەریاندا گرد و جێگای بەرزیش نەبێ بەڵام داخەکەم ئێمە نەدەوێرین و نەدەتوانین خۆمان بگەیەنینە ئەو جێگا بەرزانە، ئاسان نییە. کوردەکان خاوەن دەسەڵاتن بۆ نەهێشتنی.

لە پاش ئەوەی بە چنگەکرپیەکی زۆر و ماندووبوون بە گرد و چیاکەدا هەڵگەڕام و ئێوارە بە ئابووتی، کە گەڕامەوە، بۆ حەسانەوە چووم بۆ چادر و ئۆردووگاهەکەی (وەدیع خان)ی بەگی خۆمان، بەگی کوردە لایەنگرەکانمان. چادری بەگ لە کەناری جۆگە ئاوەکەدا هەڵدراوە و ئاگرێکی گەورەیان کردۆتەوە. بەپارچە پارچەی گەورە گەورە لە لاق و پەراسوو گۆشتی بەرخیان دەبرژاند، بە بەرامبەریاندا چل تا پەنجا چەکداری کورد بە تفەنگە درێژ و دەمانچە و پا و پلە ئەستوور و هێزدارەکەیان و باڵا و شێوە و دیمەنە بێ هاوتا و جوانەکەیانەوە، کە خوا تەنیا بەو گەلەی بەخشیوە، وەستاون. سەرۆك و گەورەکانیشیان بەڕیزە دانیشتوون. گەیشتین، ئەوانیش لە چاوەڕێیی ئێمەدا بوون. با لێرانە بەراوردێك بکەم ئەی دەبێت کوردەکانی سەر چیا چۆن پیاو و زەلامێك بن؟ بەشەو لە هەموو لایەکەوە ئاگری گەورە گەورە دەکرایەوە خامۆشیی ئەم ئۆردووگاهە مەگەر گیزە گیزی گوللەی کوردەکان تێکی بدایە. چونکە لە بەرزیی چیاکەوە بەسەرمانا دەهات.

چادر و قۆناغم دوورە پێخەفم ناگاتێ. شەو کەپەنکێکی بەگە کوردێکم وەرگرت و لە خۆمەوە پێچا و لەسەر زەوی لێی درێژ بووم. نووستم، لەبەر زۆریی ماندووبوونم پرخە پرخ لێی نووستم. لە نیوە شەوا ترس رای پەڕانم. بیری هێرشی ئەوانی بەبیرا هێنام چونکە من زۆر دەترسام، ئەوانیش کوردەکان لە چیادا بێ ترس بوون.

دەستبەجێ فەرمانم دا کە تۆپێك ببەستن بە ئێسترێکەوە و بیگەیەننە سەر گردەکەی ڕۆژهەڵاتمان و دای ببەستن، ترسان شوورەیی نییە. ئەو لایەیشمان بە چۆڵی مابووەوە مەکۆکەیان لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا نییە. وڵاخەکانیشمان کە لە ناو باغچەکاندا دەلەوەڕان زۆر باش لەوانەوە دیارە و لە ئاوایییەکەوە بە ئاسانی دەکەونە ژێر نیشانی تفەنگەکانیانەوە.

تۆپە گەورەکانیشم لای چەپەوە دامەزراند لەبەر ئەوەی وام دەزانی کوردەکان تۆپیان نەدیوە و بەگوللە بارانێك دوایی بەجەنگ دەهێنین و ئیتر خۆیان دەدەن بەدەستەوە. خۆ ئەگەر وایش نەبوو لە ژێر گوللەبارانی تۆپدا عەسکەرە پیادەکانمان دەتوانن ورووژم ببەن و بگەینە سەر سوپەرەکانیان.

٨ مایس. دوێنێ شەو محەمەد پاشا بە فیرقەکەیەوە گەیشت، دەستبەجێ کۆبوونەوە و لێدوان دەستی پێ کرد. داخەکەم زۆر بە نەزانی دەست بەکار کرا. وترا دەبێت بەنۆرە هەر جارە تۆپێك گوللە باران بکات، ئەم کارەمان هەمووی بەخۆڕایی و بێ سوود ڕۆیشت. لەگەڵ ئەمەیشدا پەی

دەر پەی نێلچییان دەنارد، کە سەعید بەگ بەبێ لێدوان و چەند و چوون قەڵاکەی بدات بەدەستەوە. لەگەڵ ئەوەیدا، کە سەعید بەگ بۆ ئەم فەرمان بەجێهێنانە ئامادەبوو، دەیشیویست داواکانی بەجێ بهێنرێت. ئیتر شەو و ڕۆژ بەبێ پسانەوە کۆبوونەوە و لێدوان درێژەی دەبەست و هەروەها بەبێ گۆڕین دەڕۆیشت.

لە لایەکەوە ئێمە و تۆپەکانمان خەریکی خۆ ڕێکخستن بووین، لەلایەکی تریشەوە بۆ ڕێکەوتنی سەعید بەگ بە چاوەڕێوە خۆمان ئامادە دەکرد. هەر لە ئێوارەوە دوو بلۆك عەسکەر بۆ پاککردنەوەی ڕێگای تۆپەکان لە پێش تۆپەکانەوە و بۆ هەر تۆپێك دوو بلۆك عەسکەرپیشمان بەرێ دەکرد، پاش ماندووبوونێکی زۆر و شەش سەعات خەریکبوون توانیمان دوو تۆپ بگەیەنینە سەر گردێکی بەرز.

چونکە لەوە پێش داوا لە پاشا کرابوو، کە ئەم نیازە بهێنێتە دی و ئەم تۆپانە بگەیەنێتە ئەو جێگایە. ئیتر دەبوایە ئەم فرمانە دروست ببێ. چووم بۆلای پاشا هەموو کارێکم تێ گەیاند. دوو ئالا عەسکەری خستە تەکم. خۆمان گەیاندە سەر ئەو گردەی، کە پێویست بوو و دوو تۆپیشمان گەیاندە لای خۆمان. سەر لە ئێوارە دوو گوللەی تۆپمان دا لە قەڵاکەی سەعید بەگ. ئەوا ئیمڕۆیش بەبێ قەڵاکەدا ڕۆیشتم. لە کوردەکانەوە هیچ تەقەیان لێ نەکردین. من خۆم بە پیاوێکی گەورە و زابتێکی گەورە دادەنا و یان وام دەزانی بڕیاری خۆ بەدەستەوەدانیان داوە، ناپانەوێت دڵشکستمان بکەن. بەڵام نا، هیچیان نەبوو. هەر پیاوەتی بوو، کە لەگەڵیان کردین. چونکە بیانویستایە هیچ گومانم نییە پەرێشانیان دەکردین.

٩ مایس، سەر لە سبەینێ دەستمان کرد بە گوللەبارانیان، ئەو پێنج تۆپەی گەیاندبوومانە سەر گردەکان هەر یەکە ٢٠ تا ٣٠ گوللەیان تەقاند نیوەی گوللەکان لە دەرەوەی قەڵاکەدا لە زەوی دەدرا. وا دەزانم لەبەر پێچ و پەنای چیاکە بوو، کە گوللەکانمان هیچ کاری لێ نەدەکردن. خۆ گوللەکانیش نەدەترسان؟ ئایا ئەمەیش پیاو نییە لە پاداشی ئەوەدا، کە دوێنێ ئەوان ئێمەیان پاراست، دەیانکوشتین ئێمە ئیمڕۆ بەتۆپ گوللەبارانیان دەکەین؟

لە گوللەبارانی دواییماندا دوو گوللەتۆپ بەر قەڵاکەیان کەوت. دەیڕووخان و لە گوللەکانی تریشمان لە ٣ بەش بەشێکی بەر قەڵاکەیان دەکەوت. ڕەنگە تەنیا ئەو گوللەیەی بەر دەرگاکە کەوتووە کاریگەر بوویێت.

تۆپەکانی لای ڕۆژئاوامان نیزیکەی ٧٥٠ و تۆپەکانی تر ٨٥٠ پێ لە قەڵاکەوە هەر چەند دوور بوو و ڕەنگیشە ئێوە ئەم ماوەیە بەدوور بزانن. بەڵام چی بکەم؟ ئێمە بە نیزیکبوونەوە و تێخزانیشەوە هەر دەبێت سوپاسی خوا بکەین، کە دەتوانین خۆمان بپارێزین.

بۆچی وا دەزانن کە ئەوانەی لە ناو قەڵاکەدان وەکو ئێمەن و ئادەمیزاد؟ بەڵێ هەر ئادەمیزادن بەڵام کوردن، ئازان، ورە بەرز ئادەن، ناترسن، بێ باکن، هەموو شتێکن. کاتێ، کە گوللەتۆپەکانیان بۆ دەچێت و بەر قەڵاکە ناکەوێت، دەکرێت بەدەنگ و هەڵاپەکی وا زۆر گاڵتە پێکردنمان دەستبەجێ ئاگربارانێکی گەرم و گوڕمان دەکەنەوە گوللەکانیان چزە چز بە پەنا گوێچکە و ناوانماندا دەڕوات. ئێمەیش چرکە ناکەین گوایا ناترسین گوێ نادەینە گوللەکانیان. بەڵام کەی وایە؟

گوللە تۆپی زۆرمان بەڕێکاوەیە ئەمانگاتێ ئیتر گوێمان نەدەدایە گوللە لەناوبردن. بەبێ ئەوەی هیچ ببینین و لێك بدەینەوە بەبێ بەزەیی وەکو چیکەنە دەمانتەقاند. بەڕاستی دوێنێ ماوەی حەسانەوە و چاوترووکاندنی ئەو کوردە دلێر و هەژارانەمان نەدا. ئەوا ئیمڕۆیش ئێمە بە تەواوی هەر بەکۆبوونەوە و نووسینەوە ڕائەبوێرین.

لە ئەنجامدا، سەعید بەگ وتی بۆ ئەوەی خۆی سەربەست بکرێت بە (بارمتە) کوڕەکەی دەنێرێت و هەموو پیاو و شتوومەکی ناو قەڵاکە بەکەلوپەل و هەموو پێویستییەوە دەدات بەدەستەوە، ئەم بڕیارەی پێ گەیاندین. کەچی پاشا ئەم قسانەی نەبیست.

ئەمجا سەعید بەگ بە ناچاری دەستبەرداری جەنگ بوو. بڕیاری هاتنی دا. بۆ ئەوەی لە کاتی هاتنی سەعید بەگدا منیش لە لایان بم پاشا داوای کردم. هەموو زابتەکانیشی کۆ کردبوو و چاوەڕێی هاتنی سەعید بەگ دەکرا، کە ئەو کوردە ئازا و دلێرە بێت و ببینین. چاوم لێ بوو تیپێك لە کوردەکان لە قەڵاکەوە هاتنە خوارەوە و تێکەڵ بەعەسکەرەکان بوون پاش نیو سەعاتیش سەعید بەگ.

سەعید بەگیش لەبەر چادرەکەماندا لە ئەسپە جوانەکەی بەشۆخ و شەنگی دابەزی. ئەو کۆشك و (شاتوو)یەی، کە پڕ لە گەوهەر و لە ناویا ژیانی شاهانە ڕادەبوێرا و پڕ بەو قەڵایە پاڵەوانی نەبەز و نەبینراو بوو، کە بەرامبەر بەڕزگارکردنی سەر و ژیانیان بوو و وای ئەزانی ڕزگار دەبێت دای بەدەستەوە کە ئەوەیش ناچاری بوو. چونکە خزمی خۆی دوژمنی ئەو و دۆستی ئێمە بوون.

هات، سەعید بەگ ئەوەندە دلێرانە هات وای دەزانی، کە هیچ ڕووی نەداوە. بێ ترس و ئەندێشە هات. ویستی دەستی پاشا ماچ بکات. من لەو کاتەدا سەرسام بووم وا دیاربوو، کە سەعید بەگ بۆ لێخۆشبوون نەهاتووە. چونکە پەنا بە شکاو و ژێرکەوتوو نادرێت. بەگ وەکو هێشتا لەشکر و هێزێکی زۆر گەورەی لە دواوە هەبێت و دەتوانێت خۆی پارێزگاری بکات. هەر تەنیا بۆ خوێن نەڕشتن و ئارەزووی دۆستایەتی هاتبێت وابوو. زۆر بەبێ باکی لەگەڵ پاشا و ئێمەدا دانیشت، قەندەکەی پڕ کرد. دەستی کرد بە قەندە کێشان. زۆر لەسەرخۆ قاوەکەیشی خواردەوە. بەتورکیش کەوتە وتووێژ.

دوا بڕیاری پاشا ئەوە بوو، کە قەڵاکە بەتەواوی لەگەڵ خاکدا یەکسان بکرێت. ئەم بڕیارە زۆر شایانی دڵتەنگی و ئازوردەییی من بوو. بەڵام کارێکی پێویست بوو. چونکە چ عەسکەر و چ هەرچی تیرمیەکی تر بگاتە ئەو قەڵایە، هەر سەعید بەگ دەبوو.

قەڵاکەی سەعید بەگ، ۱۳ مایس ۱۸۳۸ ڕەواندز

لە چادرەکەی پاشاوە تا قەڵاکەی سەعید بەگم پێوا بە تەواوی لە ۱۳٦۳ مەتر بەرزیدا بوو. گەیشتمە ناو قەڵاکە بەچاو بڵندی و جوانی و سەختی جێگاکەوە، لە ڕووی پارێزگارییەوە بۆ دامەزراندنی بینای قەڵاکە هیچ ئەرکێك بەکارنەهێنراوە. دیوارەکانی پەرێشان و ڕوو لە ڕووخاندنە. ژووری ئازووخە و ژووری نووستنی بەگ و پارەوەکان و سەربازەکانیان بەگومەزی دروست کراوە. بەڵام لە کاتی دروستکردندا دەرگاکەیان بەڕووی ئەمدیودا داناوە ئەوەیان بەبیردا نەهاتووە، کە گوللە دەیگێڕێتەوە[1].

گوللە تۆپێکمان درابوو لە دەرگای قەڵاکە، کەوانەی سەر دەرگاکەی ڕماندبوو، دیوارەکەی بەرامبەری سمیبوو چووبوو لە ژوورەوە ئاوێنە گەورەکەی پشت سەری جێگای نووستنی سەعید بەگی وردوخاش کردبوو. گوللەیەکی تریش درابوو بە چاڵی ئاوەکەیاندا و لە کاری خواردنەوە کەوتبوو. ئیتر نەدەشیا ئەو ئاوە بخورێتەوە.

تۆپە چاپلییە بچووکەکانمان دیوارسم بوو، وێرانی دەکرد. سەعید بەگ لەوەپێش بیستبووی، کە زابتێکی بێگانە لە ناو ئەم کوردەوارییەدایە. گوایا بەم باسە شڵەژاوە. چونکە هەر جارە لەسەر گردێك بینیومی سووڕانەوەکەمی پێ خۆش نەبووە و وتیان فەرمانی دابوو بە کوردەکان لە ناوم ببەن. ئایا ئەمە جێی باوەڕە؟ بۆ من ناء.

لە ناو قەڵاکەدا زۆر پیسیم بینی وەکو تەرسی وڵاخ و ئێسقان و پاشماوەی خواردەمەنی، کە زۆر لە مێژەوە نە گەسك دراوە و نە خاوێن کراوەتەوە. ڕەنگە ئەم چەپەڵییە کاری کردبێتە سەر ژیانی پاسەوانەکان.

لە ناو قەڵاکەدا کوردێکی بریندارم بینی بەدەست براکەیەوە و بە پاڵەپەستۆ دەیبرد بەڕێوە زانیم، کە ئەو هەژارە لە پێش حەوت ڕۆژەوە بریندار کراوە، ڕانێکی شکاوە. زۆر بەزەییم پێدا هات. دەستبەجێ ناردم، سەرتاشەکەی ئۆردووم هێنا بانگم کرد و فەرمانم پێ دا، کە زوو برینەکەی تیمار بکات.

---

۱. کەی سەعید بەگ یان پێشتری، نەیانزانی کە دەوڵەتە ئیسلامەکەی تورك پێنج هەزار عەسکەر بەتۆپ و تۆپخانەوە دەهێنێتە سەریان، گیان و نیشتمانیان بەگوللەتۆپ وێران و خاپوور ئەکات.

وەرگێڕ

بەڵام سەرتاشەکە بە ڕوویەکی گرژ و تاڵ و پرسیارەوە وتی: «ئایا نازانیت ئەم بریندارە کوردە، چۆن دەرمانی بکەم»؟ بەڕاستی چرچاوی ئەوەندە مۆن بوو بە ڕقەوە ڕوانییە ڕووم، من سڵم لێ کرد. وتم کورم چی دەبێت ئەگەر تیماری بکەیت، بەزۆر یا بەخواهیش پێم تیمار کرد.

مێشکی تورکەکان بۆ بەڕێوەبردن سەیرە. ئایا ئەمە دەردێکی گەورە نییە، هێزێکی چوار پێنج هەزار کەسی سوپایی بنێریت بۆ جەنگ. نە پزیشك نە دەرمان، نە برین پێچ و نە هیچ پێویستێك نەبێت و نەینێرن؟ حافز پاشام تێ گەیاند ئەویش نووسی بۆ سەر عەسکەر بەڵام. وەڵام کوا؟ وەڵامی چی؟ ڕەنگە ئێوەیش هاوبیریم بکەن، کە مێشکیان نییە.

ئایا، لە جیاتی ئەوەی خۆیان بەگژ و گیا و گوڵ و گوڵزاری (غەڵەتە باغچە)وە خەریك بکەن و لە ئەستانبوولدا چیمەن دروست بکەن و چاوپۆشی لە کاری گرنگ بکەن و دوورە پەرێز بگرن، جارجارێکیش بریندارەکانی جەنگیان بەبیرا بێت بە نرختر و چاکتر نەدەبوو؟ بۆ ئەوەی جەنگاوەرەکانیان پترتر لە ڕێگای نیشتمانەکەیاندا یەك بەدوای یەکدا خۆیان بخەنە ناو کۆڕی جەنگ و ئاگرەوە؟ مەگەر هەڵمەتی کوردەکان فێریان بکات. بەڵام باش بوو من توانیم سەرتاشەکە بەفریای ئەو بریندارە کوردە هەژارە بگەیەنم.

**چیاکانی کوردستان: ١٨ مایس ١٨٣٨**

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەوەندە زۆر بڵاو و فراوانە، کە بابی عالیی حکوومەتی ئیستەنبۆڵ هیچ ئاگای لە چۆنیەتی و بەڕێوەبردنی ئەم کیشوەرەی نییە.

لەبەر ئەوەی پادشاە – سوڵتان تەنیا ئەوەی دەوێت، کە بەسەر ئەو بەش و گەلەی لە ژێر دەست و لە ناو وڵات و فەرمانڕەواییەکەی خۆیدا دەژین، زاڵ و سەرکەوتوو بێت هیچ ئاوات و پێویستییەکی تری بە بیردا نایەت. ئەو بەشەیش ئەوەیە، کە کەوتۆتە نێوانی ڕووباری دیجلە و ئێران، کە کوردی تێدا دەژی. جا بێجگە لە بەشی کوردەکانیش ئەو زەوییە چۆڵ و بێ ئاو و زیندەوەرییەی، کە دەکەوێتە نێوانی دیجلە و فوراتیش هەرگیز بەکاری نیشتەنی و ژیان نایەت. ئەو بەشە وەکو وێرانە و کەلاوە دەبینرێت دیمەنەکەی دڵ تەنگ دەکات. چونکە وێنەی ئادەمیزادی کۆنی لەناوچوو پێشان دەدا. کەچی ئەو وێرانەیەش ئێستا کراوە بە تۆردووگا و ئێمەی تێدا دەژین. بەڵام ئەگەر قسەی ڕاستتان دەوێت بێجگە لە نیشتەنییەکانی خۆی بەولاوە، لە وزەی هیچ گیاندارێکدا نییە گوزەرانی تێدا بکات.

هەر کە لە دیجلە تێپەڕ دەبیت بۆ بەرەوژوور، وردە وردە زەوی بەرز دەبێتەوە تووشی گردی بچووك بچووك دەبی، ئەو بەرزبوونەوەیەش دەگاتە ئەوەی دەبێت بە چیای بەرزی بەفراوی، کە نیشتمانی کوردەکانە، کە بە داری بەڕوو، مازوو، گوێز... زۆر شتی تر پۆشراوە شیو و

دۆڵەکانیشی بە داری زەیتوون، هەنجیر، هەنار، ترێ و زۆر درەختی میوەداری تر ڕازاوەتەوە. ئەگەر پرسیاری خاکەکەی دەکەیت، زەوییەکانیان زۆر بە هێز و بە پیتە. بە تایبەتی گەنمی زۆر نایاب و زۆریشیان بۆ پێ دەگەیەنێت. خۆ گژ و گیا و پاوانەکانیان بۆ بارگین و گا و مانگا و مەڕ و بزنەکانیان لە باس نایەت. بەڕاستی ئاژەڵیان بەختیارە، زۆر تێرن و ئاژەڵ و ماڵاتیان لە تیرە ڕەسەنەکانن.

داخەکەم، لەو نیشتمانە جوان و ئاو و زەوییە پیتدارانەیان، زۆربەی زەوییەکانیان بە نەکێڵراوی و بەیاری ماوەتەوە. ئەگەر بێت و بۆ دۆزینەوەی هۆیەکەی بگەڕێین، بپرسین، دیارە و ئاشکرایە دەچێتەوە بۆ سەر بێ بەزەیی حکوومەت.

کوردەکان، لەگەڵ گەلەکانی ترا جیاوازییان هەیە. ئازا و دلێرن. هەر ئەدارابییانە کە تووشی جەنگ و پەلی گەورە و زلە زلەی نەگبەتییان دەکات. هەمیشە خەریکی چاندن و لە چاندگەکانیاندا نیشتەجێی خانووەکانیان خانووی لادێییە. هونەرەکەیشیان لەوەدایە، کە وەکو هێلانەی داڵ لەسەر لووتکەی چیاکان قەڵایان دروست کردووە. کەچی لە کاتی جەنگیشدا بەهێزە ئەوەستن دانانیشن، دلێرانە و بێ ترس ئەجەنگن.

کوردەکان، بێجگە لە تفەنگەکە و ئەو بەرد و خاکەی تێیدا دەژین و پارێزگارییان دەکات شتێکی تریان نییە و هیچی تریشیان ناوێت. کوردەکان سەراپا هەموویان نیشانچی و چەکبازن. تفەنگەکانیان بە زیو و زێڕ دەنەخشێنن و دەیرازێننەوە. چەکیان لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمێنێتەوە. کوردەکان، لە چەکەکەیان بەولاوە هاوڕێیەکی کۆن و ڕاستی تریان نییە. بەشی زۆریان (محمد)ین، بەڵام لە خاکی ئێرانیشدا گاورە یەعقوبییەکانیان[1] هەیە.

بەگەکانیان بەسەر کوردەکاندا فەرمانڕەوان. کوردەکان گەورەکانی خۆیان خۆش دەوێت. لە کاتی جەنگدا نایەڵن گەورەکانیان بچنە کۆڕی جەنگەوە، خۆیان دەجەنگن. بە تەواویش تێ گەیشتم، کە هیچ گوێ نادەنە بابی عالی چونکە باج نادەن، عەسکەر نادەن. ئەگەر هاتوو حکوومەتیش تەنگاوی کردن دەچنە ناو کۆڵیتی سەر چیاکان.

ئەو بەگە کوردەی ڕەشید پاشا لێی دا و شکا و بەزاندی، ئیمڕۆ بۆ وێرانکردنی قەڵاکەی سەعید بەگ شان بەشانی ئێمە لە جەنگدایە و ناویشی (وادی بەگی ڕەواندزی)یە.

لە ئەستانبوڵ (باب عالی) و نیشانی پاشایی درابوو بەسمایل بەگ بەڵام، لەگەڵ ئەمەیشدا جێی باوەڕنییە هەرچی جارێك بەرامبەر بەم بەگانە سەخڵەتییەك ڕوویدات جەنگ ڕوو نەدات و زۆر بەگرانیش نەکەوێتە سەر حکوومەتی عوسمانی. لە سامسونەوە بەباری ئێستر فیشەك

---

1. ئەوەی ئیبراهیم.

دەهێنرێت، ئیتر بزانن چەند گران دەوەستێت. بەبێ کەم و زیاد هەر دانەیەکی یەك لیرەی عوسمانی دەکەوێتە سەر حکوومەت.

خۆ ئەگەر قەڵای کوردەکان بەرگەی تۆپیش نەگرن، بێگومان بەرگەی چل - پەنجا ڕۆژ بەریەرەکانی دەگرن، چونکە قەڵاکانیان زۆر قایم و ڕیزینە. ئەوا ئیمڕۆ قەڵای کوردێکمان لەگەڵ خاك یەکسان کرد، ئەی لەمەودوا چی دەکەین. ئایا حکوومەت ماك و هۆیەکەی چییە؟ دەتوانێت بیدۆزێتەوە؟ کە لە بنەڕەت دەبێ دەریبهێنێت. ئەگینا، ئیتر خۆیان دەزانن.

ڕۆیشتن بەرەو ڕووی کوردەکان. چیای قارسان، ٤ حوزەیران ١٨٣٨

وەکو ئێمە دەمانزانی، بێدەنگی و ماتبوونی سەعید بەگ وە نەبێت هیوای کوردەکانی بڕیبێت. خۆ تا ئێستا عەسکەری تورك بە چیاکانی (مووش - حاسو)دا نەك نەیانتوانیوە گوزەر بکەن، ڕەنگە نەیشیانبینیبێ. بێگومان عەسکەرەکانی ڕەشید پاشایش نەیانوێراوە لەو چیایانەدا خۆیان پیشان بدەن.

لە ئاسیای بچووکدا بەرزترین چیا ئەو زنجیرەیەیە، کە پێی دەڵێن چیاکانی (قارسان). لادێییەکانی دێهاتی ئەم چیایە دارایی و سامانیان زۆرە تا ئێستا هیچ خەرج و باجێکیان نەداوە بە حکوومەت و نایشیدەن.

بۆ هێنانە ژێر کەمەند، زۆر داویان بۆ کوردەکان دامەزران، محەمەد پاشا بەهێزە گەورەکەیەوە چووە ناو جەرگەی کوردستانەوە. لە لایەن فەرماندەی دیاربەکریشەوە (ئاڵای ١٩مین) لە حەساوە (دوو ئاڵای سواری بە ٣ تۆپ و چەند سەد تۆپچی)، کە هەمووی پتر لە ٣ هەزار چەکدار بوو چوونە سەر کوردەکان. دەست بە وورووژمبردن کرا و لە ڕۆژهەڵاتی چیای قارسانەوە هاوشانی و هاوکارییان ئەکرد. بەو نیازەی لە هەموو لایەکەوە قارسان ئابڵوقە بدەن و هێرش ببەنە سەریان و لە ناویان بەرن.

هێزی دوژمن، کوردەکانیش بە (٣٠ هەزار) خەمڵ دەکرا بەڵام لەبەر ناڕێك و پێکی ترسمان لێیان نەبوو. چونکە ئێمەیش کوردمان لەگەڵدا بوو. ئەو ڕێگەیەی بە کەناری دیجلەدا ڕاست ئێمەی پێدا دەڕۆیشتین زۆر سەخت و نالەبار بوو لەبەرئەوە ناچار بووین بۆ هەر یەك تۆپ دە بارگیر تەرخان بکەین. کەچی هێشتا هەر لە سەخڵەتیدا بووین و نەماندەتوانی بەتەواوی گوزەر بکەین. لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر جاریش جێگەی چادر هەڵدانمان دەست نەدەکەوت. بۆ ئەوەی بۆ کوردەکانی لەگەڵماندان زیانمان نەبێت زۆر پارێزگاریمان بۆ دەکردن چونکە هاوپەیمانن.

هەر بەو نیازە زۆر جار پاشا خۆی لە نێزیکی ئاواییەکاندا ئەوەستا تا بە تەواوی سوپایی و کاروانی ئۆردووەکە تێپەڕ دەبوو. ئیتر بەم بۆنەیەوە کوردەکانمان بەبێ پەروا و بەبێ ترس

دەهاتنە ناو ئۆردوگاهەکەمان و شتومەکیان دەفرۆشت. تەنیا ناوی رووبارەکان لەبەر زۆری، ئێمەی زۆر ماندوو ئەکرد.

رێگای رۆژێکمان مابوو بگەینە (حەسو) تاوەکو بەرامبەر بە دوژمن جێگا و سوپەر ئامادە بکەین و رۆژی دوایی بە ترس و لەرزێکی ئێجگار زۆرەوە گەیشتینە ئاوایی بەڵام بەدوو پەل، دەزانن بۆچی؟ بۆ ئەوەی هەموومان بە یەکەوە نەبین چونکە کوردەکان بە ناگەهانی و لە پڕ لێمان دەدەن.

بیستمان، کە بێجگە لە لادێییە بێ دەسەڵاتەکان بەو لاوە کەس لە ئاواییدا نەماوە ئەوانی تریان هەموو داویانەتە چیا. ئێمەیش ئەو رۆژە لە نێزیك ئاوابییەوە بارەگامان دامەزراند، حەساینەوە. لەگەڵ ئەوەدا، کە زۆر جار توورە دەبووم و بە تایبەتی بە پاشام دەوت، کە بەرامبەر بەلادێیی و دێهاتییە بێ تاوانەکان خراپە نەکرێت. راسپێریم دەکرد، کەچی دێیەکانیان دەسووتاند. هەرچی خراپ بوو پێیان دەکردن. لە پڕ لە لایەن سەر فەرماندەوە فەرمانم پێ درا، کە ئاوێتەی هێزەکەیان بم. تۆپ و تۆپچییەکانم بەجێ هێشت لەگەڵ پیادەکاندا کەوتینە رێگا.

لەسەر رێگاماندا (دە) دێیان سووتاند. گەیشتینە ناو دۆڵ و گەلییەکی قووڵ. دانیشتوانی ئەو دێیە گەورەیەی، کە لە ناو ئەو گەلییەدا بوون هەموویان لە ئاواییدا بوون، چۆلیان نەکردبوو. لەسەر سەربانەکانیانەوە چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد، هەر کە نێزیك ئاوایی بووینەوە بە گوللە ئاگربارانێکی خەستیان کردین. لە لایەکەوە گوللەبارانیان دەکردین، لە لایەکیشەوە بانگیان دەکردین (دڵتان تەنگ نەبێت خۆمان دەیسووتێنین) هاواریان دەکرد.

وەکو لە دواییدا تێ گەیشتین

تێ گەیشتین دوێنێ حافز پاشا لە کاتی تێپەڕیندا لادێیەکانی زۆر سەخڵەت کردووە. زیانێکی زۆری لێ داون راویشی ناون تا لە گیانی خۆیان وەڕسی کردوون. ئەم دێیەش بە هەورازێکی زۆر کووڕەوەیە.

بۆ ئەوەی لە گوللەبارانەکەیان رزگار ببین و بە ئاسانی هێرش ببەینە سەریان، بۆ ئابڵووقەی ئاواییەکە لە لای چەپەوە لە کوردە هاوڕێکانی خۆمان و خزمی ئەوان (مەحموود) بەگم نارد. وەك گورگی هار چوو لە پشتەوە رێگای راکردنیانی بڕی. ئیتر عەسکەریش بەبێ ترس و پەروا بڵاوەیان لێ کرد، دەستیان کرد بە هێرشبردن. زۆری پێ نەچوو لە هەموو لایەکەوە عەسکەرەکانمان ڕژانە ناو ئاوایی. ئەو تەقانەی لەسەر سەربانەکانەوە لێمان دەکرا نەما. بە دەستڕێژی عەسکەرەکان ناچاری خۆشاردنەوە بوون. خوا مەحموود بەگ لە ناو ببات. خۆیان خزانە ناو خانووەکانیان، وە نەبێت هەر بەوەندە دەستبەرداریان بووبین. عەسکەر بەدەنگی

ئەڵڵا ئەڵڵاوە بە هەرچی کوردێك بگەیشتنایە، ژن، منداڵ، پیاو پیر و جوان بە سونگی پارچە پارچە دەکران. من هیچ باوەڕم نییە بەرامبەر بە دوژمنی بێگانە بتوانن ئەم هەڵمەتە بهەن. وردە وردە کوردەکان کەم بوونەوە، نەمان. چونکە سکیان هەڵدرا، لەناو چوون، کوژران. مردن.

لە پاش ئەوەی عەسکەر کوشتار و ئیشی خۆی تەواوکرد بە مالاندا پەرت و بلاو بوونەوە. دەست بەتالان کرا بەبەر چاوە زەقەکانی مەحموود بەگی خزمیانەوە، توورەکە و جانتایان پڕ دەکرد. زیندووی ناو خانووەکانیان دەکوشت، بە بێ باکی لۆژ لۆژ دەهاتنە دەرەوە. تالان هۆشی عەسکەری نەهێشتووە. سەربازێکی سواری هات بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ڕوتبە و نیشانەکانم وتی: تکایە ولاخەکەم بگرە لێم وەرگرت ڕۆیشت. چووە ناو خانوویەك جەواڵێکی بە پڕی هێنایە دەرەوە. هەر ئەوەندە وتی سوپاس، بە تالانەکەیەوە سواری ئەسپەکەی بوو ڕۆیشت. بەلام دوور نییە ئەگەر کەسێکیشی تێدا بووبێت لە خانووەکەدا قەراچۆی نەهێنابن.

هەر چەندە دوژمنیان لەناو برد بەلام مانەوەمان لە ناو ئاواییدا بەپاش نەزانی. کورد نابەزێت. هێشتا تەقەی ناو خانووەکان نەبڕاوە.

لە ناو ئەو خانووەدا، کە گەورەی کوردەکان خۆی تێدا مەلاس کردووە. ماوەی ئەوە نادەن، کە کەس بیانگاتێ. وەکو باران گوللەمان بەسەردا دەبارێنێت. چونکە ئیتر هیوای دەرچوون و ڕزگارییان نەماوە، ئەمبینی خۆی و پیاوە دڵسۆزەکانی بە ئالا جوانەکەیانەوە خرابوونە ئەو جێگا قایمەوە، کە تا پێنج سەعات تەقەیان درێژەی بەست.

پاش ئەو کارەساتە بە چنگەڕنێ بە چیاکەدا هەڵگەڕام گەیشتمە لای حافز پاشا. چی ببینم؟ لە تالان، سەری بڕاو ، گوێچکەی بڕاو، یەخسیر، برینداری سەرتاپا خوێناوی بە ئاه و ناڵەوە، ژن، منداڵی ڕەش و ڕووتی برسی و تینوو لە لایەن عەسکەرەکانەوە دەهێنران و لەبەر چادرەکەی پاشادا دلێری و ئازایی خۆیان پیشان دەدا. بەرامبەر بەو زاڵی و بەدکاری و بەدبەختییە و کێویەتییەیان، لە لایەن پاشاوە لە پەنجاوە تا سەد غروش بەخشیش پارەیان دەدرایە. برینی بریندارەکانیان نەدەبرژانەوە، تیمار نەدەکران، نائومێدیی کوردە یەخسیرەکان، گریان و هاواری ژنە رووتەکان دڵی پیاوی دەهچڕاند. بەلام دڵی مەحموود بەگ و تورکەکان زۆر خۆش بوو. با ئەو دیمەنە هەرگیز نەبینرێت. چونکە نابێت لەبیر بچێتەوە.

سەیر ئەوە بوو نەدەزانرا ئەو کوردانە لە ناو ماڵ و خێزانی خۆیان و نیشتمانی خۆیاندان و ئەمانە بۆچی وا بە زاڵییەتی دێنە سەریان، ئەم کوردە هەژارانە دەکوژن؟ ئایا بۆ پارە و تالانە یان لە ڕەگەزی خۆیان نین؟

لە ئێمەیش کوژراو، لە ناوچوو کەم نەبوو. ئیتر ڕۆژی دوایی بڕیاری حەسانەوە درا. ڕۆژی دواتریش دەستمان کرد بە هەڵگەڕان بە چیاکەدا. لە ڕێگادا بەبێ تاوان کوردەکانیان بە یەخسیر

دەگرت. ئاواییەکەیشیان دەسووتاند. من ناساخ بووم، جێگا و پێخەفەکەمم بەجێ نەدەهێشت. لە بناری چیاکە لە بارەگاهدا مابوومەوە. پاش ئەم ناڕەواییە، کوردەکان ناچار بوون دادنامە بنێرن.

زۆرم پێ خۆش بوو، کە ئەمجارە لەگەڵ عەسکەری تورکدا چوومە کۆڕی جەنگەوە. باوەڕ و ئازاییەکی زۆرم پێ بەخشرا لە لایەکەوە بەناوی ئاینەوە پاڵیان پێوە دەنرا، لە لایەکی تریشەوە بەبێ بەزەیی، بەبێ ئابڕوویی بۆ تاڵان دەجەنگان. گوایا ئەم دوژمنانەیان خاوەن دارایی و قزڵباشن[1].

ئای کوردی هەژار چۆن لە ناو دەچن

پێویستیمان زۆر کەم و کورە، لەبەر ئەوە لە کاتی بە چیادا هەڵگەڕان و سەرەوژێردا ڕۆیشتنمان، عەسکەرەکان هەموویان پێڵاوەکانیان دادەکەند و پاڵتۆکانیان لوول دەدا و دەیانکرد بە ملیاندا. بە پێخاوسی دەڕۆیشتن. درەنگ لە کردەوەی عەسکەرەکان تێ گەیشتم. گوایا ئەم فێڵەیان بۆ ئەوەیە کە پێڵاوەکانیان و پاڵتۆکانیان نەدڕێت. چونکە نییە بە دواییدا بیاندرێتێ و وەری بگرنەوە.

لە کاتی جەنگدا تفەنگ بەکارهێنانمان بێ سوود بوو چونکە عەسکەرەکانمان نیشانیان نەدەگرت. وام زانی نازانن، کە بۆ سەر دێیەك هێرش دەبرا چاوم دەبڕییە ئەو عەسکەرەی لە لامەوە تەقە دەکات. هەموو جارێك تفەنگەکەی بەو لایەدا دەتەقاند، کە دوژمنی لێ نییە و بەو لای تریدا دەیڕوانی پێم وت (براله چی دەکەیت، گوللەکانت بەلایەکی تردا دەڕوات). لە وەڵامدا وتی (بابە گیان. گوێ مەدەرێ خوا گەورەیە خۆی ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە). هەموو برا عەسکەرەکان هەر بەو پێیە تەقەیان دەکرد. گوێیان نەدەدایە ئامۆژگارییەکانم. تێ گەیشتم، کە زۆر لە برینداڕەکانمان بە گوللەی خۆمان بریندار دەکرێن و یان دەکوژرێن. بەڵام ئەوەیش بزانن گوللەی کورد بەخۆڕایی ناڕوات.

گرتنی قەڵایەکی کورد لە باوی ڕەشید پاشادا بە لەناوچوونی چوار هەزار عەسکەر کەوتە سەر حکوومەت.

بارەگا لە چیای قارسان. ١٤ حوزەیران ١٨٣٨

ئیمڕۆ بەخۆما ڕاپەڕمووم بچم بۆ ئۆردوگا و حافز پاشا ببینم. چونکە لە تۆزە ناساغییەکە ڕزگاریم بووە. وام زانی، کە لە پێش گەیشتنی مندا کارەساتە ناڕەوا و بەدبەختانەکەیان لە پاشا

---

١. شیعە، سەفەوی. بەڵام ڕاستیەکەی هەر کورد بوون و بەس.

گەیاندووە. بەڵام لە پاش چی؟ ئەوەی بەسەر کوردەکاندا هێنرا مەگەر هەر ئەو سەربازانە کردبێتیان، کە لە کردەوەی نائەمیزادی راست نەدەچوو. پاشا پیاوێکی دڵپاك و ئابڕوودارە. لە ئەنجامی بیستنی راستیی ئەم باسە ناخۆشە و کە زانی کوردەکانی ئەو دێهاتانە لە لایەن سوپای تورکەوە ئازاردراون تاڵان کراون. ئەوانیش هەر بۆ پارێزگاریی خۆیان، دز ڕەوێن تەقەیان کردووە پاشام زۆر دڵ تەنگ و ئازوورده بینی. گومانم نییە کە تووڕەیش بوویێت. لە هەمووی چاکتر خوویەکی باشی هەیە و ئەوەیش ئەوەیە، ئەگەر هات و قسەت لەگەڵ کرد گوێ ئەداتە قسە و دەبیبەت و دەیشتوانرێت بە سەربەستی وتووێژی لەگەڵ بکرێت وە دەیشیەوێت، دوایی بە بەدکاری و سەرکەشی کوردە بەکرێگیراوەکان (باشی بوزگ)ەکانیش بێنێ و دەریان بکات، چونکە تێ گەیشتبوو، کە ئەمانەن ئاگری خراپە خۆش دەکەن. بەڵام، دڵنەرمییەکەی ماوەی نادات.

بەراستی پاشا دەیەوێت دوایی بەم کارەساتە بهێنێت وە لەگەڵ نێرراوی کوردە یاخییەکاندا قسەیان یەك بگرێت. بەڵام وتووێژ زۆر بەگران و ورد دەڕۆیشت چونکە لە هیچ لایەکەوە باوەڕ بە یەکتری نەدەکرا و یەکدگیر نەدەبوون. زۆرتریش کوردەکانی لای خۆمان بەرگرییان دەکرد. بڕیار وایە، کە ئیمڕۆ نوێنەری هەموو پەلەکانی کوردە ئازاکان بگەنە ئۆردووگا. کەچی تا ئێستا دیار نەبوون، کاریش تەواو نەبوو.

بەپێی بیروباوەڕی من، بردنی هێرشێکی گەورە و سەخت هەرچەندە پێویست بوو بەڵام لە ترسی ئەوەی نەوەك کوردەکان داڵە بدەنە ناوچەکانی (مووش)، کە والی مووشیش خۆی کوردە و والی ئەرزەڕۆمیش بێگومان ماوەی نومایشێکی عەسکەریمان نادات، پرکێشمان نەکرد ئەم ئەهێلانەیش هەبوو.

خەرج و عەسکەری. چیای ڤارسان، ١٥ حوزەیران ١٨٣٨

بۆ ئەوەی لە چۆنیەتیی ئەم شارە کە لە پێش (٣) ساڵدا بەرامبەر بە حکوومەتی عەلییە (ئەستانبۆل) ملکەچ و ژێرباری یاسا بوون بە تەواوی تێ بگەم زۆر ئارەزوومەند بووم. باش بوو تێ گەیشتم. کوردەکان لە دوو شت تەنگاو وە وەڕست بووبوون. یەکەم باج و دووەم عەسکەری بۆ دەوڵەت. کوردەکان لەوەپێش هیچ خەرج و باجێکیان نەداوە.

لە بڕ و بیانووی پیاوانی میری ئاسوودە بوون. بەڵام ئێستا لە رووی ناکۆکی و جەنگی هەمیشەیی ناو خۆیانەوە چاندگە و کشتوکاڵیان هەمووی لە ناوچوو و لە پێتی زەوی و زاریان مافینگی و دەست بە تاڵ مانەوە. دێهاتیان ئەسووتێ، وێران دەکرێت، پیاویان دەکوژرێت، پەرێشان دەبن. کەچی یەکێکیش نابینیت داوای خۆی بە حکوومەت بگەیەنێت چونکە فێر نەبوون.

ئێستا حکوومەت دەستدارە، باجیان لێ دەسەنێت، دەبێت دادیان بە حکوومەت بگەیەنن. دەپشپرسرێت، لە ناو تیرەکانیاندا جەنگ و کوشتار نەماوە ئەگەر ئەم یەکیەتییەیان لە دوارۆژا بۆ حکوومەت وەزن و زیانی نەبێت.

لە هەموو جێگایەکدا کوردە گاورەکان پتر پارە و باج دەدەن بە حکوومەت. هەموو بێگارێکیش بە وان دەکەن. بەڵام نەك بە بەدبەختی و یان زۆرەملێ. هەر بە رووخۆشی و قسەی شیرین ئەو بێگارانەیان پێ دەکەن، کە خۆیشیان شەرم دەکەن رەخنە بگرن بەڵام کوردە ئیسلامەکان لەو پەیەی ئەواندا نین.

کوردەکان لە دانی خەرج و باجی راستی هاوار ناکەن. لە دەمبڕ و مفتە لێساندنیان و زۆرداریی مەئموورەکان، کە دەیانەوێت بیانڕووتێننەوە و تالانیان بکەن، دەرەنجێن. کوردەکان دەڵێن دارایی و دەستکەوتنەکانمان بقرچێنن، بزانن چییە و چەندە ئەوسا لێمان بسێنرێت. بەڵام خۆ ئەگەر وەکو ئێستا لێیان بسێنرێت، کە بەپێی دۆنم حکوومەت لەسەریان خەمڵ دەکات و بەم چەشنە بڕووتێنرێننەوە خۆ منیش دەزانم ئیتر زەویی کێڵراو و چێنراو نابینرێت، کە وەکو ئێستا زەویی بەهار و دانەچێنراویان زۆرە.

وڵات و زەوی و ناوچەکانیان ئێجگار بە پیتە و کانگای داراییە بۆ حکوومەت. کەچی حکوومەت هیچ پێویستێکیان بۆ پێك ناهێنێ. ئایا دەبێت هەر لەبەر ئەوە بێت، کە کوردن؟ سەرم سوڕماوە نازانم بۆچی حکوومەت نازانێت، کە چ وڵاتێکی بەپیتی هەیە؟ ئەو ئاوە زۆرە روون و ساردەی، کە بە خۆڕایی دەڕژێت و بە خۆڕایی دەڕوات دەتوانرێت بە هەزاران مەکینە کارخانەی لەبەرا داپنرێت و دروست بکرێت. ئەو هەموو دارستانە جوان و نایابە، کە بۆ خۆی وشك بووە و رزیوە، تەنانەت رێگای هۆی گواستنەوەیشیان نییە بە ملیارەها کانگای هەموو چەشنەیان هەیە. بەڵام کێ دەیزانێت و کێ بیبینێت؟ بە هەزاران زەویی نەکێڵراو هەیە. ئایا لە کێڵراوەکان بایی تاوە بەنێك پارەیان لێ دەست دەکەوێت؟

لە بابەت ئەو هەموو رەنجەڕۆییەوە گلەیی ناکەوێتە سەر لادێیە کوردە نیشتەنییەکان، چونکە خاوەنی داراییەکی وا نین تا بتوانن فەرێ لێ وەربگرن و رێگەیش نادرێت کەسیش تێکەڵیان ببێت. ئیتر خۆ گومانی تێدا نییە بێت و ئەو کەسەیش هەرچی کەسێك بێت ئەگەر هاوکارییان بکات لە سەدی ٦٠ تا ٧٠ سوود و قازانج وەردەگرێت. بەڵام داخەکەم ئەم پیت و سوودە هەمووی دەچێتە گیرفانی قۆنتراتچییەکی چڵێس یان گیرفانە قووڵەکانی مەئموورانی میرییەوە و گەنجینەکانی میریش لە دوورەوە زەقەی چاوی دێت بەتاڵی دەمێنێتەوە.

کوردەکان لە زەوییەکانی قەراغ ئاوایییان دەترسن. ماڵەکانیان بەرەڵایە. ئەگەر پارەیەك یان شتێکی بەنرخ گرانیان هەبێت دەیکەن بە پڕیاسکە و دەیئاخننە ناو گۆزە و دیزە و لە خاکیشدا

دەیـنـێژن. دەزانـن بـۆچـی؟ نـەوەك تـالآن بـیـبـات. شاهـبـەنـدەرەكـان بـازرگـان (تـجـار)ەكـانـیـان دەپارێزن. چونكە دارایی كەوتۆتە دەست بێگانە، حكوومەتیش لە سەرەتادا هەموو كانگاكانی پێ سپاردوون، پێیان دەفرۆشێت، كەچی لە جیاتی پارەكەیشی هەر بە نرخەكەی خۆی كەلوپەل و شتومەكیان لێ دەكڕن. ئەمەیش لە رووی نادانی و بێ پیاوییە لە دەوڵەتدا. لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە لە دەریاكاندا ئالآی توركیش وەكو ئالآی دەوڵەتەكانی تر، ئینگلیز ئەڵمان، رووس، فرانسز دەلەرێتەوە. پاپۆرەكانیان دەسووڕێتەوە. كەچی ئەم دەوڵەتە گەورە و خاوەنی وڵاتە پیتدارە لەبەر بێنەرمەتانی و دەستكورتی، بە ناڵە ناڵەوە دەژیەت. نازانم چۆن وەستاوە و ئەگەر خەرج و باجیش وەكو ئێستا بسێنرێت هیچ لای خوا پەسند نابێت خۆ كوردیش گەلی عوسمانییە.

محەمەد پاشا لە خوا ترسە. بۆ ئەو كوردانەی هاوپەیمانی خۆمانن ئەو پارێزگارییەی بۆ ماڵ و كشتوكاڵەكەیان دەیكات بەڕاستی پەسندە و لە بیریشم ناچێتەوە. لە ناو ئۆردوگاهەكەماندا بازارێكی دامەزراند، كوردەكان بەبێ پەروا بۆ كڕین و فرۆشتن دەهاتن. پێی عەسكەری لە چوونە ئاوایی بڕی. زۆر دڵنەوازیی ئەمیرە كوردەكانی دەكرد. گەیاندییە ئەو پلەیەی وەختابوو وڵاخەكانمان لەبەر بێتفاقی لە ناو بچێت. تالآنكردن نەما. بەڵام بە پیاوەتی دەتوانرێت هەموو بەروبوومی ساڵانەی چاندگەكانیان لە كوردەكان بسێنرێت، نەك بە خورتی.

ئێستا بام لە باسی خەرج و باج لادەین. بێینە سەر باسی عەسكەری و عەسكەر گرتن. پاش گرتنی (سعرد) لە لایەن رەشید پاشاوە، دەست كرا بە ناونووسین. لە ئەنجامدا (لە موسڵمان ٦٠٠ لە هەرمەنیی ٢٠٠ كەس) دانیشتوان ناونووس كرا. دەستبەجێ ٢٠٠ لاو لە كوردەكان گیرا. كران بەسەرباز و ژێر چەك. ئیتر كە كوردەكان بەم كارەساتەیان زانی لە ٦٠٠ ماڵەوە هاتنە سەر ٣٠٠ ماڵ بەڵام، كە بیستیان لەمانەیش هەر دەگیرێت ئەوانەی گەیشتبوونە تەمەنی عەسكەری، هەموویان شاریان بەجێ هێشت دایانە چیاكان. باوەڕبكەن لە ناو كۆڵانەكانی شار بێجگە لە منداڵ و پیر، گەنجێك نەدەبینرا. ئیتر لە عەسكەری و خەرج و باج، یاخیبوون و راكردن وەكو یەكی لێ هات.

دەبوایە لە عەسكەریدا ماوەی (١٥) ساڵ برمێنێتەوە و بچەوسێتەوە بۆ حكوومەت. كوردەكان فێرن بە گەنجی ژن دەهێنن جا كاتێك، كە بنێررێن بۆ عەسكەری و دووچاری ئەو چوورتمە بوون دەبێت یان بە تەواوی دەستبەرداری ژن و ماڵ ببن یان رابكات و دەست بداتە چەك و بدەنە چیاكان. كەوابوو ئیتر بە كۆمەڵ عەسكەری ناكەن. ئێستا لە چیاكانی كوردستاندا نیوەی عەسكەرەكانمان كوردن، ژن، منداڵ، كەسوكاریان هێرش دەهێنن. لە پڕ دەكەن بەناو ئۆردوگاهەكەماندا پرسیاری رۆڵە، باوكیان دەكەن بزانن ماون یان لە ناو چوون. بەدەم

گریانەوە ماچ و مووچ دەکەن.

هەر چوارلای ئۆردوگاهەکەمان بە پاسەوان تەنیوە، ئەم پاسەوانانەیش وەنەبێت لە ترسی دوژمن بێت. بەڵکو بۆ ناو ئۆردووەکەیە کەچی لەگەڵ ئەو هەموو وریاییە و پاسەوانە زۆرەدا هەموو شەوێك زۆر لە عەسکەرەکانمان رادەکەن. بەرامبەر بەم سەختڵەتییە تەنیا چارە ئەوەیە، کە بۆ ماوەیەکی کەم عەسکەرەکان لە کوردستان دوور بخرێنەوە.

لە ناکاو لە ئەستەنبووڵەوە ماوەی عەسکەری کەم کرایەوە کرا بە پێنج ساڵ و بەم چەشنە فەرمانمان بۆ هات. ئەم دەنگە بڵاو بووەوە بەڵام کام کورد و لادێیی بەم باسە باوەڕ دەکات. رەنگە کاتێك باوەڕ بکەن، کە پاش پێنج ساڵە عەسکەرییەکە کوڕەکەی یان پیاوەکەی بگەڕێتەوە و بە گوێی ناگردانەکەیاندا لنگ درێژ بکات. چونکە تا ئێستا یەکێکیان نەگەڕاوەتەوە.

**ئۆردوگا لە چیاکانی قارسان. ٢٢ حوزەیران ١٨٣٨**

دوێنێ بۆ ئەوەی لە کەلێنێکەوە دەست وەشاندن و بەخۆ پیشاندانەوە جەزرەبەیەکی ئەو کوردانەی لەسەر گردەکە مۆڵیان داوە، بەدەین پێویست بوو.

بۆ ئەم مەبەستە لە عەسکەرەکانمان (١٤ بلووك و لە کوردە باشیبوزگەکانیش یەك بلووك) بەهەر چوارلای ئەو گردە بەرز و تیژەدا بەچنگەڕنێ هەڵگەڕاین. بە پێنج سەعات گەیشتین. لەگەڵ ئەو کوردە دلێرانەدا پێکدا هاتین. لە ئێمە عەسکەر، شانزە کوژراو و پتر لە ٦٠ بریندارێشمان بوو. بەڵام کوردەکان ژنەکانیشیان چەکدار و لە جەنگدا بوون لە کاتی گەرمەی جەنگدا ژنە کوردێك زۆر بە مەردانە بە خەنجەر عەسکەرێکی کوشت. کە بەتەواوی عەسکەر گەیشتە سەریان بە جارێك پەلاماریان درا، لە کۆڕی جەنگدا پتر لە ٥٠٠ کورد کوژرا لە ناو یەخسیرەکاندا (٦٠) ژن گیرابوو، عەسکەر دوایان کەوتبوون بە کۆمەڵ خۆیان فڕێ دایە ناو رووبارەکە و بە خنکاوی ناویردنی چونکە مردنەکەیان بەباشتر زانی لە ئازاری عەسکەرەکان.

لەسەر ویستنی پاشا، ئێمە هاوکاری ئەم کارەساتە نەبووین لە کردەوەی ناپەسند و ناشایستەیان، من تووکی سەرم هەڵدەوەرا، لە کاتێکدا ٦٠٠ کورد کە بە ژن و منداڵیانەوە بە یەخسیری هێنرابوون هەندێکیان لە ئازاری برینە نەبرژاوەکەیان و هەندێکیان بە ئەشکەنجە و لێدان بە قۆناخە تفەنگ دەمردن. خۆ مردنەکەیان باشتر بوو. لام وایە تا مردنی دوایی کەسیان، پارووە نانێك یان خواردنێك نەدرا بە یەکێکیان و هیچ شتێك نەچووە ناو زگیان. وا ئێمە بەرگری خراپەی عەسکەرەکانیشمان پێ نەدەکرا، کە بەرامبەر بەم یەخسیرە هەژارانە دەیانکرد، ئەی کوردەکانمان کە لە خۆیان بوون بۆچ؟

ماوە نەدران گیا، توێکڵە دارێکیش بخۆن و ئەوەیش لێك نەدەدرایەوە، کە ئەم ٦٠٠ یەخسیرە

کوردەیش گەلی عوسمانییە و تورك بەبێ بەزەیی لە ناویان دەبات. ئایا ناترسن ئەم تۆڵەیەیان بەچەند جار پترتر لێ بسێننەوە؟

لە چیاکاندا بزووتنەوەی عەسکەری. لە دیجلەوە بۆ فورات، سووڕاننەوەمان بەسەر رووباری فوراتدا، خەرپووت. ٣٠ حوزەیران ١٨٣٨

لە تەواوبوون و دوازۆژانی مانگی حوزەیراندا چووینە بارەگاهی پاشا. کە گەیشتین پاشا شێوی کردبوو. خەریکی قاوە خواردنەوە بوو. پاش ماوەیەکی زۆر کەم فەرمانی رۆیشتنمانی دا. زۆرم پێ خۆش بوو. ئەم جێگایە و بارەگاهەم زۆر لا ناخۆش و ستەم بوو. لەبەر گەرما، ماری زۆر دەخزایە ناو چادرەکانمان. لە ناو نوێن و پێخەفەکانماندا بە ریزە دووپشك دەسووڕایەوە. تا رۆژ ئاوا نەبوایە توانای چوونە دەرەوەمان نەبوو. هەر لە ترسی گەرما بەشەو دەڕۆیشتین و رێگامان دەگرتەبەر. تینی هەتاو، تیشکی رۆژ بەرد و داری داغ دەکرد، سووری دەکردەوە. رووی زەویی ئەو ناوچەیە دەبوو بە ئاگردانی ئاگر لەگەڵ ئەوەیشدا نە درو نە پنچکێك نییە لە پەنایدا بحەسێینەوە. ئەوا ئیمڕۆ بە رۆژ ملی رێگامان گرتووە. بە پەرێشانییەکی زۆرەوە دەڕۆین.

راستە دەڵێن پاش ناخۆشی خۆشییە. ئەوا نیزیك نیوەڕۆیە گەیشتینە سەرکانی و ئاوێك. نازانم لە خۆشییاندا چی بنووسم، ئای لەو دەرووە خۆشەی بەڕووماندا کرایەوە، ئاو وەکو بەفراو سارد. چەشنی ئاوێنە دەدرەوشێتەوە لە چاوی قرژاڵ روونترە. خۆمان و بارگیرەکانمان لە خۆشیاندا خۆمان تێ فڕێ دا. وەکو نەدی و بدی خێرا خێرا ئاومان دەخواردەوە بەو ئاوە، کە لە سەهۆڵ ساردتر بوو دەستمان کرد بە خۆشوشتن. دڵمان نەهات تا ئێوارە بە جێی بهێڵین.

کەوتینە رێگا لە دوورەوە منارەی مزگەوتەکەی (حەشرو)مان بەدی کرد، گەیشتین. ئەم شارە هەر چوارلای باخ و باخاتە. بە دارگوێز، ئیلخاموور، چنار تەنراوە. بە تایبەتی دار چنارە جوانەکانیان شایانی لێدوانە. لەم ناوچەیە چنارەکانیان ئەوەندە راست و بڵند دەبێتەوە لە بینینیان تێر نەدەبووم. وەکو ئەم دارانە زۆر کەمە و بە دەگمەن دەبینرێت.

لە شار و دێهاتەکانیدا باوە ئەو رۆژەی منداڵیان دەبێت کوڕ یان کچ لەگەڵ لە دایکبوونیاندا (دە) بڕ چنار دەڕوێنن. جائەم دارانە ساڵ بەساڵ لەگەڵ ئەو منداڵە گەورە ئەبێت تا کاتی شووکردن یان ژنهێنان. ئەو کاتە ئەبڕێت وە ئەفرۆشرێت پارەکەی دەکرێت بە خەرج و تفاقی پێویستی ماڵ پێکەوەنان. بەڕاستی کارێکی زۆر جوانە کە کوردەکان گرتوویانەتە پێش و سەرشانی خۆیان.

لەو کیشوەرەدا کەرەستەی ماڵیان هەمووی لەو داری چنارانە و بە دەستی خۆیان دروستی

دەکەن. سەربانی خانووەکانیان بەو دارە نایاب و ئەستوورانە دارەڕا دەکەن. بە قامیش بەند و خیزەرە و قوڕپەستێکی لماوی قوڕپەستی دەکەن و بە باگردێنێکی بەردینە دەیپەستن. چەند بەباش و جوانم بینی، کە ئیتر هەرگیز ئەم جۆرە سەربانانە لە زستاندا دڵۆپە ناکات و بە ئاسوودەیی تێیدا دەژین و لە هاوینیشدا لەسەری دەنوون، چونکە لە ناو ژووردا گوزەران ناکرێت.

تەمووز ١٨٣٨

گەیشتینە (مەعدەن)، حافز پاشا بڕیاری دا، کە لەم جێگایە (قەڵا)یەك دروست بکات. چونکە لەم جێگایە باشتر جێگایەك نابینرێت بۆ قەڵا دەست بدات. مەعدەن – کان، کانگایەکی زۆر گەورەی ئاسن و جێگایەکی پیتدارە. بۆ ئاسن دۆزینەوە نەپێویست بە زەوی هەڵکەندنە و نە عەودالّی، بەبێ ماندووبوون هەموو بەردە بۆرەکان هەڵسەنگێنە خۆی تێت دەگەیەنێت، کە ئاسنە و بەرد نییە. خۆڵەکەیشی بە قورسیدا خۆی خۆی پیشان دەدا، کە ئاسنێکی زۆری ئاوێتەیە.

یەکە یەکە گردە بەرزەکانمان سەرەوژوور و سەرەوژێر بڕی، قولەکانمان بینی، گەیشتینە ئەو جێگایەی، کە دیجلە و فورات لە یەکتر دوور دەکەونەوە. تا ئێستا هیچ گەڕۆکێکی بێگانە نەگەیشتۆتە ئەم جێگایە. چونکە ئەم ناوچانە زۆر پیتدارن. بەربەستی کراون، ماوە نەدراوە ببینرێت.

ئاوی رووبار زۆرە، بێجگە لە کەڵەك هیچ هۆیەکی تر نییە کە بتوانرێت بپەڕینەوە. تاڤگەکانیش زۆر گەورە و تیژ و بە خوڕە، رێگایەکی تریش نییە. لەوە پێش لە دێی (پالوو) کەڵەکێکی بە کوونەدە دروستکراو کڕابوو. هەموو کەلوپەل و تفاقەکانمان لێ بار کرد. چەند سەوڵ وەشێنێکمان لەگەڵ خۆمان برد، ئاغا (ضابط)ێك لە ئاغاکانی پاشا و دوو چەکداریشمان سوار کرد. بۆ رێگاپیشاندەر پۆسەلەیەك وە هەندێك کەرەستەی پێویستی تر وە پەیغامێکی شارەزای رێگازانی رووبارەکەیشم لەگەڵ خۆمدا برد.

تا (پۆلو) ئەم رۆیشتنەمان بەسەر ئاودا و بە ناو چیا دارستانەکەدا ئەم رووبارە پڕ تاڤگە جوان جوانانەی دێتە خوارەوە و دەڕژێتە ناو دەشتێکی پانمانا بینی، کە بەلای چەپدا شارە جوان و پڕ پیتەکەی (خەرپووت) دەبینرێت. جا ورده ورده کەڵەکەکە و ئێمەیش بە سەریەوە بە دەم ڕێژەوەی ئاوەوە بە قونە قون و قونتەرە کردن، بەناو دار گوێز، داربەڕوو، مازوو دارەکانی چیا شیرینەکەدا دەکشین. دێهاتی بچووك بچووکی کوردمان دەبینی بە قەراخ و ناوەڕاستی ئاوایییەکاندا. لە هەموو کاوە شاخ و بوودڕێکەوە گڤەگڤی ئاو بە کەفی سپییەوە وەکو شیر بە

هـاژەهـاژ دەهـاتە خوارەوە و تێکەڵ دەبوون بە فورات و دەڕۆیشت.

فورات لە پاش (گەڕ گەڕ) ڕژوە و بـاری ڕۆیشتنی دەگۆڕێت ورده ورده پان دەبێت، لەسەرخۆ و بە مەنگی بەناو گەلییەکەدا تێپەڕ دەبێت. لەمبەر و لەوبەری ئاوەکەدا، لە ناو بەردە ڕەنگ سوورەکاندا لە بەرزایی (٤٠٠) پێدا زۆر ئەشکەوت دەبینرێت. لە ناو ئەم ئەشکەوتانەدا جێگای پیاوە زۆر کۆنە ئاینییەکان دروست کراوە. ئێستا گەیشتن و چوونە ناو ئەو ئەشکەوتانە ئاسان نییە.

ئاغەڵ و ماڵە بچووکەکانی (گوریس)مـان بەجێ هێشت. ئیتر فورات لەم جێگایەوە بە پێچاو پێچ ڕوو دەکاتە (سامـات) و لەوێشەوە ڕوو دەکاتە قەڵای ڕوومەکان و لێرانەیشدا کاری من تەواوبوو و ئەم ئاواییە تورکن.

لێرانەدا هەندێك لە چۆنیەتیی بینراوەکانم

لە وڵاتی ئەنادۆڵی کوردەکاندا وا باوە ئەگەر هـات و هـاتنی میوانێکیان بیست، یان میوان ڕووی تێ کردن، چەند کەسێك لە دەستەی پیاوە گەورە و ناسراوەکانیان تا ماوەیەکی دوور لە ئاواییەکەیانەوە دەچن بە پیر ئەو میوانەوە. زۆر بە ڕێزەوە دەیگەیەننە جێ. لە بارگیرەکەی دای دەبەزێنن. بە گورجی دەچنە ژێر باڵی. ئەگەر بکاتە بەر بەرزی یان پێپلکەیەك زوو قۆڵی دەگرن. بۆ سەرکەوتن یاریدەی دەدەن. کە دانیشت جزمەکانی پێی بۆ رادەکێشن، دۆشەکی خاوێنی بۆ رادەخەن، ئاگردانی ئاگری بۆ گڕ دەدەن. خاوەن ماڵ جێگا و پێخەفی خۆی بە میوان دەبەخشێت. لە کاتی دانیشتندا خاوەن مـاڵ بەرامبەر بە میوانەکەی بە پێوە دەوەستێت. ئەگەر لەسەر ویستنی میوانەکەی دابنیشێت لە نێزیك دەرگاوە بە چۆکدا دێت. بۆ خواردنەوەی ئەو قاوەیەی لەسەر ویستنی میوانەکە دەیخواتەوە سوپاسی میوانەکە دەکات. دەڵێت:

«کە تۆ هـاتیت ئیتر سەر و مـاڵ هی تۆیە. هی من نییە». بە درێژیی مانەوەی پتر میوانداریی دەکەن. هەرگیز لە میوان وەڕست نابن. لە کاتی ڕۆیشتنی میوانەکەیاندا دیاریی ناپابیشی پێشکەش دەکەن. وەختێك من لە مـاڵی خانەخۆکەم جیابوومـەوە ویستم پـارەی خواردن و نووستنەکەمیان بدەمێ، بەڵام ئەم کردەوەیەم لەلایەن ئاغاوە پەسند نەکرا. ئیتر تا من ماوم بەرامبەر بەو چاکە و پیاوەتییە و میواننەوازییەی ئەو کوردانە سوپاس و یادیان دەکەم. ئەو هەڵەیەی خۆیشم بە کردەوەیەکی ناڕێك و ناپەسند دەزانم.

پاش (١٨) سەعات ڕێگابڕین، لە دوورەوە دەشتێکی وەك زمرووت درەوشاوەمان دەبینی. گەیشتینە ئاواییەکەی لە هەموو لایەکەوە لە بەفراو ساردتر ئاو هـاڕە دەکات. لە بن سێبەری دارگوێزی گەورە گەورەدا حەساینەوە. زۆر سوپاسی خوام کرد، کە دیمەنی وا جوان دەبینم،

کەچی ناو ئاواییەکە شارێکی چۆڵ و بێ زیندەوەر بوو، بە ڕاستی سەرم سڕما.

زۆر سەیربوو، خۆم بەخۆم دەڵێم ئای خوایە ئەمە چییە؟ جادوو نەبێت؟ وەختابوو بتەقم و بتۆقیم. ئارامم نەما. پرسیم وتیان کوردەکان لە هاویندا دێهاتیان بەجێ دەهێڵن. دەچن بۆ زۆزانی چیا و کوێستانەکانیان بۆ ئاژەڵ بەخێوکردن، تا وردە وردە، کە بەفر دەتوێتەوە کوردەکانیش بە دوای ئەو چیمەن و گیا تاسکەدا سەردەکەون و هاوینان کوردەکان هەموویان خەریکی کۆچکردنن. بە دوای بەفرەکەدا بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێن، دەچن بۆ جێگای دەرامەت و باشتر. کە ئەمەم بیست کە کوردەکان لەم جێگا ئاوادارەی کە لە وێنەی بەهەشتە دوورکەوتوونەتەوە بەبێ گومان بەهەشتی خۆشتریان دەبێت هەبێت. وتم ئەی بۆچی ئێمەیش نەچین بە چاوی خۆمان ئەو بەهەشتەیش نەبینین. هەر بۆ ئەوەی لە ناویاندا ڕابوێرین بە گردەکاندا هەڵگەڕاین، کەوتینە سەر شوێن و دوای دووکەڵی ئەو ئاگرانە، کە لە هەواری کوردانەوە بەرز دەبێتەوە. پاش ماوەیەك گەیشتینە لایان، ڕەشماڵە جوانەکانیان بە ڕیزە و کەوانەیی هەڵدرابوو. ژنیان مەڕیان دەدۆشی. پیاوەکانیان لەسەر زەوی ڕاکشابوون قەندەیان دەکێشا. منداڵەکانیشیان یارییان دەکرد.

کوردەکان بە بینینی ئێمە شڵەژان، ویستیان بچن بۆ لای چەکەکانیان، من کە ئەمەم بینی دەستبەجێ تێ گەیشتم، کە تورکەکان بە سووتاندنی دێهات، چێنراو لەناوبردن، گرتنی کوڕەکانیان بۆ عەسکەری، وای لەم کوردانە کردووە، کە هەرگیز باوەڕیان بە چاکیی حکوومەت نەمێنێت. وام زانی، کە میوانداریمان ناکەن و رایشمان ناگرن. لەبەر ئەوەی هێزەکەی ئێمە ئەوەندە نەبوو و عەسکەرەکانیشمان تیپێکی ئەوەندە بەرێز نەبوو، کە سڵمان لێ بکەن. بە تەواوی لێیان نیزیك بووینەوە. ئیتر بە چەشنێك میوانداری کراین، کە زۆر پترتر بوو لە هیوای ئێمە. لەم هەوارگەیەدا بە تەواوی گیان و دڵم حەسایەوە. چونکە هەر لەگەڵ دەرکەوتنمان سەرۆکی خێڵەکە هات بە پیرمانەوە، بە ڕاکردن هات منی لە ئەسپەکەم دابەزاند. بردمی بۆ ژێر ڕەشماڵەکەی خۆی. چاکترین دۆشەکی بۆ ڕاخستم، دای نام. خۆی بەو پیرییە لەگەڵ پیرەژنەکەیدا بە دەستووری میوانداری خۆیان هاتن جزمەکانیان داکەند. ئاویان هێنا قاچمیان شت. جگەرەی خۆیانی دایە دەستم و بە داخێکی زۆرەوە وتی:

«داخەکەم، ئێمە قاوە ناخۆین». ئەم کردەوانەیان لە ڕووی ئازایی و پیاوەتییانەوەیە. کورد لە ترساندا هیچ کارێك ناکات و ناتوانرێت پێیان بکرێت ترسیشیان بەلاوە پەسند نییە. دەستوور، ڕەوشت، خووی کوردەکان لەگەڵ تورکەکان زۆر جیاواز و دوورە. من، کە گەیشتمە (سامات) بینیم، کە خواردن، خواردنەوە، بام ئاویش بێت بە پارە بوو. باسی لەشکری مۆریان و ئەسپێش ناکرێت. کارەساتێکی کەمیان بەسەر نەهێنایین نامەوێت یەکە یەکە و هەموو شتێك باس بکەم.

بە ڕاستی لە هەموو بابەتێکەوە کوردەکان بە پێچەوانەی تورکەکانن.

ئینجا پاش خۆشهاتنێکی زۆر و ڕێزێکی تەواو ئەو سەرۆکی خێڵە کوردەکان دەستبەجێ گیسکێکی سەر بڕی، کردیان بە بریانی.

پیاوەکانی ناو خێڵەکە یەکە یەکە بە چەکەوە دەهاتن خۆشهاتنیان لێ دەکردین. بە بەرامبەرماندا بەچۆکدا دەهاتن و دادەنیشتن. ژنە کوردەکان نە سەرپۆش و نە پەچە ناپۆشن. بە تیلایی چاو وا تێ گەیشتم، کە ژنە جوان و کچەکانیان لە ڕەشماڵەکان نەدەهاتنە دەرەوە، لە ناویاندا جوانم نەدەبینی. خۆ جوانی زۆر لە ناو کوردایە.

ژنەکانیان خەزێمیان لە لووتدایە. بەسەر سەر و ئەگریجەیاندا خشڵی زۆری زیوینەیان هەڵواسیوە. هەرچی پارە و شتێکی زیوینەیان دەست بکەوێت بە لەشیاندا هەڵدەواسن. نایخەنە ناو پریاسکە و نایشارنەوە.

منیش لە هەموو چەشنێك هەندێك پارەم دا بەکچە بچکۆڵەکەی کوێخا کە هەمووی بایی ٣٠ تا ٤٠ غروش ئەبوو، وایان زانی، کە گەنجی قارپوونم داونەتێ و کیسەیەك قاوەیشم دا بە دایکی. بەلایانەوە دیارییەکی زۆر گەورە و خۆش بوو چونکە بە پیاوەتییان دەزانی بەڵام من تێ گەیشتم بۆ ئەوەی بیخەنە بەرامبەر میوانداریەکە بوو نەك زۆریی بەخشندەیی من.

ڕۆژی دوایی، کەوتینە ڕێگا گەیشتینە سەر ڕووباری (سوڵتانی)، کوردەکان بە بێ یارمەتیی حکوومەت خۆیان مەردانە بەند (سد)ێکی زۆر باشیان لەبەر ئەو ڕووبارەدا دروست کردووە. ئاوەکەیان لە وێنەیەکی زۆر جوان و پەسندا بە دوو پەل دابەش کردووە. جۆگەکانی ئەم بەندە نیزیکەی (٢٠) هەزار خێزانی حەساندۆتەوە و کەوتوونەتە خۆشیی ژیان. بەڵام دێهاتە دوورەکانیان، کە لەو ئاو و بەندەوە دوورن، لە سووتاو دەچن.

ئەو دێهاتانەی، کە بە ڕاستی وەکو زمرووت لە ناو شینایی دار و درەختدا و دارەکانیان وەکو منارە لە ناو باخ و باخاتەکەیاندایە و بە هەموو چەشنە میوەجاتێك ڕازاوەتەوە و بە کورتییەکەیشی وەکو بەهەشتن، دێهاتی کوردەکانە.

**لە نیزیك مەرزا - خەرپووت. ٢٣ تەمموز ١٨٣٨**

لەگەڵ ئەو هەموو ئاوە زۆر و جوانە و بارەگا پاك و خاوێنەدا، بە پاشاوە نیزیکەی نیوەی سوپاییەکانمان نەخۆش کەوتوون، چونکە پزیشك نییە، دەرمان نییە، نییە.

خەریووت. ٣ ئاغستوس

لەو کاتەدا، کە حافز پاشا نەخۆش بوو خوا کردی قونسوڵی ئینگلیزەکان لەم ڕێگایەوە ڕابوورد، پزیشکێکی لەگەڵدا بوو. قونسوڵ فەرمانی دا، کە پزیشکەکەی دەرمانی پاشا بکات. لەسەر دەرمانەکان پارێزیشی بۆ دانا. لە ماوەیەکی کەمدا پاشا ئیفاقەی بوو، چاکتر بوویوو. بەڵام لاوازی و زگ ئێشە بێزاری کردبوو. لەملا و لەو لاوە لە ناو کوردەکاندا پیاوی لە نەخۆشی زانیان بۆ پەیدا کرد. پارێز و مارێزیان بەلاوە ڕاست نەبوو. لە جیاتی دۆزینەوە و زانینی نەخۆشییەکەی حۆقەیەك نانیان بۆ دەگوشییە ناو گۆشتاو و دەرخواردیان دەدا دەیانوت ئەمەیە دەرمان. لەسەر خوا بیخۆ قەیناکات. تای ناگریتی هەر لە زۆری بوو. یەکێك لە میوانەکان قاوەیەکی دایە وتی: پاشام من خۆم گرفتاری ئەم نەخۆشییە بووم بەیەك فنجان قاوە ڕزگاریم بوو. لەسەر خوا تۆش بیخۆ بۆ تۆیشی بگێڕێت بە دەرمانی باش.

نەخۆشیی پاشا گەیشتە ئەوەی پێویستی بە شرنقە بێت، کە لەوە پێش بۆ ئیسلام دەستی نەدەدا و دروست نەبوو. بە ناچاری دڵەمان دایە بەر ئەجزاچی، پاشایش گەیشتە ئەوەی خوا ناخوا شرینقە لێ بدات، لەگەڵ ئەوەیشدا و گوێ نەدان بە پارێز ئەو نەخۆشییە پاشای گەیاندە ئەوەی لەشساخی و ڕزگاربوونی بدرێتە دەست خوا.

لە سیواس بەڵگەی (تاعوون) بینرا. چەند هەوڵ دەدرا بۆ پاراستنی سوپاییەکان کەچی ئەوەندە زیاتر تینی ئەساند و بە هەزاران نەخۆش لە ناو جێگادا دەیناڵاند. خۆ کورنتینەیش دانرابوو کەچی لەم کاتە تەنگ و چەڵەمەیەشدا هێشتا نە پزیشك و نە دەرمان نەبوو. ئیتر لەم کاتە گرنگ و ناخۆشییەدا توانای چوونە جەنگی کوردەکان و بەریەرەکانێمان نەما. چونکە لەو باوەڕەدا بووم ئەگەر بێتو بچینە جەنگەوە بێگومان نیوەی هێزەکەمان دەدۆڕێنین ئەوا شەش حەفتەیشی بەسەرا ڕابوارد لەبەر ناساخی هێشتا پاشا نەیتوانیوە عەسکەرەکانی ببینێ. ئەمە بوو ژیانی چەند حەفتەیەکمان پێش ئەوەی بچینە کۆڕی جەنگەوە.

نامەی شاهانە. خەریووت ١٩ ئاغستوس

بەبۆنەی سەرکەوتنەکەی قارسانەوە بە ناوی پیرۆزبایییەوە لە لایەن خاوەن شکۆ (مەحمودی دووەم)ەوە بۆ پرسیاری چۆنیەتیی سوپا و فەرماندەکان لە ئەستەنبوڵەوە حاجی ئەسعەد ئەفەندی بە نامەیەکی شاهانەوە نێررابوو بۆ لامان.

بە هۆی هاتنی حاجی ئەسعەد ئەفەندی و نامەی شاهانەوە بۆ ئاراستەکردنی ئاهەنگ و ئامادەکردنی خواردنێکی نایاب، فەرمان درا. بە ڕاستی خواردنێکی مشە و بە تام و خۆشیان دروست کرد. بەڵام خواردنەوە تەنیا ئاوی سارد بوو، کە ئەوەیش سەر گەرم ناکات. هەر بەو

سەرساردییە و دەستووریکی جوان و ئاهەنگێکی نایابەوە چووین بە پیر حاجی ئەفەندییەوە. ماوەی ئەو هێزەمان، کە لە هێزی سوپاکەمان نەخۆش نەکەوتبوون بە پڕ چەکەوە بردمانن بە پیرییەوە. پاشایش لە ناو چادرەکەیدا و لەگەڵ فەرماندەکانی چاوەڕێی ئیلچییەکە دەکات. لە پێش ئەوەدا، کە سەد هەنگاوی بمێنێت پاشا چوو بە پیر حاجی ئەسعەد ئەفەندییەوە، نامەی شاهانەی وەرگرت. حاجی کرد، نایە سەر سەری. هەموویان بە یەکەوە گەڕانەوە بۆ ناو چادرەکە. جەنەراڵ و فەرماندەکان هەموویان بەڕیز بەچۆکدا هاتن و لە پاش ماوەیەك هەردووکیانمان دوو بەدوو بەجێ هێشت.

زۆر خراپ رووی دا بە ناوی هاتنی ئەم ئیلچییەوە بۆ تۆپ تەقاندن فەرمان درا. بۆ ئەوەی تۆپچییەکان بە تۆپەکانیانەوە بێن تۆپ بتەقێنن فەرمان دەرچوو کەچی لە ڕێگادا لە قوڕا چەقین، هەر لە دوورەوە دەستیان کرد بە تۆپ تەقاندن. ئیتر چارەیانمان نەبینی. پاشا لەم کارە زۆر تووڕە بوو. ڕووی کردە فەرماندەکان و وتی:

ئێمە لە کاتی خۆیدا چاکترین تۆپچی بووین لەم گێتییەدا. کەچی ئێستا لە قوڕا دەچەقین، لە چۆڵ و بیاباندا ئەمێننەوە. لە وەڵامدا یەکێك لە فەرماندەکان وتی: مادام ئێمە لە ژێر فەرماندەی پروسیاییەکدا بین، دەبێ وابێت. ئەمە لە ئارەزووی تۆپچییەکانیشدا نییە.

بەڵام پاشا وتی: های های، ئەی کار نەزانی تێ نەگەیشتوو. پادشا، مەلیك ئەم برادەری بۆ ئێمە ناردووە، کە ئێمە نووستووین و ئەویش لە سوودی ئێمەدا تێ ئەکوشێت و ماندووە. کە پاشا ئەمەی وت، ئیتر دڵخۆشی و خۆشوەختیی من مەپرسن، وا نییە؟

لە پێش مەڵاتییەدا، بارەگا لە نازیوزد

بەرگی کوردەکان – ڕۆژهەڵاتی. ٢ ئەیلوول ١٨٣٨

پاش شەش حەفتە کە لە کەناری دیجلەدا ڕام بوارد لە (خەربووتەوە چووین بۆ نازیوزد)، کە نیزیکەی هەزار پێ لە گەلییەکەی (مەرزا) بەرزترە. لەوێدا جێگاگیر بووین. بە ڕاستی بارەگای پێشوومان ئەوەندە ناساز بوو جێگای ژیان نەبوو. لەبەر گەرمای تیشکی ڕۆژ ئاراممان نەمابوو. وەکو داڵ خزابووینە ناو هێلانەوە. لەو جێگا ئەوەندە بەرزەوە دێهات، ڕێگا، ڕووبار وە چاندگەکانی بەمەوو وەکو نەخشە (خريطة) دەهاتە پێش چاو. لەگەڵ ئەوەیشدا ژیانێکی خۆشیمان نەبینی. ناچاریش بووین تا ڕۆژ ئاوا نەبوایە نەماندەتوانی لە ژوور بێینە دەرەوە یان دەربکەوین.

چونکە لە دەرەوە هەناسە نەدەدرا. لەم کاتەیشدا خانووەکانی هەوارەکانیان پڕ بوو لە خێزان چونکە کوردەکان خۆیان بۆ حەسانەوە دەخزێنە ناو چیاکان.

گەورەكانیان لە جێگا تایبەتییەكەی خۆیاندا بە ڕۆژ لەسەر دۆشەك و قالی بە خاوێنی دادەنیشن و خەریكی قەلیە كێشانن. بچووكەكانیشیان بە پێوە، دەست بە سنگەوە بەرامبەریان دەوەستن بەردەستی باوك و گەورەكانیان دەكەن، ئامادەی بەجێهێنانی فەرمانیانن.

پاشا ویستی لەگەڵیدا بچم بۆ (مەلاتییە)، لە پێشەوە چاوێكمان بەناو سوپاكەدا گێڕا، لە پێویستەكانیان تێ گەیشتین و ملی ڕێگامان گرت چووین بۆ زۆزان (مصیف)ەكانی مەلاتییە-ئازیوزد. من ئەم وڵاتە شین و جوان و ئاوەدارەم بە وڵاتی (لومباردیا) دەهاتە پێش چاو. ئەو خانووەی درا بە من جوانترین و خاوێنترین جێگا بوو. لەوە پێش هی وەساف ئەفەندی، نهێنیداری سوڵتان مەحمود بووە. لەبەر ئەوەی لە پێش چاوی سوڵتان ڕەش بووە، بۆ (معدن) سەرنگون و ئاوارە كراوە و لەم خانووەدا دانیشتووە. بەڵام لە دواییدا نێرراوە بۆ (وارنە) و لە ناكاو مردووە. ئەوا ئێستا من جێگاكەی ئەوم گرتۆتەوە.

ئەوا ئیمڕۆ چوار مانگمان بردە سەر نە پەڵە هەورێك دەبینرێت وە نە دڵۆپێك باران دەبارێت. بەشەو لەسەر كەپر دەنووم و ژێر كەپرەكەیش بە قالی و دۆشەكی جوان داخراوە. لە ناو باخەكاندا هەموو چەشنە دارێكی بەردار و میوە، لە زەویدا فاسۆلیا، شووتی، كاڵەك.... هەموو چەشنە شیناییەك داچێنراوە.

لە ناو ماڵا بەرگی كوردەكان وەكو مانتۆی، جەنگاوەرەكانی (مالطە) وایە، كە لە ئەورووپاوە دەیهێنن. ئەمان لە كەپەنك لباد دروستی دەكەن و ئەیپۆشن. بۆ تەندروستی ئەم بەرگەی ئەمان زۆر بە باشتر ئەبینم. چونكە دەتوانرێت لە ژێر كەپەنكەكەوە چە بەرگێكت بووێت لەبەر بكرێت[1].

بێجگە لەمەیش، پیاوە سوارییەكانیشیان لەو لبادە كیف بۆ تفەنگە درێژەكانیان دروست دەكەن و بە نەخشی ڕەنگاوڕەنگ دەینەخشێنن. بۆ خۆیشیان سەرپێچی لێ دروست دەكەن. بە ڕاستی بەو وێنەیەیانەوە چەند شۆخ و شەنگ، چەند چالاك و بە بەختن. من وا دەزانم ئەگەر ئێمەیش وەكو ئەم كوردانە (ڕۆژهەڵاتی) بژین و بە تەواوی لاساییان بكەینەوە زۆر باشترە. لام وایە لەم قسەیەدا بە هەڵە نەچووم. زۆر بەلامەوە خۆشە، كە ئەو بەرگ و شتانەی لە ئەورووپا، لە پاریس و ڤیەنادا دەدوورێت بەلایانەوە هیچ كەڵكی نییە، بە كاری هیچ نایەت، بە تایبەتی ئەو پانتۆڵە تەسك و تروسكە و ئەو یەخە لە مل جەڕاوە و ئەو جزمە تەنگە لە پێكردن یان ئەو شەفقە ڕەق و تەقە لەسەركردنی ئێمە بە ئەركێكی زۆر گران و كارێكی ناتەواو دەزانن. سوێند دەخۆن، كە هەرگیز توانای ئەم ئەرك و حەپسییەیان نییە، كە ئێمەمانان بەم بەرگەوە دەیچێژین.

---

١. دوور نییە كەپەنك، كە ئێمە پێی دەڵێین فەرەنجی لە وانمان وەرگرتبێت چونكە پێتی فەرەنجی دەبێت ئەفرەنجی بێت. هەر بۆ لە گەرمای هاوین و سەرمای زستان خۆ پاراستنیان لەبەری دەكەن، تەنانەت هەر بەو نهازە سەرپشتی بارگیرەكانیشیانی پێ دەپۆشن.

لە نیزیك مەلاتیە و ئازیوزدەوە. ڕاکردووەکانمان ٢٣ ئەیلوول ١٨٣٨

ئاغایەك (زابت) لە ئاغاکانی حەیدەر پاشا نامەیەکی بە زمانی چەرکەسی نووسراوی هێنا دایە دەست پاشا. خوێندیەوە تا دانیشتووەکان بڵاو نەبوونەوە هیچ دەنگی نەکرد. لە جێگای خۆیشی نەبزووت.

پاش چۆڵ بوون پاشا سواربوو. منیش سواربووم لە ڕێگا وتی، لە سوپاییەکانی ڕەدیف[1] (١٨٠) سوپایی کورد بە زابتەوە و تەواوی چەك و تفاقیانەوە ڕایان کردووە. دەستبەجێ فەرمان درا بە هێزی سوارە و بە هەموو لایەکدا بڵاوکرایەوە، کە هەرچی کەسێك یەکێك لەو فیرارانە بگرێتەوە (نیو کیسە)[2] پارەی دەدرێتێ. پەیمان درا، بیستمان، کە ڕوویان کردۆتە ناو بەگە کوردەکانی ناو چیاکان. ئێمەیش ڕوومان کردە ئەو لایە، شەو مانگەشەوێکی زۆر جوان بوو. سوارییەکان بڵاوەیان کرد.

ئێمەیش لەگەڵ پاشا و یاوەرەکەی لە ناو گیا و جێگایەکی خۆشدا دانیشتبووین. وردە وردە تووڕەییی پاشا دامرەوە. بە دەم قسەکردنەوە پاشا دەستی کرد بە گێڕانەوەی باس و سەرگوزەشتی خۆی، کە چۆن لە قافقاسەوە ڕای کردووە و باوکیشی بەستوویەتێوە و بە چە فڕ و فێڵێك خۆی ڕزگار کردووە، درێژەی پێ دا. لەگەڵ تەواوبوونی ڕاز و داستانەکەی پاشادا شەویش تەواوبوو. ڕۆژ بووەوە و ئێمەیش گەڕاینەوە.

لە ڕاکردووەکان دە کەسیان گەڕانەوە و هاتنەوە. بەڵام یەکی پاش بە سەد قامچی دارکاریکردنیان بەسەر لقەکاندا بڵاوکرانەوە.

پاشا تێ گەیشتبوو، کە ڕاکردنی ئەم ڕەدیفانە بۆ سوپاکەی ئێمە پەڵە و لەکەیەکی ڕەش و ناوێکی پیسی دروست کردووە. چونکە پاشای خۆمان، خۆی سەرۆکی دابەشکردن و ڕێکخستنی کاروباری ئۆردووەکەی ئێمە بوو. لەم کاتەیشدا محەمەد پاشا لە خەرپووتەوە گۆڕرا بۆ (ئورفە). بۆ گواستنەوەی کەلوپەلیان داوای هەزار بارگیری کردووە، کە ئێمە بۆی بنێرین. بۆ ئەوەی لە بابەت نابەجێیی ئەم داوایەی محەمەد پاشاوە لەگەڵ پاشای خۆمان قسە بکەم خۆم ئامادە کردبوو. لەناو سوپاییەکانی عوسمانیدا لە هەموویان زیرەکتر و وریاتر حامید بەگ بوو. لەبابەت چەندێتیی بارگیر و ئالیکی وڵاخەکانی ئەو ئۆردوویەی سووریا، کە لە میسرەوە ڕاپۆرتێکی ئامادە کردبوو، خوێندمەوە. بۆ ئەوەی پێشکەشی پاشای بکات هانم دا و بۆیارمەتیشی ژوانم دایە.

١. ئەو سەربازانەی پاش ئیحتیات دەگیرێن بە سەریان.

٢. یەك کیسە هەزارە.

پاشا هێشتا دوو دێری ڕاپۆرەکەی نەخوێندبۆوە، سەرێکی بادا. کە گەیشتە چوارەمین دێر، بە ڕاپۆرەکەوە دەستی بۆ من درێژ کرد. وتی ها، کوڕم ها، ئەو هەڵانەی، کە لەم ڕاپورەدا پیشان دراوە لە مێژەوە ئەیزانم. بەڵام چی بکەم؟ ئەگەر بمەوێت ڕێکی بخەم هەموو زابتەکان لێم هەڵدەستنەوە سەرپێ. کەوابوو بام بە خۆڕایی ماندوو نەبین.

منیش وتم پاشام، سەرورەرم، وەکو خۆت ناوناخنی ئەم ڕاپۆرەت پێك هێنابێت تۆ بینێرە بۆ ئەستەنبۆڵ. داوای جێبەجێکردنی بکە. ڕەنگە لە وێنەی یاسا و دەستووردا بۆ ئێمە بگەڕێتەوە.

- بەڵێ، کە هاتەوە هەموو دەڵێن ئەم پەند و پەراوێزە لە ژێر سەری پاشاوە دەرچووە. ڕیشی من دەگرێتەوە. هێرش دەهێننە سەر من. کەوابوو خۆم ئەزانم چی دەکەم. ئێمەی دەمکوت کرد.

***

مولتەکە، ئیتر لەبابەت کوشتن، بڕین، سووتان، وێرانکردن و پەرێشانیی کوردەوە دوایی بەباس و یادداشتەکەی دەهێنێت. بەڵام لە پەردەی ئاواتدا دەڵێت:

خۆزگەم، ئەو گەلی کوردی ئازا و ڕووخۆش و میوان پەرستانە لە چنگی ڕاوکەرانی بەدبەختی بێگانە ڕزگار دەبوون. ببوونایە بە خاوەنی ماڵ، دارایی خۆیان. ئەو چاندگە جوان و زەرووەدییانەیان، ئەو کانی و ئاوە ساردە و ڕووبارە سازگارانەیان، دەستی دوژمنیانی لێ دوور دەکەوتەوە. کاشکی منیش یەکێك بوومایە لە هاوژیانیان. ناتوانم باسی ئازایی، دلێری، جەنگاوەرییان بە نووسین تەواو بکەم. ئەوانەی دەیانەوێت بە تەواوی لە ڕاستیی قسەکانم بگەن دەتوانن گەشتێك بکەن بەناو هەرێمە و چیاکانی ئەم گەلە خاوەن شانازییانە بە بازووی خۆیان، تاوەکو بە چاوی خۆیان بەخشندەیی و کردەوەکەیان، کە وەك پڵنگ لە پێناوی ڕزگاریی نیشتیمانەکەیاندا لە لانەدا مەڵاس بوون و لەوەیش گرنگتر کە (شەرەفیانە) سنگ بە بەر گوللەی دوژمنەوە دەنێن ئەو گیانە بەرز و بڵندەیان بەخت دەکەن، ببینن.

بەڵام تەنیا داخم ئەوەیە، کە کورد لەناو خۆیاندا یەك نین. لە پێناوی سوودی بێگانەدا وەکو گورگی هارن.

***

### لەم کتێبەدا

شێخ مەحموود بەبێ پەروا لەگەڵیان کەوتە گفتوگۆ. بەڵام، بۆ ئازادیی بوو نەك بۆ کۆیلەیی، یان بۆ دوژمنایەتیی ئینگلیز.

کورد و هەموو گەلەکانی گیتی لە پاش جەنگی یەکەم بە گێژی دەژیان، لە هەموو کردە و کاری دەوڵەتە سەرکەوتووەکان بێ ئاگا بوون. بە تایبەتی کورد، کە دەستخەرۆی مرۆڤ نەوازیی ئینگلیز بوون. لەو کاتی هەلە گەورە و گرنگانەدا نەدەزانرا، کە لە بەر قووتدانی بابا گوڕ گوڕە و لەو پایتەختە دەترسێت، کە لە کەرکووکدا دادەمەزرێت. کەرکووکیش وەکو (برستول) چۆن لە ئینگلتەرا جیا نابێتەوە. ئەویش کوردستانە و لە کورد جیا نابێتەوە.

چاپخانەی
ئاراس
هەولێر – کوردستان